# مام جەلال

## دیداری تەمەن

له لاوێتیەوه بۆ کۆشکی کۆماری






ئامادەکردنی ـ سەلاح رەشید

# مام جەلال

## دیداری تەمەن لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری

## بەشی یەکەم

گفتوگۆیەکی فراوانی هەمەلایەن

**ئامادەکردنی: سەلاح رەشید**




- کتێب: مام جەلال - دیداری تەمەن- لە لاوێتییەوە بۆ کۆشکی کۆماری
- بابەت: چاوپێکەوتن
- ئامادەکردنی: سەلاح رەشید
- دیزاین: شۆرش ئەحمەد
- بەرگ: رێبوار سەعید
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم ۲۰۱۷
- چاپخانە: کارۆ
- نرخ: (۲۰) هەزار دینار بۆ هەردو بەرگەکە
- لەبەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (۱٤۰۰)ی ساڵی (۲۰۱۷)ی پێدراوە

**ناوەرۆک** | **لاپەڕە**

### سەرەتای قۆناغی چالاکی لە دەرەوەی عێراق



### یەکەم دیدار لەگەڵ بارزانی



### گەشانەوە و گەشەکردنی خەباتی کوردایەتی ١٩٥٨-١٩٦٣

### شۆرش چۆن دەستی پێکرد؟



### گفتوگۆ و خەباتی دبلۆماسی



### عەبدولناسر و کورد و خەباتی کوردی – عەرەبی

**سەرەتای ناکۆکی لە نێوان (مەکتەبی سیاسی) و (بارزانی)دا**



**لە هەمەدانەوە بۆ بەغدا**

**هاتنەوەی بەعس و بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠**



**ئاشتبونەوە و تێکەڵبونەوە**



**کورد و چەپەکانی ئێران و کاریگەرییان لە گۆڕەپانی سیاسی کوردستانی عێراقدا**



**کارکردن لە ناو فەلەستینیەکاندا**



**رێککەوتنامەی جەزایری ١٩٧٥**



**بناغە بۆ خەباتێکی نوێ (ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە و دامەزراندنی)**

# ئەم دیدارە چۆن دروست بو؟

لە ئایاری ساڵی ١٩٩٠ کەدەکەوتە رەمەزانەوە، مام جەلال بەسەردانێك هات بۆ بەرلین و ماوەیەك لەوێ مایەوە، لەو ماوەیەدا، لەگەڵ بەرێزیان لە شوقەی برادەرێك بوین کە خۆی لەوێ نەبو، کاتمان زۆر بەدەستەوە بو کە بەگێرانەوەی بەسەرهات و گفتوگۆ بەرێمان کرد، لەبەر ئەوەی مام جەلال بەرۆژو بو، رۆژانە هەندێ کاتیشمان بەکڕینی پێویستیەکانی رۆژەوە بەسەر دەبرد و پێکەوە دەچوینە بازاڕ.

رۆژێك بۆ ئەوەی نانێکی بەربانگی باش ئامادەبکەین، بەیەکەوە چوین بۆ بازارێك بەناوی "میترۆ" کە بازاڕێکی زۆر گەورەیە و تەنها خاوەن چێشتخانە و شوێنە گشتییەکان بە کارتی تایبەت ئەتوانن کەلوپەلی لێ بکڕن، ئەمە سەرەڕای گەورەیی بازاڕەکە، لەوێ هەندێ خواردن هەبون، نە لە کوردستان و نە لە بازاری ئاسایی دەست نەدەکەوتن، ئەو رۆژە مام جەلال کۆمەڵێك خواردەمەنی بەتام و دانسقەی کڕی، لەوانە باڵندەیەك لە کەوێکی بچوك دەچو، بەندە لەپێشتردا نە بینیبوم و نە خواردبوم، بەڵام ئەو باڵندەکەی لە لوبنان خواردبو، لەماڵیشەوە، هەر خۆی بە شێوەیەکی تایبەت لێینا، دیارە قسەی ئەوبو، خواردنەکە زۆر بەتام وچێژ دەرچو.

لەو ماوەیەدا، ئەوە هات بە بیرما، بۆ سود لەکاتەکە نەبینم و دیدارێك لەگەڵ مام جەلال سازبکەم؟ سەرەتا ویستم بە نوسین ئەنجامی بدەم، بەڵام هەر زو هەستم کرد، تینوێتی پرسیارەکانم لە رێگای کاغەز و قەڵەمەوە ناشکێت، بۆیە بیرم لە تۆمارکردن کردەوە، بۆئەوەش لە ماڵەوە تەسجیلێکی بچوکم هەبو، کە میکرۆفۆنەکەی لە خۆیدا بو، بۆیە ناچار بۆ تۆمارکردن، تەسجیلەکەم بەرز دەکردەوە، یاخود لەسەر شتێکی بەرز دادەنا تاکو قسەکان بە باشی تۆمار بکرێت.

لەراستیدا پێشتر نە من خۆم بۆ دیدارێکی دورودرێژ ئامادە کردبو، نە جەنابی مام جەلال بەڵام پرسیار، پرسیاری نوێی دروست دەکرد و وەڵامەکانیش زۆرجار دەیگێڕاینەوە

بۆ سەرەتایەك كە پێشتر بەبیری كەسماندا نەهاتبو، دیارە لەدیدارێكی ئاوادا كە پێشوەخت پرسیارەكانم ئامادەنەكردبو، هەروەها مامیش هیچ سەرچاوەیەكی لەبەردەستانەبو بۆ وەڵامەكان، پێویستمان بەوەستاندن و دەستپێكردنەوە هەبو.

ئەو ماوەیەی لەو شوقەیەدا پێكەوەبوین، سەرەتای ئەم چاوپێكەوتنە درێژەی لێ بەرهەمهات، ئەوكاتانەی وا پێویستیش بو، بچمە دەرەوە بۆ كڕینی پێویستی یان هەركارێكی تر، بۆ ئەوەی سود لەكاتەكە وەرگرین، چەند پرسیارێكم لەبەردەستی بەرێزیان دائەنا بۆ ئەوەی تا دەگەڕێمەوە وەڵامیان بداتەوە و كاسێتی بەتاڵیشم لە تەنیشتەوە بۆ ئامادە دەكرد، بۆیە زۆرجار هەرخۆی كاسێتەكانی دەگۆڕی و هەڵی دەگێڕانەوە، هەندێ جار كە دەگەڕامەوە، سەیرم دەكرد، مام جەلال وەڵامی هەمو پرسیارەكانی داوەتەوە، بەڵام كاسێتەكەی نەگۆڕیوە، لەبەر ئەوەی تەسجیلەكە تازە نەبو، كاتێك دیوێكی تەواو دەبو، نەدەكوژایەوە و بەئاسانی گوێت لێ نەدەبو كە كاسێتەكە تەواو بوە، لەبەر ئەوە، مام بەناچاری دەبو جارێكی تر، وەڵامی پرسیارەكان بداتەوەو ئەشی گوت: "ناخۆشترین وەڵام ئەومیە كە دوبارە بكرێتەوە".

كاتێك بەشێكی باشی ئەم دیدارەمان تۆماركرد، مام جەلال سەفەری كردەوە بۆ كوردستان و دوای ئەودش گۆڕانی گەورە لە كوردستان و عێراقدا رویداو، ئێمە دواتر لە كوردستان یەكترمان بینیەوە، لەو ماوەیەوە تا گەڕانەوەی یەكجاریم لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٠ بۆ كوردستان و دەستكردنم بە كاركردن وەك یاریدەدەری جەنابی بۆ كاروباری دەرەوەی یەكێتی، فرسەتی دیدار دروست نەبو تا روخاندنی بەعس و دروستكردنی مەجلیسی حوكم لە بەغدا، ئەوكاتە ناو بەناو مامم دەبینی و بە پێی ماوەكەی چەند پرسیارێكی تازەم لێدەكرد و تۆمارم دەكرد، یاخود بەسەر هەندێ پرسیاردا دەچومەوە و وردترم دەكردنەوە.

وەك پێشتر ئاماژەم بۆكرد لەم دیدارەدا، جەنابی لەهیچ كاتێكدا نەگەڕاوەتەوە بۆ سەیركردنی سەرچاوەیەكی دیاریكراو، یاخود هەستم نەكرد دودڵ بوبێت لە وەڵامێكی یاخود پرسیارێكی رەتكردبێتەوە و ویستبێتی پرسیارێك بەویستی خۆی ئامادەبكات، تەنانەت هەستیشم بەوە نەكرد حەزی كردبێت پرسیارەكە بە شێوەیەك بكرێت كە بە دڵی ئەو بێت. متمانەی ئەو بە دیدارەكە ئەوەندە بو رۆژێك نەهات بیەوێت سەیری پرسیار و وەڵامەكان بكات، یاخود دەستكاری وەڵامێكی خۆی بكاتەوە.

بەداخەوە كاتێك پاكنوسی ئەم دیدارە تەواو بو، خۆی ئەم دیدارەی بە هیچ جۆرێك نەدیبیەوە. پێشتر لە چەند شوێنێك و لای چەند كەسێك و لەم دیدارەشدا باسی لەوە كردوە، كە بیرەوەرییەكانی نوسیوەتەوە، گوتویەتی: "بەڵام بۆ بڵاوكردنەوە ناشێت، چونكە كۆمەڵێك دۆست و ناسیاو و كەسایەتی جیاواز لێم عاجز ئەبن، لەوانە مام جەلال خۆی"!.

دیارە ئەم دیدارە كە وەك تۆماركردنی بیرەوەرییەكانی وایە و لەشێوەی پرسیارو وەڵامدایە،

زۆر ئاساییە کە کۆمەڵێك پرسیار لای هەندێ کەسایەتی دروست بکات، یان کومەڵێکیان بۆچونی جیاوازیان هەبێت، دەربارەی روداوەکان و رەنگە ئەوان لە روانگەیەکی ترەوە روداوەکانیان بینیبێت و هەڵسەنگاندنی جیاوازیان بۆی هەبێت، ئەمەش کارێکی زۆر ئاساییە، کە بۆچونی جیاواز دەربارەی روداوەکان لێکدانەوەی جیاوازی بۆ بکرێت.

لەم دیدارەدا، مام جەلال روداوەکان وەك تێگەیشتنی خۆی دەگێڕێتەوە، چۆن دیویێتی و تێیدا ژیاوە، بەتایبەتی ئەو ڕۆڵی دیار و گەورە و سەرەکی لە زوربەی ڕوداوەکاندا هەبوە، بۆیە ناتوانین بڵێین کە ئەوەی شێوازێکی گێرانەوەی هەیە زۆر بێلایەنانەیە و ئەو تەنها وەك گێڕانەوەی روداوێکی مێژویی سەیری کردوە، کە پرسیارەکەی تێدا کراوە.

ئەم دیدارە لە ماوەیەکی درێژ، کە نزیك لە ١٥ ساڵی خایاندوە تۆمارکراوە و ئەنجامدراوە، لەو ماوەیشدا روداوی گەورە و گرنگ لە جیهان، ناوچەکە، عێراق، کوردستان و ناو ریزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان رویانداوە، لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە کە مام جەلال کاتێ بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەوە گوزارشت لە کات و شوێنی دیاریکراوی خۆی دەکات، کە پرسیارەکەی تێدا کراوە و زیاتر ئەو روداوە مێژوییە بەوشێوەیە دەگێڕێتەوە وەك ئەوەی کە ئەو لەوساتەدا چۆن بینیویێتی، نەك وەك ئەوەی ئێستا هەیە، لەبەرئەوە، هەمو لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و شیتەڵکردنەوەی ئەم دیدارە، پێویستە لە ڕوانگای ئەو ڕۆژەوە لێکبدرێتەوە.

زۆر دۆست و هاورێ، پێیان وابو کاتی بڵاوکردنەوەی ئەم دیدارە نەهاتوە، بەڵام من ئەم دیدارە لە کاتێکدا بڵاو دەکەمەوە، کە بەداخەوە مام جەلال نەخۆشە و پێشتریش دەرفەتی ئەوە نەڕەخساوە دیدارەکە ببینێ و سەرنجی نوێی لەسەر بڵێ، یان تەنانەت روخسەتی بڵاوکردنەوەشی لێوەربگرم، بەڵام خۆم باوەڕم بەوە هەیە، کە مێژوی هاوچەرخی کورد و ئەوەی نوێ، پێویستی بەم شایەتیەی و زانیاریانەی لای مام جەلال هەیە، هەر لەبەر ئەوەش بڵاوکردنەوەیم بە زۆر گرنگ زانی. هەندێ برادەریش پێیان وابو بارودۆخەکە ناسکە و رەنگە زیان بە دۆخەکە بگەیەنێت، یان هەندێ لایەنی سیاسی یان کەسایەتی دڵگران بکات، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئەی کەی کاتی گونجاوە؟

لەوکاتەوەی بیرمان دێت، هەمیشە دەوترێت، بارودۆخی کوردستان ناسکە و لەبار نییە و ئەمەش کراوەتە بەهانە بۆ نەوتن و خەفەکردنی زۆر روداوی گرنگی مێژویی. لەڕاستیدا سەرباری هەمو ئەو بۆچونانە، من ئەم ئەرکەم وەك ئەمانەتێکی مێژویی و ئەخلاقی گرتۆتە ئەستۆ، هەروەها لەوەش دڵنیابوم ئەم دیدارە روناکییەك دەخاتە سەر بەشێ لە مێژوی خەباتی گەلی کوردستان و دەبێتە گۆشەیەکی جیاواز بۆ بینینی رابردو.

سەرئەنجام ئەم دیدارە بەمەبەستی دژایەتی یان بەرژەوەندی لایەنێك یان کەسایەتیەك

ئەنجام نەدراوە، بەڵکو تەنها باسی دوێنێیە وەك ئەوەی مام جەلال بینیوێتی، هەرچەندە پێشموانییە توانیبێتمان لەم دیدارەدا هەمو پرسیارێک بکەین، دەربارەی لایەنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەسی مام و ڕاو بۆچونی دەربارەی هەمو بوارەکان بزانین. لەگەڵ ئەوەی ڕەنگە نەشتوانرابێت زانیاری ورد و تەواو دەربارەی وێنەکان بخەینە رو، ئەمەش ڕەخنەیەکە کە مافی خوێنەرە ڕوبەروی بەندەی بکاتەوە، بەڵام وەك پاکانە نایڵێم کاری تاکە کەسی هەمیشە کەموکورتی هەیە و ڕەنگە زۆر لەمە باشتر دەرنەچێت.

لەم چاوپێکەوتنەدا دو بۆشایی گەورە و گرنگ هەن، کە باسیان لێوە نەکراوە، ئەوانیش کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجەن، یاخود کیمیابارانی کوردستان، بەڵام مام جەلال، لە دیداری زۆر جیاوازدا بە درێژی باسی لە هەردو کارەساتەکە کردوە، دڵنیام ئەتوانرێت ئەو دیدارانەی تر ئەو بۆشاییە بە باشی پڕبکەنەوە.

هەندێ دۆست و برادەریش، بۆچونێکیان هەبو کە مەرج نیە، هەمو وەڵامەکانی مام جەلال وەك خۆی بڵاوبکەینەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندیان بە کێشە ناوخۆیەکانی جارانی پارتی و یەکێتییەوە هەبوە، بەتایبەت لەم بارودۆخەدا کە یەکێتی کۆمەڵێك کێشەی ناوخۆیی هەیە، هەندێ دۆست و برادەری تریش لەو بروایەدا بون، کە باسکردنی مێژو نابێت پچرانی تێدا بێت و ئەبێت روداوەکان وەك خۆی باس بکرێت، یان وەك مام جەلال وەڵامی داوەتەوە بڵاوبکرێتەوە، دیارە بەسود وەرگرتن لەو سەرنجانە هێشتا ئەو مافەم بەخۆم ڕەوا نەبینی کە چیم پێ باش بێت بڵاوی بکەمەوە و چی بە گونجاو نەزانم هێڵی سوری پێدا بهێنم.

لەبەر ئەوەی مێژوی هەندێ پرسیار و وەڵام، بو قۆناغێك دەگەرێتەوە کە ڕوداوەکانی ئەوکاتە زۆر کاریگەرییان لەسەر مام جەلال هەبوە، هەرلەبەرئەوەش هەندێ وەڵامی "سیاسیانە و دبلۆماسیانە"ی نەداوەتەوە، بەڵکو زیاتر وەك هەمو تاکێك کە ڕوداوەکان کاریان تێکردوە و هەستی ئەو کاتەی خۆی دەربڕیوە. بۆیە تەنها شتێك کە بەگونجاوم زانی ئەوەبو ناوی هەندێ کەسایەتی لەدیدارەکەدا لابەرم، بەڵام وەڵامەکان کە باسی روداوەکان دەکەن وەك خۆی ماونەتەوە، خۆ ئەگەر خوا یاریێت، لەکاتێکی گونجاودا ئەوا دەقی دیدارەکە هەموی وەك خۆی پارێزراون و ئەتوانرێت جارێکی تر لەبەرگێکی نویدا بەچاپی بگەیەنینەوە.

چەندەها جار لە دیدار و نوسین و کتێبی جیاوازدا، کەسایەتی و لایەنی سیاسی لەڕوانگاو دیدی هەمەجۆرەوە بە درێژی باسیان لە روداوەکانی کوردستان، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ناکۆکیی و ململانێکان کردوە، بەڵام ئەوەی تازەیە، ئەوەیە کە مام جەلال خۆی بەم شێوەیەی ئێستا باسی ئەو روداوانەی ناو پارتی و ناوخۆی یەکێتی لەهیچ دیدارێکدا بەم شێوەیە نەکردوە.

هەروەها هەوڵیشمداوە وەڵامی پرسیارەکان وەك خۆی بنوسمەو، واتا بە هەمان لەهجە و تەعبیری مام جەلال و دەستکاری رێنوس و دەربڕینەکانم نەکردوە، یان وشە عەرەبیەکانمان نەگۆریوە بۆ کوردی، یاخود رستەکانمان لەگەڵ نوسین و دارشتنی ئیمرۆدا نەگونجاندوە، بەداخیشەوە رەنگە ناوێك یان مێژویەك بە هەڵە نوسرابێت، ئەویش لەبەر ئەوەی تۆمارە دەنگییەکە بەهۆی خراپی تەسجیلەکەوە هەندێك کێشەی دروستکردبو، تەنانەت هەندێ وشە و رستە زۆر بە رونی مەبەستەکەی دیارنەبو. سەرەرای ئەوەی چەندەها جار گوێمان لێگرتۆتەوە و دوایش بەدواداچونمان بۆ کردوە، وەك ئەوەی تێیگەیشتوین نوسیومانەتەوە.

لەم دیدارەدا مام جەلال، باسی زۆر روداو و کەسایەتی کردوە، ئێمەش بۆ زیاتر رونکردنەوە و شیتەڵکردنەومیان تا کارئاسانی بۆ خوێنەر بکەین هەندێ پەراوێزمان بۆ داناوە، هەوڵمان داوە سەرچاوەی باوەرپێکراو و هەمەرەنگ بەکاربهێنین.

تەمەنی ئەم بەرهەمە، زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە، سوپاس بۆ دڵخۆشی هاوسەرم کە هاوکارم بوە لە بەرلینەوە بۆ بەتاڵکردنەوەی هەندێ کاسێت و نوسینەوەی، بەڵام بەداخەوە دوای هیلاکییەکی زۆر بەشێکی زۆری ئەوەی نوسیبومانەوە، بەهۆی خراپی کۆمپیوتەرە کۆنەکەمەوە سڕانەوە و دەستم نەکەوتنەوە و ناچار جارێکی تر دەستمان کردەوە بە بەتاڵکردنەوەی کاسێتەکان. بۆدڵنیایی زیاتریش چەندین جار بەسەر ئەم دیدارەدا چومەتەوە نەبا هەڵەیەك روویدابێت، دیارە بەسوپاسەوە بە هاوکاری هاورێیان، بە تایبەتی (ستران عەبدوڵلا، چولی ئەسعەد، کامەران سوبحان و هەڤاڵ کوێستانی) کۆمەڵێك هەڵەیان بۆ راستکردومەتەوە و تێبینی زۆر بەسودیان داومەتێ و بێ ئەو هاوکاریانە، ئەم دیدارە بەم شێوەیە دەرنەئەچو.

هەروەها سوپاسی کۆمەڵێک دۆست و هاورێ دەکەم کە هاوکاریان کردوم لە بەخشینی وێنە و ساغکردنەومیان.

ئەم دیدارەم بە ئەرکێکی هەمەلایەنە سەیرکردوە، لە هەمانکاتیشدا، بە دانانی بەردێک دائەنێم لەسەر بناغەی کۆشکی مەزنی خەباتی کەسایەتیەکی دانسقەی وەک مام جەلال، کە بەداخەوە تاکو ئێستا زۆر کەم باس لە ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتی و فکری و کۆمەڵایەتی کراوە، هیوادارم بە هاوکاری هەمو دڵسۆزان هەوڵبدەین بەشێ لەو بۆشاییە پڕبکەینەوە..

**سەڵاح رەشید**

**بەهاری ٢٠١٧**




# منداڵی، قوتابخانە و دەستپێکردنی ژیانی سیاسی

*** سەرەتا بەوە دەست پێدەکەین، کە ناوی تەواوت چییە و کەی و لە کوێ لەدایک بویت؟**

- ناوم، جەلال کوڕی شێخ حسامەدینی کوڕی شێخ نوری، کوڕی شێخ غفوری تاڵەبانیم. لە دێی کەلکان سەر بە شارۆچکەی کۆیە لە دایک بوم. بە دڵنیاییەوە نازانم کەی لە دایک بوم، پێش ئەوەی دایکم وەفات بکات، ئەمویست لە مێژوەکەی بپرسم و تێبگەم، چونکە دایکم نەخوێندەواربو، هەر ئەوەندەی ئەزانی، وەرزی هاوین بوە و بە حسابێک قسەی ئەکرد کە ئەبێت بگاتە ساڵی۱۹۳۳ - ۱۹۳٤، چونکە ئەو ئەیگوت، ساڵێک پاش پەیدابونی فلوسی سور لە عێراق بوە، ئەکاتە ساڵی ۱۹۳۲.

لەبەر ئەوە، ساڵەکە لەنێوان ساڵی ۱۹۳۳ - ۱۹۳٤ دایە، خۆم پێموایە مەوالیدی ۱۹۳۳م، چونکە ساڵێک زوتر مافم هەبو بچمە قوتابخانەی سەرەتایی، من ساڵێک دوا کەوتم، چونکە جاران منداڵ بە حەوت ساڵی لە قوتابخانە قبوڵ ئەکرا. لەبەرئەوە پێموایە مەوالیدی ۱۹۳۳م، هەرچەندە لە دەفتەرو بەڵگەنامەدا ساڵی ۱۹۳٤ نوسراوە[1].

*** سەرەتای قوتابخانە و لاوێتیت لەکوێ بردوتەسەر؟**

- چەند ساڵێک لە دێی کەلکان مابوینەوە، پاشان مامێکی گەورەی باوکم لە کۆیە شێخی تەکیەی تاڵەبانی بو، ئەمری خوای بەجێ هێنا و باوکمی لەجێی خۆی دانا، ئەو بوە مورشیدی تەکیەکە. لەبەرئەوە ماڵمان چوە کۆیە، لە بیرم نییە چ ساڵێک چوینە کۆیە، بەڵام ئەزانم کە کاتێ چوینە کۆیە، باری ژیانمان بەتەواوی گۆڕا، لە لادێوە ڕومان کردە شار.

تەکیە ساحەیەکی زۆر گەورەی هەبو، باخ و سەوزایی لێبو، هەمو ڕۆژێ زیکر و تەهلیلە و نوێژی لێ ئەکرا. نوێژی جەماعەت و بانگی پێنج وەختە، هەمو ئەوانە

ئێمەی خستە جەوێکی دینی و جەوێک، دەروێش و تەکیە و قورئان خوێندن و تەهلیلە و زیکر گرتبویەوە، من لە یادمە، هەر لە منالّییەوە ئەچومە ئەو ئەلّقانەوە.

واتا لە زیکر و تەهلیلە و خودا پەرستی بەشداریم ئەکرد و لەپێش ئەوەی بچینە قوتابخانەش لە حوجرە دایانناین کە ئەبێ قورئان بخوێنین و فێربین. ئامۆزایەکی گەورەشمان هەبو، بەناوی کاکە سور، شیعری شێخ ڕەزای تالّەبانی فێرئەکردین، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە مەدحی تالّەبانی و شێخی تالّەبانیەوە هەبو.

سالّی ١٩٤١م لە یادە، لە کۆیە بوم، ئەو سالّەش سەبارەت بەوەی کە سالّی شەڕی ڕەشید عالی گەیلانی بو لەگەلّ ئینگلیز و پاشانیش شەڕی سۆڤێت بو، ئەلّمان پەلاماری سۆڤێتیدا، ئەو دو ڕوداوەم زۆر چاک لەیادە، چونکە:

یەکەم: ئێمە یەکێک لەو مالّە کەمانە بوین لە کۆیە، رادیۆمان هەبو، گوێمان لە هەوالّ ئەگرت و بەهۆی ڕادیۆوە ئەمانزانی دەوری ئینگلیز لە حەببانیە گیراوە، من منداڵ بوم، ئەمزانی سوپای عێراق، ئینگلیزی ئابلّوقەداوە، پاشان کە ئینگلیز حکومەتی ڕەشید عالی گەیلانی شکاند و گەمارۆ تەواو بو، سەربازی ئینگلیزی هاتنەوە لای کۆیە و زانیمان ئینگلیز سەرکەوتوتەوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی جارێکی تر لەناو بازاڕ و لە ناوشاردا دەرکەوتنەوە، سینەما دەستی کردەوە بە دیعایەکردن بۆ ئینگلیز.

دووەم: باشم لەبیرە کە ئەلّمان هێرشی کردەسەر سۆڤێت، چونکە ئەو سەردەمە وەکیلی قایمقام لە کۆیە شێخ فازیلی تالّەبانی بو، باوکی خەسرەو تالّەبانی، من لە مەجلیسەکەدا دائەنیشتم لەبەرئەوەی تاکە کوڕی باوکم بوم، مافیان دابومێ، بچمە مەجلیسەوە، لەوێ گوێم لێبو، باسی ئەوەیان ئەکرد کە ئەلّمان ئەشکێت، چونکە پەلاماری روسیای داوە، پێشتر هەر باسی ئەوە ئەکرا، ئەلّمان لە جەنگدا سەرکەوتوە، باسی سەرکەوتنیان ئەکرد.

شێخ فازیل، بڕوای وابو، ئەلّمان سەرەتای شکانێتی، باسی ئەوەی ئەکرد کە ناپلیۆنیش کاتی خۆی چۆتە روسیا و هەتا مۆسکۆ چوە و دوایی وەستاندویانە. من لەو کاتانەدا سێ، چوار ناو فێربوبوم، لەوانە ناوی (ستالین، ناپلیۆن و هیتلەر)، ئەتوانم بلّێم، ئەوە لە منالّییەوە کاری تێکردوم.

مەسەلەی شەڕی ستالین و هیتلەر و ئەو ململانێیەی ئەو سەردەمە، کاری کردەسەر ئامادەیی مێشکم بۆ قبولّکردنی کاروباری سیاسی و فکری، تەنانەت من یەک مانگ دوای ئەو سالّە چومە قوتابخانە. ئەو سەردەمە مامۆستاکانمان

هەمویان کورد بون، شیعری کوردییان پێ لەبەرئەکردین و گۆرانی کوردییان پێ ئەوتین و هەستی کوردایەتیان ئەجوڵاندین.

ئەوانە هەمو، هۆبون بۆئەوەی من زۆر زو بکەومە کۆڕی کوردایەتیەوە، لە بیرمە، لە پۆلی چواری سەرەتایی بوم، یەکەمجار یادی نەورۆز لە کۆیە کرایەوە. وەکو منداڵێک لە نەورۆزدا شیعریان پێ ئەخوێندمەوە، هەروەها چونکە قوتابییەکی باش بوم و هەمو رۆژێ کە لە قوتابخانەکە ریز ئەبوین، ئەبوایە یەکێک شیعر بخوێنێتەوە، زۆر جار من بانگ ئەکرام و زۆرجاریش ئەو شیعرانەی، ئەمخوێندەوە شیعری حاجی قادری کۆیی و مەلای گەورە و شیعرە نیشتمانیەکانی تر بون، زوربەیان لە گۆڤاری گەلاوێژدا بلاوئەکرانەوە[٢].

لەناو مامۆستاکاندا، دو سێ مامۆستای سەرەتایی زۆر کاریان کردەسەر بیر و رەوشت و بۆچونی سیاسیم، یەکێکیان، مامۆستای مێژومان خوالێخۆشبو مامۆستا مەجید شێخ نوری بو، یەکێکی تریان، محەمەد ئەمین مەعروف بو، ئەو زۆر زیاتر لەهەمویان کاری کردەسەر بیروراو بۆچونەکانم، مامۆستایەکی زۆر زیرەک بو، هەر یەکەیان دەرسی جیا جیایان پێ ئەگوتین، بەلام بە هەڵسوکەوتیان و رەوشت بەرزیان لە گەڵماندا بە گشتی، کاریان زۆر تێ ئەکردین.

لە بیرمە، کە گەیشتمە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، ئیتر دەمم لە سیاسەت ئەدا و مەسەلەی کۆماری مەهاباد لە ئارادابو، هێشتا کۆمارەکە دانەنرابو، بەلام باسی مەهاباد هەبو. باسی راپەرینی بارزان لە رۆژنامە و گۆڤاری نیشتمانی و لە بەشی کوردیەکەی رادیۆی تەورێز کە بەشێکی کوردی هەبو، ئەمانە هەموی هەوێنی بۆچونی سیاسی من بون لەو قۆناغەدا. لەو سەردەمەدا، گۆڤاری (نیشتمان) کە ئۆرگانی کۆمەڵەی (ژ.ک.) بو، دەستاودەست ئەگێرا و هیوا و ئاواتی رزگاری کوردستانی تێدا بەدی ئەکرا.

لە ماڵێ ئێمە، هەمو کەس باسی سیاسەتی ئەکرد، بەتایبەتی کە خەڵک ئەهاتە مەجلیسی باوکم لە تەکیە، زوربەیان باسی سیاسەتیان ئەکرد، لەوانەش: حاجی باقی بو، کە دوایی لە سلێمانی گیرا، پیاوێکی زۆر زیرەک و رۆشنبیری ئەو سەردەمەبو.

*** ئەو حاجی (باقی)یەی مامۆستای فیزیا بو، لە ١٩٦٣ دا لە سلێمانی گیرا؟**

- بەڵێ ئەو لە ١٩٦٣دا لەلایەن بەعسییەکانەوە گیرا و دوایی ئیعدام کرا، دراوسێی ئێمە بو، وەکو خزمیش وابو، هاوینان کە ئەهاتەوە، تەقریبەن هەمو

ڕۆژان لە ماڵی ئێمە بو، لە هەیوانەکەی ماڵمان، کە زۆر فێنک بو، دائەنیشت و قسەی بۆ ئەکردین، دەرسیشی پێ ئەگوتم، هەمیشە دەرسی ساڵێکی لەپێشەوە پێ ئەگوتم، بۆ نمونە، کە لە پۆلی چوار دەرچوم بۆ پێنج، ئەو دەرسی پێنجی پێ ئەگوتم، لە پێنجیشەوە بۆ شەش بەهەمان شێوە.

لەبەرئەوەی، جەوی ماڵی ئێمە جەوێکی سیاسی بو، خۆشم حەزم لە شیعر بو، لە قوتابخانە سرودی نیشتمانیمان لەبەرئەکرد، بۆیە لەو کاتەوە هەستی سیاسیم هەبو، لەبیرمە لە پۆلی پێنجی سەرەتایی بوم و لە کۆیە یادی نەورۆز کرایەوە، ئەو یادە زۆر کاری کردەسەر بۆچونی سیاسیم، ئەوەبو گوتیان، نەسرێک بنوسمەوە، منیش وتارێکی کورتم بە عەقڵی ئەو سەردەمە نوسیەوە، باسی ئەوەم کردبو، کورد دواکەوتوە و زوڵمی زۆری لێکراوە، وا هەمو دنیا بەرەو ئازادی ئەچێت و جولەکەش ئەبێت بە دەوڵەت، تەنها کورد بەهیچ نەگەیشتوە. کە وتارەکەم خوێندەوە مامۆستایەکمان هەبو بانگی کردم، گوتی: "وتەکەت باشبو، بەڵام جولەکەش وەک ئێمە ئینسانن، تۆ بۆچی واتگوت".

لە ڕاستیدا، من مەبەستم ئەوە نەبو نیشانی بدەم کە پێم ناخۆشە جولەکە دەوڵەتی بۆ دروست ببێت، چونکە من خۆم لە کۆیە پەیوەندیم لەگەڵ جولەکەکانی ئەوێ زۆر باشبو، لەپۆلەکەی خۆمان قوتابیەکی جولەکەی لێبو، تەنها من هاوڕێی بوم و ئەویش زۆر کاری تێکردبوم.

ڕوداوێک وای لێکردم، بە باشی ببم بە هاوڕێی ئەو کوڕە جولەکەیە، ئەویش ئەوەبو، لە هەرای (ڕەشید عالی)دا[٢]، کۆمەڵێک گەنجی سەرکەش پەلاماری گەڕەکی جولەکانیاندا لە کۆیە. قوتابخانەکەی ئێمە لەو گەڕەکەبو، بەناوی (قوتابخانەی جولەکەکان)ەوە ناونرابو، لەوێ من چاوم لێبو کە گەنجەکان جولەکەکانیان بەرد باران ئەکرد، ئەو برادەرەی من بەردێکی بەرکەوت و سەری شکاو خوێنی پێدا هاتە خوارێ، ئەو دیمەنە زۆر ناشرین و ناپەسەند بو لەبەرچاوم، زۆر پێی پەست بوم، زۆرم پێ ناخۆش بو، چوم لەسەری بکەمەوە، تێکەڵیان بوم، دیاربو پێش من خەڵکی تر گەیشتنە ئەوێ و لێکیان جیاکردنەوە، ئەوە بوبە هەوێنی دۆستایەتیەکی باشتر لە نێوانماندا.

## پەراوێزەکان:

١- شێخ جەنگی برای مام جەلال و فاتیح رەسوڵ دەیگێڕنەوە: شێخ ئەدیبی مامی مام جەلال، ڕۆژ و مانگ و ساڵی لە دایك بونی ئەندامانی بنەماڵەکەی لەسەر دیواری تەکیەکەی نوسیوە، بەو پێیە مام جەلال لە کۆتایی مانگی ٣ و سەرەتای مانگی ٤ی ساڵی ١٩٣٣ لە دایك بوە. دایکی مام جەلال لە عەشیرەتی مەنگور بوە، دوای کوژرانی مێردی یەکەمی، واتا شێخ بورهان، لە ١٩٢٧، شوی بە هێوەرەکەی خۆی دەکات، واتا شێخ حیسامەدین، کە جێگری براکەی بووە. کوڕێکی دەبێ بە ناوی جەلالەدین و دوو کچ بە ناوەکانی فەوزیە و جەمیلە. لە شێخ بورهانیش ٣ منداڵی بووە بە ناوەکانی: شێخ جەنگی، موحەمەد ساڵح و مریەم. خەدیجە حسێن دایکێکی هێمن و لەسەرخۆ و کارجوان و قانیع بووە. (دوای شەست ساڵ، ژیان و بیرەوەرییەکانی جەلال تاڵەبانی. عرفان قانیعی فەرد. بەرگی یەکەم. ل . ٩٣).

٢- گۆڤاری گەلاوێژ، گۆڤارێکی ئەدەبی، ڕۆشنبیری و زانستی بو، یەکەم ژمارەی لە کانونی یەکەمی ١٩٣٩ لە بەغدا دەرچوە، خاوەنی ئیمتیازی ئیبراهیم ئەحمەد و سەرنوسەریش علادین سوجادی بو، بە شاکارێکی ئەدەبی قۆناغی خۆی دەژمێرێت، زۆربەری ڕۆشنبیر و شاعیر و سیاسەتمدارانی ئەو قۆناغە تێیاندا دەنوسی، وەك (ساڵح قەفتان، پیرەمێرد، حامید فەرەج، تۆفیق وەهبی، عەبدوڵلا گۆران، محەمەد ئەمین زەکی بەگ، بابا شێخ عەلی، عەلی مەدهۆشی شاعیر، شوکری فەزلی، فایەق بێکەس و کۆمەلێك نوسەری تر). ماوەی ١٠ ساڵ توانرا بە ڕێکوپێکی دەرچێت و ١٠٥ ژمارەی لێدەرچو، کاربەدەستانی دەوڵەت لە ئابی ١٩٤٩ دا دایانخست.

٣- رشید عالی گەیلانی، کەسایەتیەکی ناسراوی نیشتمان پەروەری عێراقی بو، ٣ جار لە کاتی حوکمی پاشایەتیدا بوە بە سەرۆکی حکومەت، لە ساڵانی١٩٤١،١٩٤٠،١٩٣٣ لە ١٩٢٤ەوە بەشدارە لە کابینە جۆراوجۆرەکاندا، بە نمونەی دژایەتی ئینگلیز لە عێراق دەژمێرێت و داوای سەربەخۆیی عێراقی لە دەسەڵاتی ئینگلیز دەکرد. لە دروستبونی دەوڵەتی عێراقەوە لە ١٩٢١، ڕۆڵی هەبوە لە دام و دەزگای جیاوازی حکومەتدا.

# سەرەتای ژیانی سیاسی

*** بەدەر لەوشتانە چی تر، کاری لە سەر بیر و هۆشی منداڵیت کرد و لە سیاسەتی نزیک کردیتەوە؟**

- لە کۆیە کۆمەڵێک پیاوماقوڵی جولەکە هەبون، ئەهاتنە تەکیە و زیارەتی باوکمیان ئەکرد، پاشانیش کاری سیاسیان ئەکرد.

لەساڵی ١٩٤٥ دا برادەرێکمان لە کۆیە لێ پەیدابو کە لە دەرەوە هاتبویەوە، ئەو زۆر لە ئێمە گەورەتربو، بەڵام لە قوتابخانەدا زۆر باش نەبو کە هاتەوە قوتابخانە، هەمو وامان ئەزانی مامۆستایە، بەڵام دوایی دەرکەوت، قوتابییە و ناوی (حیسامەدین تەیب) بو، دوایی بە (شەعب) ناوی دەرکرد و خزمی جەمیل شەرەف بو.

ئەو دەستی بە سیاسەت کرد و باسی کوردایەتی و نیشتیمان پەروەریی ئەکرد و هەمیشە دوپاتی ئەکردەوە، ئەبێ خۆمان رێکبخەین و رێکخراومان هەبێت و ئاڵای کوردستان پیشان بدەین.

یەکەمجار بۆ تاقیکردنەوە، کەوا ئێمە ئەتوانین بێ ترس و سڵەمینەوە کارەکانی خۆمان ئەنجام بدەین، پێویست بو، بە شەوی تاریک بچین بۆ گۆڕستانێک، لە دەرەوەی کۆیە بو، لەوێ ئاڵای کوردستان دابنێین.

من ئەو کارەی خۆمم جێبەجێ کرد و ئاڵام برد و چەقاندم، لەبەرئەوەی من لە لادێوە هاتبوم و منداڵی لادێ، کەمێک چاوکراوە ترە و کەمێک نەترس ترن، بۆیە زو کارەکەم ئەنجامدا. من لەناو سێ، چوار گەنجدا سەرکەوتم و ئاڵاکەم چەقاند، مامۆستا حیسامەدین تەیب چو تەماشای کرد، ئایا ئاڵاکە چەقێنراوە کە هاتەوە، ئیتر منی وەک یەکێک لە موریدەکانی قبوڵکرد.

لە هاوینی ١٩٤٥- ١٩٤٦ گۆڕانێکی گەورە لە ژیانی مندا رویدا، ئەویش ئەوە بو، خوێندکاری کولیات هاتبونەوە بۆ کۆیە کە بیروباوەڕی کوردایەتی و نیشتمان پەروەرییان بڵاوئەکردەوە (ئەو کاتە کولیات هەبو، نەک جامیعە).

تازە پارتی خەریک بو دروست ئەبو، کاک عومەر دەبابە (١)، ئەوکاتە لاوێکی بە هەیکەل و بە هەیبەت و مەشهوری کۆیە بو، زۆر ناودار و خۆشەویست بو، رۆژێکیان لە چاخانەکەی "حەمە رەق" لە کۆیە دانیشتبوین و ئەشیزانی، من قوتابیم و ئەخوێنمەوە و لە قوتابخانە سرودی نیشتمانی ئەڵیم.

کە بینیمی، بانگی کردمە لای خۆی و هەندێ نوسراو و وێنەی دامێ، لەوانە وێنەی مەلا مستەفا و قازی محەمەد و بەیانی دامەزراندنی پارتی بو کە لە مەهاباد چاپکرابو و بەناوی مەلا مستەفاوە دەرچوبو، بەڵام هەمزە عەبدوڵڵا بە عەرەبی نوسیبوی.

*** لەو سەردەمەدا، لە کۆیە هیچ ناوەندێکی رۆشنبیری یان سیاسی هەبو؟**

– ئەو سەردەمە لە کۆیە دو کتێبخانە هەبون، کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، کە سەر بە پارتییەکان بو، لەگەڵ کتێبخانەی کۆیە، کە سەر بە حیزبی شیوعی بو. ئێمەی قوتابی لە ژێر کاریگەریی هەردو فکرەکەدا بوین. من خۆم دۆستایەتیەکی زۆر نزیکم لەگەڵ فاتیح رەسوڵ و جەلال بێتوشی و عەزیزی برای هەبو، هاوپۆل بوین، جەلال بێتوشی و فاتح رەسوڵ، هەوڵیان ئەدا ئێمە بکەن بە شیوعی، لەبەرئەوە منیان کردبو بە بەشداربوی کتێبخانەی کۆیە، منیش مانگی ١٠٠ فلسم ئەدا و ئەچوم کتێبم ئەخوێندەوە، بەهەمان شێوەش بەشدار بوم لە کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی.

*** رۆڵی ئەو کاتەی رێبازی کۆمۆنیستی و یەکێتی سۆڤێت چی بون لەسەر گەشەکردنی ژیانی سیاسیتان؟**

– من خۆم ساغ نەکردبویەوە بەلای هیچ لایەکدا، بەڵام زۆر لە ژێر کاریگەریی سۆڤێت و سەرکەوتنەکانی سۆڤێت و یارمەتی سۆڤێت بوم بۆ کۆماری مەهاباد.

ئەو کاتە شیعرەکانی هەژار و هێمن بڵاوبوبونەوە، ئێمە یەک لە شیعرەکانی ئەو کاتەمان لەبەرکردبو:

بژی ستالین خۆش بێ چەکوش و داس
لە ژێر ئیستیبداد، کوردی کرد خەلاس

یان شیعرێکی تر هەبو کە بۆ مەدحی سۆڤیێت نوسرا بو، ئەوەشمان لەبەرکردبو:

ئەزانی، کە ماڵمان چلۆن بو برا
چ غەدرێ، چ زوڵمێ لە کوردان کرا
کە ئاڵای سورمان لەنێو هەڵکرا
بەجارێ تەمی هەوری غەممان ڕەوی
بژی دۆستی کورد، دەوڵەتی شورەوی

ئەو ڕۆژە وا باوبو، وا ئەزانرا، دەوڵەتی شورەوی، کوردی ڕزگار کردوە و دەوڵەتی کوردستان بەهۆی سۆڤیێتەوە دائەمەزرێت. کۆماری مەهابادیش کاریگەری گەورەی لە دڵ و دەرونی خەڵکدا هەبو، من زۆرتر لە ژێر کاریگەری شیوعییەکاندا بوم تا ئەو کاتەی کە ئەوان کەوتنە گیروگرفتەوە لەسەر ئەوەی، کورد ئوممەیە، یاخود ئوممە نیە!

ئەو مەسەلەیە بیر و بۆچونی جوڵاندم و کەوتمە موناقەشەکردن لەسەرئەوەی، ئایا کورد نەتەوەیە یان نەتەوە نیە؟.

ئەو هاوینە، لە پۆلی پێنجی سەرەتایەوە دەرچوبوم بۆ شەش، کاک عومەر دەبابە ناوبەناو بڵاوکراوەی ئەدامێ، جارێکی تر چوم بۆ لای کاک عومەر و لێم پرسی "کە ئایا کورد ئوممەیە، یان ئوممە نیە"؟ ئەویش مانای نەتەوەی بۆ شیکردمەوە و گوتی: "بەڵێ، کورد ئوممەیە" و بۆچونەکانی ستالینی دەربارەی نەتەوە بۆ باسکردم.

ئەو کاتە زۆرم پێ خۆشبو کە لای من ساغ ببێتەوە کە کورد ئومەیە، کوردایەتی لە دڵ و دەرونمدا سەری هەڵدابو، لەبەرئەوە کەوتمە موناقەشە لەگەڵ شیوعییەکان، من لەسەرئەوە لە شانەی هوشیارکردنەوەی شیوعیدا چومە دەرێ.

کاک فاتح ڕەسول، حەفتەی جارێک کۆی ئەکردینەوە، من سوربوم لەسەرئەوەی کە کورد ئومەیە و کوردیش مافی چارەنوسی خۆی هەیە و هەمو ئەو قسانەی ئەوانم قبوڵ بو، بەڵام بۆ کورد بێت. واتا کە باسی حیزبی پێشڕەویان ئەکرد و ئەیانگوت پێویستە کرێکار و جوتیار و ڕەنجبەران پێشڕەوبن، ئەمگوت هەمویم قبوڵە بە مەرجێ بۆ پێشڕەوی خەڵکی کوردستان بێت و ڕەنجدەر و کرێکار و جوتیارانی کوردستان ڕزگارکرێن و وڵاتی کوردستان ڕزگار بکرێت.

بەهۆی ئەم بۆچونانەمەوە، من لە ئەڵقەی هۆشیاری ئەواندا نەمام و دامشکاند

بەلای پارتیدا. ئیتر کاک عومەر دەبابە، چەندین جار کۆبونەوەی پێکردین. قوتابخانەش کرایەوە مامۆستاکانیشمان، زوبەیان پارتی بون، ئەوانیش دەوریان هەبو لە گەشەکردنی بیر و بۆچونەکانماندا.

مامۆستایەکی تازەمان بۆ هات بەناوی (کەمال عەبدولقادر نەشئەت) ئەسڵی کۆیی بو، بەڵام لەبەرئەوەی باوکی لە دەرەوە فەرمانبەر بو، ئەو هاتبووە کۆیە و مامۆستای وەرزش بو، زۆر گرنگی بە وەرزش ئەدا، من لە وەرزشدا تەنها پینگ پۆنگم باش ئەزانی (یاری مێزی تێنس)، بۆیە ئەویش پینگ پۆنگەکەی قوتابخانەی تەسلیمی من کرد و منیش یارمەتی ئەو کەسانەم ئەدا کە یاریان ئەکرد، بەو بۆنەیەشەوە قسەی سیاسیشم بۆ ئەکردن. هەروەها مامۆستاش، ناو بەناو منی وەک لێپرسراوی پینگ پۆنگ بانگ ئەکرد و ئامۆژگاری ئەکردم.

# دەستپێکردنی کاری سیاسی

*** چۆن ژیانی سیاسیت دەستی پێکرد؟**

– من برادەرێکم هەبو، ناوی وریا مەلا عەلی کانیمارانی بو، ئەو کەمێک لە من گەورە تر بو، بەڵام ئەو لە لادێوە هاتبو، ئێمەی ئەبردەماڵی خۆیان، وردە وردە وای لێهات ئەو هانیداین، لە رێکخستندا کاربکەین و لەو ساڵەدا خۆمان بۆ مانگرتنێک لە قوتابخانە ئامادەکرد.

لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بوم، مانگرتنێکمان لە دژی دو مامۆستا سازدا، یەکێک لە مامۆستاکان بەد رەفتاریی هەبو، واتا دەستی لە رومەتی قوتابیان ئەدا، لەبەرئەوە نارەزاییمان دەربری و راپەرین و مانمانگرت. لە مانگرتنەکەدا، من لە پێشەوە بوم و دەمراستی مانگرتنەکە بوم و چوینە سەر بەرێوەبەری قوتابخانەکە و ئەو وتارەی کە نوسیبومان پێشکەشمان کرد، بەرێوەبەرەکەش ئامۆژگاری کردین و گوتی: "ئێوە قوتابین، بۆئەوەی کارەکانتان سەرکەوێت، ئەبێ رێکخستنێکتان هەبێ".

بەرێوەبەرەکە یارمەتی داین، بۆ دروستکردنی کۆمەڵەیەکی قوتابیان. لەبیرمە

ناوی کۆمه‌ڵه‌که‌مان نا (KPX-کۆمه‌ڵه‌ی پێشکه‌وتنی خوێنده‌واریی) و که‌وته ژێر کاریگه‌ریی پارتییه‌وه، من چالاکترین ئه‌ندام بوم تێدا، یاخود وه‌ک سه‌رپه‌رشتیاری رێکخراوه‌که وابوم.

له زستانی ۱۹٤۷ دا، مامۆستایه‌کی ترمان هه‌بو ناوی تایه‌ر سه‌عید بو، زۆر پیاوێکی زیره‌ک و هوشیار بو، له حساب و ئینگلیزیدا زۆر باش بو، وریا و منی بانگکرد بۆ ماڵی خۆیان و پاش ماوه‌یه‌ک گوتی: وه‌رن ببن به ئه‌ندام و کارتیان هێنا و ئیستیماره‌مان پڕ کرده‌وه، من و وریای عه‌لی کانیمارانی پێکه‌وه له کۆتایی کانونی دوه‌می ۱۹٤۷ دا بوین به ئه‌ندامی پارتی و من نازناوی (ئاگر) م وه‌رگرت و وریاش نازناوی (پشکۆ)ی وه‌رگرت، له‌و کاته‌دا من له پۆلی شه‌شی سه‌ره‌تاییدا بوم.

وریا، له من گه‌وره‌تر بو، له‌یادمه شه‌وان، که له کۆبونه‌وه دوائه‌که‌وتین و دره‌نگ ئه‌بو، به وریا یان ئه‌گوت، که من بگه‌یێنێته ماڵه‌وه، هه‌روه‌ها ئه‌وه‌نده حه‌زم به کاری رێکخستن و حزبایه‌تی ئه‌کرد، هه‌رکاتێ، که به‌یان و بڵاوکراوه‌ی حیزبیم ده‌ست ئه‌که‌وت، راسته‌وخۆ ئه‌چومه ژورێک و به هێمنی ده‌ستم ئه‌کرد به خوێندنه‌وه‌ی. زۆرجار که کاتی نانخواردن ئه‌هات، من تا بڵاوکراوه‌کانم نه‌خوێنایه‌وه، نانم نه‌ده‌خوارد.

هه‌ندێ براده‌ری نزیکی تریشم هه‌بون، که به‌یه‌که‌وه خوێندکار بوین و له حیزبیشدا به‌یه‌که‌وه کارمان ئه‌کرد، وه‌ک: جه‌ماڵی حاجی تایه‌ری کۆیی، محه‌مه‌د مه‌لا سادق، که‌ریم شێخانی، خالید سه‌عید، واحید سه‌عید، مه‌جیدی ئاسنگه‌ر و چه‌ند براده‌رێکی تریش.

# کۆماری مه‌هاباد

*** که‌وتنی کۆماری کوردستان له مه‌هاباد، هیچ کاریگه‌ریه‌کی له‌سه‌رتان هه‌بو؟**

- بێگومان، کاتێ له به‌هاری ۱۹٤۷ دا کاره‌ساتی روخانی کۆمار رویدا[٢]، ئه‌و رواوه زۆر کاری تێکردم، له‌به‌رئه‌وه‌ی کۆیه‌ش له‌گه‌ڵ مه‌هاباد، په‌یوه‌ندیه‌کی تایبه‌تی هه‌بو، به‌هۆی ئه‌وه‌ی، چه‌ند کۆییه‌کیش له مه‌هاباد به‌شدار بون، له‌وانه

رەئیس (بەکر عەبدولکەریم حەویزی) و (مستەفا خۆشناو) کە لە کۆیە پەروەردە بوبون، ئەوانەی تر کەسوکاریان لە کۆیە هەبو. دو کۆیی تریش چوبون بۆ مەهاباد، یەکێکیان عەریف بو لە سوپا و لە ڕێگای هاتنەوەدا لەناو بەفردا ڕەق بوەوە و مرد، ئەوەی تریان (محەمەد تۆفیق وەردیی) بو، مامۆستای منیش بو، لە پۆلی چواری سەرەتایی، ئەو هەڵهات و چو بۆ مەهاباد و لەوێوە گەڕابۆوە، هەروەها (دڵشادی رەسوڵی) هەبو، مامۆستا و نوسەر بو، لە گەلاوێژیشدا نوسینی بڵاوئەکردەوە، ئەویش لە مەهاباد گەڕابۆوە. وردی و دڵشاد رەسوڵی گەڕانەوە و گیران و پاش ماوەیەک ئازادکران، ئێمە لەگەڵ ماڵی وردیدا دراوسێ بوین، دوای گەڕانەوەشی هەر دایئەشکاند بەلای حیزبی شیوعیدا، بەڵام دڵشادی رەسوڵی دایدەشکاند بەلای پارتیدا.

ئەوان باسی مەهابادیان بۆ ئەگێڕاینەوە کە چی قەوماوە و چۆن بوە و چی بەسەر کورد هاتوە، بۆیە ئێران لەبەرچاومان زۆر سوک بو، شا زۆر بە دزێو و دڕندە دەهاتە بەرچاومان، بە تایبەتی کە قازی محەمەدی ئیعدامکرد. من زۆر چاک ڕۆژی ئیعدامی قازی محەمەدم لەبیرە، ئێمە تەعەزێمان گرت، بێگومان ئەوەنەبو کە ڕیشمان هەبێ بەڵام جلی رەشمان لەبەرکرد، خۆمان زۆر بە ماتەمی نیشاندا، هەرچی نیشانەی گۆرانی و خۆشی هەیە نیشانمان نەئەدا، لە قوتابخانە دەقیقەیەک بەبێ دەنگی وەستاین.

هەرەسی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، کارەساتێکی نەتەوەیی گەورەبو، هەمو کەس زۆری پێ ناخۆشبو، بە زیانێکی گەورەی نەتەوەیی ئەزانرا.

لەو کاتانەدا، هەندێ لە بارزانییەکان گەڕانەوە بۆ کوردستان و کۆمەڵێکی تریان بەرەو سۆڤێت ڕۆیشتن، هەندێ لەوانەی، بۆ کوردستان گەڕانەوە، هاتنە کۆیە.

ئەو کاتە بارزانی لەلای من زۆر شتێکی پیرۆز بو، وەکو موسوڵمانێک چۆن بە ڕێزەوە تەماشای مەکە و مەدینە ئەکات، بەڕاستی من بەهەمان شێوە، یاخود شتێک لە خوار ئەوەوە، تەماشای بارزانیم ئەکرد، مەلا مستەفا لای ئێمە وەکو قارەمانێکی میللی گەورەی ئازا، لە دڵ و دەرونماندا جێگەی خۆی گرتبو. هەتا لەبیرمە ژنێکی بارزانی لە کۆیە سواڵی ئەکرد، چومە لای هەندێک موی پێ بو و گوتی: ئەوە موی مەلا مستەفایە، گوتم باشە بێنە لێت ئەکرم، ئەو کاتە دینارێکم هەبو و دامێ، دینار، گەلێک زۆر بو، هیچم پێ نەما، بەڵام بە دینارێ چەند مویەکی مەلا مستەفام لێکڕی بۆ ئەوەی لای من بێت. لەبیرمە دو، سێ ماڵی بارزانی هاتن بۆ کۆیە و ئێمە

لە دێیەک لەو دێیانەی کەسەر بە بنەماڵەی تاڵەبانییە جێمان کردنەوە.

*** کام ساڵ دابنێین بە سەرەتای دەست پێکردنی کاری سیاسیت؟**

- من لە ساڵی١٩٤٧ەوە کەوتومەتە دنیای سیاسەتەوە، سیاسەتی رێکوپێک، سیاسەتی رێکخراویی، پێشتر لە ریزی کۆمەڵەی پێشکەوتنی خوێندەواری (KPX) کارم کردبو، لە ساڵی ١٩٤٧ەوە وەک ئەندامێکی چالاکی پارتی کە ئەو کاتە پێیان ئەگوت (پارتی دیموکراتی کوردی عێراق) کارم ئەکرد.

ئەو کاتە لەناو پارتی و شیوعیدا لە کۆیە، ناکۆکی و دو بەرەکی هەبو، بەڵام کە چوار ئەفسەرەکە لە ١٩ حوزەیرانی ١٩٤٧ دا ئیعدامکران، (مستەفا خۆشناو، عیزەت عەزیز، خەیروڵڵا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی)، عەلی عەبدوڵڵا شانەی سەرەکی قوتابیانی کۆکردەوە و داوای خۆسازدان و سرود ئامادەکردنی لێکردین. داوا لە هەمو کەس کرا، بەشداری تێدابکات، بە تایبەتی، کە مستەفا خۆشناو، بە خەڵکی لای کۆیە حسێب ئەکرا، بەڵام تەرمەکەیان نەهێنایەوە بۆ کۆیە، بردیان بۆ سلێمانی، لەوێ لە گردی سەیوان ناشتیانن و خەڵکی سلێمانی خۆپیشاندانێکی شایستەی گەورەیان بۆ کردن و چەندەها شاعیری گەورە، وەک بێکەس، پیرەمێرد و کامەران، شیعر و وتاری حەماسییان خوێندەوە. لە هاوینی ١٩٤٧ دا دەستمکرد بە خوێندنی وانەکانی پۆلی شەش، چونکە من دەرچو بوم و کۆمەڵێک کتێبی عەرەبیم پەیداکرد، لەو سەردەمەدا کتێبی عەرەبی زۆر کەم بون، من لە ١٩٤٧ ەوە بەشداربوم لە رۆژنامەی (ئەهالی)، کە رۆژانە دەرئەچو.

*** رۆژنامەی (ئەهالی) کێ دەری ئەکرد و چ رێبازێکی هەبو؟**

(ئەهالی) خاوەنەکەی مامۆستا کامیل چادرچی بو[٢]، زمان حاڵی پارتی نیشتمانی دیموکراتی عێراق بو، بەڵام رۆژنامەیەکی ناوداربو، من لەو رۆژنامەیەوە زمانی عەرەبی باش فێربوم، واتا بۆئەوەی تێبگەم، ناچارئەبوم، لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە و مامۆستاکان بپرسم.

بۆ یەکەمجار لەو ساڵەدا کتێبێکی ئینگلیزییم کەوتە بەردەست، هی حاجی عەبدولباقی بو، ئەو کاتە لەکوللیەی مەلیک فەیسەڵ ئەیخوێند و ئینگلیزی ئەزانی، کوللیەی مەلیک فەیسەڵ، سانەوییەک بو لە بەغدا، دانرابو، بۆ ئەو کەسانەی زیرەک بون، لەوێ وانە بە ئینگلیزی ئەگوترایەوە. ئەو کتێبێکی هێنابو بە ناونیشانی (ستالین لەسەر لینین ئەنوسێ) و رەسمی لینین و ستالینی پێوەبو،

بەڵگەنامەکانی لینین بو، هەتا من رستەکانم لەبەرکردبو، من هەمو ماناکانیم نەدەزانی، هەندێ وشەی کەمم ئەزانی، ئەوەم لەبیرە کە ئەڵێ: لینین مامۆستامانە و نوێنەرمانە و لێی تێبگەین و بیخوێنینەوە.

ساڵی ١٩٤٧ بناغە دارێژرانی ژیانی سیاسیم بو، من هەم لە پارتیدا بوم بە ئەندام و هەم لە کۆڕی خوێندن و خوێندنەوەدا خەریک بوم. هەرچی کتێبێکم دەست بکەوتایە ئەمخوێندەوە، چ بە عەرەبی چ بە کوردی، بەشدار بوم لە کڕینی هەندێ گۆڤار و ڕۆژنامەدا.

# گۆڤاری گەلاوێژ

*** دەوری گۆڤاری گەلاوێژ و گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تری ئەو کاتە لەسەر تۆ چیبون؟**

- گۆڤاری گەلاوێژ، گۆڤارێکی بەناوبانگ بو، خاوەن و سەرنوسەرەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد[٤] و بەڕێوەبەری نوسین مامۆستا عەلادین سوجادی بو، ئەوکاتە لە بەغدا دەرئەچو، لە ساڵی ١٩٣٩ تا ١٩٤٩ ئەو گۆڤارە بڵاوئەکرایەوە. بەڕاستی گەلاوێژ ڕۆڵێکی زۆر گەورەی نواند، لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی کوردایەتی، لەناو خەڵکی پێشکەوتنخواز و دیموکرات و دژ بە فاشیزم و بیروباوەڕی سۆشیالیزمدا.

گەلاوێژ، ڕۆڵی گرنگی نواند، لە بوژاندنەوەی ئەدەبی کوردی و فێرکردنی کوردی نوێ و داڕشتنی وشە و ڕستەی تازە بە کوردی. من لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی ئەمخوێندەوە و زۆریشم لەبەرئەکرد، گەلاوێژ گەلێک سودی هەبو، بۆ زمانی کوردی و کوردی فێر بون.

ئەوکاتە لە کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی ڕۆژنامە دائەنرا و خەڵک ئەیتوانی بچێت بیخوێنێتەوە.

ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بریتی بون: لە (ئەهالی) و (شەعب) هی یەحیا قاسم، (وەتەن) کە پارتی گەل دەری ئەکرد و خاوەنەکەی عەزیز شەریف بو[٥]، (ئیتیحاد) کە ڕۆژنامەی ئیتحادی وەتەنی بو، کە سەرۆکەکەی عەبدولفەتاح ئیبراهیم بو.

ئەم ڕۆژنامانە بۆ خوێندنەوەبون، ئەگەر بەشداریش نەبویتایە ئەتتوانی لە کتێبخانەکە بیخوێنیتەوە. من یەکێک بوم لەوانەی ئەو ڕۆژنامانەم ئەخوێندەوە، دیارە لە هەموی تێنەدەگەیشتم، عەرەبیەکەم زۆر باش نەبو، بەڵام زۆر وشە فێرئەبوم، زۆریم ئەخوێندەوە و هەندێکم لەبەرئەکرد و هەندێک بە نێوەناچڵی و هەندێکیشم ئەپرسی و ئیتر بەو جۆرە.

# ڕوداوەکانی عێراق و ڕاپەڕینی وەسبە

*** کاریگەری ڕوداوە سیاسیەکانی عێراق، چی بون لەسەرتان و ڕۆڵی ئێوە چی بو تێیاندا؟**

- ساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨ چومە قوتابخانەی ناوەندی کۆیە، لە کانونی دوهەمی ئەو ساڵەدا، ڕاپەڕینی بەناوبانگی (وەسبە)ی بەغدا رویدا[٦]، ئەو ڕاپەڕینە لە کۆیەش زۆر دەنگی دایەوە و خەڵکی وروژاندبو. هۆی وروژاندنی خەڵکی کۆیە ئەوەبو، هەواڵێکیان بۆ هاتبو کە عومەر دەبابە، لە خۆپیشاندانی وەسبەدا دەورێکی چالاکی هەبو، شەهیدبوە، بەڵام دوایی دەرکەوت، هەواڵەکە ڕاست نیە و کاک عومەر تەنها بریندار بوبو.

هەواڵێکی تر، کەوا خەڵکی کۆیەی وروژاند و خەڵکی زۆری پێی خۆشبو، ئەوەبو کە نائیبی کۆیە لە پەرلەمان، محەمەد زیاد ئاغای غەفوریی لەگەڵ چەند ئەندامێکی تری پەرلەمان بروسکەیان لێدا و ئەوانیش ئیستیعفایان کرد لە ئەندامێتی، لەسەرئەوەی، کە خەڵک لە خۆپیشاندانەکەدا کوژراون.

لەبیرمە، یەکەم خۆپیشاندان لە کۆیە بۆ پشتگیری وەسبە بە هاوکاری پارتی و شیوعیی بەیەکەوە ئەنجامدرا.

لەوێدا، بروسکەی محەمەد زیاد ئاغا (کاکە زیادی کۆیە) خوێنرایەوە، کاکە زیاد وەک پیاوێکی نیشتمانپەروەر ناسرابو، لە بروسکەکەیدا گوتبوی کە من ئیستیقالەم کردوە، چونکە حکومەت خەڵک ئەکوژێ و ئازاری خەڵک ئەدا.

چەند ڕوداوێک هەن، کە لەبیرم ناچنەوە، ئەویش موفارەقاتی یەکەمی

خۆپیشاندانەکەبو ، ئەوەبو لە جیاتی پارتی کاک عەلی عەبدوڵڵا وتاری خوێندەوە و دەستی پێکرد و گوتی: "مژدە بێ لە گیانی قازی محەمەد و هاوڕێکانی و چوار ئەفسەرەکە".

برادەرێکمان هەبو، ناوی (حوسامەدین فەرید) بو، کە دەوری هەبو لە هاندانماندا بۆ کوردایەتی، ئەو هوتافی ئەکێشا و لەو کاتەدا گوتی: بژی قازی محەمەد، قازی محەمەد ماوەیەکی کەم بو ئیعدامکرابو، هەروەها یەکێکیش لە شیوعییەکان کە وتاری خوێندەوە، گوتی: "مامۆستای گەورە وای فەرموە"، مەبەستی ستالین بو، شیوعییەکان وا راهاتبون، هەمیشە ستایشی ستالین و هاورێکانی بکەن. شیوعییەکان ئەو کاتە وا راهاتبون قسەیەک لە ستالین وەرگرن، ئەویش ئەوەیە هیچ کارێک بێ پرۆلیتاریا ناکرێ و پێویست ناکات لە عێراقدا حیزبی کوردی هەبێ. ئەوان هەرگیز نەیان ئەگوت ستالین، بەڵکو ئەیانگوت (مامۆستای گەورە) ئەفەرموێ، مامۆستای گەورەش لە کۆیە نازناوی (مەلای گەورە)ی کۆیە بو، مەلای گەورەش چوار ساڵ بو کۆچی دوایی کردبو، لەبەرئەوە، کە ئەوان ئەیانگوت مامۆستای گەورە، هەندێ پیاوی بەتەمەنی موسوڵمان فرمێسکیان لە چاو ئەهاتە خوارەوە و ئەیانگوت هەزار رەحمەتی لێبێت، چونکە وایان ئەزانی، مامۆستای گەورە، مەبەستیان لە مەلای گەورەیە!.

هەر لە ساڵی ١٩٤٧ دا پەیوندیمان بە قوتابیانی هەولێر و سلێمانیەوە کرد کە دۆستایەتی پارتیان ئەکرد، ئەویش لە رێگای عەبدولخالقی فەتاح ئاغای حەوێزی کە لە سلێمانی ئەیخوێند و لەو رێگایەوە، حیلمی عەلی شەریف و محەمەد ئەحمەد تەها، کامەرانی شاعیر و جەمالی حاجی شەفیق مان ناسی.

*** ئەی ساڵی ١٩٤٨، جگە لە راپەرینەکە، هیچ روداوێکی تری گرنگ رویدا؟**

- بەڵێ، ساڵی ١٩٤٨ روداوی گرنگی تێدابو، هەڵبژاردن کرا، بۆ یەکێتی قوتابیان کە هەر قوتابخانەیەک نوێنەرێکی هەبێت، من هەڵبژێرام بۆ کۆمیتەی بەرێوەبەری یەکێتی قوتابیان لە کۆیە و بومە نوێنەری ناوەندیەکانی کۆیە، لە یەکەم کۆنگرەی گشتی خوێندکارانی عێراق، کە لە ١٩٤٨/٤/١٤ دا لە گۆرەپانی (سیباع) لە بەغدا گیرا، ئەو کۆنگرەیەی کە بە (کۆنگرەی سیباع) ناوی دەرکرد.

بەشداربوان لە زۆر جێگاکانی عێراقەوە هاتبون، هەرچی دیموکرات و چەپ و شیوعی بون بەشداریان تێدا کردبو، جگە لە هێزە نەتەوەییەکان.

*** واتا ئەمە یەکەم سەفەری تۆ بو بۆ دەرەوەی کۆیە؟**

- بەڵێ، ئەوە یەکەم سەفەرم بو بۆ کارێکی سیاسی بۆ بەغدا، لە گۆرەپانی سیباع شاعیری گەورەی عێراقیش، جەواهیری[٧]، بەشداری کرد، ئەوە یەکەمجار بو، کە لە دورەوە چاوم پێی بکەوێت و لەوێدا شیعرە بەناوبانگەکەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| يومَ الشَهيد: تحيةٌ وسلامُ | بك والنضالِ تؤرِّخُ الأعوام |
| بك والضحايا الغُرِّ يزهو شامخاً | علمُ الحساب، وتفخر الأرقام |
| بك والذي ضمَّ الثرى من طيبِهم | تتعطَّرُ الارَضونَ والأيام |
| بك يُبعَث "الجيلُ" المحتَّمُ بعثُه | وبك "القيامةُ" للطُغاة تُقام |
| وبك العُتاة سيُحشَرون، وجوهُهُم | سودٌ، وحَشْوُ أُنوفهم إرغام |
| سفاً إلى سف طغاماً لم تذُقْ | ما يجرَعون من الهَوان طَغام |
| ويُحاسرون فلا "وراءُ" يحتوي | ذَنباً ولا شُرطاً يحوز "امام" |
| وسيسألون مَن الذين تسخَّروا | هذي الجموعَ كأنها أنعام |

ئەوە یەکەمجاربو جەواهیری ببینم شیعر بخوێنێتەوە، بەراستی شیعرەکانی زۆر کاریان تێکردم، لەو کاتەوە بوم بە موعجەب و دەروێشی جەواهیری.

لەو شیعرەوە، کە خۆی بە دەنگی کاریگەریی خۆی خوێندیەوە، کە زۆر نەبو برایەکی بەناوی (جەعفەر) شەهیدکرابو، زۆر کاری تێکردم، ئیتر هەتا ئیمڕۆ من وەکو دەروێش و موعجەبی جەواهیری ماومەتەوە.

*** کۆنگرەی سیباع تەنها بۆ خوێندکارانی سەر بە حیزبی شیوعی بو؟**

- نەخێر، هەمو لایەک بەشداربون، لەو کۆبونەوەیە لایەنگران و ئەندامانی حیزبی شیوعی تێدا زۆربون، بەڵام هی سێ حیزبی کەشی تێدابون، نیشتمانی دیموکراتی، پارتی گەل و پارتی، واتا چوار حیزب تێدا بەشدارییان کردبو، هەر چوار حیزبەکە لەوێ نوێنەریان هەبو و هەریەکە لەوانە دەوری خۆی هەبو، بەڵام دیارە حیزبی شیوعی دەستی باڵای هەبو.

هەتا لە یادمە، سەرکردایەتیەکەی دروستکرا لە نوێنەری هەمو کۆمەڵەکان، بۆ نمونە، لە کوللیەی قانون و کوللیەکانی تر لیستی هاوبەشمان هەبو. ئەو نوێنەرانە

یەکێکیان هی قەومیەکان (حیزبی ئیستیقلال)، یەکێکیان هی بەرەی دیموکراتی بو کە حیزبی شیوعی و پارتی گەل و پارتی بون.

لەیادمە، عومەر دەبابە لە پۆلی دوی کوللیەی قانون بو، لە هەڵبژاردنی قوتابیاندا نوێنەری حزبی تەحرر بە چەند دەنگێکی کەم لەوی بردەوە، ئەگەر عومەر دەبابە دەرچوبایە، ئەبو بە ئەندامی لیژنەی سەرکردایەتی.

نوێنەری پارتی، حەیدەر حەمە ئەمین، لاوێکی هەولێری بو، خرایە لیژنەی سەرکردایەتیەوە، ئێمە ئەو پارتییانەی کە لەوێ بەشداربوین، ئەوەی ناوەکانیانم لە یاد بێت بریتی بون لە: حەیدەر حەمە ئەمین لە هەولێرەوە و فائق سەبری عەبدولقادر لە خانەقینەوە و منیش بوم لە کۆیەوە، لە سلێمانی لیستی کۆمۆنیستەکان دەرچوبون.

ئێمە دەورمان هەبو لە هەڵبژاردن و من خۆشم هەڵبژێردرام بۆ جێگری لیژنەی تەنفیزی یەکێتی قوتابیانی عێراق.

* **ئەوە یەکەم سەفەرتان بو بۆ بەغدا؟**

- بەڵێ، ئەو سەفەرەم یەکەم سەفەرم بو، بەهۆی کاری سیاسییەوە چوبێتمە بەغدا، بەڵام پێشتر لەبەر چاوئێشە و بۆ تەداوی چوبوم بۆ لای دکتۆر، بەڵام ئەوە یەکەم سەفەری سیاسی من بو.

لەوێ کاک عومەر دەبابە سەرپەرشتی ئەکردین و بۆ یەکەمجار چومە بارەگای پارتی گەل و (عەزیز شەریف) مان بینی و چوینە بارەگای پارتی نیشتمانی دیموکراتی و (کامل چادرچی) مان لەوێ بینی.

ئەو پیاوە ناسراوانەی عێراق، هەردەم ناومان ئەبیستن و خۆیانمان نەدیبو، هەروەها چەندین برادەری ناسراوی پارتیشم ناسی، وەک رەشید عەبدولقادر کە ئەوکاتە لە خۆپیشاندانی ١٩٤٨دا لە وتار خوێندنەوەدا دەورێکی دیاری هەبو، هەروەها چوینە لای د.جەعفەر محەمەد کەریم کە ئەو کاتە کەسایەتیەکی ناوداری پارتی بو، زۆر خۆشەویست بو، دو سێ وتاری لە رۆژنامەی (ئەهالی) لەسەر کورد و بارزانییەکان بڵاوکردبۆوە.

د.جەعفەر، کەسایەتیەکی عێراقی خۆشەویست بو، قسە خۆشبو، من لە عیادەکەی چومە لای و زۆر بە روخۆشیەوە بەخێرهاتنی کردین و قسەی خۆشی بۆ کردین.

# ژیانی خوێندکاریی

*** با بگەڕێینەوە بۆ ژیانی تایبەتی خۆت، تۆ هەتا ۱۹۵۱ لە هەولێر مایتەوە، دوایی کەی چویت بۆ بەغدا؟ و کەی ژیانی زانکۆت دەست پێکرد؟**

- لەساڵی خوێندنی ۱۹۵۰- ۱۹۵۱ دا قوتابی پۆلی چواری ئامادەیی بوم لە هەولێر، پێش تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ، خوێندنم تەواوکرد، چونکە دەرەجەکانم باشبون، ئەوکاتە ئەو قوتابییەی کە تێکڕای نمرەکانی لە ۸۵ و زیاتر بوایە، عەفوئەکرا لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ.

ئیتر هاتمەوە کۆیە، بەڵام یەکسەر گیرام، ئەوە یەکەمجاربو کە بگیرێم، لە هاوینی ۱۹۵۱ دا، دراین بە دادگا و نەفی کراین بۆ موسڵ. یەکەمجار بو، ژیانی نەفی ببینم، لەبیرمە، ئەوانەی کە لەگەڵ من گیرابون، بریتی بون لە: (حامد یوسف، عەلی عەبدوڵڵا، عومەر حەربی، عومەر دەبابە، ڕەئوف سەربەستی هەولێر و حەمید باتاسی) بە گشتی حەوت کەس بوین.

ئەو هاوینە، هەمومان لە موسڵ ماینەوە و هەر لەوێوە ئیستئنافمان کرد و دەعواکەمان بردەوە و ئازادکراین.

بە بڕیاری پارتی، من هاتم بۆ کەرکوک، لەوێ خانویەکم بەرامبەر ماڵی عەلی حەمدی بە کرێ گرت. کە چومە ناوی، پێیان گوتم، ئێمە تۆمان هێناوە بۆ یارمەتیدانی ڕۆژنامەی ڕزگاری کە خاوەنەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بو، مەرحوم میرزا فەندی عەبدولکەریم تایپی ئەکرد، تایپەکەی لە ماڵی خۆی دانابو، ڕۆنیۆکەش لە ماڵی عەلی حەمدی بو. ڕۆژنامەکە دەرئەچو ئەهاتە لای من و لەوێوە بڵاوئەکرایەوە. بە کورتی، ماڵەکەم بو بە وەکری بڵاوکردنەوەی ڕزگاری. خۆشم ئەوکاتە لە ئامادەیی بوم و ئەندامی لیژنەی ناوچە بوم.

روداوی تری گرنگ کە لە ژیانی من لەو ساڵەدا روی دابێت، ئەوە بو بێجگە لە کاری حیزبایەتی، ئەو ساڵە گیرام و زۆر بە ئەعجوبە رزگارم بو. هەر وەکو بۆم باس کردیت هەمو شتەکانی پارتی ئەهاتە ماڵەکەمان. هەمو ڕۆژنامەکان لای منەوە

بڵاوئەکرانەوە، جارێکیان رزمەیەک رۆژنامەی بەشی رانیەم دابو بە کابرایەک، کابرا لە رێگا بۆ رانیە، گیرابو و ئیعترافی کردبو، گوتبوی ئەو رۆژنامانەم لە فلانە کەس وەرگرتوە. حاکمی تەحقیقی کەرکوک، پیاوێک بو بەناوی کەمال عومەر، کابرایەکی باش و ئینسانێکی پێشکەوتوخوازی دیموکرات بو. دۆستی حیزبی شیوعی عێراقی بو، من خزمێکم هەبو بەناوی ئیحسان تاڵەبانی، برای موکەرەم تاڵەبانی، ئەو حاکم ئێحسان بانگ ئەکات و ئەڵێت: "کورێک هەیە ناوی جەلال تاڵەبانیە، ناوی هاتوە کە بیگرن، دیارە خزمتە و ئەیناسی"، ئەویش ئەڵێ بەڵێ وایە، ئەڵێ: "دەباشە برۆ پێی بڵێ، ئەگەر شتی قەدەغەی هەیە لە ماڵەوە با لای بات، چونکە هەندێ رۆژنامە گیراوە و پۆلیس دێت بۆ ماڵەکەیان و ئەیپشکنن". حاکم پێی گوتبو، کە سەعات ئەوەندەی ئێوارە دێن، گوتبوی جەلال بدۆزەرەوە، پێی بڵێ: "ئەچم ماڵەکەی ئەپشکنم، بەڵام مەترسی نیە".

ئەویش بە پەلە منی دۆزیەوە و ئاگاداری کردم و بردمیە لای حاکم عومەر، ئەویش گوتی: "چیت هەیە لە ماڵەوە پێویستە بەزویی نەیهێڵیت، چونکە من و پۆلیس دێین و لە دوایدا تەحقیق ئەکەم".

منیش چوم هەمو بڵاوکراوە قەدەغەکانم لابرد، دوای ماوەیەک حاکم و پۆلیس هاتن و موختاریشیان لەگەڵدا بو. کە هاتن هیچم لانەمابو، بەڵام بردمیان تەوقیفیان کردم، چونکە من قوتابی ئامادەیی بوم و ئەو سەردەمە قوتابی ئامادەیی مستەوایەکی تری هەبو، لە هەمو کەرکوکدا دو ئامادەیی هەبو، یەکێکیان بەیانیان و ئەوەی تر ئێواران، لەبەرئەوەی حاکمی تەحقیق گوتی: بیبەنە جێیەکی تایبەت، نەیانبردمە ناو سجن. قەرەوێڵەیەکیان بۆ دانام لە ژورێکی تایبەت، وەکو نەخۆشخانەی سجن وابو، لەوێ دایاننام و چەند رۆژێک گیرام و دوایی کابرا هاتە مەحکەمە، منیش گوتم ئەو درۆ ئەکات ناشی ناسم و ئەویش پەشیمان بوبوە و لە مەحکەمە گوتی: "وەڵڵا لێیان داوم بۆیە وام گوتوە".

ئەو مەسەلەیە، پێش تاقیکردنەوەی سەری ساڵی بەکالۆری بو، دو هەفتە گیرام و زۆر تەئسیری تێکردم، سەعی و کاروباری قوتابخانەم لە کیس چو، بەڵام دەرەجەکانم زۆر باش بون، هەرچەندە ئەو ساڵە ئێمە لە ٧٨ قوتابی تەنها حەوت قوتابی دەرچوین، من یەکێک بوم لە حەوت قوتابییە.

دەرەجەکانم بە گشتی باش بون، بەڵام لە دو دەرسدا دەرەجەی خراپم هێنا، ئەویش لە کیمیا پەنجام هێنا، بۆیە ئەوە هەمو دەرەجەکانی تری هێنامە خوارێ، من ٨٥، ٩٠، ٩٥م هەبو بەڵام بەهۆی دەرەجەی کیمیاوە، دەرەجەکانی ترمی

هێنایە خوارەوە، دەرسێکی کەش کەمم هێنا ئەویش ٥٢ بو. ئەو دو دەرەجە کەمە، کاری کردەسەر هەمو دەرەجەکانی ترم و بە گشتی دەرەجەم بو بە ٧٠.

لە هاوینەکەیدا هاتمەوە هەولێر بۆ ئیشکردن و پایزەکەی چومەوە بەغدا، واتا لە پایزی ساڵی ١٩٥٢ دا بوم بە قوتابی کوللیەی حقوق.

* چۆن چویتە کۆلیژی حقوق؟

- باپێت بڵێم چۆن بوم بە قوتابی کوللیەی حقوق، من یەکەمجار ویستم بچمە کوللیەی توبەوە، چونکە من خۆم فەرعی عیلمیم تەواو کردبو، دەرەجەشم باش بو، بایی ئەوە بو کە لە کوللیەی توب وەربگیرێم.

لە لیوای کەرکوک مافم هەبو، پێشکەشی کوللیەی توب بکەم و وەربگیرێم، بەڵام پێویست بو، هەمو ئەوراقم تەواو بێت. گیروگرفتی جنسیەی عێراقیم هەبو، شەهادەی حوسنی سلوکم نەبو. تەحقیقاتی جینائی ئەبوایە رەزامەند بێت بۆ ئەوەی شەهادەکە وەربگرم، کاتی خۆی ئەگەر شهادەکەت نەبوایە لە کوللیە قبوڵ نەدەکرایت. من بەپێی تەحقیقاتی جینائی شهادەکەم وەرنەئەگرت، چونکە دو جار گیرابوم و جۆرەها تاوانیان دابوە پاڵم، واتە لای ئەوان (حوسن سلوکم) زۆر باش نەبو.

منیش نەمئەزانی چی بکەم، ئەوەندەی نەمابو، کە وەرگرتن لە کوللیەی حقوق دابخرێت، خزمێکمان هەبو دۆستی عەمیدی کوللیەی حقوق بو، گوتی: "ئێمە ئەچینە لای و پێی ئەڵێین، کە دوای قبوڵکردن، ئەوراقەکان تەواو ئەکەین".

منیش چوم ئەوراقەکانم لە کوللیەی توب وەرگرتەوە و بردم بۆ کوللیەی حقوق، بە مەرجێ لەوێ وەرگیرام کە معامەلاتەکەم تەواو بکەم، دو شتی نوقسان بو، جنسیەی عێراقی و حوسنی سلوک.

رۆژێک لە عیمادەی زانکۆ ناوی کۆمەڵێک قوتابی نوسرابون کە پێویستە ئەوراقیان تەواو بکەن، یەکێک لەوانە من بوم، منیش چومە لای مولاحیزەکەی کولیەی حقوق، زۆر پیاوێکی خراپ و قیزچسمە بو، هیچ مساوەماتێکی نەئەکرد. رۆژێک چوم شەهادەی جنسیەکەم تەواو کرد، بەڵام حوسنی سلوکەکەم نەبو، چومە ژورەوە و گوتی بۆچی هاتوی، گوتم ئەوراقەکانم هێناوە، گوتی باشە داینێ و برۆ منیش دامناو رۆیشتم. دو مامۆستاش لەوێ بون، پاش ماوەیەک جارێکی تریش ناوم نوسرابۆوە، گوایە موعامەلاتم تەواو نەکردوە، منیش چومە سەری گوتم ئەوە چیە؟ من ئەو رۆژە نەمهێنا، گوتی وەڵڵا راست ئەکەیت، گوتم دو

مامۆستاش شایەتن، گوتی ئاخر هەرچەند ئەگەرێم دیار نیە! گوتم چوزانم من هەقم چییە من جنسیەکەم لەگەڵ دانا، گوتی باشە بابە قەیناکە!!.
بەو شێوەیە چومە کوللیەی حقوق و لەوێ منیر قازی عەمیدی کوللیەی حقوق بو، پیاوێکی زۆرباش بو، سیاسی نەبو، بەڵام لەگەڵ (تاڵەبانییان) دۆست بو، مونیر قازی بەو شێوەیە قبوڵی کردم، ئەگینا من ئەو ساڵە قبوڵ نەدەکرام، نە لە حقوق، نە لە توب.
کە چومە بەغدا، لەوێش کەوتمە کاری سیاسی و توانیمان لیژنەی ناوچەی پارتی دروست بکەینەوە.

*** چ روداوێکی گـرنگی تر رویدا لە ژیانی خـوێندکاریتدا، لـەو ماوەیەی لە بەغدا بویت؟**

– ئەو ساڵە وەکو باسم کرد، زۆر روداوی گەورە رویدا، پارتی لە روی رێکخستنەوە گەشایەوە، لە ١٩٥٣ دا، لە زۆر شوێن لیژنەی ناوچەی پارتی دروست کران، رێکخستن لە بادینان سەری هەڵدایەوە، لە ناوچەکانی تر، خەباتی جوتیاران و پشتیوانی لە خەباتی جوتیاران گەشەی کرد و ئەو گەشەکردنە کاری کردەسەر ئیتیجاهی سیاسی پارتی و بەرەو پارتییەکی چەپی شۆرشگێری برد.
لە هەمان ساڵدا، مەلیک فەیسەڵی دوهەم لە بەغدا تەتویج کرا، بەو بۆنەیەوە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وتارێکی زۆر گرنگی لە رۆژنامەی رزگاریدا نوسی، ئەو وتارە ئەوەندە باش بو کە لەبەرمان کردبو، واتا وشەی ئەدەبی زۆر جوان و رێکوپێکی دژ بە مەلیک و دژی تاجدارکردنی تێدابو، هەروەها باسی لەوەکردبو، کورد دانی پێدا نانێت، چونکە ئەو بەزۆر بەسەر گەلدا سەپێنراوە.
پاش تەواوبونی هاوین، ئێمە چوینەوە زانکۆ و ساڵی خوێندن دەستی پێکردەوە.
لەبیرم چو بیڵێم، روداوێکی گرنگ تریش رویدا، ئەویش میهرەجانی لاوان و قوتابیانی جیهان بو لە وارشۆ، بۆ یەکەمجار ئێمە هەوڵماندا، بەشداریمان کرد و پارەمان کۆکردەوە لەناو پارتی و دۆستانی پارتیدا، توانیمان هەژاری موکریانی بنێرین بۆ ئەو میهرەجانە، هەروەها زەبیحی و سینەم بەدرخانیش لە گەڵیدا چون.
کاتێ کە هەژار لە میهرەجانی وارشۆ هاتەوە، زۆر ناڕەزایی پیشاندا بەرامبەر بە پارتی کۆمۆنیستی عێراق کە لەوێ نەیانهێشتوە باسی کورد بکات و بچێت بۆ مۆسکۆ و کۆمەڵێک شتیان لە میهرەجانەکە لێ تێکدابو و نەیانهێشتبو کوردایەتیەکی باش و چاک بکات.

# ڕۆڵی پارتی کۆمۆنیستی عێراق
# بەرامبەر بە مەسەلەی کورد

*** ئەو سەردەمە ناکۆکی لە نێوان پارتی و شیوعیدا لەسەر بونی کورد وەک نەتەوە لە ئارادا بو، ئایا چەند ئاگاداری ئەو کێشەیە بویت؟**

– ئەو ساڵە، دانوستاندن لە نێوان پارتی و شیوعیدا لەسەر مەسەلەی کورد زۆر گەرم بو، ئەویش بەهۆی ئەوەوە بو، ئایا کورد ئوممەیە یان ئوممە نیە؟ شیوعییەکان نەک تەنها ئەیانگوت کورد ئوممە نیە، بەڵکو ئەیانگوت کورد نەتەوەش نیە، ئەوەی نەتەوەش نەبێت، مافی چارەنوسی نیە! کەواتە کورد مافی چارەنوسی نیە، کەواتە کورد گەل نیە!.

مادام کورد گەل نیە، کەواتە مافی نیە پارتی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی هەبێت، هەروەها مافی نیە ڕێکخراوی تایبەتی خۆی هەبێت، مافی نیە مافی چارەنوسی هەبێت. ئەیانگوت کوردستان بەشێکە لە عێراق، ئەو گفتوگۆیانە شێوەیەکی زۆر توندوتیژیی بە خۆیەوە گرتبو.

*** واتا شیوعیەکان هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد زۆر سەلبی بو؟**

بەڵێ، شیوعییەکان هەتا وشەی کوردییان کەم بەکارئەهێنا، لە سڵاو لەیەککردندا ئەتزانی کام کەس شیوعییە و کام کەس پارتییە، هەرچی پارتییەکان بون ئەیان گوت (ڕۆژ تان باش) هەرچی شیوعییەکان بون ئەیانگوت (السلام علیکم) واتا هەرچی وشەی کوردی بەکار بهێنایە و کوردایەتی بکردایە ئەوە دیار بو، سەر بە پارتییە، هەرچی بیگوتایە، کورد نەتەوە نییە و مافی نیە، وشەی عەرەبی بەکاربهێنایە، ئەوە ئەزانرا، کە شیوعییە.

ناکۆکی لە نێوان پارتی و حیزبی شیوعی لەسەر زۆر مەسەلە هەبو، بۆ نمونە لەسەر هەڵوێست لەسەر پارتەکانی تر، وەک پارتی گەل و پارتی دیموکراتی کە

حیزبی شیوعی دژی ئەوان بون و پارتی لایەنگری ئەوە بو، بەرەیەکی فراوان دروست بکرێت و کۆمۆنیستەکانیش ئەیانگوت، ئەبێ ئەوان سەرکردەی ئەو بەرەیە بن و کارەکان ئەوان بەڕێوەی بەرن.

ئەوکاتە بێگومان لای پارتی هەستی نەتەوایەتی زاڵ بو، لای کۆمۆنیستەکان زیاتر هەستی چینایەتی.

*** لەو هەلومەرجەدا، باوی ڕێکخراوی جەماوەری بو، بیرتان نەکردەوە ڕێکخراوی تری جەماوەری دروست بکەن؟**

- ئێمە بۆ یەکەمجار لە ١٩٤٨دا بیرمان لە دامەزراندنی کۆمەڵەی جوتیارانی کوردستان کردەوە، بۆ ئەوەی جوتیاران ڕێکخراوێکی تایبەت بە خۆیان هەبێت.

من یەکێک بوم لەو کەسانەی، زۆر چالاک بوم لەو بوارەدا، لە سەرەتادا دەستم کرد بە ڕێکخستن و کارکردن لەناو کرێکاراندا، لەو روانگەیەوە، ئەوان بەردی بناغەی ڕێکخستنن.

لە هاوینی ١٩٤٨ کەوتمە ڕێکخستنی کەناسی شارەوانی و ئەو گروپە زۆر نەدارانەی کە هیچیان نەبو، وەک ئەوانەی، لۆکە و پەمۆ چاک ئەکەن و هەللاجەکان. لەوانەوە چومە لای کورتاندرو، شاگردی کورتاندرو، ئاسنگەر و شاگردەکانیان و ئەو خەڵکانەی لەو جۆرە پیشانەیان هەبو.

توانیمان لە ناویاندا گروپێکی باش دروست بکەین، لە پاشاندا لەناو جوتیارانیشدا توانیمان کاری باش ئەنجام بدەین، چونکە پەیوەندیم لەگەڵ لادێ هەبو، بە تایبەتی بەهۆی ئەوەوە، زۆر خەڵکی لادێ ئەهاتن بۆ تەکیەکەی ئێمە و منیش بە شەو ئەچوم بۆ لایان و قسەم بۆ ئەکردن و باسم ئەکرد، دوژمن خوێنتان ئەمژێ و زوڵمتان لێئەکا و ئێوە پێویستە ڕاپەڕن و خۆتان ڕێکبخەن و بەرگری لە مافەکانی خۆتان بکەن.

لەو سەردەمەوە، واتا لە ١٩٤٨ەوە هەستم ئەکرد، بیروباوەڕم زۆر چەپ بو، واتا من لەو گروپە بوم لەناو پارتیدا کە کتێبی مارکسیمان ئەخوێندەوە، ئەو کاتە دو سێ کتێبی مارکسی هەبون، کاک عەلی عەبدوڵڵا بۆی شەرح ئەکردین و ئەڵقەی رۆشنبیریان بۆ دروست کردبوین.

لەو کتێبانەی، کە ئەمانخوێندەوە (ماتریالیزمی دیالیکتیکی و ماتریالیزمی تاریخی) لە نووسینی ستالین و تەرجومەی خالد بەگداش و کتێبی (المسالة الوطنية)ی ستالین بو.

# سەرەتای یەکەم ناکۆکی نێوان ریزەکانی پارتی

*** ئایا لەو رۆژگارانەدا زۆربەی ئەندامانی پارتی وەک چەپ بیریان نەکردەوە؟**

- لەناو پارتیدا ناکۆکییەک دەستی پێکرد، لەسەر ئەوەی دەرکەوت کە شێخ لەتیفی حەفید و حەمە زیاد ئاغا، هەردوکیان لە سەرکردایەتی پارتی بون، حەمە زیاد ئاغا، پیاوێکی زۆر نیشتمان پەروەر و کورد پەروەر بو، لە ئاستی نیشتمانپەروەریشدا لە شێخ لەتیفیش(٧) لە پێشتر بو، بەڵام شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحمود بو، ئەویش ناوبانگی هەبو، دەورێکی نواندبو لە کۆماری مەهابادا.

هەردوکیان کرابونە جێگری سەرۆک، دیارە ئەو کاتە ئێمەی گەنجەکانی پارتی لە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی چەپدا بوین. مامۆستایەکمان هەبو محەمەد ئەمین مەعروف ئەو زۆر مەسەلەی بۆ رون ئەکردینەوە، ئاسۆی بیری نەتەوایەتی فراوان کردین.

پێش ئەوەی پارتی دابمەزرێ، رۆژنامەی (شۆڕش) و (رزگاری) هەبون، شۆڕش زمان حاڵی حیزبی شیوعی کوردستانی عێراق بو، ئەویش پارتێکی نیشتمان پەروەری لەگەڵ خۆی دروستکردبو بەناوی پارتی رزگاری، واتا رزگاری و شۆڕش.

*** رۆڵی پارتە چەپەکانی عێراق چی بون لەو قۆناغەدا و ئەندامە چەپەکانی ناو پارتی رۆڵیان چی بو؟**

- بۆ یەکەمجار سەرکردایەتی ئەو دو حیزبە، کەوتبوە دەست خوێندەوار، جاران بزوتنەوەی کوردایەتی بەدەست شێخ و مەلا و ئاغا و دەرەبەگەوە بو، بەڵام بە دامەزراندنی پارتی سەرکردایەتیەکی عەشایەری گەڕایەوە بۆ ناو جوڵانەوەی کورد. پارتی کە دامەزرا سەرۆکەکەی مەلا مستەفا بو، خۆی هەم مەلا بو، هەم سەرۆک عەشیرەت، دو جێگرەکەشی شێخ لەتیف و کاکە زیاد بون، ئەوە بوبەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵێک لە گەنجەکان واز لە پارتی بهێنن.

دوایی کە شێخ لەتیف لە ١٩٤٨دا کەوتە ناکۆکی لەگەڵ هەمزە عەبدوڵڵا[٩]، مەسەلەکە لە ناو ئێمە و لەناو باڵی چەپی پارتیدا تەقیەوە و سەرکردایەتیەکی دەرەبەگ بە شتێکی خراپ حساب ئەکرا، ئێمە چۆن ئەبێ ئاغا لە سەرکردایەتی حیزبماندا هەبێ، ئەوانە ئەتوانن دۆست بن، لایەنگر بن، بەڵام نابێ سەرۆک و جێگری سەرۆک بن و لە سەرکردایەتی حیزبەکەدابن.

ئێمە کە لە کۆیە بوین، لە ژێر کاریگەریی بۆچونی چەپدا بوین، بەشی هەرە زۆرمان لە لیژنەی ناوچەی کۆیە، لە ژێر کاریگەریی مامۆستا حەمەدئەمین مەعروف دا بوین، ئەو خەتە بوین، پێمان باش بو، ئەو گیروگرفتانەی ناو پارتی، لە یەکەمین کۆنگرەی پارتیدا چارەسەر بکرێن و لاچن، بە تایبەتی کە مەلا مستەفا لە وڵات نەبو.

بە بۆچونی من، هەمزە عەبدوڵڵا هەڵەیەکی گەورەی کرد لە مێژوی کوردا کە، عەشایەری هێنایەوە ناو بزوتنەوەی کوردایەتی و هێنایەوە ناو رێکخستن.

ئەتوانرا ئەو کاتە وەکو سەردەمی حیزبی رزگاری کار بکرایە، لە زەمانی رزگاریدا باڵی عەشایەری هەبو، ژمارەیەک پیاوی گەورەی عەشایەریی بەرێز، کرابون بە ئەندام، وەکو کاکە زیاد ئاغای کۆیە، عیزەدین مەلا فەندی هەولێر، ساڵح بەگی میران بەگی شەقڵاوە و کۆمەڵێک کەسایەتی ناسراو، کرابون بە لق و پێیان ئەگوتن (لقی عەشایری حیزبی رزگاری)، حیزبی رزگاری وەکو فیرقەیەک وابو، بە رەئی من ئەو رێگایە چاکتر بو لەوەی، کە وەک باڵ لەناو حیزبدا کاریکەن.

هەمزە ئەو کارەی تێکەڵاو کرد و ئەوانەی هێنایەوە بۆ سەرکردایەتی، ئەوە بە گەورەترین پاشەکشە لە روی سیاسی و ئایدیۆلۆجی و چینایەتیەوە ئەژمێرێت، لە مێژوی بزوتنەوەی رزگاریخوازیی خەڵکی کوردستاندا.

ئەو پاشەکشەیە لە مەهابادیش دەستی پێکرد، واتا لە مەهابادیش بە هەمان شێوە بو.

# (ژ.ک) و کۆماری مەهاباد

*** کاریگەری (ژ.ک) و کۆماری مەهاباد چی بون لەسەر گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی لە کوردستانی عێراقدا؟**

- (ژ.ک) حیزبێکی بچکۆلەی ژیکەڵەی جەماوەریی بو لە خەڵکی رەشوڕوت، خوێندەوار، دوکاندار، مەلا و فەقێ و کاسبکار پێکهاتبو. بۆ یەکەمجار لە کوردستانی ئێران جوڵانەوەیەکی جەماوەریی لەناو کۆمەڵانی خەڵکەوە هەڵقوڵابو، سەرکردایەتی و رابەری ئەکرا.

کە سۆڤێت هات و قازی محەمەدی کرد بە سەرکردە و قازی محەمەدیش وەک سەرکردایەتیەکی عەشایەریی دیاربو، ئەو هەستا هەندێ دەوڵەمەندی دانا بۆ سەرکردایەتی بەناوی ئەوەی حیزبی نوێیە، ناوی نا (حیزبی دیموکراتی کوردستان)، سەرکردایەتیە جەماوەرییەکانیان لابرد، وەکو (عەبدولرەحمان زەبیحی و دڵشادی رەسوڵی و نانەوازادە و سدیقی حەیدەریی) و کۆمەڵێک کەسانی وەک ئەوان، ئەوانە هیچیان نەمان و یەک دەستە لە ئاغا و دەرەبەگ و بازرگانی کورد هێنران بەناوی پیاوماقوڵەوە کران بە سەرکردایەتی حیزبەکە.

بەرای من، یەکێک لە هۆکانی روخاندن و زو هەرەسهێنان و شکستەکەی کۆمار و قازی محەمەد ئەوە بو، کە حیزبەکە سەرکردایەتییەکەی بازرگان بون، خۆیان لە بنەڕەتا پیاوی موسالیم و سازشکار بون و تاقەتی خەبات و شۆڕشی درێژخایەنیان نەبو، وایان ئەزانی حکومەتێکیان بۆ دادەنرێت و ئەوان لە بەروبومەکەی ئەخۆن، بەڵام ئەوەبو کە روس کشایەوە، ئەوانیش روخان و چۆکیان دادا بۆ شا.

ئەو هەڵەیە لەوێوە دەست پێدەکات، واتا ئەگەر (ژ.ک) وەکو خۆی بمایەوە و پەروەردە و گەشەی بکردایە، لە جیاتی ئەوەی سۆڤێت بچێ قازی محەمەد بێنێ و دەوروبەرەی پڕ کات لە عەشایەر و دەرەبەگ، ئەیتوانی ئەو کوڕانەی (ژ.ک) وەک وەفد، تاقم تاقم ببات بۆ سۆڤێت و هەر یەکە دو ساڵ مەشقی پێ بکردنایە و هەوڵی لەگەڵ بدانایە بۆ خۆ پەروەردەکردن، ئەو کاتە ئەیتوانی پاش ماوەیەکی

کەم، زوربەیانی بکردنایە بە پیاوی شارەزا و رۆشنبیر و ئەیتوانی سەدان کادیر بۆ کورد دروست بکات.

*** ئایا پارتیش لە کوردستانی عێراقدا، فۆتۆکۆپی کارەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی کرد؟**

- لێرەدا ئەمەوێ بڵێم، هەمزە عەبدوڵڵاش هەمان هەڵوێستی نواند، ئەویش لەژێر کاریگەری تاقیکردنەوەی مەهاباد و لە ژێرکاریگەریی سۆڤێتەکاندا بو.

لێرە ئەمەوێ دو شت بڵێم: کە دەرس و پەندی گەورەیە لە کۆماری مەهابادەوە دەستمان ئەکەوێت.

یەکەم: سۆزی کورد بۆ سۆڤێت و ئەو دەست تێوەردانەی سۆڤێت لە کاروباری کورد، زیانی هەبو بۆ کورد، نەک سود، واتا ئەگەر سۆڤێت قازی محەمەدی نەهێنایە بۆ سەرۆکایەتی کۆماری مەهاباد، بەڵکو (ژ.ک) ببوایە بە حکومەت و حکومەتی گرتبایە دەست، ئەوە بەو شێوەیەی لێ نەئەهات، کە بینیمان.

دوهەم: بزوتنەوەی کورد، لە کوردستانی عێراقیش ئەوەندە چوبوە پێشەوە، بەڵام بە هێنانەوەی باڵی عەشایەری، بوە هۆی ئەوەی کە ئەو گەشەکردنە گیروگرفتی تێکەوت و ئۆباڵی ئەکەوێتە سەر دەستتێوەردانی سۆڤێتیش.

لەبەرئەوە دەستتێوەردانی سۆڤێتەکان لە کاروباری کورد، هەم خراپ بو بۆ کورد و هەم بۆ سۆڤیەت.

*** رۆڵی حیزبی شۆرش چی بو، لە دامەزراندنی پارتیدا؟**

- کادیرەکانی حیزبی شۆرش، لە سەرەتادا هەمویان رازی بون لەسەر دروستکردنی پارتی، رازی بون لەسەر دروستکردنی پارتێکی دیموکراتی شۆڕشگێڕی جەماوەریی، بەڵام بەو مەرجەی جڵەو و بڕبڕەی پشتی کارەکەی بەدەست کەسانی مارکسی لینینییەوە بێت. کاتێ کە هەمزە هاتەوە، ئەو بۆچونەی رەتکردەوە و تێوریەکی زۆر راسترەوانەی داهێنا، گوایە کۆمەڵگای کورد، کۆمەڵگەیەکی عەشایەرییە و هێزی سەرەکی تێدا عەشایەرە، لەبەرئەوە ئەبێ ئێمە عەشایەر بگرین و بەهۆی عەشایەرەوە شۆرش بۆ رزگاری گەلی کورد بکەین.

ئەم بۆچونە، بوبەهۆی ئەوەی، باڵێک لە شۆڕشێکان جیا ببنەوە، هەرچەندە بەداخەوە ساڵح حەیدەری بە شێوەیەکی سەرلێشێواوانە و ناراستانە باسی ئەو

سەردەمە ئەگێڕێتەوە، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە، من لە کتێبەکەمدا لە زەمانی خۆیەوە نوسیومە.

سالّح حەیدەری، خۆی ئیدیعای ئەکرد، ئەو پشتگیری ئەوەی نەکردوە شیوعی جیاببنەوە. ئەو سەردەمە هەمویان لەسەر ئەوە رازی بون کە هەمو لە یەک پارتی دیموکراتی شۆڕشگێڕدا کۆببنەوە، ئەو بۆچونەش لە ژێر کاریگەریی نەزەریەکەی ستالیندا بوە.

ستالین لە وتارێکدا، لە جامیعەی (کادحی الشرق) خوێندوییەتیەوە، ئەڵێ:

یەکەم: مارکسی لینینی لە وڵاتانی دواکەوتودا ۳ جۆر کار ئەکەن: ئەو وڵاتانەی، پرۆلیتاریا تێدا گەشەی کردوە و وەکو چینێک هاتۆتە مەیدان و جوڵانی هەیە و سیمای تایبەتی خۆی هەیە (وڵاتی هیند بە نمونە ئەهێنێتەوە)، ئەڵێ ئەبێ حیزبی شیوعی هەبێ.

دووەم: ئەو وڵاتانەی، تێدا پرۆلیتاریا هەیە، بەڵام هێشتا وەکو چینێک گەشەی نەکردوە و تاقیکردنەوەی سیاسی و نەقابی نیە، ئەکرێ دو باڵ بن لەناو یەک حیزبدا، (کۆماری چینی ئەو سەردەمە بە نمونە دێنێتەوە).

سێهەم: ئەڵێ ئەو وڵاتانەی، چینی کرێکار هێشتا گەشەی نەکردوە و نەبۆتە چینێکی رێکوپێک کە سیمای تایبەتی خۆی هەبێت، بۆ کەسانی مارکسی لینینی باشترە، رێکخراوێکی دیموکراتی شۆڕشگێڕ دروست بکەن.

لەبەرئەوە بەپێی قسەی ستالین، سێ جۆر حیزب ئەتوانێ پێشڕەو بێ، یەکێکیان حیزبی شیوعیە لە وڵاتانی سەرمایەداریی، دوهەمیان حیزبی شیوعی کرێکاریی لە وڵاتانی پێشکەوتوی دنیای سێ و سێهەمینیان حیزبی دیموکراتی شۆڕشگێڕە لە وڵاتانی دواکەوتو.

ئەم تیۆریەی حیزبی دیموکراتی شۆڕشگێڕ، سەرچاوەی فیکری و ئایدیۆلۆجیای دامەزراندنی پارتی بو.

هەمو شۆڕشییەکان قبوڵیان بو، حیزبێکی لەو جۆرە دروست بکەن، بەڵام کە هاتە سەر دانانی سەرکردایەتیەکەی، شۆڕشییەکان جیابونەوە و گوتیان ئێمە ئەوە قبوڵناکەین، هەتا لەسەر مەلا مستەفاش رازی نەبون و ئەیانگوت: "مەلا مستەفا کابرایەکی عەشایەرییە و تاقیکردنەوەی حیزبایەتی نیە، با وەکو کەسایەتیەکی نیشتمانپەروەر رەچاوی بکەین، نەک بیهێنین بیکەین بە سەرۆکی خۆمان".

ئەو کاتە شۆڕشییەکان ناڕازی بون، لە هەندێ پەیوەندی مەلا مستەفا،

لەگەڵ هەندێ ئەفسەری ئینگلیز هەبیو، هەرچەندە ئەوان ئەو بەڵگەنامانەیان نەدەزانی کە دوایی دەربارەی پەیوەندی ئەو ئەفسەرانە و مەلا مستەفا بڵاو بونەتەوە.

بێگومان ئەگەر ئەو رۆژە ئەوەیان بزانیبایە، هەر کافریان ئەکرد و هەزار تۆمەتی نۆکەرایەتی ئیمپریالیزم و خیانەتیان ئەدایە پاڵ.

# یەکەم جیابونەوە لەناو پارتیدا

*** هۆی جیابونەوەی چەپەکانی ناو پارتی چی بو؟**

- ئەم باڵە چەپە، بەداخەوە لە جیاتی ئەوەی لەناو پارتیدا بمێنێتەوە و ئیش بکات و هەوڵبدات لە کۆنگرەدا پارتی بگۆڕێت، یا هەر لە کۆنگرێسەکەدا بچێت و لیستەی خۆی دابنێ و نەیەڵێ لیستەکەی تر دەربچێ، وەکو ئێمەمانان دوایی کردمان، ئەوان جیابونەوە، چونە ناو حیزبی شیوعییەوە.

ئەو دوبەرەکی و ناکۆکییەی لە کوردستان دروست بو، خەتای گەورە لەسەر شانی هەمزە عەبدوڵڵایە، چونکە بەراستی هەمزە عەبدوڵڵا ئەو بیروبۆچونە راسترەوانەی هێنایە کایەوە و باڵی دەرەبەگایەتی و عەشایەری گەڕاندەوە بۆ ناو جوڵانەوەی کوردی.

ئەمێنێتەوە ئەوەی کە شۆڕشییەکان بەلای منەوە هەڵەیان کرد، نەئەبوایە جیا ببنەوە، مادام باوەڕیان بە حیزبەکە هەبو، پێویست بو لەناویدا بمێننەوە و کاریان تێدا بکردایە، رەنگە لەو هەڵبژاردنەدا خۆیان دەرچونایە، ئەو کاتە ئەتوانرا وەک خۆیان ئەیانویست وابکەن.

لە ١٩٤٩ دا کۆمەڵێک مەسەلە هاتە پێشەوە، لەوانە، ئایا چی لە حیزبەکەمان بکەین؟ بە تایبەتی لە سەرەتای ١٩٤٩ کە ئیرهاب لە عێراقدا دەستی پێکرد و ئیرهاب و گرتن و کوشتن و ئیعدام کردن سیمای ئەو ساڵە بون.

لە ئەنجامی راپەڕینی کانونی دوهەمی ١٩٤٨ دا کە بە (وەسبە) ناسراوە، کۆمەڵێ خەڵک گیران و کۆمەڵێکیش لە سەرکردەکانی پارتی وازیان هێنا،

لەوکەسانەی کە گیران: د.جەعفەر، کە نەفی کرا بۆ ئێران، رەشید عەبدولقادر، گیراو سێ ساڵ حوکم درا، عومەر دەبابەش حوکم درا.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، ئەوکاتە لە سەرکردایەتیدا نەبو، بەڵام لە ناودارەکانی پارتی بو، لێپرسراوی لقی سلێمانی بو، هەروەها کۆمەڵێک برادەری تری چالاکیش وەک نوری ئەحمەدی تەها، ساڵح دیلان، حیلمی عەلی شەریف، غەفور رەشید داراغا، ئەوانەش گیران و حوکم دران.

هەندێک لەو برادەرانە وازیان لە پارتی هێنا و چونەوەماڵێ خۆیان و بە پیاوی چاک مانەوە وەکو پارێزەر رەشید باجەلانی خانەقینی، پیاوێکی نیشتمان پەروەر بو، ساڵح یوسفی و چەند کەسێکی تر کە وازیان هێنا، هەروەها تەها محێدین مەعروفیش کە لە زەمانی بەعس بەناو جێگری سەرۆک کۆماری عێراق دانرابو.

ئەوانەی لە سەرکردایەتی پارتی مانەوە و نەگیران، بریتی بون لە کاکە زیاد ئاغا، کاروباری رێکخستنی پێسپێرابو، عەلی عەبدوڵڵا، کەریم تۆفیق، لاوێکی کۆیی زۆر زیرەک بو لە پۆلی دوی کوللیەی مەلیک فەیسەڵ بو، دوایی حقوقی تەواوکرد و یەکێک بو لە دامەزرێنەرانی پارتی و ئەندامی (م.س)ی هەم شۆرش و هەم پارتی دیموکراتی کورد بو، بەڵام ئەویش دوای ئەوەی زانکۆی تەواوکرد سست بو و وردە وردە خۆی کێشایەوە لە لێپرسراوێتی.

ساڵی١٩٤٩ تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر لەناو پارتی تەقییەوە و زۆر لە سەرکردەکان وازیان هێنا و رۆیشتن، یان گیران.

حیزب کۆنفرانسێکی لە بەغدا بەست، ئەو کۆنفرانسە بۆ چارەسەریی وەزعی پارتی بەرێوەچو، ئەوانەی لە کۆنفرانسەکەدا بەشداربون بریتی بون لە: نوێنەرایەتی بەغدا، کۆیە، سلێمانی، موسڵ و ئەوانەی، لە سەرکردایەتی مابونەوە وەک، عەونی یوسف و عەلی عەبدوڵڵا و نوێنەرانی سلێمانی، لەم کۆبونەوەیەشدا کۆمیتەیەک هەڵبژێردرا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی پارتی بکات و زەمینە بۆ کۆنفرانسی گشتی خۆش بکات.

ئەوانەی لەو کۆنفرانسەدا هەڵبژێران، بریتی بون لە: عەونی یوسف، عەلی عەبدوڵڵا، ساڵح ڕوشدی، عەلی حەمدی، مستەفا کەریم، نوری محەمەد ئەمین، محەمەد موسا سادق و بەندە، ئەمانە هەڵبژێردران و بون بە سەرکردایەتی پارتی.

سەرەرای ئەو هەوڵانە، گیرگرفت و ناکۆکیەکانی ناو پارتی تەقییەوە، هەم لەسەر چۆنێتی پارتی و هەم لەسەر رەفتاری هەمزە عەبدوڵڵا، کە لە سلێمانی گیرابو.

* **هەمزە عەبدوڵلا رۆڵی چی بو؟**

- هەمزە عەبدوڵلا، لە ساڵی ١٩٣٨ەوە جنسیەی عێراقی لێ سەندرابۆوە، موختەفی بو، نزیکی ١١ ساڵ بە موختەفی مایەوە، لەو ١١ ساڵەدا وەک پیاوێکی تێکۆشەر ناوبانگێکی باشی دەرکرد. کە بەربو جێی سەرسوڕمان بو کە چۆن بەربوە و چۆن بەردەبێت؟ ئەمانە پرسیاری ئەو برادەرە چەپڕەوانەی ناو پارتی بون، بە تایبەتی ساڵح روشدی و مستەفا کەریم، ئەوانە لێیان کرد بە هەڵڵاو گوتیان: "ئەوە حەتمەن سازشی کردوە، ئەگینا بەر نەئەبو".

ئەوە بو بەهۆی دروستبونی دوبەرەکییەک لە ناو پارتیدا، زۆربەی زۆری ئەندامەکان و کادێرەکانی پارتی باوەڕیان بەوە نەبو کە هەمزە خیانەت یان سازشی کردبێ، بەڵام پێشیان وا نەبو، هەمو شتێکی راست بێت. من ئەو ساڵە لە کۆیە لە پۆلی سێی ناوەندی بوم و ئەندام بوم لە لیژنەی ناوچەی کۆیە و لێپرسراوی قوتابیان و کرێکاران بوم.

ئێمە لە کۆیە، بۆچونەکانی سەرکردایەتی، بە تایبەتی ساڵح روشدیمان رەت کردەوە و گوتمان ئەوە قسەی خراپە و ئێمە گۆڕینمان ئەویست کە نەکرابو، ئێمە ئەمانویست پارتی بەرەو چەپی بچێ و ناوەکەشی بگۆڕێت. ئێمە ئەمانویست لە پارتی دیموکراتی کوردەوە بکرێ بە پارتی دیموکراتی کوردستان، چونکە تەنها کورد لە کوردستاندا ناژی و ئەبێ ناوی حیزبەکە بە ناوی وڵاتەکەوە بێ، نەک بەناوی گەلەکەوە، بۆئەوەی غەیری کوردیش وەک تورکمان و ئاشوری مافیان هەبێ لەو حیزبەدا بەشداربن.

ئێمە ئەمانویست پارتی تیۆری چەپی هەبێت و گرنگی بدات بە مەسەلەی کرێکار و جوتیار و مەسەلەی ئیسلاحی زەراعی.

* **مەبەستتان لە ئێمە کێیە؟**

- ئێمە ئەو گروپەی کۆیە بوین، واتا لیژنەی ناوچەی کۆیە، رێبەرەکەمان حەمەد ئەمین مەعروف بو، مامۆستایەکی زۆر زیرەکی ئەو سەردەمە بو لە کۆیە، پەیوەندیشمان لەگەڵ سلێمانی هەبو کە هەمان بۆچونیان هەبو، لەوانەش حیلمی عەلی شەریف، غەفور رەشید داراغا، شەهابی شێخ نوری، ئەوانە ئەو ئیتیجاهەیان لەوێ پەروەردە ئەکرد و پشتگیریان ئەکرد.

# ڕاپەرینی تشرین

*** هۆی ڕاپەرینی تشرین چی بو لە بەغدا و ڕۆڵی پارتی و شیوعی چی بو تێدا؟**

- ساڵی ١٩٥٢ یەکەم ساڵی زانکۆم بو، ئەو ساڵە ساڵێک بو کە بەغدا ڕاپەڕینێکی گەورەی لە تشریندا بە خۆوە بینی، قوتابیان و کۆمەڵانی خەڵکی بەغدا ڕاپەڕین، لە مێژوی عێراقدا بەناوی ڕاپەرینی تشرینەوە ناوی دەرکردوە.

ڕاپەرینەکە، لە دانیشگاکانەوە دەستی پێکرد و پاشان پەرەیسەند و چوە ناو جەرگەی شار و کۆڵانەکانیشی گرتەوە، خەڵک لەو سەردەمەدا داوای ئازادی و دیموکراسی و دروستکردنی حکومەتێکی نیشتمانی، بە سەرکردایەتی کامل چادرچی یان ئەکرد و داوای بەرەڵاکردنی زیندانیە سیاسییەکان و ئازادکردنی بارزانییەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ شوێنی خۆیان ئەکرد.

ئێمەش دروشمێکمان خستە ناو خۆپیشاندانەکەوە، داوای بەتاڵکردنەوەی ڕێککەوتننامەی عێراق و ئینگلیزمان ئەکرد، مەبەستمان ئەوەبو، ئەو داخوازیە بکەوێتە سەرزاری خەڵک.

هەروەها داوای ئازادی و دیموکراتی حیزب و ڕۆژنامەکان ئەکرا و داوای (هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ) ئەکرا، ئەوکاتە هەڵبژاردن لە عێراقدا ڕاستەوخۆ نەبو، بە دو قۆناغدا تێئەپەڕی.

شیوعییەکان دەورێکی دیار و چالاکیان هەبو لەو ڕاپەڕینەدا، هەم لەناو کۆلیژەکانەوە و هەم لەسەر شەقامەکان، ئەو کاتە کۆمەڵانی خەڵک و زوربەی هێزە سیاسییەکان تێیدا بەشداربون، بە تایبەتی ئێمە وەک پارتی، لە کوللیەکاندا دەورێکی چالاکانەمان بینی و بەشداریمان تێداکرد.

کاتێ ئەو ڕاپەڕینە گەورەیە بە حکومەت دانەمرکایەوە و درێژەی خایاند و (وەسی - عەبدول ئیلاە) ناچاربو سەرۆکی ئەرکانی سوپا نورەدین مەحمود، کە کورد بو، بانگ بکات و داوای لێ بکات حکومەتێک دابنێت و دەست بگرێت بەسەر بارودۆخەکەدا. لە ئەنجامدا، سوپا دابەزیە کۆڵانەکانی بەغدا و توانرا ئەو

راپەرینە بکوژێنرێتەوە. هەر دوای ئەوە، ئەحکامی عورفی ئیعلان کراو قوتابخانە و کوللیەکان داخران و قوتابیەکان گەڕانەوە ماڵی خۆیان و ئێمەش هاتینەوە کۆیە.
لەو کاتانەدا، گەلێ بروسکەی دەستکرد بۆ نورەدین محمود نێرا، بروسکەیەکی گاڵتەجاریشی تێکەڵ کرا کە بە سەرۆک وەزیرانیان گوتبو (تسعیرکم الشغلم آثلج صدورنا)!

# بەرەو چەپ ڕۆیشتنی پارتی و ناو گۆڕینی

*** ئایا روداوی گرنگی تر لەو ساڵەدا رویدا؟ ئایا پارتی، کۆنگرەی لە هەمان ساڵدا سازکرد؟**

- روداوی گرنگی ئەو ساڵە ئەوەبو کە سەرۆکی وەزیرانی ئەو کاتەی ئێران د.موسەدق تەئمیمی نەوتی کرد و خەڵکی ئێران لە دژی کۆمپانیای نەوتی ئینگلیز راپەرین، ئەم راپەرینە کوردستانیشی گرتەوە، بەتایبەتی کاتێک کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دامەزرابۆوە و کەوتبوەوە چالاکی و نوێنەرانی ناردبوە لای پارتی بۆ کوردستانی عێراق.
لە ٢٦ کانونی دوهەمی ١٩٥٣دا روداوێکی گرنگ لە مێژوی پارتیدا رویدا، ئەویش گرتنی کۆنگرەی سێیەمی پارتی بو کە لە ماڵێک لە کەرکوک، بە نهێنی بەسترا، هەمو نوێنەرانی حیزب و رێکخراوەکان بەشداربون تێیدا، بۆ یەکەمجار هەندێک لەو برادەرانەی، لە زیندانیش بەربوبون وەکو رەشید عەبدولقادر بەشدارییان تێدا کرد. رەشید عەبدولقادر، ئەوکاتە ئەندامی (م.س) بو، دو سێ ساڵ حوکم درابو، تازە بەربوبو، بە ئەندامی سەرکردایەتی ئەدرایە قەڵەم.
لەو کۆنفرانسەدا، بڕیاری سیاسەتێکی چەپی پێشکەوتنخوازانەی شۆڕشگێڕانە لەناو پارتیدا درا و ناوی پارتیش کرا بە (پارتی دیموکراتی کوردستان- عێراق) و دەسەڵات درایە کۆمیتەی ناوەندی کە پرۆگرامێک لە روانگەی بڕیارەکانی کۆنگرەوە دابڕێژێت و بڵاوی بکاتەوە، تێدا مافی چارەنوس بۆ گەلی کورد دەستنیشان بکرێت و داوای روخاندنی رژێمی پاشایەتی و هێنانەدی کۆمارێکی

دیموکراتی میللی لە عێراق و کۆمارێکی فیدراڵی چەپ لە کوردستاندا بکرێت، هەروەها داوای ئیسلاحی زەراعی و لەناوبردنی دەرەبەگایەتی بکرێت.

پەرەوکردنی سیاسەتی چونە ناو کرێکاران و جوتیاران و رەنجدەران لە کوردستاندا خاڵێکی تری ئەو پرۆگرامە بو، هەروەها کۆنفرانس سڵاوی نارد بۆ مامۆستا عەزیز شەریف لەسەر کتێبە نایابەکەی، بە ناونیشانی (المسالة الكردية في العراق)، کە ئەو رۆژگارە، هەڵلایەکی گەورەی نابۆوە، چونکە پێش ئەوەی ئەو کتێبە دەرچێ ناکۆکیەکی گەورە هەبو لە نێوان پارتی و شیوعی و هەندێک لەو گروپە چەپانەی تری وەکو (وحدة النضال)، کە مامۆستا عەزیز شەریف سەرکردایەتی ئەکرد.

دەربارەی مەسەلەی مافی چارەنوسیش کە ئایا کورد نەتەوەیە یان نەتەوە نیە، ئەنجامەکەی بە بەزاندنی بیروباوەڕی شۆفێنی کۆتایی هات، ئەو بیروباوەڕە کۆنەی حیزبی شیوعی بەزی کە ئەیگوت، کورد نەتەوە نیە و مافی چارەنوسی پێڕەوا نابینرێ، بە پێچەوانەوە هەتا حیزبی شیوعی خۆی بڵاوکراوەیەکی بەناوی (میساقی باسم) دەرکرد، باسم مەبەست لە بەهادین نوری بو[١٠].

# بەشداریی پارتی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا

*** هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق چۆن بەڕێوەچو، رۆڵی کورد چی بو تێیدا؟**

– بریاردرا کە پەرلەمانی عێراق راستەوخۆ هەڵبژێرێت، پارتی لە زۆر شوێن ئەیتوانی خەڵک هەڵبژێرێت، بەڵام درەنگ بە خۆیدا گەیشت و کارەکە پەلەی تێکەوت، لە کۆیە مەسعود محەمەد[١١] هەڵبژێردرابو بە نائیب.

من لەوێ یەکێک بوم لەو کەسانەی، لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا زۆر پروپاگەندەم بۆ کرد و بۆ یەکەمجار چومە بازار و وتارم خوێندەوە. پێشتر من لە هیچ چالاکی وا جەماوەریدا بەشداریم نەکردبو، بەڵام یەکەمجار بو چوینە ناو بازاڕ و خەڵکمان کۆکردەوە و من چومە سەر کورسی و دەستم کرد بە خوتبەدان دەربارەی هەڵبژاردن و سودەکانی و چۆنێتی هەڵبژاردن، هەروەها باسی کاک

مەسعود محەمەدم ئەکرد کە مرۆڤێکی باشە و خوێندەوار و هوشیارە و پیاوێکی کورد پەروەرە و تێکۆشەرە، بیرم دێت، ئەو کاتە مەسعود محەمەد ئەندامی پارتی بو، بە راستی خۆی ئاگای لە هەڵبژاردنەکە نەبو، واتا پارتی هەڵیبژارد.
بەداخەوە، خۆی وەک چۆن بو، وای نەئەگێڕایەوە و وای نیشان ئەدا، ئەو خۆی خۆی هەڵبژاردوە و لەبەرئەوەی کوڕی مەلای گەورە و پیاوێکی ناسراو بوە لە کۆیە دەرچوە، بەڵام راستیەکەی ئەوە بو کە ئەو حاکمی تەحقیق بو لە سلێمانی، لیژنەی ناوچەی کۆیە منیان نارد بۆلای مامۆستا ئیبراهیم، ئەوکاتە سکرتێری پارتی بو، لەو بارەیەوە راوێژی پێ بکەم کە ئێمە لە هەڵبژاردندا چی بکەین؟.

*** ئەنجامی هەڵبژاردنەکە چۆن بو؟**

- یەکەمجار لە کۆیە کاکە زیاد ئاغا دەرچو، کاکە زیاد ئاغا، پیاوێکی باش و کورد پەروەر بو، ئەندامی پارتی بو، بەڵام وەک پێویست ئەو خوێندەواریەی نەبو، کە (ناتق و بەلیغ) بێت و بە عەرەبی لە پەرلەماندا قسە بکات. زۆرجار موعارەزەی ئەکرد، بەڵام قودرەتی قسەکردن و رادەربڕینی نەبو.
لەناو پارتیدا، دو بۆچون هەبون دەربارەی بەشداری لە هەڵبژاردندا، کە بچین و بەشداربین و بزانین چیمان پێ ئەکرێت، یاخود موقاتەعەی بکەین.
بۆ یەکەمجار، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بەرەچاوکردنی کتێبەکەی لینین (چەپڕەوی لە جوڵانەوەی کۆمۆنیستیدا، سەر لێشێوانێکی منالآنەیە) باسی ئەوەی ئەکرد، کە هەڵبژاردن ململانێیە و موقاتەعە هەڵەیە، لەوێدا ئیستیشهادی بە لینین ئەکرد، ئەبێ هەڵبژاردن بکەین بە ململانێ تەنانەت لە کۆنەپەرستترین پەرلەمانی دنیادا بەشداری بکەین و ململانێ بکەین، خۆ ئەگەر لە هەڵبژاردندا دەرچوین باشە و ئەگەر دەرنەچوین ململانێیکەمان کردوە و حکومەتمان ڕسوا کردوە، ئەگەر دەرچوین ئەوە نوێنەرەکەمان چۆتە پەرلەمانەوە و بیروباوەڕمان ئەگەیەنێ.
مامۆستا ئیبراهیم، گوتی: "مادام ئێمە لە کۆیە بە دڵنیاییەوە ئەتوانین یەکێک دەربچێنین با مەسعود محەمەد بەشداربێت"، هەرچەندە هەندێ سەرنجی لەسەر مەسعود محەمەد هەبو، بەڵام گوتی: "با نوێنەری ئێمە بێت و هەڵی ببژێرین، چونکە مەسعود محەمەد پیاوێکی هۆشیارە، خوێندەوارە، پارێزەرە، ئەگەر دەرچو بیروباوەری ئێمەی پاراست و مایەوە و بە قسە و ئامۆژگاریەکانی ئێمە رەفتاری کرد، ئەوە زۆر باشە، ئەگەر وانەبو و لایدا ئەوە هەڵوێستی لێ وەردەگرین".
چونکە، ئەو رۆژانە مەسعود محەمەد هەندێ بۆچونی هەبو، هەندێکیان زۆر

دوربینانە بون و هەندێکیان سازشکارانە بون، لە زۆر دوربینەکانی ئەوەبو کە موتەئەسیر بو بە بلیخانۆف و ئەو کتێبانەی ئێنجلسی خوێندبوەوە و لایەنگری تەحلیلاتی ئینجلس بو بۆ مێژو، رەخنەی هەبو لە هەندێ مەسەلەی ستالین.
سازشکاریەکەی، کەمێ نەرم بو بەرامبەر بە حکومەت، بەتایبەتی لە مەسەلەی چون بە گژ دەرەبەگایەتیدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەڵمان بژارد و بەرنامەی هەڵبژاردنەکەشی خۆمان بۆمان نوسی و پارەی بەشداربونیشی هەر پارتی پەیدایکرد، کە ١٠٠ دینار بو.
ئەو تەنها پێی وترابو کە هەڵت ئەبژێرین و ئیتر ئەو هەقی بەسەر هیچەوە نەبو، تا لە هەڵبژاردندا دەرچو، من یەکێک بوم لەو کەسانەی کە هەم لە شاری کۆیە و هەم لە دێهاتەکاندا پروپاگەندەم بۆ کرد.
لە یادمە کە یەکەمجار چومە چەند دێهاتێک کە دەمناسین و پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبو، لەوێ جوتیارەکانم هێنا و بردمن بۆ تەق تەق بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردندا و یەکەمجار بو پێڵاوەکەم دڕا، بە پێخاوسی و لەژێر لێزمەی باراندا پێشیان کەوتم و جوتیارەکان زۆر تەشجیع بون، من وەک قوتابیەکی کولێژ و گەنج و شلە شاری ئاوا چالاکم! ئیتر ئەوان چۆن بەشدار نابن؟ بە باران سەدان کەس لەگەڵمدا هاتن، هەتا چوینە تەقتەق و لەوێ دەنگماندا.
هەمو دەنگماندا بە کاک مەسعود، پێشتر لیژنەی سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردنەکەی کۆیە لە خۆمان دەرچو بون، کۆمەڵێک کەسانی باش بون، لە ئەنجامدا کاک مەسعود دەرچو، بەرامبەرەکەی مەلا حەویز ئاغا بو، ئاغایەکی کۆنەپەرست بو لە کۆیە، کە دەنگێکی ئەوتۆی نەهێنا.
کاک مەسعود، یەکەم نائیبی پارتی بو کە چوە پەرلەمانەوە، کاکە زیاد ئاغاش موخالەفەی نەکرد و پشتگیری کرد و ئەویش پشتیوانی لێکردین و بە خۆشییەوە وەریگرت و گوتی با ئەم جارە ئەو دەرچێ، بەو شێوەیە نوێنەرێکمان چوە پەرلەمانەوە.

*** بۆچی نوێنەری پارتی لە ناوچەکانی تری کوردستاندا هەڵنەبژێرا؟**

– لە شوێنەکانی تر خۆمان ئامادە نەکردبو، ئەگینا نوێنەرانمان ئەیانتوانی لە سلێمانی و لە هەولێریش دەرچن.
کە قوتابخانە کرایەوە، من لەگەڵ کاک مەسعود چوم بۆ بەغدا، ئەو نائیب و من خوێندکار، لە بیرمە لە کۆیەوە چوینە هەولێر و لە هەولێرەوە بۆ بەغدا.

## پەراویزەکان:

١- عومەر دەبابە، یان عومەر مستەفا، لەدایکبوی ١٩٢٣یە لە کۆیە، دەرچوی کولیژی یاسای زانکۆی بەغدا بوە لە ١٩٥١ و لە هەمان ساڵ لە کۆنگرەی دوهەمی پارتی دیموکراتی کوردستان وەك ئەندامی کومیتەی ناوەندی هەڵبژێرا. لە ناکۆکیەکانی ناو پارتی، دەبابە، سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بو. لە١٩٧٥ لەگەڵ ساڵح یوسفی و هاوڕێیانی تری، بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانیان دامەزراند.

ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بو هەتا ٢٩ کانونی دوهەمی ١٩٩٢ کە لەناو هۆڵی کۆنگرەی یەکەمی یەکێتی لە سلێمانی دڵی وەستا و کۆچی دوایی کرد.

٢- قازی محمەد و هاوڕێیانی لە ٣١ مارتی ١٩٤٧ لە مهاباد لە سێدارە دران و بەو کارەساتەش، کۆماری کوردستان لە مهاباد کۆتایی هات.

٣- کامیل جادرچی لە بەغدا لە ساڵی ١٨٩٧ لە دایك بوە و سەرۆکی یەکەم ریکخراوی رۆژنامەنوسانی عێراق بو، رۆژنامەی ئەهالی لە ساڵی ١٩٤٢ تا ١٩٦٢دەرکرد و وەك زمان حاڵی حیزبەکەشی بو بە ناوی پارتی نیشتیمانی دیموکراتی کە لە ١٩٤٦ دا دایمەزراندبو.

٤- ئیبراهیم ئەحمەد، ناوی ئیبراهیم ئەحمەد فتاح مستەفا رەشید غفور حسێنە، لە ٦ی ئازاری ١٩١٤ لە سلێمانی لە دایك بوە، تا پۆلی دوی ناوەندی لە سلێمانی خوێندوە و پۆلەکانی تری ناوەندی لە بەغدا تەواو کردوە و ساڵی ١٩٣٤ لە کۆلیژی یاسا وەرگیراوە و دوای چوار ساڵ لە ١٩٣٧ کولیژی تەواوکردوە و بوە بە پارێزەر، بە یەکێك لە دیارترین کەسایەتی دەژمێرێت کە پارتی دیموکراتی کوردستانیان دامەزراندوە و گەشەیان پێکردوە، هەروەها بە دامەزرێنەر کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد (ژ.ك) لە باشوری کوردستان دادەنرێت، پێش شۆرشی ١٤ تەموز چەند جارێك زیندانی دەکرێت. لە کۆنگرەی دوهەمی پارتی لە ئازاری ١٩٥١ دا، بە سکرتێری پارتی هەڵدەبژێرێت.. لە ١٩٦٤ تا ١٩٧١ وەك سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان، باڵی مەکتەبی سیاسی بەردەوام دەبێت.

ئیبراهیم ئەحمەد، وەك رۆشنبیرێك و شاعیر و چیرۆك نوسێکی دیار و بەتوانا دەرکەوتوە و چەندەها بەرهەمی دیاری هەیە، وەك (ژانی گەل) و نامیلکەی (کورد و عەرەب) و چەندەها شیعری دیاریش.. هەروەها لە بواری رۆژنامەوانیدا دەنگ و رەنگی دیاری خۆی هەبوە و سەرنوسەری چەندەها رۆژنامە و گۆڤار بوە، سەرنوسەری گۆڤاری گەلاوێژ بو لە ١٩٣٩ تا ١٩٤٩.

لە ٢٠٠٠/٤/٨ لە تەمەنی ٨٦ ساڵیدا لە لەندەن کۆچی دوایی کردو لە سلێمانی لە ٢١ نیسانی هەمان ساڵدا لە گردی سەلیم بەگ بەخاك سپێرا.

٥- عه‌زیز شه‌ریف له ساڵی ١٩٠٤ له شارۆچکه‌ی عانه له دایك بوه و به‌شی یاسای له زانکۆی به‌غدا له ١٩٣٢ ته‌واو کردوه و له نیسانی ١٩٤٦ حیزبی شه‌عبی دروست کرد، که حیزبێکی چه‌پی پیشکه‌وتوخواز بو، چه‌ندین پۆستی له حکومه‌ته جیاوازه‌کان وه‌رگرتوه، له‌وانه وه‌زیری کار له ١٩٦٩ دا و رۆڵی باشی هه‌بوه له ئاماده‌کردنی ریکه‌وتنامه‌ی ئازاری ١٩٧٠ و له کۆتایی حه‌فتاکاندا عێراقی به‌جێهێشت و چوه مۆسکۆ و له ١٩٩٠ کۆچی دوایی کرد و کتێبێکی به‌نرخی له‌سه‌ر کێشه‌ی کورد نوسیوه به ناوی کێشه‌ی کورد له عێراق.

٦- راپه‌رین یان وسبه‌ی ١٩٤٨، به رۆژێکی مێژویی دائه‌نرێت له مێژوی خه‌باتی سیاسی عێراقیدا، جه‌ماوه‌ری عێراق له ١٨ کانونی دوهه‌می ١٩٤٧، له ناوجه‌رگه‌ی به‌غدا و له‌ناو کوللیه‌کانی زانکۆی به‌غدا، به تایبه‌تی کۆلیژی پزیشکی و ئه‌ندازیاری دژ به حکومه‌تی ساڵح جه‌بر راپه‌رین و داوای روخاندنیان ده‌کرد، ئه‌ویش له ئه‌نجامی ئه‌وه‌ی، سه‌رۆکی حکومه‌ت رێکه‌وتنێکی له‌گه‌ڵ حکومه‌تی ئینگلیز مۆر کرد، که به رێکه‌وتنی پۆرتسمۆس ناو ده‌برێت، که له سودی عێراقدا نه‌بو. راپه‌رینه جه‌ماوه‌ریه‌که، گه‌شه‌ی کرد بۆ پێکدادان له نێوان جه‌ماوه‌ر و پۆلیسدا و له ئه‌نجامدا سه‌دان شه‌هید و بریندار هه‌بون، له نێویاندا، جه‌عفه‌ر جواهیری، برای شاعیری ناودار، جه‌واهیری، که قه‌سیده‌یه‌کی نایابی بۆ نوسی.

٧- جواهیری، که ناوی ته‌واوی محه‌مه‌د عه‌بدولحسێن مه‌هدی جه‌واهیری و له ١٨٩٩/٧/٢٦ له نه‌جه‌ف له دایك بوه له ١٩٩٧/١/١ کۆچی دوایی کردوه، جه‌واهیر به ناسراوترین شاعیری عێراق دەژمێرێت، له ١٩٢٤ یه‌که‌م دیوانی شیعری ده‌رکردوه و هه‌روه‌ها سه‌رنوسه‌ری کۆمه‌ڵێك رۆژنامه‌ی عێراقی بوه، له‌وانه: فورات، (الانقلاب)، چه‌نده‌ها پۆستی جۆراوجۆری بینیوه، به‌ڵام به‌هۆی هه‌ڵوێسته نیشتیمانپه‌روه‌ره‌کانیه‌وه، چه‌ندین جار زیندانی کراوه، چه‌ند جارێك عێراقی به‌جێ هێشتوه و زوربه‌ی کاتی ئاواره‌یی له دیمه‌شق و براگی پایته‌ختی چیك به‌سه‌ر بردوه، بۆ ئاخرجار له ١٩٨٠ عێراقی به‌جێهێشت و له دیمه‌شق جێگیر بو، که چه‌ند شیعرێکی بۆ شام و حافیز ئه‌سه‌دیش نوسیوه. جه‌واهیری به دۆستێکی نزیکی کورد و مام جه‌لال دائه‌نرێت، هه‌میشه کڵاوێکی له‌سه‌ردا بو، که لیی نوسرابو کوردستان، مام جه‌لال پێشکه‌شی کردوه.. هه‌روه‌ها جه‌واهیری شیعرێکی زۆر جوانی نوسیوه بۆ کوردستان به‌ناوی (قلبی لکردستان)، که له کۆنگره‌ی هه‌شته‌می کۆمه‌ڵه‌ی خوێندکارانی کورد له ئه‌وروپا له شاری میونخ له ٩/٨/ ١٩٦٣ خوێندیوه‌ته‌وه.

٨- شێخ له‌تیفی شێخ مه‌حمودی حه‌فید، کوری شێخ مه‌حمودی مه‌لیکی کوردستان بوه و له ١٩١٧ له دایك بوه، له ١٩٣٩ بوه به ئه‌ندامێکی چالاکی حیزبی هیوا و به‌وهۆیه‌وه، حکومه‌تی مه‌له‌کی له ١٩٤٢ دا ده‌یگرێت و زیندانی ده‌کات. له کۆنگره‌ی یه‌که‌می پارتی دیموکراتی کوردستان له ١٩٤٦/٨/١٦ شێخ له‌تیف وه‌ك یه‌کێك له جێگره‌کانی بارزانی هه‌ڵبژێرا.. به‌هۆی چالاکی سیاسیه‌وه له ١٩٥٦ تا شۆرشی چوارده‌ی تموزی ١٩٥٨ زیندانی کرا. دوایی وازی له کاری رۆژانه‌ی حیزبی هێنا تا له رۆژی ١٩٧٢/٥/١٥ کۆچی دوایی کرد.

٩- هه‌مزه عه‌بدوڵڵا. هه‌مزه کوری عه‌بدوڵڵای کوری عومه‌ری کوردۆیه، له ساڵی ١٩١٥ له گوندی راژانی ناوچه‌ی مه‌رگه‌وه‌ری کوردستانی رۆژهه‌ڵات له دایکبوه. له ١٩٣٤دا کۆلیژی یاسای

لە زانکۆی بەغدەدا تەواوکردوە، لە ١٩٤٣ دا بە هاوکاری کۆمۆنیستەکانی کۆیە، چۆتە مهاباد و لەوێ چەند سەرکردیەکی حیزبی دیموکراتی ناسیوە، لەوانە دڵشادی رەسوڵی و سەدیقی حەیدەری، لە ١٢ ئابی ١٩٤٦ دا لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و تەها محێدین مەعروف، چۆتە بەغدا و بە هاوکاری ئەو برادەرانە و کادێرانی حیزبی شۆرش و رزگاری و هیوا کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان دەبەسترێت و ئەویش بە سکرتێری حیزبەکە دەستنیشان دەکرێت. بەهۆی چالاکی سیاسیەوە، لە ١٩٣٨ دا رەگەزنامەی عێراقی لێسەندرایەوە و دوای شۆرشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨، لە کۆنگرەی دوەمی پارتی، داوای لێدەکرێت، کە واز لە سکرتێری حیزب بهێنێت. دوایی وازی لە کاری حیزبی هێناو لە ١٣/١١/١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد.

١٠- بەهادین نوری، لە ساڵی ١٩٢٠ لە ناوچەی قەرەداخی سەر بە سلێمانی لە دایك بوە،، لە ١٩٤٦ وە، چۆتە ریزەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە و لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا بوە بە سکرتێری ئەو حیزبە، لە ١٩٥٣ حوکمی ئیعدامی بۆ دەردەچێت و دوایی ئەگۆرێت بە زیندانی هەتا هەتایی و لە دوای شۆرشی تەموزی ١٩٥٨ ئازاد دەکرێت. نزیکی ٤٠ ساڵ لە سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی و بۆ ماوەی چوار ساڵ سکرتێری ئەو پارتە بو. لە دوای راپەرینی ١٩٩١ رێکخراوێکی بەناوی (بزوتنەوەی دیموکراتی) دروست کرد و ئێستا خانەنشینە.

١١- مەسعود محەمەد، لە بنەماڵەیەکی ئاینی لە ١٩١٩ لە شاری کۆیە، لەدایك بوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە کۆیە و هەولێر تەواوکردوە و لە ١٩٤٠ دا لە کولیژی یاسا لە بەغدا وەرگیراوە، چەند خولێک ئەندامی پەرلەمانی عێراق بوە، لە ١٩٥٣ و ١٩٥٤ وەك نوێنەری ناوچەی کۆیە، چەندەها پۆستی جیاوازی بینیوە لە حکومەتە جیاوازەکاندا لەوانە وەزیر بوە لە کابینەی تاهیر یەحیا لە ١٩٦٤.

بە یەکێك لە رەخنەگرە شارەزاکانی سیستەمی شیوعی ناودەبرێت. لە ١ نیسانی ٢٠٠٢ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد.

# دروستکردنی رێکخراوی قوتابیان و لاوان و ژنان

*** هەر لەو سەردەمەدا بو، بیرتان لە دروستکردنی رێکخراوی پیشەیی کردەوە؟**

- لەساڵی تازەدا، یەکەم کارمان دانانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان (ی.ق.ک) بو، ئەحمەد عەبدوڵڵامان هەڵبژارد بە سەرۆک و من بوم بە سکرتێر.

ئەحمەد عەبدوڵڵا، قوتابیەکی زۆر بەتوانا بو، لە دارموعەلیمینی عالی بو، خەڵکی ئامێدی بو، هەم قوتابیەکی زیرەک و هەم عەقڵی زۆر باش بو، عەرەبیشی باش ئەزانی، بەشی مامۆستایانی لە زانکۆ تەواو کردبو، لە سیاسەتیشەوە زۆر دور نەبو، دەستی نوسینیشی هەبو.

لەبیرمە، کۆبونەوەکەمان لە ماڵی عەبدولقادری کاکە زیاد ئاغای کۆیە لە ئەعزەمییە کرد، عەبدولقادر پیاوێکی باش بو، پێکەوە هاوپۆل بوین و لە حقوقیش پێکەوە بوین، ئەو کەسانەی لەو کۆبونەوەیەدا بەشداربون، بریتی بون لە: (ئەحمەد عەبدوڵڵا و حەیدەر حەمەدەمین) لە هەولێر، (حیلمی عەلی شەریف، غەفور رەشید دارئاغا و جەلال عەزیز) لە سلێمانی (فایەق عەبدولقادر) لە بەغدا، لەگەڵ چەند برادەرێکی تر کە هەمومان نزیکەی دە، دوانزە کەسێ ئەبوین.

*** ئەوە کۆنگرەی دروستکردنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بو؟**

- بەڵێ، لەوێدا یەکێتی قوتابیان بەرنامەکەی دانرا و لە پاشاندا نامیلکەیەک دەرچو بەناوی: بۆچی (ی.ق.ک) پێویستە؟ کە من نوسیبوم.

ئەوە یەکەم باسە کە لە سەرەتای ژیانی سیاسی خۆمدا نوسیبێتم و بەو شێوەیە بڵاو کرابێتەوە، لەدوایی ئێمە بوین بە هەوێن بۆ دانانی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانیش، ئەو کەسانەی، لە لیژنەی دامەزرێنەردا بون، بریتی بون لە: بەکر ئیسماعیل، کە پارێزەر بو، هەژاری موکریانی و من. ئەو سێ کەسە دانراین لە پاشان حەیدەر محەمەد ئەمین و برادەرێکی فەیلی بە ناوی محەمەد موسا سادق کە قوتابی بو لە کولێژ لەگەڵماندا دانران.

بەوجۆرە، هەم یەکێتی قوتابیان و هەم یەکێتی لاوانمان دروستکرد، ئەوەی راستی بێت یەکێتی لاوان نەیتوانی ببێتە رێکخراوێکی گەورە و راستەقینە، بەڵام یەکێتی قوتابیان جێی خۆی کردەوە و بو بە رێکخراوێکی چوست و چالاک.

لە سەرەتاوە، کۆمۆنیستەکان زۆر کێشەیان بۆ دروستکردین، بەو بیانوەی، ئەوە هەنگاوێکە بۆ جیابونەوە، هەر لەو ساڵەدا، ئێمە لەگەڵ قوتابیە شیوعییەکاندا کەوتینە ناکۆکی، لەسەر مەسەلەی فکری، ئایا بونی یەکێتی قوتابیان پێویستە یان پێویست نیە؟.

ئەو سەردەمە، چالاکترین قوتابی شیوعی، لەو مونازەراتانەدا بەشدار بون و کۆبونەوەمان لەگەڵیاندا ئەکرد بریتی بون لە: (عێزەدینی مەلا مستەفا) و (فازیل فەرەج)ێک هەبو، قوتابی بەشی پزیشکی بو، (جەمال نەبەز)، کە ئێستا لە بەرلین ئەژی.

هەندێ لەمانە دەم ڕاستی شیوعیەکان بون، لە بەربەرەکانیکردنی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا، بەڵام فکرەکە رۆیشت و یەکێتی قوتابیان جێگای خۆی کردەوە.

*** ئەی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان چۆن و کەی دامەزرا؟**

- باس لە دامەزراندنی یەکێتی ئافرەتانی کوردستانیش کرابو، لە سلێمانی توانرا کۆمەڵەیەکی بۆ دروست بکرێت، ئەو کەسانە، ناسرابون تێیدا بریتی بون لە: ست ئەنجومی عەبدوڵڵا زوهدی و ست بەهیە مەعروف و ناهیدەی شێخ سەلام و درەخشانی شێخ جەلالی حەفید، لە بەغدا روناکی خوشکی ست ئەنجوم و خوشکێکی محەمەد مەمەندی دانساز و لە کۆیەش سورەیا خانی خوشکی کاک مەسعود محەمەد و هەندێ ژنی تریش لە بەغدا هەبون، وەک ست زەکیە ئیسماعیل حەقی کە هێشتا قوتابی بو، زیاتر وەکو لایەنگر لەوێ لەناو فەیلیەکاندا چالاکی ئەنواند، زەکیەش لە ١٩٥٣ من کردم بە پارتی، ئەمانە هەوێنی دروستکردنی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بون.

*** ئەی باشە، بۆچی رێکخراوی پیشەیی، وەک یەکێتی جوتیاران و کرێکاران نەیانتوانی لە کوردستاندا، وەک پێویست جێگای خۆیان بکەنەوە؟**

- ئێمە هەوڵماندا، یەکێتی جوتیاران گەشە بکات، هەتا بۆ یەکەمجار گۆڤارێکمان بە نهێنی بەناوی (نرکەی جوتیار)ەوە دەرکرد، کە گرنگیدا بە مەسەلەی ئیسلاحی زراعی.

(م.س) بڕیاریدا، پارێزەرە پارتییەکان بەرگری لە کێشەی جوتیاران بکەن، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، خۆشی بریارەکەی جێبەجێ ئەکرد، بە تایبەتی لە جوڵانەوەی جوتیارانی دەشتی دزەیی و ناوچەی شاربازێر و شارەزور، پارتی پشتیوانی چاکی ئەکردن.

بزوتنەوەی کرێکارانیش لە کوردستاندا بەهێز نەبو، چونکە تەنها کرێکاری نەوت ژمارەیان زۆر بو، ئەویش بەشێکی زۆریان کورد نەبون، بەڵکو بریتی بون لە کورد، تورکمان، عەرەب هەروەها ئاشوری و ئەرمەنیشیان تێدا بون.

هەرچەندە ئێمەش هەوڵماندا لە هەمو شارێکدا، دەزگایەک وەک نەقابە دروست بکەین بۆ کرێکاری بینا و خشت و شارەوانی، بەڵام ئەوانە نەیانتوانی ببنە نەقابەیەکی زیندوی گەشەداری گیاندار.

# حیزبی شیوعی و مافی چارەنوس

*** باسی ململانێی شیوعیەکانمان کرد، لەو کاتەشدا میساقی باسم هاتە کایەوە، ئەوە ساڵی چەند بو؟ گرنگی ئەو میساقە چی بو؟**

– میساقی باسم لە ١٩٥٣ دا دەرچو، ئەو میساقە بەناوی بەهادین نوری یەوە ناسرابو، واتا گۆڕین بو لە بەرنامەی حیزبی شیوعیدا، چونکە حیزبی شیوعی میساقی نیشتمانی خۆی لە ساڵی١٩٤٤ دەرکردبو، تا ئەوکاتە هیچ گۆڕینێکی تێدانەکردبو، لەو میساقەدا، کورد بە کەمایەتی نەتەوەیی ناسرابو، بەڵام لە میساقی باسمدا باس لەوە ئەکات، کورد (ئوممە) یە و مافی چارەنوسی تا مافی جیابونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەیە.

لە ئەنجامی دەرچونی ئەو میساقە و هەندێ گیروگرفتی تردا، ناکۆکیەکان لەناو حیزبی شیوعیدا تەقینەوە و کۆمەڵی (راية الشغيلة) جیابونەوە، ئەو کۆمەڵەیە بە سەرۆکایەتی عەزیز محەمەد و جەمال حەیدەری و ساڵح حەیدەری و عەبدولڕەزاق سافی و حەمزە سەلمان و محەمەد حسێن، ئەبولعیس و کۆمەڵێک لە کادێرە کۆنەکانی حیزبی شیوعی عێراقی بون.

حیزبی شیوعی عێراقی ڕۆژنامەکەیان ناونا (راية الشغيلة)، جیابونەوەکەی خۆشیان ناونا (انتشالي) واتا دەربازکردنی حیزب، وتیان لەمەودوا سیاسەتێکی چەپڕەوانە لە حیزب پەیرەوی ئەکرێت، لە ڕاستیدا، سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانە بو، داوای ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی و داوای دیموکراتی میللی و مافی چارەنوس بۆ گەلی کوردیان ئەکرد و گرنگی درا بە کرێکار و جوتیاران.

ئەو بۆچونانە ڕەنگە هەندێک ڕتوش و مەزاهیری چەپڕەوی پێوە دیار بێت، بەڵام لە ناوەڕۆکدا سیاسەتێکی ڕاست بو، شیوعییەکانی قاعیدە لەم باڵە کەوتنە تەقە و پێیان ئەگوتن (راية البلاط).

*** جیاوازی لە نێوان میساقی (فهد) و میساقی (باسم)دا چی بو؟**

– کۆمەڵی (راية الشغيلة) هەر لە ژێر کاریگەریی بۆچونە کۆنەکانی فەهددا مابونەوە. هەرچەندە (میساقی فەهد) لە ڕاستیدا بەرنامەیەکی هەڵبژاردن بو زیاترلەوەی کە میساقی حیزبێکی شیوعی بێت.

میساقی فەهد ئەگونجا، بکرێت بە بەرنامەیەک بۆ هەڵبژاردن و بۆ چونە ناو پەرلەمانەوە، چونکە زیاتر داخوازی ئیسلاحی زۆر بچوک بون، بەڵام بەرنامەکەی بەهادین نوری، زۆر گرنگ بو، بۆ چارەسەرکردنی بنەڕەتیانەی زوربەی کێشەکان.

*** ئەگەر بێینەوە سەر پارتی، کەی و چۆن گۆڕانکاریی شەخسی و ڕێکخراوەیی لەناو پارتیدا ڕویدا؟**

– ئەو گۆڕانانە لە ٢٦ی کانونی دوەمی ١٩٥٣ لە کۆنفرانسێکی دو ڕۆژیدا ڕویدا و لە هەمان کۆنفرانسدا بڕیار درا کە (ڕێکخراوە دیموکراتیەکان) دروست بکرێت، وەک یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی قوتابیانی کوردستان، هەروەها گرنگی بدرێت بە دروستکردنی کۆمەڵەی جوتیاران و یەکێتی ئافرەتان.

بڕیارێش درا، بە چالاکی بەشداری بکرێت لە جوڵانەوەی ئاشتیخوازی عێراقی و جیهانی و ئەو فێستیڤاڵ و کۆبونەوانەی کە لە دەرەوەی وڵات ئەگیرێن.

ئەنجامی ئەم کۆنفرانسە ئەوەبو کە بڕیاردرا، واز لە سیاسەتی موقاتەعە کردن بهێنرێت و پارتی بۆچونی خۆی دەربارەی هەڵبژاردن و هەمو مەسەلەکانی تر بە ئاشکرا ڕونبکاتەوە و حکومەتی ئیستیعماری لە عێراق ڕسوا بکات.

# پەیوەندی پارتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

*** کەی پارتی پەیوەندی لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا دروستکرد؟**

- ساڵی ١٩٥٣ ساڵی پەیوەندیەکی بەتین بو، لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا. بۆ یەکەمجار هەندێک لە برادەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هاتبون بۆ لای ئێمە، لەوانە غەنی بلوریان[1].

لە پایزی ١٩٥٣ دا، غەنی بلوریان هات بۆ بەغدا، بەناوی حیزبی (تودە) وە[2]، بۆ ئەوەی بزانێ باری بزوتنەوەی ئێمە لە چیدایە، من خۆم لەگەڵیا چوم بۆ تەرجومە بۆ لای عەزیز شەریف و سەلیم چەلەبی، ئەو کاتە لێپرسراوی حیزبی شیوعی عێراقی بون لە (جەماعەتی قاعدە)، هەروەها چوە لای جەمال حەیدەری و زانیاری کۆکردەوە و بردیەوە بۆ حیزبی تودە.

هەروەها پەیوەندیشی لەگەڵ ئێمەدا دروستکرد، بەڵام ئەوە بو لە هاوینی ئەو ساڵەدا حکومەتی موسەدق لە ئێران روخا.

*** ئایا ڕوداوەکانی وڵاتانی دنیا، بە تایبەتی وڵاتانی سۆسیالیست کاری نەکردە سەر ئێوە؟**

- بێگومان، بۆ نمونە کاتێ کە ستالین مرد، ئێمە بۆ یەکەمجار بەشداریمان کرد لەو مەراسیمەدا، من نامەیەکم بەناوی (م.س) پارتیەوە نوسی و بردم بۆ سەفارەتی سۆڤێتی، ئەو ڕۆژەی کە چوم بۆ سەفارەت ترسی گرتن هەبو، بەڵام من لە بیرمە، نامەکەم برد و تەسلیمم کرد و لە دەفتەری تەشەریفاتیش ناوی خۆم نوسی، بەڵام نەم نوسی کە من چیم.

یادی ماتەمینی مردنی ستالین دانرا و لەو ڕۆژەدا، سەعات دوانزە بو، دەقیقەیەک وەستاین، روداوێکی خۆشت لەسەرئەوە بۆ بگێڕمەوە: ئەو کاتە کاک نوری ئەحمەدی تەها یەکێک بو لە ئەندامە چالاک و ناودارەکانی پارتی

و ناسرابو بە ئازایەتی لە دادگادا، چونکە بەرگریەکی قارەمانانەی کردبو لە زینداندا.

پێویست بو لە یادی ماتەمینیەکەدا، هەریەکە، لە هەرکوێیەک بێت رابوەستێت، لە دەقیقەی ماتەمینیەکەدا، ئەو وەستابو، مودیری سجن بەوێدا دێت و بانگی ئەکات و ئەڵێ، مەرحەبا کاکە نوری، وەڵامی ناداتەوە، دوای ئەوە لێی نزیک ببوەوە هەمدیسان ئەڵێ، مەرحەبا کاکە نوری، ئەو هەر وەڵامی ناداتەوە، ئەویش ئەڵێ ئەرێ کاکە نوری ئەوە چیە؟ واقی وڕدەمێنێت و سەری سوڕ ئەمێنێت، هەتا دەقیقەکە تەواو دەبێت، ئینجا کاک نوری ئەڵێت: مردوت مرێ تۆ نازانی ئەوە چیە؟ ئێستا هەمو عالەم دەقیقەیەک وەستاوە، کاتی ماتەمینی ستالینە، ئەویش ئەڵێ ئێ ستالین کێیە؟.

لەو ساڵەدا ئاگری نەورۆزمان کردەوە، شیوعییەکان هاتن بەناوی بەشداریکردن کە لێمان تێک بدەن، وەفدێکیان هاتنە سەرمان، بریتی بون لە عێزەدینی مەلا مستەفا و فازیل فەرەج هاتبون بۆ لامان ئەیانگوت، پێویستە حیزبی شیوعی بەشدار بێت و وتار بخوێنێتەوە. ئێمەش گوتمان، ئێمە خۆمان ئیجازەی نەورۆزمان وەرگرتوە و لێپرسراوین بەرامبەر هەمو کارەکان، بۆیە خۆمان ئاگرەکە ئەکەینەوە و پارەتیمان کۆکردۆتەوە لە کوردەکان و کەسایەتیە کوردەکان.

## ڕێگەدان بە یادکردنەوەی یادە نەتەوەییەکان

*** کێ ڕێگەی پێدان یادی نەورۆز بە ئاشکرا بکەنەوە؟**

- ئەو کاتە، دکتۆر فازل جەمالی سەرۆک وەزیرانی عێراق بو، چیرۆکێکت بۆ ئەگێرمەوە لەگەڵ نوکتەیەکی خۆشدا: چوینە سەر نایبێکی کورد داوای پارەمان لێکرد، ئەو نائیبە ناوی کاک (هۆمەری خدری حاجی ئاغا) بو، نائیبی پشدەر و برازای مەحمودی حاجی ئاغا بو، من ئەمناسی، وەختێک کە پارەکەمان کۆ ئەکردەوە، لیژنەیەک بوین، پێک هاتبون لە: موحسین دزەیی، جەمال شاڵی و رەئوف مەعروف کە گەنجێکی هەولێری و لاوێکی چاک و تێکۆشەر بو، موحسین

دزەیی کە شیوعی بو، ئەوکاتە هاتبۆوە لای پارتی، ئێمە سودمان لێ وەرگرتبو.

چوین بۆ لای کاک هۆمەر و گوتمان: "ئەوە نەورۆز ئەکەین، خەڵکمان دەعوەت کردوە، بەشکو تۆش یارمەتیمان بدەی". ئەو سەری سوڕمابو گوتی: "وەڵا ئەوە یەکەمجارە، خەڵک بە سواڵکردن بیەوێت دەعوەت ساز بکات، ئاخر کاکە کە پارەت نیە بۆ خەڵک بانگ ئەکەیت؟ بانگی مەکە"، هەرچیەک ئەمانویست تێیبگەیەنین، ئەو نەدەچو بە عەقڵیدا، بەڵام هەر ٥ دینارمان لێسەند.

پاشان، فازل جەمالی داخوازیەکەی ئێمەی بەرەو روی وەزیری ناوخۆ کردەوە کە سەعید قەزاز[٢] بو، تازە ببو بە وەزیر، هەرچەندە ئێمە مۆڵەتەکەمان لە موتەسەریفیەت وەرگرتبو، بەڵام وەزیری ناوخۆ لەغوی کرد، ئێمەش وەفدێکمان لە قوتابیانی کۆلیژەکان دروستکرد و چوینە لای فازل جەمالی بۆئەوەی ئیعتیراز بگرین لەسەرئەوەی داخوازیەکەمانیان رەتکردۆتەوە.

کە چوینە لای، خوا هەقە لە مەکتەبەکەی خۆی داینابن، وا دیاربو چاوەڕێی سەعید قەزازی ئەکرد، بەوی گوتبو، ئەویش ئامادەبێت، سەعید قەزاز هات و ئێمەی بینیی، سڵاوی کرد و گوتی ئەوە چ دەکەن لێرە؟ روی لە من کرد، چونکە من پێشتر ئەمناسی، گوتم: "وەڵڵا هاتوین شکات لە تۆ بکەین!" گوتی بۆچی؟ گوتم چونکە نەورۆزەکەت لەغوکردوە، گوتی ئەوە وانیە، ئەوە عیلاقەی بە شتی ترەوە هەیە، گوتمان نەخێر ئەوە وایە.

ئەو چوە ژورێ و دوایی رێگەی ئێمەشیاندا و چوین و مەسەلەکەمان بۆ سەرۆک وەزیران باس کرد و گوتمان ئەو قەدەغەکردنە شتێکی هەڵەیە! یادی نەورۆز مافی میللی خۆمانە و هۆی چییە، رێگامان لێ ئەگرن؟.

سەرۆک وەزیران گوتی: خۆتان ئەزانن من شیعەم و گیروگرفتم لەگەڵ نەورۆزدا نیە، ئەوە وەزیری خۆتان و لەگەڵیدا رێک بکەون. سەعید قەزازیش روی کردە سەرۆک وەزیران و دەستی بۆ من درێژکرد و گوتی: من ئەمە باش ئەناسم، بەڵام زۆر بە روخۆشی و بە پێکەنینەوە گوتی: "ئەمە مەبەستی ئەوەیە، یادی نەورۆز بکاتەوە و وتار بخوێنێتەوە و بڵێت بروخێ موعاهەدەی تورکی و پاکستانی".

ئەو کاتە رێککەوتنی سەربازی تورکی پاکستان مۆر کرابو، گوتی لەبەرئەوە من موافەقەت ناکەم، هەرچەندە هەوڵماندا قانع نەبو، بەڵام لەگەڵمان هاتە دەرێ، زۆر بە روخۆشی گوتی ئەوە رێگام نەدان نەورۆزەکە بکەن، بەڵام لەجیاتی ئەوە وەرن کارێکی دیکەتان بۆ ئەکەم و وەرن گۆڤارێکتان ئەدەمێ، ئەوە گۆڤاری گەلاوێژ نەماوە، وەرن ئێوە گۆڤارێک دەربکەن، بەڵام روی کردبوە من "تۆ هەموی

مەکە بە سیاسەت و دژی ئیستیعمار و حیلفی تورکی و پاکستانی و ئەو جۆرە نوسینانە، زیاتر لەسەر رۆشنبیریی بنوسن"، منیش گوتم باشە بەسەرچاو، گوتی "با یەکێک داواکە پێشکەش بکات، بەڵام ئەو کەسە خۆت نەبیت و یەکێک بێت، کە مەشبو نەبێت".

ئیمەش خێرا رێکەوتین، جەمال شاڵی دەستنیشان بکەین، چونکە هیچی لەسەر نەبو سلوکی باش بو. بەناوی ئەوەوە نەخشەی دەرکردنی گۆڤاری (تریفە)مان دانا، زۆر گەڕاین بۆئەوەی بەرێوەبەرێک بدۆزینەوە، دوای گەرانێکی زۆر، پارێزەرێکمان دۆزیەوە کە کورد بو ناوی فایەق عەقراوی، ئەو ئامادەبو ببێت بە بەرێوەبەر.

ئیمەش داخوازیەکەمان پێشکەشکرد، بەڵام سەعید قەزاز ئیجازەکەی نەداینێ و پەیمانەکەی خۆی بەجێ نەگەیاند و گۆڤاری تریفە دەرنەکرا.

## لە کۆیەوە بۆ هەولێر و جۆشدانی کاری حیزبی

*** کەی کۆیەتان بەجێ هێشت و چون بۆ کوێ؟**

- لە هاوینی ١٩٤٩ —١٩٥٠ مامۆستا هەمزە بەربوبو، ناکۆکی لەناو پارتیدا زۆر توند بوبو، لەهەمو لایەکەوە داوا ئەکرا، کۆنگرەیەک بۆ پارتی ببەسترێت، من لە هاوینی ١٩٥٠ دا پۆلی سێی ناوەندیم تەواو کردبو و چومە هەولێر بۆ خوێندنی ئامادەیی، لە ڕاستیدا من بۆ کاری سیاسی چومە هەولێر، چونکە لقی کۆیەی پارتی تابعی لقی هەولێر بو، لقی هەولێریش، ڕوخاو و نەمابو، من چوم بۆئەوەی هاوکارییان بکەم، بۆ بوژانەوە و زیندوکردنەوەی لیژنەی ناوچەی پارتی لە هەولێر.

لە لقی هەولێر، تەنها لیژنەی ناوچەی کۆیە و باڵەکایەتی مابۆوە، و ئیتر هیچ رێکخستنێکی تر نەمابو، لە هەولێر پیاوێکی کورد پەروەری ناوداری لێ بو، بەناوی میرزا فەندی عەبدولکەریم، باشکاتب بو لە مەحکەمە. ئەو چەند ئەندامێکی لە دەوری خۆی هێشتبۆوەوە، هەروەها نوری شاوەیس و میرزا فەندیش لەوێ بون، ئەو سێیە یەکترمان گرتەوە و لیژنەی ناوچەمان دانا و دەستمان کرد بە کارکردن.

هەریەکە لە ئاستی خۆیدا دەستی کرد بە کار و کۆکردنەوەی ئەندامان، میرزا

فەندی چەند برادەرێکی کۆنە ئەندامی کۆکردەوە و منیش چەند قوتابیەکم دۆزیەوە و هەندێکی تازەشم پەیدا کرد، هەروەها کەوتمە ناو کرێکاران و جوتیارانەوە.

لەو کەسانەی لە رێکخراوی جوتیاراندا بون، بریتی بون لە (حەسەن مستەفا، ساڵح شێرە، مەلا عەبدوڵڵا) کە دوایی بە مەلا ماتۆڕ ناوی دەرکرد، ئێمە ئەم برادەرانە، وەکو ئەندامانی چالاک لەناو جوتیاراندا کەوتینەوە ئیشەوە، من چوم بۆ لیژنەی ناوچەی باڵەکایەتی بۆ جۆشدانی ئەوان.

لە هەولێر، عەونی یوسفی بەربوبو و هاتبۆوە، ئەویش چوار پێنج ئاغای نیشتمانپەروەری کۆکردبۆوە، وەک: (ئەحمەدی حەمەد ئەمینی دزەیی، ئیبراهیمی دزەیی، سابیر ئاغا و موشیر دزەیی)، هەمو پیاوی زۆر باش بون، ئیتر هەمو بەیەکەوە دەستمانکرد بە ئیشکردن، لەبەرئەوە لقی هەولێر ژیایەوە و هەروەها لە هەولێریشەوە لقی بادینانمان بوژانەوە.

لە ناوچەی بادینان، زۆر هەوڵماندا، توانیمان لە ئاکرێ شانەیەک دروست بکەین، بەڵام لە شوێنەکانی تر سەرکەوتو نەبوین، بۆ نمونە کە چوین بۆ لای سەیدا ساڵح یوسفی، گوتی: من حیزبایەتی ناکەم و نەیدەوێرا و کەمێ سڵی کردەوە، وتی پارتایەتی لە بادینان سودی نیە.

دوایی توانیمان لە ئامێدی و دهۆک و ئاکرێ وردە وردە رێکخستن دروست بکەین و گەشە بکەین و بکەوینە چالاکی.

*** کۆنگرەی دوهەمی پارتی بۆچی گیرا؟**

- کۆنگرەی دوهەمی پارتی لە مانگی مارتی ١٩٥١ دا لە ماڵی عەلی حەمدی لە بەغدا گیرا، لەو کونگرەیەدا، ساڵح ڕوشدی و موستەفا کەریم خۆیان لە کۆنگرەکەدا کشانەوە و گوتیان یان هەمزە دەرئەکرێت، یان ئێمە خۆمان ئەکشێنینەوە، دوای کشانەوەیان رزگاری نوێیان دەرکرد و چەند کەسێکی کەمیان لەگەڵدا رۆیشت.

هەرچەندە ئێمە چارەسەرێکمان دۆزیەوە، ئەویش ئەوە بو، لیژنەیەکی نوێ هەڵبژێرێت و هیچ یەکێک لە برادەرە کۆنەکانی تێدا نەبێت، ئەو لیژنە نوێیە پرۆگرام و پەیرەوێکی نوێ ئامادەبکات و سیاسەتی پارتی نوێ بکاتەوە و ناوەکەشی بگۆڕێت و بیکات بە پارتێکی جەماوەری شۆڕشگێڕیی پێشەکەوتوخواز، کە سود لە مارکسی لینینی وەرگرێت.

ئەو بۆچونانەمان لە کۆنگرەکەدا دارشت و پێنج کەسمان هەڵبژارد بۆ بەڕێوەبردنی کاتی پارتی، بریتی بون لە: مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، جەلیل

هۆشیار کە تازە لە بەندیخانە بەربوبو، محەمەد ئەمین مەعروف، خەڵکی کۆیە بو، وەکو مامۆستای ئێمە وابو، نوری شاوەیس و بەکر ئیسماعیل.

*** هۆی چی بو، کە تۆ لەو تەمەنە گەنجێتیدا هەڵبژێرایت بۆ سەرکرادایەتی؟**

- من هەڵبژێردرام، بەڵام لەبەرئەوەی تەمەنم بچوک بو لە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بوم، خۆم نەمکرد و تەنازولم کرد بۆ جەلیل هۆشیار.

بێگومان بە دانانی ئەو سەرکردایەتیە، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی پارتی دەستی پێکرد، بە بیروباوەڕێکی نوێ، بەرنامەیەکی نوێ و خەڵکێکی نوێوە، ناوەرۆکی ئەو نوێخوازیە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بو، سکرتێر و ئەندامانی سەرکردایەتی کۆن، وەک هەمزە عەبدوڵڵا و عەلی عەبدوڵڵا و کەریم تۆفیق، هەڵنەبژێرانەوە بۆ سەرکردایەتی، گوتمان با ئەم جارە ئەوانەی تێدانەبن، هەتا پارتی ئەکەین بە پارتیەکی نوێ و سەرلەنوێ دایدەڕێژینەوە.

# کاریگەریی یەکێتی سۆڤێت و بەرەی سۆسیالیست لەسەر پارتی

*** لەو هەلو مەرجەدا، کاریگەریی یەکێتی سۆڤێت، بە تایبەتی و بەرەی سۆسیالیست بە گشتی چی بو لەسەر پارتی؟**

- بە داخەوە، لە سەرەتاوە ئەوانەی کە سۆڤیەت بە لێپرسراوی مەلەفی کوردی دای نابون، ئازەربایجانی بون، بە بیری شۆڤینی دەیان روانیە مەسەلەی میللی کورد و هەندێکیان بۆچونی هەڵەیان هەبو دەربارەی کێشەی کورد، دەوریان هەبو لە تێکدانی مێشکی هەمزە عەبدوڵڵا، لەوانە پرۆفیسۆرێکی روسی بو بەناوی (ڤیلچێفسکی) کە دایاننابو بە شارەزای مەسەلەی کورد و کتێبێکی هەیە لەسەر کورد، بەڵام بۆچونی زۆر هەڵەی هەبو، یەک لەو بۆچونانەی ئەوە بو، ئەیگوت "کۆمەڵگای کوردی، کۆمەڵگایەکی عەشایەرییە، لەبەرئەوەی هێزی سەرەکی دەرەبەگە، بۆیە ئەبێت هەوڵدەین عەشایەر راکێشین و بەهۆی عەشایەرەوە،

گۆڕین لە کۆمەڵگای کوردستانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانیدا بکەین".

ئازەرەکانیش ڕای شۆڤینیان هەبو، زۆر باکی بزوتنەوەی کوردایەتیان نەبو، (جەعفەر بافرۆف) یەکێک بو لەو کەسانەی، کە نوێنەری ئەو بۆچونە شۆفینییە بو، هەمو هەوڵێکیان ئەدا بۆ تێکدانی (ژ.ک).

بە بۆچونی من، یەکەم هەڵەی سۆڤیەتی دەربارەی بزوتنەوەی کوردی لەوێوە دەست پێ ئەکات، هاتن (ژ.ک) یان تێکدا و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان دروستکرد. دانانی حیزبی دیموکراتی کوردستان زۆر باش بو، بەڵام ئەبوایە (ژ.ک) بکرایە بە حیزبی دیموکرات، واتا بەشێوەیەکی ئاسایی (ژ.ک) خۆی ناوی خۆی بگۆڕیایە و بەرنامەی دانایە و هەڵبژاردنی خۆی بکردایە و سەرکردایەتییەکی بۆ خۆی هەڵبژێردایە، بەڵام ئەوان وایان نەکرد، هاتن قازی محەمەدیان هێنا و گوتیان تۆ برۆ حیزبی دیموکراتی کوردستان دانێ و بەرنامەی بۆ دانێ.

ڕاستە قازی محەمەد لەگەڵ (ژ.ک) بو، بەڵام هەر بەناو (ژ.ک) بو، نە جەماوەری ئەوان و نە سەرکردایەتیە شۆڕشگێڕەکەیان هاتن بۆ ناو حیزبەکە.

قازی محەمەد، بە هاوکاری و یارمەتی سۆڤیەت، باڵی عەشایەری گەڕاندەوە بۆ ناو بزوتنەوەی کوردی لە ئێران، لە کاتی (ژ.ک) دا بێ هێز و لاواز مابونەوە[٤].

لە کوردستانی عێراقدا هەمزە عەبدوڵڵا کە بە فکر شیوعی بو، زۆر لە ژێر کاریگەریی سۆڤێتدا بو، وای بیردەکردەوە، هەرچی سۆڤیەت ئەیڵێت پیرۆزە، هەتا بەرنامەی پارتی، خۆمان دامانناو، پێی باش بو کە پێویستە سۆڤێتەکان بیبینن، ئەوەبو مستەفا خۆشناو و میرحاجی نارد بۆ تەورێز کە بەرنامەکە بەرن و نیشانی روسەکانی بدەن، ئەوانیش بەهەوەسی خۆیان دەستکاریان کردبو.

هەر لەبەرئەوە هەرکاتێ ئێمە کە بمانویستایە بیگۆڕین، هەمزە دەهاتەوە بە گژماندا و ئەیگوت، ئەو بەرنامەیە دەستی لێ نادرێت و تورە ئەبو.

لەو کاتەدا ئەمانزانی، بەرنامەکە هەندێ مەسەلەی تێدایە، پێویستی بە دەستکاری هەیە، باسی ئیسلاحی زراعی تێدا نەبو، ئەمانگوت مەرج نیە، سۆڤیەت وەزعی ئێمە باش بزانێت. هەمزە زوربەی کات بە سۆڤێتی ئەگوت (بابی کوردان)، بابی کوردان گوتویەتی! بابی کوردان ڕازی نەبوە! بابی کوردان ئەبێت ڕازی بێت! و بەم شێوەیە!.

ئێمە ئەو عەقڵیەتەمان شکاند و گوتمان ئێمە یەکێتی سۆڤیەتمان زۆر خۆش ئەوێت، بەڵام مەرج نیە ئەوەی لەوێ ڕاست و باش و گونجاوبێت، بە هەمان شێوە بۆ ئێرەش گونجاو بێت، ئەوەی وا بیر بکاتەوە هەڵەیە، ئەوە بۆچونێکی

راسترەوانەیە، رەنگە هەمزە راست نەڵێت و بەناوی سۆڤیەتەوە ئەو قسانە بکات.

هەرچەندە دوایی، من لە ١٩٥٥ دا چومە مۆسکۆ، بۆم دەرکەوت، ئەو قسانە هی خۆی نەبو، بەڵام ئێمە گوتمان ئەوە بۆچونی راسترەوی هەمزە خۆیەتی و ئەیەوێت بەناوی سۆڤیەتەوە بیسەپێنێت بەسەرماندا.

خراپییەکی تری ئێمە، کلکایەتیەکەمان بو بۆ سۆڤیەت، وامان ئەزانی هەر شتێک لەوێوە بێت وەک قورئان وایە، بەڵام دوای ماوەیەک ئەو بۆچونەمان راست کردەوە، زیاتر خۆمان بیرمان ئەکردەوە. لەو سەردەمەدا، من لە باڵە چەپەکە بوم، لایەنگیرانی باڵە چەپەکە لە ناو جەماهیردا بە چاکترین و هوشیارترین کەس ئەژمێران، لەوانەش وەک: حیلمی عەلی شەریف کە لە ئێمە خوێندەوار تر بو، زیندانی دیبو، لە کۆیە حەمەدەمین مەعروف هەبو، وەکو مامۆستای ئێمە وابو، هەروەها مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دوای ئەوەی لە بەندیخانە ئازاد کرا و لە هەموان باشتر لە مەسەلەکە تێ گەیشتبو.

مامۆستا ئیبراهیم بو بە رێکخستندەر و رێبەری ئەو ئیتیجاهە چەپەی ناو پارتی، دەیویست پارتی وا لێبکات، کە مارکسی لینینی تەبەنی بکات و دیموکراتی شەعبی قبوڵبکرێت و بکرێت بە دروشم. هەروەها چارەسەری مەسەلەی کشتوکاڵ بکرێت و دۆستایەتی لەگەڵ سۆڤیەت پتەوبکرێت.

ئێمە دژی بێلایەنی وەستاین، چونکە ئەو کاتە حکومەتی عێراق داوای بێلایەنی ئەکرد، مامۆستا ئیبراهیم ئەیگوت: "ئێمە بێلایەن نین، دو بەرە هەیە، بەرەی سۆشیالیزم بە سەرۆکایەتی سوڤیەت، ئەوە ئێمە لەگەڵ ئەوین، بەرەی ئیمپریالیزم بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا، ئەوە ئێمە دژی ئەوین، بۆیە بێلایەنی بۆ ئێمە مانای نیە"، ئەو ئیتیجاهە چەپە، لەناو پارتیدا گەشەی کرد و دەسەڵاتی بەدەست هێنا، واتا کەسێک نەبو بتوانێت بەربەرەکانی بکات و دژی بوەستێت.

پارتی، ئەوکاتە ژمارەی کەم بو، هەموی چەند سەد ئەندامێکی هەبو، زوربەی زۆری بە بیروباوەری چەپ پرچەک کرابون، بۆیە ئەتوانین بڵێین، ئەو چەپایەتیە، بو بە شتێکی موتڵەق و باو لەناو هەمو پارتیدا و پەرەی سەند.

چەند کتێبێک لەسەر دیموکراتی میللی دەرچوبو، بەڵام چونکە ئێمە زمانی بێگانەمان نەدەزانی، مامۆستا ئیبراهیم ئینگلیزی ئەزانی و بۆی ترجمە ئەکردین، هەروەها مامۆستا ئیبراهیم چەند کتێبێکی چینی لەسەر دیموکراتی شەعبی و بیروباوەری ماوتسیتۆنگ خوێندبۆوە، بۆیە مەسەلەی دیموکراتی گەلی، لەناو ئێمەدا هاتەکایەوە.

# کۆماری کوردستانی دیموکراتی میللی

*** ئێوە چۆن مەسەلەی کورد و عێراقتان بەیەکەوە ئەبەستەوە؟**

– لەو روانگەیەوە ئێمە پێمان وابو، ئەو رژێمەی کە بێتەکایەوە، پێویستە رژێمێکی دیموکراتی شەعبی بە سەرۆکایەتی چینی کرێکار بێت، بۆ یەکەمجار دروشمی روخاندنی رژێمی پاشایەتی لەناو ئێمەدا سەری هەڵدا.

هەروەها، دروشمی مافی چارەنوس شیتەڵ کرایەوە، مەبەستمان ئەوەبو، عێراق لە دو جمهوریەت دروست ئەبێت، جمهوریەتی کوردستانی دیموکراتی شەعبی و جمهوریەتی عەرەبی دیموکراتی شەعبی و هەردوکیان جمهوریەتی عێراقی دیموکراتیی شەعبی دروست ئەکەن. جمهوریەتی کوردستانی دیموکراتی شەعبی، مافی هەیە پەیوەندی دیبلۆماسیشی هەبێت و ببێتە ئەندام لە کۆمەڵی نەتەویەکگرتوەکاندا.

ئەم بۆچونانە، لە بەرنامەی ساڵی ١٩٥٣دا دارێژران، بەڵام سەرەتاکەی لە ١٩٥١وە دەستی پێکردبو.

بۆچونی چەپ لەناو پارتیدا زاڵ بوبو، هەروەها لە دروشمەکاندا خۆی ئەبینیەوە، ئێمە دروشمەکانمان لە عەرەبیەوە کرد بە کوردی، هاتنی دوکتۆر جەعفەر بۆ لای ئێمە کە لە ئێران خوێندنی تەواوکردبو، لە ئینگلتەراوە هاتبۆوە یارمەتیەکی باش بو بۆ ئێمە، بە تایبەتیش ئەو بیروباوەڕە چەپانە لەو سەردەمەی ئێران باوبو.

# کوردی ئێران و بەشداریان لە نێو ڕیزەکانی پارتیدا

*** هەژاری شاعیر، وەکو کوردێکی ئێران، چۆن نوێنەری قوتابیان و لاوانی کوردی عێراقی کرد لە میهرەجانی دەرەوەدا؟**

- میللەتی کوردستان، لەو کاتەدا ئەو جیاوازیەی نەدەکرد، هەمو کوردەکانی ئێران، کە لە زەمانی کۆنەوە لێیان قەومابو هاتبونە لای پارتی، وەک زەبیحی، هەژار، حەسەنی قزلْجی، دلْشادی رەسولْی، ئەمانە هەمو، لەناو پارتیدا ئەندام بون و هەریەکەیان ئەرکێکیان پێ سپێرابو.

مامۆستا ئیبراهیم، لە پارتیدا، وای بیر ئەکردەوە، یەک حیزبی سەرتاسەری هەمو کوردستان داش عێراق دروست ببێت، داش عێراقەکە لەو روانگەیەوە بو، لەهەر ولاتێک داش ئەو ولاتە هەبێت و یەک سەرکردایەتیش وەکو سەرکردایەتیەکی نەتەوایەتیش هەبێت بۆ هەمو حیزبەکان.

واتا، هەمان سالْ گرنگیەکی زۆرماندا بە تورکیا، بەپێی توانای خۆمان هانی چەندین قوتابیمان دا کە تازە لە ئامادەیی دەرچوبون بەنیازبون بچن بۆ تورکیا و لەوێ بخوێنن و لەوێ پەیوەندی بکەن بە کوردەکانی تورکیاوە. یەکێک لەوانە نەژاد ناوێک بو، لاوێکی کەرکوکی بو لە ئامادەیی لەگەلْ مندابو، یەکێکی تر لەو کەسانەی هەلْبژێران ئەنوەر دزەیی برای مەرحوم ئەحمەد حەمە ئەمین بو، ئەویش چو بۆ ئەوێ و دەوری هەبو بۆ ئەوەی لەگەلْ کوردەکان قسە بکات و هەستی نەتەوەییان ببزوێنێ.

# دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوردی پارچەکانی تری کوردستان

*** ئایا ناردنی قوتابیان بۆ دەرەوە، بۆ خوێندن بو، یان بۆ پەیوەندی کردن بو بە کوردەکانی تورکیاوە، یاخود بۆ ئەوە بو، لەوێش پارتییەکی وەک ئەوەی کوردستانی عێراق دروست بکرێت؟**

– بۆ هەردوکیان بو، ئێمە چەند برادەرێکمان نارد بۆئەوەی، کە لە دواڕۆژدا حیزب دروست بکەن و کوردایەتی ببوژێنەوە، چونی مامۆستا هەژاریش بۆ دەرەوەی کوردستان و رۆشتنی بە سوریادا، بە مەبەستی ئەوەبو، کە ئەو سەفەرە سەرەڕای بۆ کاری تەندروستی خۆی بو، بەڵام بە پێویستیان زانی، کە ئیستیغلال بکرێت بۆ پەیوەندیکردن بە کوردەکانی سوریاوە، ئەو کاتە کوردەکانی سوریا، پارتی سیاسیان نەبو.

هەمان ساڵ کاک مەسعود محەمەدیش کە نائبی پارتی بو لە پەرلەمانی عێراقیدا، دەوری باشی هەبو، زۆر جار بە عەرەبیەکی بێگەرد و جوان و بە ئیرتیجالی لە پەرلەمان قسەی ئەکرد. بۆ یەکەمجار لە پەرلەماندا هەندێک مەسەلەی هێنایەکایەوە لەسەر کورد و نیشتمانی کورد و دواکەوتنی ناوچەکانی کوردستان.

هەمان ساڵ، ساڵی بەهێز کردنی پەیوەندیمان بو لەگەڵ حیزبەکانی عێراقدا، هەم لەگەڵ حیزبی شیوعی نێوانمان زۆر باشتر بو، هەم لەگەڵ پارتی وەتەنی دیموکراتی عێراقی.

ئێمە هەوڵماندا، وردە وردە پەیوەندیمان لەگەڵ حیزبی شیوعیش کە بە (جماعة القاعدة) ناسرابون، باش بکەین، ئەو کاتە حەمید عوسمان لێپرسراویان بو.

لەبەرئەوە، ئەتوانم بڵێم ئەوە ساڵێکی زۆر دەوڵەمەند و بەپیت و بەرەکەت بو بۆ کار و چالاکی سیاسی و حیزبی.

هەمان ساڵ، بەهادین نوری گیرا و درا بە دادگا، لە دادگادا زۆر ئازایانە بەرگری کرد، هەتا دەربارەی داننان بە مەسەلەی مافی چارەنوسی گەلی کوردا، ئەو هەڵوێستە هۆیەک بو، حوکمی ئیعدامی بەسەردا بدرێت کە دوایی گۆڕدرا بە زیندانی هەتا هەتایی.

لە هەمان ساڵدا، ئێمە توانیمان، سود لە پیاوێکی عەرەبی رۆشنبیر بە ناوی (داود الصائغ) وەربگرین، ئەو یەکێک بو لە سەرکردە کۆمۆنیستەکانی کۆن، بەڵام ئەوە بو، لەناو خۆیاندا تێکچون و (منظمة العمال الشيوعي)ی دروستکرد و دوایی دەرکرا و هاتە دەرێ و ئێمە یارمەتیمان ئەدا.

کتێبی مارکسی، ئەو کاتە زۆر کەم بو، داوامان لێکرد کە بۆمان تەرجەمە بکات، ئەویش دەستی پێکرد، بە کتێبی (الاشتراكية العلمية و الاشتراكية الطوباوية) و ئێمەش چاپمان کرد.

* دوای ئەوە مەسەلەکان بەرەو کوێ چون؟

– ئەوەی لەیادمە، لە سەرەتای دەست پێکردنەوەی خوێندنەوە، پەیوەندیمان لەگەڵ قەومیە عەرەبیەکانیش پەیداکرد، واتا ئێمە پێشتر هەر لەگەڵ کۆمۆنیستەکان پەیوەندیمان هەبو، لە پایزی ئەو ساڵەدا، واتا لە پایزی ١٩٥٣ دا، قەومیەکانمان ناسی و لەو کوللیەیەی کە منی لێبوم، واتا لە یاسا، قوتابیەکم ناسی بەناوی زەکی، یەکەم جار ناوی حیزبی بەعسم لەوەوە بیست و زانیم، کە حیزبی وا لە عێراقدا هەیە.

# یەکەم چالاکی سیاسی لە دەرەوەی کوردستان

*** کەی لە دەرەوەی کوردستان یەکەم چالاکیت هەبو؟**

– بۆ یەکەمجار، لە کۆبونەوەی قەومیەکانی عەرەب کوردێک قسەی کرد، ئەویش من بوم، باسی برایەتی کورد و عەرەب و یەکێتی تێکۆشان و پێویستی هاوخەباتی هەردو میللەتم کرد.

کۆمۆنیستەکان زۆر زۆریان پێناخۆش بو، لێیان کردین بە هەڵایەکی زۆر گەورە و هێرشێکی گەورەیان کردە سەرمان، کەوا راستڕەوین و کۆنەپەرستین، چونکە لەگەڵ قەومیە عەرەبەکان هاوکاری ئەکەین.

*** باشە ئایا پەیوەندیکردن بە پارتە عێراقیە عەرەبیەکانەوە، هیچ جۆرە مەترسییەکی هەبو لەسەر کۆمۆنیستەکان؟**

– کۆمۆنیستەکان ئەیانویست، پەیوەندی جوڵانەوەی کوردایەتی هەر لەگەڵ خۆیاندا بێت و پارتی هیچ جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ هیچ پارتییەکی عەرەبی نەکات.

ئەوەی تر، کە لەیادم بێت لەو ساڵەدا، ئەوەبو، پاش ئەوەی هەژاری موکریانی لە فێستیڤاڵەکە گەرایەوە، هەندێک هۆنراوەی دانابو، رێکخراوی (لاوانی دیموکراتی کوردستان)یشمان دروستکردبو، کەوتبوینە چالاکی بە نوسین و تەرجمەی کتێب دەربارەی ئاشتی و بزوتنەوەی ئاشتی لە دنیادا.

حەمەی ئەحمەد تەها (کامەرانی شاعیر) کۆمەڵێک هۆنراوەی لە ١٩٥٤ وە دانابو لەسەر ئاشتی، من پێشەکیەکم بۆ نوسی و بڵاویکردەوە. ئەو پێشەکیەی، کە من نوسیبوم، بو بە هۆی گیروگرفتێکی گەورە، من بە زمانی چەپی ئەو سەردەمە نوسیبوم و زۆر باسم لە ئیمپریالیست کردبو، وەک پیاوخۆر دابومە قەڵەم.

لەسەر ئەو هۆنراوەیە و پێشەکیەکەی درانە دادگا، حەمەی ئەحمەد تەها بە ساڵێک دورخستنەوە حوکم درا و منیش بەرەڵا کرام، چونکە من شاعیرەکە نەبوم، بەڵکو ناشرەکە بوم.

# خۆشەویستی و زیندان

*** باشە با لەسەر وێستگەیەکی تایبەتی بوەستین، باس ئەکرێت کە تۆ لەو سەردەمەدا، بەدەر لە کاری حیزبی دڵداریشت کردووە؟**

– ئەو سەردەمە، بیرەوەریەکی ناخۆشم دێنێتەوە یاد، ئەو کاتە من لاو بوم، ئەو سەردەمە یەک قات جلی زۆر چاکم لە محەلێک کڕیبو، کە پێیان ئەگوت خەیاتەی شیک، لە زانکۆ کچێکیشم ئەناسی و حەزمان لەیەک کردبو، بە تەمای هێنانی بوم، ئەو ڕۆژە خۆم قۆز کردبو، ئەو جلەم لەبەرکردبو کە لە شیک کڕیبوم، لەگەڵ کراسێک و پێڵاوێکی نوێ، مەوعیدم هەبو لەگەڵ ئەو کچەی کە ئەمناسی.

سەعات ١١:٤٠ لە کوللیە هاتمە دەرێ، بۆئەوەی بڕۆم بۆ چاوپێکەوتنەکە کە هاتمە دەرێ دو پۆلیسی تەحقیقاتی جەنائی یەخەیان گرتم، یەکێکیان لەگەڵ خۆمانبو ناوی ئەحمەد ڕاوی بو، من ئەمزانی پۆلیسە، بەڵام نەم ئەزانی لە تەحقیقاتی جەنائی ئیش ئەکات، گوتیان فەرمو سوار بە، تەکسیەکیان ڕاگرت و بردیانم بۆ تەحقیقاتی جەنائی، لەسەر ئەو کتێبە دەستیان کرد بە تەحقیق کردن لە گەڵمدا، حەوت ڕۆژیان هێشتمەوە، قاتەکەشم هەموی ڕزی و درا.

ئەو کاتە، ئێستگەی شەمەندەفەری هەولێر لە دەرەوەی شار بو، شاری هەولێریش بچوک بو وەکو ئێستا نەبو، لەبەرئەوە لە شەمەندەفەرەکەوە بەپێ منیان هێنا و دو پۆلیسیش زنجیریان کردبوە دەستم و دەستیان کەلەپچە کردبوم، بە زنجیرێکی درێژ ڕایان ئەکێشام.

بەو شێوەیە، منیان لە ئێستگەکەوە هێنا بەناو شەقامەکانی ناو شاردا، تا سەرا بۆ تەوقیفخانەی ئەوێ، لەوێ نە عەرەبانەیەک، نە ئوتۆمۆبیلێک، هیچی لێنەبو، ناچار بەپێ هێنایانم، جا ئەوە قسەیەکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە لەسەر ئەوە: دکتۆرێک هەبو بەناوی دکتۆر ڕەئوف، پیاوێکی زۆر خۆش بو، دۆستی کاک عەونی یوسف بو، عەلی عەبدوڵڵاش ئەو کاتە هاتبوە هەولێر، لای کاک عەونی بو، ئەو دکتۆرە ئەچێت باسی منیان بۆ ئەکات ئەڵێت: کابرایەکم دی پەتێکیان

کردبوە دەستی و رایان ئەکێشا، ریش و سمێڵی تێکەڵ بوبو، کاتێ لێی ئەروانم دەبینم مام جەلالە و ئەیانبرد بۆ سەرا، بەو شێوەیە ئەوان زانیان کەمن گیراوم.

ئینجا، کە چومە ئەوێ، لەوێش درامە دادگا، بەڵام لەبەرئەوەی لە قانون پەرەگرافێک هەیە پێی دەڵێن (دفع بعدم الصلاحية) بە حاکمەکەم گوت، لەسەر یەک مەسەلەی جەنائی، مرۆڤ دوجار دادگا ناکرێت، چونکە لەسەر هەمان مەسەلە من لە بەغدا دادگایی کراوم، بۆیە نابێت ئێستاش بە هەمان شێوە بدرێم بە دادگا، لەگەڵ ئەوەشدا ٧ رۆژ بەند کرام، بەڵام راستیەکەی هەزار رەحمەت لە قاسمی مەلا ئەفەندی بێت، هیمەتێکی بۆ کردم و لە بەندیخانەی ئاسایی دەریان هێنام و هێنامیانە نەخۆشخانەی بەندیخانە، ژورێکیان بۆ نەخۆش چاک کردبو، هەر لە ماڵیشەوە نوێن و پێداویستی و شتی تریان بۆ ناردم.

ئەو زەمانە بەندبون شەرەفێکی گەورە بو، خەڵک وەکو حەجی کردبێت وابو، لە هەمو لایەکەوە رۆژی جۆرەها خواردن ئەهات بۆ ئەو کەسانەی کە گیرابون.

ساڵی ١٩٥٣-١٩٥٤، ١١٠ سەدودە رۆژ لە قوتابخانە غائب بوم، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەری ساڵ، هەمو دەرەجەکانم باش بون.

# رۆڵی ئیبراهیم ئەحمەد و هەمزە عەبدوڵڵا لەناو (پارتی)دا

*** رۆڵی بارزانی لە ساڵەکانی نێوان ١٩٥٣ – ١٩٥٨ دا، لەناو روداوە سیاسیەکانی کوردستانی عێراقدا چی بو؟**

– کە مامۆستا ئیبراهیم بو بە سکرتێری پارتی، دو شت لەناو پارتیدا رویاندا، یەکێکیان ئەوەبو، کۆمەڵی ساڵح روشدی جیابونەوە، دوای ئەوەش هەمزە عەبدوڵڵا لە ١٩٥٤ دا جیابۆوە، هەروەها مەلا مستەفا لەو سەردەمەدا لە سۆڤیەت، هیچ ئاگای لە پارتی نەبو، هیچ دەورێکیشی نەبو لەناو بزوتنەوی کوردایەتیدا. هەواڵێک بڵاوبۆوە، مەلامستەفا و ئەوانەی نەفی کراون بۆ روسیا مادام لە وڵات

نین و لەویٚ ئامادە نین، پێویستە لە سەرکردایەتی لابیرێن.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، ڕەئی وابو، "بارزانی لە وڵات نییە و ئاگامان لێی نیە و نازانین ئایا ئەو سەرۆکی پارتی قبوڵە یان قبوڵی نیە؟ ئێمە ئەو، وەک سەرۆک قبوڵ ناکەین".

هەمزە عەبدوڵڵا، هیچ یاسایەکی قبوڵ نەدەکرد، بە راستی بۆچونەکانی بەپێی ڕەئی ئەو سەردەمەی ئێمە، راست و ڕەوا نەبو، بۆ نمونە، ئەو دژی ئەو ئیتیجاهە چەپەی ناو پارتی بو، پێی باش نەبو، هاوکاری لەگەڵ بەرەی سۆشیالیزم بکرێت و بە کارێکی هەڵەی ئەزانی و ئەیگوت، "کۆمەڵگای کوردی، کۆمەڵگایەکی عەشایەرە و نابێ ئێمە دژی دەرەبەگ و شێخ و ئاغا بوەستین، بەڵکو پێویستە بۆلای خۆمان رایان کێشین".

هەروەها هەمزە لایەنگریی ئەوەنەبو، بچینە ناو کرێکاران و جوتیارانەوە و ئەیگوت، پێویستە گرنگی بە دەرەبەگ بدەین، چونکە کە دەرەبەگمان بۆ لای خۆمان راکێشا، مانای وایە کۆمەڵمان ڕاکێشاوە.

ئەتوانین بۆچونەکانی هەمزە عەبدوڵڵا بە نەتەوەیی راسترەو بدەینە قەڵەم، هەرچەندە رەگوریشەی خۆی نویٚ بو، بەڵام زۆر گەڕابۆوە دواوە و هەروەها کۆمەڵێکی لەدەور کۆبوبونەوە، بەناوی باڵی پێشکەوتوخوازی پارتی دیموکراتی کوردی عێراق، هەر لەسەر (کورد)ەکە رۆیشتن و دانیان بە کوردستانی و گۆڕینی ناو بەرنامەدا نەدەنا.

ئەو کەسانەی، لەگەڵیابون، کۆمەڵێک بون لە سلێمانی و دو سیٚ کەسیش لە بادینان ئەوانەی سلێمانی بریتی بون لە (محەڕەم محەمەد ئەمین، محەمەد کەریم فەتحوڵڵا، شەهاب شێخ نوری، عەبدولی سۆران و بابە تایەری شێخ جەلال و عومەر کەریم عەزیز و ڕەئوف مەعروف).

ئەمانە ئەو رێرەوە چەپەی پارتییان پیٚ باش نەبو، هەمزە عەبدوڵڵا، مەلا مستەفای هەر بە سەرۆکی خۆی و گەلی کورد ئەزانی و عیبارەتێکی داهێنابو، لە کۆتایی هەمو نامەیەکدا ئەبوایە بنوسین، (الى الامام بقيادة بطل التحرير كردستان، جنرال مصطفى البارزاني) ئەو ئەیگوت من وەکیلی مەلا مستەفام، (الوكيل كالاصيل)، بە کورتی ئەو خۆی لەجێی مەلا مستەفا دانابو.

زۆربەی رۆشنبیرانی پارتی بۆچونیان وابو، پارتی حیزبێکی پێشڕەوە، سود لە مارکسی لینینی وەرئەگرێت و مەلا مستەفاش ئازادە کە تێدا ئەمێنێتەوە یان نامێنێتەوە , بەڵام ئەبێت لە خۆی بپرسین و بزانین، ئایا ئەمێنێتەوە،

یان نا. هەرچەندە ئەو هیچ پەیوەندییەکی بە پارتیەوە نەمابو و هیچ ئاگا و خەبەرێکیشمان لەیەک نەبو.

ئەو بۆچونە، وردە وردە لەناو ریزەکانی جوڵانەوەی کوردایەتیدا گفتوگۆی لەسەر ئەکرا، کە ئایا مەلا مستەفا هەر وەکو جاران سەرۆک بێت یان نەبێت؟.

*** بەدەر لەو بۆچونانە، ئەی بۆچونی تۆ چی بو بەرامبەر بە بارزانی و مەسەلەی سەرکردایەتیەکەی؟**

– من خۆم یەکێک بوم لەو کەسانەی پێموابو، پێویستە بارزانی، سەرۆک بێت و لە روانگەی پەیرەوی ناوخۆوە سەیرم ئەکرد، (هەر کەسێک لە سەرکردەکان بەهۆی چالاکی سیاسی خەباتەوە دورکەوتبێتەوە لە شوێنی خۆی، لاناچێت و ئەمێنێتەوە).

بۆ نمونە، د.جەعفەر دورکەوتبۆوە و هەر بە ئەندامی سەرکردایەتی مابۆوە، یان میرحاج دورکەوتبۆوە هەر بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی دانرابو، لەبەرئەوە پێم وابو، پێویستە بە نسبەت بارزانیشەوە بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

ئێمە لاریمان لەوە نەبو، بارزانی سەرۆکمانە، بەڵام بە عەمەلی، دەوری نەبو، بەشداری لە هیچ کارێک و بریارێکماندا نە ئەکرد، ئاگامان لەیەک نەبو، نەماندەزانی لە چ جێگایەک دەژی. ئەویش خۆی لەلای خۆیەوە هیچ هەوڵێکی نەدابو بۆ پەیوەندیکردن پێمانەوە.

ئەو سەردەمە، لە کۆتایی ١٩٤٩ دا مەلا مستەفا لەگەڵ جەعفەر باغرۆفی، سکرتێری حیزبی شیوعی ئازربایجان تێکچوبون، چیرۆکی ئەو تێکچونە لای سەید عەزیز و دکتۆر رەحیمی قازی و ئەو برادەرانەی تر بو کە لەوێ بون، تاکو ئێستا کەم لەوبارەیەوە نوسراوە.

ئەوەی من لێم بیستوە ئەوە بو: ساڵی١٩٥٠ لە کاتێکدا، شەڕی کۆریا هەڵگیرسا سۆڤێتیەکان ئەیانویست بۆ کوردیش شتێک بکەن و جوڵانەوەی کوردی گەورە بکەن، کوردەکان چەکدار بکەن و بیان نێرنەوە بۆ کوردستانی عێراق و ئەوانیش لەوێ شۆڕش هەڵگیرسێنن تەنانەت حکومەتی کوردی لە مەنفا دروست بکەن.

ئەوکاتە، بارزانی لەسەر رۆڵی رەحیمی قازی کە چیە و پێویستە چۆن بێت، رێک نەکەوتبون، بارزانی زۆر دژی رەحیمی قازی بو، ئەوی بە جاسوسی جەعفەر باغرۆف ئەزانی و ئەویش پشتیوانی زۆری لە جەعفەر ئەکرد.

پەیوەندی نێوان بارزانی و باغرۆفیش تێکچو، لەپڕ بارزانیەکانیان گرت و هەمویان

ناردن بۆ ناوچە دورەکانی رۆژهەلاتی ئازربایجان و تاجیکستان و ئۆزبکستان.
بلاوبونەوەی کوردەکان لە ناوەوەی قولایی سۆڤیەت و دەوری سنوری ئێران، ئەو پرۆژەیەی تێکدا، حیزبێکی کوردستانی دروست بکرێت و مەلا مستەفا سەرۆکی بێت و بارزانیەکان مەشق پێبکرێن و بنێرێنەوە بۆ عێراق و لەوێشەوە شۆرش هەلگیرسێننەوە. ئەم نەخشەیە لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیەی نێوان مەلا مستەفا و جەعفەری باغرۆف تێکچو.

# نەفی کردنی بارزانیەکان، ژیان و کاری سیاسییان لە روسیادا

*** ماوەی چەند بارزانیەکان بۆ روسیا دورخرانەوە؟ ئایا لەو ماوەیەدا پەیوەندیان لەگەل ئێوەدا هەبو؟**

- بارزانیەکان لە ١٩٥٠ تا ١٩٥٣ نەفی کرابون، ئەو ماوەیە نە ئێمە ئەمانزانی ئەوان لە کوێ نەفیین و پەرت و بلاوبونەتەوە، نە ئەوانیش ئەیانتوانی پەیوەندیمان پێوە بکەن. دوایی لە ١٩٥٣ دا مەلا مستەفا ژنێکی روسی هێنا(٥)، لەوێ ژنەکەی ئەنێرێتە مۆسکۆ و نامەیەک ئەنوسێت بۆ ستالین، ئەو لەو بروایەدا بو، مۆسکۆ ئاگای لەو کارانە نیە.

ئەو کاتە، هێشتا ستالین مابو، پاش ئەوە، نامەکە ئەگات، وەزعیان کەمێک باشتر ئەبێت و دەسەلاتداران نەختێک کۆیان کردنەوە و قوتابخانە و خوێندنیان بۆ ئاسان کردن و رێگایاندا بگەرێنەوە مۆسکۆ.

دوای مردنی ستالین، لە ١٩٥٣ دا مەلا مستەفا و سەید عەزیز و کۆمەلێک خەلکی تر رەوانەی مۆسکۆ کران. هەندێکیان چونە قوتابخانەی حیزبی و هەندێکیان چونە قوتابخانەی کشتوکال و بەو شێوەیە نێردران بۆ فێربون و مەشقکردن و بە گشتی ژیانیان بەرەو باشی رۆیشت.

بە بۆچونی من و ئەوەی من خۆم تێگەشتوم، شۆڤێنیەتی ئازربایجان رۆلی

هەبو لەو مەسەلەیەی بەسەر بارزانییەکان هات، رەنگبو مەلا مستەفا بتوانێ بە شێوەیەکی نەرم و بە ژیرانە چارەسەری بکات، چونکە میرحاج و سەید عەزیز و ئەوانە بۆچونیان وابو کە تەتەروفی مەلا مستەفا، شۆفێنیەتی جەعفەر باغرۆفیشی زیادکرد، بارزانی ئەیویست خۆی سەیتەرە بکات و خۆی ئەو کارانە بگرێتە دەست.

بە بۆچونی خۆم، دوای ئەوەی، قسەیان بۆ کردم و لەمەسەلەکە گەیشتم، رەئیم وابو، باش ئەبو ئەگەر مەلا مستەفا قبوڵی بکردایە کە رەحیمی قازی ببێت بە ئەندامی لیژنەی ناوەندی، چونکە یەک کەس ناتوانێت بە تەنها زۆر شت بگۆرێت، هەتا ئەگەر جاسوسی سۆڤێتیش بێت، با یەک جاسوسی سۆڤیەت دابنرێت لە جیاتی ئەوەی، پرۆژەیەکی وا گەورە تێک بدرێت[٦].

هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە کوردستان و دانانی حکومەتی کوردی لە مەنفا و پشتیوانی سۆڤیەت لەو خەباتە چەکدارە، نابێت ببێت بە قوربانی ئەوەی، دو کەس یان سێ کەس کارەکانیان خراپ ئەنجام بدەن، چونکە ئەتوانرێت لەدوا رۆژدا، ئەو کارە چاک بکرێت و بگۆڕێت.

مەشروعی شۆڕشی کوردستان و دانانی حکومەتی کوردستان لە مەنفا تێکچو، ئەوە زەربەیەکی گەورە بو لە خەڵکی کوردستان درا، چونکە ئەگەر ئەو رۆژە لە کوردستان شۆرش هەڵبگیرسایە و حکومەتێک لە مەنفا دروست بکرایە، هیچ نەبێت لە جیهاندا دەنگێکی گەورەی ئەدایەوە و مەسەلەی کوردی زۆر بەرەو پیشەوە ئەبرد.

*** باشە بۆچی دەبارەی حکومەتی مەنفا زۆر کەم نوسراوە؟**

راستە کەم نوسراوە، بە رەئی من تا ئێستا باسی بە وردی نەکراوە، سەبارەت بەوەی، رەحیمی قازی نەیوێراوە خۆی باسی بکات، چونکە خۆی هەڵوێستی باش نەبو، مەسئولیەتی هەبو، نەیوێرا ڕاستیەکە باس بکات، هەروەها سەید عەزیزی شەمزینی نەینوسیوە و بڵاوی نەکردۆتەوە وابزانم ئەویش دژی ڕەحیمی قازی و قازی محەمەدیش بو.

وابزانم کاک مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا باسی تێک چونی باوکی لەگەڵ جەعفەری باغرۆف کردوە، بەڵام نەک بەو درێژیە.

*** بۆچی تۆ لە کتێبەکەی خۆتدا، کە لە١٩٦٩ دا چاپکرا، هیچت لەو بارەیەوە نەنوسیوە و خۆت بە دورگرتوە لەو کێشەیە؟**

- ئەگەر سەرنج بدەیت، من ئەو کتێبەم تا روداوەکانی ١٩٦١ نوسیوە،

هەرچەندە لە ١٩٦٩دا بە چاپ گەیشتوە، هۆیەکی تریش کە باسم نەکردوە ئەوەبو، ئەبو ئێمە ڕەخنە لە سۆڤیەت بگرین و بڵێین ئەوە تاوانی سۆڤیەت بوە، هۆیەکی تریش ئەوەبو، ئەوە نهێنییەک بوە لە نهێنیەکانی بزوتنەوەی کوردی و ڕەنگە ئەو ڕۆژە زیانی هەبوبێ، کە بڵاوبکرێتەوە.

ئەوکاتە باش نەبو، بڵێین سۆڤیەت بە تەمابو دەوڵەت بۆ کورد دابنێت و شۆڕش هەڵبگیرسێنێتەوە، شان بە شانی جوڵانەوەی کۆریا، چونکە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا زۆر خراپ لێک ئەدرایەوە.

*** دوای ئەو ڕوداوانە، کەی یەکەم پەیوەندی لە نێوان بارزانی و پارتیدا دروست بو؟**

- مەلامستەفا، خۆی هیچ پەیوەندی نەکرد، بەڵام پارتی هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵدا بکات، لە ساڵی ١٩٥٥ دا من چوم بۆ فێستیڤاڵی لاوان و قوتابیانی جیهان لە وارشۆ و لەوێوە دەعوەت کرام بۆ چین، بەرێگای سۆڤیەتدا چوم و هەوڵمدا لەوێوە مەلامستەفا ببینم و باسی خۆمانی بۆ بکەم.

لە چونماندا بۆ سۆڤێت، هیچ کەسمان نەدی، بەڵام لە گەڕانەوەما، بە ڕێکەوت عێراقیەکم دیت، ناوی (محەمەد عەلی هاشمی نەجەفی) بو، پیاوێکی ناودار بو لە بزوتنەوەی شورشگێری عێراقی و لە ١٩٣٤وە لەناو حیزبی شیوعیدا بو، لە دوایدا لە عێراق دەرکرا و جنسیەی لێ سەنرایەوە و چو بۆ ئەبادان، بە بیانوی ئەوەی کە ئێرانیە، لەوێ لە بزوتنەوەی چەپی ئێرانی دەوری هەبو، پاشان چوبو بۆ سۆڤیەت لەوێ لە رادیۆی مۆسکۆ ئیشی ئەکرد.

لە ڕێی گەڕانەوەمدا، لە چینەوە و لە کاتێکا لە مۆسکۆ پیاسەم ئەکرد، لە بەردەمما دو کەس بەعەرەبی قسەیان ئەکرد، یەکێکیان ئەو دەنگە بو کە لە ڕادیۆی مۆسکۆ گوێم لێبوبو، منیش قۆڵیم گرت و سڵاوم لێکرد و گوتم، "من فڵانە کەسم و لە کوردستانەوە هاتوم" و چاکوچۆنیم لەگەڵ کرد، خوا هەقە بەگەرمی وەریگرتم وپێموت: تۆ فڵانەکەس نیت؟ تۆ نەجەفی نیت؟ وتی نەخێر! بە کورتی، سەرئەنجام ئەویش سەلماندی، گوتی باشە لە کوێیت، گوتم لە ئوتێلم و ناو و ژمارەی ژورەکەم دایە. دیار بو پرسیبوی و زانیبوی کە من لە لاوانی دیموکراتم و لە چین بوم و هاتومەتەوە لە سۆڤیەت کارم هەیە و سورم لەسەر ئەوەی، تا کارەکەم ئەنجام نەدەم نەڕۆمەوە.

دو هەفتە زیاتر لە مۆسکۆ مامەوە، هاشمی نەجەفی دو سێ جار هات بۆ لام و گوتی چیت هەیە بۆ بارزانی، ئەتوانم بۆت بەرم و تێگەیاندم، ئەو پەیوەندی

لەگەڵیدا هەیە، ڕۆژێک لە ژورەکەی منەوە تەلەفۆنی لەگەل مەلامستەفا کرد، بەڵام نەیانهێشت من قسەی لەگەڵ بکەم، ئەو تەقریرەم بۆ نوسیبو کە کاک مەسعود لە کتێبەکەی خۆیدا بڵاوی کردۆتەوە، باسی وەزعی پارتی بو، هاشم نەجەفی هەواڵی ئەوانی بۆ هێنام، تەندروستیان زۆر باشە، بەڵام ناکرێت ئەم جارە بیان بینیت، تێی گەیاندم کە ئەم جارە ناکرێت بیبینم.

* ئەیگوت بۆ نابێت بارزانی ببینیت؟

- تێی گەیاندم، ئێستا سۆڤیەت ڕێگا نادات و کاتی ئەو بینینە نەهاتوە، بەڵام لای منەوە دو جار تەلەفۆنی لەگەڵ کرد، ئامۆژگاریەکانی بارزانی بۆ هێنامەوە، کە چی بکەین، چی نەکەین؟ پەیوەندیمان دروستکرد و ناونیشانێکیان دامێ لە بەرلینی ڕۆژئاوا، هەموجارێک هەواڵ و دەنگوباس بنێرین بۆ ئەو ناونیشانە.

ئەو کاتە، پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی خۆی ئامادەئەکرد بۆ کۆنگرەی بەناوبانگی بیستەمین، مەلا مستەفا داوای ئەوەی کرد، گوتی: ئەگەر ئەکرێت هەمزە عەبدوڵڵام بۆ بنێرن، هەروەها گوتی: پێکوەرنەوە و هەوڵ بدەن، بیهێننەوە ناو حیزب و ڕێکی بخەنەوە، ئەو ناکۆکیە خراپە و باش نیە. لەوێوە ئەتوانم بڵێم، یەکەم پەیوەندی لە ١٤ یان ١٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٥ لەگەڵ مەلا مستەفا لە مۆسکۆ بەهۆی ئەو محەمەدی هاشمی نەجەفیەوە دروستکرا.

* ئەو کاتە مەلا مستەفا لە کوێ نیشتەجێ بو؟

- مەلا مستەفا، لە مۆسکۆ بو، بەڵام جاری یەکەم نەیانهێشت من بیبینم، من جاری دوهەم لە١٩٥٧ دا کە چومەوە بۆ مۆسکۆ بینیم، لەو سەفەرەدا من بۆ یەکەمجار لە ڕادیۆی مۆسکۆوە قسەم کرد، واتا ئەوە یەکەمجار بو کە کوردێک لە ڕادیۆی مۆسکۆوە قسە بکات. بە عەرەبی قسەم کرد بەناوی حەمەئەمینەوە، باسی کوردستان و میللەتی کورد و پرۆژەی سەدی دوکان و داوای برایەتی و دۆستایەتی کوردم کرد، لەگەڵ سۆڤیەت و باسی ئەوەی کە گەلی کوردیش مافی هەیە بە ئاشتی بژی.

* پەیوەندیت لەگەڵ بارزانی لە ساڵی ١٩٥٥ و دەستی پێکرد، بۆچی دوای دو ساڵ چاوتان پێی کەوت؟

- لە ١٩٥٥ پەیوەندی دەستی پێکردەوە، بریتی بو لەوەی کە ناونیشانێکمان

درایە لە ئەڵمانیا، بەپێی ئەوە، هەمو جارێک رۆژنامە و بڵاوکراوە و بەیان و هەواڵی خۆمان بۆ ئەو ناونیشانە ئەنارد، بەڵام هیچمان لەوانەوە وەرنەدەگرت، واتا خراپییەکەی ئەوە بو، هەر ئێمە شتمان بۆ ئەوان ئەنارد، ئەوان هیچیان بۆ ئێمە نەدەنارد.

من لەوێ، نامەم بۆ مەلا مستەفا، میرحاج، سەید عەزیز نوسی، بە ئیعتبار کە ئەوانیش ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بون، بەڵام ئەوان وەڵامێکیان نەبو تا١٩٥٧.

# پارتی لە سەردەمی پاشایەتی

*** باشە پارتی بۆ پێش شۆرشی ١٩٥٨ هەوڵی نەدا، ئیجازەی رەسمی وەرگرێت و وەکو پارتییەکی ئاشکرا کاربکات؟**

- هیچ جار هەوڵ نەدرا، چونکە بەپێی یاسای عێراقی قەدەغەبو، ئەو کاتە کارکردنی هەمو پارتیەک لەسەر بناغەی نەتەوەیی قەدەغەبو، لەبەرئەوە پارتی بە هیچ جۆرێک هەوڵی ئەوەی نەداوە، هەروەها لە پرۆگرامی پارتیدا، راستەوخۆ باسی روخاندنی حکومەت و رژێمی پاشایەتی دەکرا، بۆیە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ یاسای ئەو سەردەمەی عێراقدا نەئەگونجا عێراق یەک رژێمی دیکتاتۆری کۆنەپەرەستانەی هەبو، رێگای بە کاری وا ئازاد نەئەدا.

حکومەت، پارتە عەرەبیەکانیشی لەخۆی کردبو، نوری سەعید گەڕایەوە، ئیلغای حیزبی وەتەنی دیموکراتی و ئیستقلال و جەبهەی شەعبی و هەمو ئەو حیزبە عەرەبیانەشی کرد، چجای ئەوەی حیزبێکی کوردی رێگای پێی بدرێت کە هەم کوردیە و هەم بە مارکسی حسێب ئەکرا.

پارتی ئەوکاتە لای حکومەتی عێراق دو جار کافربو، یەکەم حیزبێک بو کە کوردایەتی ئەکرد و لەپێناوی مافی چارەنوسیدا خەباتی ئەکرد، دوەم پارتی بە مارکسی لینینی ئەدرایە قەڵەم، لەبەرئەوە هەم کوردی و هەم شیوعی، لە دادگادا پێیان ئەگوتین هەم ئینفیسالی و هەم شیوعی.

بە (مادەی ٨٩ قانونی عقوباتی بغدادی ئەلف و ب)، کە یەکێکیان ئینفیسالیەت و یەکێکیان شیوعیەت بو، باسی لەوە ئەکرد (کل من روج باحدی وسائل النشر و للمبادئ الشیوعیة و الانفصالیة)، هەردو پەرەگرافەکە ئێمەیان ئەگرتەوە، هەم کافر و هەم نەتەوەیی، لەبەرئەوە بە هیچ شێوەیەک رێگای ئەوە نەئەدرا بیر لەوەبکرێتەوە داوای ئیجازە بۆ پارتی بکرێت و رێگای کاری پێ بدرێت.

*** حکومەت ئەیزانی، پارتی وەک هێزێکی سیاسی هەیە و مامۆستا ئیبراهیم سکرتێرە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی ئەناسران ئەگەر پیویستایە ئەیتوانی بیانگرێ؟**

- حکومەت هەمو زانیاریەکی نەدەزانی، لە پاشان ئێمە هەندێکجار ئەگیراین، واتا ئەوان نەیاندەزانی کێ کێیە، گومانیان لە هەندێ کەس ئەکرد و هەندێ جار خەڵک ئەگیران و هەمو ساڵێک چەند جارێک ئەو برادەرانەی ناوت هێنان ئەگیران، بەڵام ئەو کاتە دادگا هەبو، ئەدران بە دادگا و ئەبوایە بەڵگەیەکت لەسەر بێت و تاوانەکە بە یاسا و بەڵگە بسەلمێت. ئەو کاتە حوکم ئەدرایت. نمونەیەک ئەهێنمەوە، ئێمە هەر جارێک ئەدراینە دادگا، ئەیانگوت ئێوە پارتین و ئێمەش ئەمانگوت نەخێر پارتی نین و کەس بەڵگەی پێ نەبو، کە بتوانێ بیسەلمێنێت ئێمە پارتین.

کۆمەڵێک برادەری پارتی حوکم دران، وەک رەشید عەبدولقادر؛ سێ مانگ، مامۆستا ئیبراهیم؛ دو ساڵ، عەونی یوسف؛ یەک ساڵ، عومەر دەبابە؛ ساڵ و نیوێک، ساڵح دیلان؛ ساڵێک، نوری ئەحمەدی تەها و حیلمی عەلی شەریف؛ ساڵێک و دەیان کادیر و ئەندامی پارتیش بە هەمان شێوە دران بە دادگا، منیش لە ماوەی ئەو سێ، چوار ساڵەی، لە حقوق بوم رەنگە چەندەها جار گیرابم، هەموی بیخەیتە سەر یەک، زیاتر لە ساڵێک لە بەندیخانە بوم، پاشان لە کۆتایی ١٩٥٦ دا لە حقوق دەرکرام و خۆم شاردەوە.

لە دادگا ئەگەر ئیسپات نەکرایە و شتێکت بەسەردا نەسەلمایە، ئەوا نەدەگیرایت، هەزاران کەسی پارتەکانی تریش هەبون شکیان لێ ئەکرا، بۆ نمونە (کۆمەڵی ئەنساری سەلام) بە ئاشکرا کاریان ئەکرد، هەندێکیان وەک هەواداری ئەوان ئەدران بە دادگا، یاخود لایەنگیرانی حیزبی وەتەنی دیموکراتی، کە حیزبەکەیان بەناو داخرابو، بەڵام بە عەمەلی کاریان ئەکرد.

هەرکەسێک بدرایە بە دادگا، ئەبوایە بەڵگەی لەسەر هەبێت، بۆ نمونە، من درامە دادگا لەسەر ئەوەی چومەتە مۆسکۆ، شریتی تەسجیلەکەیان هێنا کە من

لە رادیۆوە قسەم کردبو، منیش گوتم ئەوە دەنگی من نیە، منیش درامە دادگا و چومە کەرکوک بە هۆی خزمە تاڵەبانیەکانمەوە ئیجازەیەکی نەخۆشیم پەیداکرد، من ئەو کاتە تەداوی کراوم و لیژنەیەکی پزیشکی ئیجازەی بۆ کردوم. بەو هۆیەوە لە دادگا ئیجازەکەی من خواردی و وا دەرکەوت، من لە کەرکوک بوم نەک لە مۆسکۆ!.

ئەو کاتە، جگە لە دادگای عورفی، زۆر گوێ نەئەدرایە دادگاکانی تر، دادگای تر، ترسی نەبو دادگای ئیستیئناف و تەمیز هەبو، پارێزەر ئەهات و بەرگری لێ ئەکردی.

ئەو کاتە، لە عێراق جۆرێک لە سەربەستی دادگا و سەربەستی بەرگری و پیرۆزی دادگا هەبو، بۆیە مەسەلە تەنها شک نەبو، بەڵکو پێویست بو کە بەڵگە هەبێت.

بۆ نمونە، مەسعود مەحەمەد ئەندامی پەرلەمان بو، بەڵام شکی لێکرابو، ئەندامی پارتییە، نە ئەتوانرا بیسەلمێنن لەسەری، چونکە کە لێیان ئەپرسی، ئەو ئەیگوت من پارتی نیم!.

ئێمەش بە هەمان شێوە، من چەند جارێک بۆ گەڕاندنەوەم بۆ خوێندن، داوای ئەوەیان لێکردم، وتیان کە بەرائەت بنوسم، منیش گوتم ناینوسم، واستەیەکم لای سەعید قەزاز بۆ کرابو، لە سجنی تەحقیقاتەوە بردیانم بۆ لای ئەو، ئەویش گوتی با قوتابخانەکەت لە کیس نەچێت و دو خەت بنوسە، منیش گوتم بۆ بینوسم؟ مانای چیە؟ گوتیان هەر ئەوەندە بڵێ من پارتی نیم، گوتم "باشە ئەگەر پرسیارم لێ بکەن لە دادگای لێکۆڵینەوە، یاخو ئەوە جەنابت لێم ئەپرسی، منیش ئەڵێم پارتی نیم، خۆ ئەگەر پرسیارێکم بە نوسین لێ بکەیت، ئەوا منیش بە نوسین وەڵامت ئەدەمەوە و ئەڵێم من فلانی کوڕی فلانم و پارتی نیم و هیچ پەیوەندیەکم بە پارتیەوە نیە، بەڵام نوسینی بەرائەت کەرامەتی ئینسان ئەشکێنێت، ئەوە ئیهانەیە، بۆ ڕێزی ئینسان و بۆ مەبادئی ئینسان"، گوتم: "ئەوە نیە من لە دادگادا ئەڵێم من پارتی نیم، ئێوە حەز ئەکەن بەرائەتەکەم بڵاوبکەنەوە! بۆچی ئەبێت ئیفادەکەم لە رۆژنامە بڵاو بکەنەوە، ئەوە بەرائەتە! ئەوە ئیهانەیە، ئەوە خۆ سوک کردنە، لەبەرئەوە نایکەم".

زۆریان هەوڵدا ئیفادە بنوسم، منیش گوتم نایکەم، بەڵام خۆشیان ئەیانزانی کێ پارتیە و کێ کۆمۆنیستە، دیار بو لە کۆیە، لە ڕانیە و لە سلێمانی زانیارییان هەبو، کێ چییە! خەڵک هەمیشە چاودێری ئەکران و ناو بە ناو ئەگیران، بەڵام دوایی هەمو بەرئەبون و هیچیان لەسەر ئیسپات نەدەبو.

## پەراوێزەکان:

١- غەنی بلوریان بە یەکێك لە سیاسەتمەدارانی کوردستانی ئێران دادەنرێت، زۆربەی ژیانی لاوێتی لە ١٩٦٢ تا ١٩٨٩ لە زینداني ئێراندا بەسەر بردوە و لە سەرکردەکانی حیزبی تودە بوە و ڕۆڵی هەبوە لە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، هەرچەندە لە کۆتایی تەمەنیدا یەکێك بو لەوانەی کە لە حیزب جیابۆوە. ڕۆژی ٩ مارتی ٢٠١١ لە شاری بۆن لە ئەڵمانیا کۆچی دوایی کرد.

٢- حیزبی تودە، درێژکەرەوەی حیزبی شیوعی ئێرانی بو، کە لە ١٩٢٠ دا دروست بو، ساڵی ١٩٤٢ ئەم ناوی لەخۆ نا، دوای ئەوەی حیزبی شیوعی قەدەغە کرا، تودە لە پەیرەوانی هێڵی سۆڤێتی بو، لە هیچ کاتێکدا نەیتوانی سیاسەتێکی سەربەخۆ بگرێتەبەر.دوای سەرنەکەوتنی ڕاپەرینی موسەدەق و هاتنەوەی شا، لە ١٩٥٣ دا، زوربەی کادیرانیان هەڵهاتن بۆ بەرلینی ڕۆژهەلات، لەوێ مانەوە تا سەرکەوتنی شۆرشی گەلانی ئێران لە ١٩٧٩دا، ئەم حیزبە نەیتوانی جێ پێی خۆی لەناو جەماوەردا قایم بکات، بۆیە زۆربەی لێپرسراوەکانی و کادیرەکانی لە دوای ١٩٨٣وە، ئیعترافیان کرد یان هەڵهاتن بۆ دەرەوەی ئێران.

٣- سەعید قەزاز، لە سلێمانی لە ١٩٠٤دا ناحیەی خورماڵ لەدایك بوە، بە یەکێك لە تێگەیشتوەکانی سەردەمی خۆی دانەنرێت و بە توانای خۆی بوە بە فەرمانبەر و لە بەرێوەبەری ناحیەوە و هەنگاو بە هەنگاو چۆتە پێشەوە تا لە ١٩٤٤دا بوە بە موتەسەریفی هەولێر و چەند شارێکی تریش.. لە ١٩٥٢ بو بە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی و دوایی بە وەزیری ناوخۆ، دوای شۆرشی ١٤ تەموز خۆی نازادانە تەسلیمی دەسەڵاتدارانی نوێ کرد، ئەوانیش زیندانیان کرد و دادگا بڕیاری هەڵواسینی بەسەردا سەپاند، لە ڕۆژی لە سێدارەدانیدا، وتە ناسراوەکەی دەڵێت: "کە ئێستا مردن زۆر نزیك بۆتەوە لێم و سێدارە نامترسێنێت، کاتێ بۆ سێدارە سەردەکەوم، چەندەها کەس لە خوار خۆمەوە دەبینم کە موستەهەقی ژیان نین"، لە ١٩٥٩/٢/٤ لە سێدارە درا، سەعید قەزاز سەر بە هیچ پارت و گروپێکی سیاسی نەبوە تەنها بەهۆی لێوەشاوەیی خۆی، ئەو پۆستانەی وەرگرتوە.

٤- ژ.ك. یان ژیانەوەی کوردستان، ڕێکخراوێکی سیاسی بو لە ١٦ ئابی ١٩٤٢ لە مهاباد دروستکرا، زوربەی ڕۆشنبیرانی ئەو دەمەی کوردستانی ئێران بەشداربون لە دروستکردنیدا، لەوانە عەبدولرەحمانی زەبیحی ڕۆڵی سەرەکی تێدا بینیوە، ئەم ڕێکخراوە بەئاشکرا دژی دەرەبەگایەتی بو، ئەندامانی لە ڕۆشنبیر و کاسب و جەماوەری شار و دێهاتەکان پێکهاتبو.

ژ.ك. توانی لە شارەکانی کوردستانی عێراق، لە سلێمانی، کەرکوك، کفری و شوێنی تر، لق بکاتەوە و ئیبراهیم ئەحمەد و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و بێکەسی شاعیر ڕۆڵی سەرکردایەتیان تێدا دەبینی.

ژ.ك. بو بە بناغەی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و خۆشی هەڵوەشایەوە.

٥- دەربارەی ئەوەی، مەلا مستەفا ژنی روسی هێنابێت، سەرچاوەی رون و باوەڕپێکراو نییە، زرار سلێمان بەگ، یەکێك بوە لە هاوڕێیانی بارزانی کە لە مهابادەوە لەگەڵیا بوە و ئاگاداری بارودۆخەکە بوە، لە بیرەوەریەکانیدا دەنوسێ: (بارزانی لە پایزی ١٩٥٧ دا لە مۆسکۆوە هاتە تاشکەند و چەند رۆژێك لە ڤریڤسکی مایەوە و لە کۆبونەوەیەکدا لەگەڵ ئێمەدا دەربارەی ئەوانەی، ژنی بێگانەیان هێنابو گوتی: ئەوانەی ژنیان هێناوە، کوردیان لە بیر نەماوە، ژنی خۆیان بە هەمو کوردستان ناگۆڕنەوە، هەر ئەوەشە ئەوەی ئێمەی توشی ئەو هەورازە کردوە و لێی سەرناکەوین". لە کۆبونەوەیەکی تریشدا جنێوی زۆری بەوانە داوە کە ژنی بێگانەیان هێناوە و وتویەتی (ئەوانە پیاو نین). ئەم هێرشانە، مانای ئەوەیە، بارزانی ژنی روسی نەبوە، ئەگینا بەو رونیە هێرشی نەدەکردوە سەر ئەوانەی ژنی بێگانەیان هێناوە. ئەوەی ئاشکرایە، بارزانی ٣ ژنی هێناوە، مەحبوبە، کچی ئەحمەد ئاغای شیروانیە، سێ کوڕو سێ کچی لێبوە، ژنی دوهەمی ناوی حەفیزە بو، کچی عەبدولڕەحیمی بارزانیە و کوڕ و کچێکی لەم ژنەش هەبوە، خێزانی سێهەمی حەمایل خان بوە، کچی مەحمود ئاغای زێباری بوە و لەمیش شەش کوڕ و دو کچی بوە). (زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی لاپەرە ٢١٠ و ٢١٨، بیرەوەریەکانم لە ساڵانی ١٩٤٣ — ١٩٧٧، چاپخانەی رەهەند سلێمانی - ٢٠٠٢).

٦- زراری سلێمان بەگ لە بیرەوەریەکانیدا بەم شێوەیە باسی ئەم مەسەلەیە دەکات: (لە پڕێکا دەنگ و باسێك راگەینرا، بریارێکی زۆر گرنگ لە سەرکردایەتی سۆڤێتەوە دەرکراوە، بە رەزامەندی ئەنجومەنی باڵای سۆڤێت و حیزبی کۆمۆنیست و ئەنجومەنی وەزیرانی سۆڤێت، بە دانانی ئەنجومەنێك بۆ کوردە پەنابەرەکان لە شێوەی حکومەتێکی کاتی لە دەرەوەی کوردستان... ئەوەی زانرا سەرۆك کۆماری ئازربیجان (باغیرۆڤ) بە مەبەستی راگەیاندنی ئەو بریارە مەلا مستەفا و شێخ سلێمانی برازای بانگی لای خۆی کردبون و لە زمانی شێخ سلێمان. (باغیرۆڤ) پێشەوازیەکی گەورەی لێکردبون، لە دوایدا پێی گوتبون: "مژدەیەکی زۆر گەورەم پێیە بۆ گەلی کورد، لە رێگای ئێوەوە پیرۆزبایی سەرکردایەتی سۆڤێتان پێڕادەگەیەنم و بە ناوی خۆم و گەلی ئازربیجانەوە گەرمترین پیرۆزبایتان لێدەکەم و پیرۆزبایی لە گەلی کوردی برامان دەکەین". دوای ئەوە گوتبوی: "بۆ جەنابی مەلا مستەفا، ئەوا حەسەنۆف راسپێردراوە هەمو پێداویستیەکانتان بۆ رێکبخات". شێخ سلێمان گوتی: لە کاتێکدا دەرکەوتین، حەسەنۆف و سەرۆك وەزیرانی ئازربیجان لەگەڵمان دەرکەوتن، داوای لە مەلا مستەفا کرد، لیستی ئەوانەی لەو ئەنجومەنە بەشدار دەبن، ئامادەبکات بۆ رۆژی یەکەمین کۆبونەوەی راگەیاندنی ئەنجومەن. لە گەڕانەوەماندا، مەلا مستەفا لەگەڵ میرحاج خەریکی رێکخستنی لیستەکە بون. ئەوانەی بەشداری لە ئەنجومەنەکە دەکەن، ئەوەی زانرا، میرحاج بەپێی رێنمایەکانی مەلا مستەفا لیستەکەی رێکخست و شوێنی هەریەکەی لە ئەندامانی ئەنجومەنی دیارکرد و ئامادەی کردبو، مەلا مستەفا چۆنی دانابون، ئەویش ئاوەهای رێکخستبو، وەك لە دوایی بەدیارکەوت. پێشنیازەکانی سەرۆك کۆمار لەگەڵ ئامۆژگاریەکانی بە میرحاج نەگوتبو پێش رێکخستنی لیستەکە. بۆ هەمان مەبەست میرحاج راپۆرتێکی سیاسیشی ئامادە کردبو بۆ رۆژی

دیاریکراو، رۆژی ۱۹٤۸/۱/۱۹ دیاریکرابو بۆ بەستنی یەکەم کۆبونەوەی دامەزراندنی ئەنجومەنی کاتی بۆ کوردە پەنابەرەکانی دەرەوەی کوردستان.

لە رۆژی دیاریکراو لە باکۆ، پایتەختی ئازربیجان، کۆبونەوەکە ئەنجامدرا، لەو کۆشکەی بۆ ئەنجومەنەکە دەستنیشان کرابو، ئەوانەی دەستنیشان کرابون بۆ ئەندامێتی ئەو ئەنجومەنە بریتی بون لە: مەلا مستەفا، سەرۆك، شێخ سلێمان بارزانی، میرحاج ئاکرەیی، علی محەمەد سدیق بارزانی، سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، محەمەد نجیب بەرواریی، عبدولرحمان مفتی ئامێدی، سەید عەزیز شەمزینی، رەحیم قازی سابڵاخی، عەلی گەلاوێژ سابڵاخی... لە دوای خوێندنەوەی لیستەکە، وتاری حکومەتی ئازربیجانی سۆڤێت و سەرکردایەتی پەنابەرەکانی ئازربیجانی ئێرانی خوێندرانەوە، لەگەڵ پیرۆزبایی فەرماندەی سوپاکانی قەفقاس.

لە دوایدا، سەرۆك وەزیرانی ئازربیجان (حەسەنۆف) بە بارزانی گوت: جەناب، ئەگەرچی ئێمە دەست ناخەینە نێو ئیشوکارەکانتان، بەڵام تێبینیم ئەوەیە رێنمای و ئامۆژگاریەکانی سەرۆك کۆمار لەو لیستەی کە خوێندرایەوە رەنگی نەدایەوە. کاتێك میرحاج گوێبیستی ئەوە دەبێت، کە رێنمایی و ئامۆژگاری هەبوە و پێی نەوتراوە، هەر ئەوکاتە ئاڵۆز بوبو، یەکسەر نامەی دەستکێشانەوەی نوسی و دەرکەوت و نەگەرایەوە. یەکسەر گەرابۆوە سەربازگەکەی سەر لێواری دەریا. دوای چەند رۆژێك دوای وازهێنانی میرحاج، عەبدولرەحمان موفتی، محەمەد نەجیبی بەرواری و سلێمان بەگیش گەرانەوە لای میرحاج. هەر دوای ئەوان رەحیمی قازی و عەلی گەلاوێژیش ئەوێیان بەجێهێشت، ئەو دەنگە بەرزە کپ بو، شادی و خۆشی بو بە پەرۆشی) (زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی (بیرەوەریەکانم لە ساڵانی ۱۹٤۳ – ۱۹۷۷ – ل. ۱۹٤ چاپخانەی رەهەند سلێمانی - ۲۰۰۲).

# فێستیڤاڵی وارشۆ و نازم حیکمەت

*** لەو سەردەمەدا، ئێوە چۆن چونە فیستیڤاڵی لاوان؟ ئایا بانگهێشت کرابون، یان خۆتان چون؟ یاخود ئەندامی وەفدی لاوانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بون؟**

- ئەگەر بە باشی بزانیت ئەوە پرسیارە با بە تەسەلسول بۆی بچین، چونکە دو جۆر فێستیڤاڵ هەبو، فێستیڤاڵی ١٩٥٥ لە وارشۆ و فێستیڤاڵی ١٩٥٧ لە مۆسکۆ.

*** ئێوە بەناوی کێ ڕۆشتن بۆ ئەو فیستیڤاڵە؟**

- لە عێراق بڵاوکرایەوە کە ئەمساڵ فێستیڤاڵی پێنجەمی لاوان دەگیرێت، بە دزیەوە کۆمیتەیەک دروستکرا بۆ ئامادەکردن و بەشداری لە فێستیڤاڵی وارشۆ، ئێمەش لەگەڵ پارتی کۆمۆنیست، بەشداریمان تێدا کرد، ئێمە یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان و ئەوانیش لاوانی دیموکراتی عێراقی بون. بۆئەوەی بچین ئەبوایە پاسپۆرت و پارەی سەفەر پەیدا بکەین و بڵاوکراوە و دیاریش لەگەڵ خۆماندا بەرین.

ئەوکاتە، ئەوەی کە گرنگ بو جلی کوردی، کڵاش و کڵاوی کوردی بو، خۆ ئەگەر پۆستەرات و بڵاوکراوەی تر هەبێت زۆر باشتر بو.

ئێمە، هەمو پێویستیەکانمان پەیداکرد و کۆمانکردنەوە و کۆمەڵێک یارمەتیشمان لە خەڵک کۆکردەوە، نوێنەرانی پارتی لە وڵاتەوە بریتی بون لە: مەلا شوکر مستەفا، نەجیب خەفاف کە لە تورکیا بو، منیش.

لە ڕێگای سوریاوە سەفەرمان کرد، من موشکیلەم هەبو، چونکە ئەوان هەردوکیان پەساپۆرتیان هەبو، من پەساپۆرتم نەبو، برادەرێکمان هەبو بەناوی (محەمەد موسی سابیر)، پاساپۆرتەکەی ئەومان تەزویر کرد و وێنەکەی ئەومان لێکردەوە و ئەوەی خۆمان پێوەنا.

بەو پاساپۆرتە، بە شەمەندەفەر لە موسڵەوە چوین بۆ حەڵەب، لەوێشەوە چوینە شام، ئینجا پەیوەندیم بە برادەرانی ترەوە کرد.

لەوێ، ناوی خۆم نوسی و ڕۆیشتین بۆ وارشۆ، لەوێ، دو کەسی تریشمان پەیداکرد، هەمو بوینە حەوت کەس.

ئێمە ویستمان بەناوی وەفدی کوردیەوە بەشداری بکەین، بەڵام کۆمۆنیستەکانی عێراق نەیانهێشت، هەتا چوینە سەر یەکێتی لاوانی دیموکراتی جیهانی، ئەوانیش گوتیان نابێت ئێوە بەناوی وەفدی کوردستانەوە بەشداری بکەن!

ئێمەش بڕیارماندا لەبەردەم بارەگای لاواندا مانبگرین، لە کۆتاییدا چارەسەرێکی مام ناوەندیمان دۆزیەوە، ئێمە وەک گروپێک لەناو وەفدی عێراقیدا بین و مافی هەندێک چالاکیمان هەبێت، وەک ئەوەی، دیاریەکان بەناوی خۆمانەوە دابەش بکەین، بانگهێشتی خەڵک بکەین، چاوپێکەوتن بەناوی خۆمانەوە بکەین.

*** ڕۆڵی ئێوە چی بو لە میهرەجانەکەدا؟**

– کەچوینە وارشۆ، دو روداو رویدا کە ئەمەوێت بۆ مێژو بۆت بگێڕمەوە، یەکێکیان کچێکی عەرەب و یەکێکیان کوڕێکی کورد. کچە عەرەبەکە، ناوی بوشرا جلیل برتو بو کە ماوەیەک یەکێک بو لە سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و لەگەڵ جوڵانەوەی ئافرەتانی پارتی کۆمۆنیست بو، کچێکی شۆخ و شەنگی ناودار بو، جلی کوردی لەبەرکرد و لەگەڵماندا لە شایی و هەڵپەرکێی کوردیدا بەشداری ئەکرد، ئێمە زۆر سوپاسمان کرد و زۆر لێی مەمنون بوین.

ئەوەی تریان، کاک محەمەد مەحمود عەبدولڕەحمان (سامی) بو، هاتبو عەگالی لەسەر کردبو، ئەیگوت من "مەشاعیرم عەرەبییە" جلی کوردیشی لەبەر نەکردبو. کوڕێکی تریش هەبو بە ناوی نەوزاد نوری عەبە، کە بە نەوزادە قەڵەو ناسرابو، خەڵکی سلێمانی بو، ئەویش هاتبو بەهەمان شێوە عەگالی لەسەرنابو!

*** ئەوانە لەگەڵ کام وەفد هاتبون؟**

– ئەوانە لەگەڵ حیزبی شیوعی هاتبون، پارتی کۆمۆنیست ئەیویست وانیشان بدات، کە وەفدی لاوان تەنها لاوانی کۆمۆنیست نین، بەڵکو لاوانی پارت و ڕێکخراوەکانی تریشیان لەگەڵدایە کە لە راستیدا وابو، وەفدەکە تەنها ئێمە و حیزبی شیوعی و جەماعەتی رایەتی شەغیلە بوین، واتا ئەو سێ ئیتیجاهە سیاسییە تێیدا بەشداربو.

وەفدەکە، منیان کردبو بە جێگری سەرۆکی وەفدی عێراقی، سەرکردەیەکی نەقابی شیوعی ناسراو بو کە دوایی بەعسیەکان کوشتیان، دکتۆر (صلاح الحافظ) یشمان لەگەڵ بو، مامۆستای یاسا بو لە کوللیەی حقوق، بەڕاستی زۆر یارمەتی

داین، ئەوکاتە ئەو یەکێک بو لەو کەسانەی لە حیزبی شیوعیدا عەقڵیان زۆر کراوەبو لەسەر مەسەلەی کورد و خەباتی کورد، ئەو لە پاریس ژیابو. ئەو زۆر یارمەتی دام و هانی دام و گوتی: برۆ بڵێ خۆ ئەمە فێستیڤاڵی لاوانە نەک کۆنگرەی ئەحزابی شیوعیە!.

(کەریم مروە)ش کە جاران جێگری سکرتێری گشتی حیزبی شیوعی لوبنانی بو، ئەو زۆر موعاریز بو، زۆر کۆسپی هێنایە پێشمان، ئەوکاتە لێپرسراوی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست بو لە یەکێتی لاوانی جیهانیدا. سۆڤیەتیەکانیش یارمەتیان داین و کابرایەکی سۆڤیەتی هەبو بە ناوی (رۆمانۆفسکی) بەرگری لەو بۆچونەی ئێمە ئەکرد کە کورد گەلێکە و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە.

هەروەها لاوێکی شیوعی هندی هەبو، ئەویش هەڵوێستی باش بو، بە کورتی ئێمە توانیمان بیسەلمێنین، ئێمە لەناو وەفدی عێراقیدا گروپێک بین و مافمان هەبێت چالاکی خۆمان بنوێنین، دیاری خۆمان دابەش بکەین، دیاریش وەربگرین و دەنگ و رەنگی جیاوازی خۆمان هەبێت.

دو مەسەلەش هەبو، زۆر یارمەتی داین لە ناساندنی خۆمان بە خەڵکەکان، یەکێکیان ئەوە بو، کۆبونەوەیەکمان کرد و نوێنەری وڵاتە گەورەکانی دنیامان بانگهێشت کرد، لەوانە سۆڤیەت، ژاپۆن، ئەندەنوسیا، هیندستان، فەرەنسا، ئینگلیز، ئەمەریکا، بەرازیل، میسر، لەو کۆبونەوەیەدا (یاسر عەرەفات) یش ئامادەبو، ئەو کاتە وەک قوتابیەک لە قاهیرەوە هاتبو، بەناوی وەفدی فەلەستینیەوە بەشداربو.

*** کام کەسایەتی ناودارتان لەو میهرەجانەدا ناسی؟**

- ئەو کۆبونەوە تایبەتیەی ئێمە، گرنگیەکی تری هەبو، ئەویش ئەوە بو، ئێمە چوینە لای نازم حیکمەتی[1] شاعیری ناوداری تورک، زۆر بەگەرمی پێشەوازی لێکردین، ئەملا و ئەولای ماچ کردین و گوتی: "من کوردم وا خۆشدەوێت"، عەتفی زۆر بو لەسەر مەسەلەی کورد و گوتی: من دێم بۆ کۆبونەوەکەی ئێوە، بەستنی کۆبونەوەکەی ئێمە و هاتنی نازم حیکمەت دو هۆبون، کە مەسەلەکەی تەقاندەوە، چونکە نازم حیکمەت ناودارب‌و، ئەو سەردەمە زۆر خەڵک ئەچون بۆ لای، بۆ ئەوەی وەک تەبەروک ئیمزای لێ وەرگرن.

نازم حیکمت، هات بەشداری کۆبونەوەکەی کرد و منیش بەناوی لاوانی دیموکراتی کوردستانەوە وتارم خوێندەوە، لەدوای من نازم حیکمەت وتارێکی پێشکەشکرد و باسی زوڵمی سەر گەلی کورد کرد و گوتی: "ئەبێت زۆر ئاسایی

بێت بۆ گەلی کورد، کە بە مافی چارەنوسی خۆی شادبێت، ئەوانیش وەکو ئینسانی ئەم سەردەمە"، دوایی قسەکەشی بەوە کۆتایی هێنا و گوتی: "من سوپاسی لاوانی کورد ئەکەم، کە دەعوەتیان کردم بۆ ئەم کۆبونەوەیە، تکایەکیشم هەیە لێیان و هیوادارم بێتە دی، ئەویش ئەوەیە، ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستانی ئازاد بانگم بکەن، بۆئەوەی بەشداربم لەو جەژنەدا"، ئیتر ئەوە جەوی فێستیڤالەکەی بەسودی ئێمە گۆڕی.

وتەکانی نازم حیکمەت، گرنگیەگی تایبەتی خۆی هەبو، چونکە شەخسیەتێکی ناسراوبو، بەهۆی ئەوەوە کۆبونەوەکەی ئێمە دەنگی دایەوە چینییەکان و سۆڤیەتیەکانیش وتاریان خوێندەوە و باسیان لە خەباتی کورد کرد، لە سەرەتاوە چینییەکە قسەی کرد، هەرچەندە من پێشتر چینیەکانم بینیبو، ئەوان نەیان ئەزانی کوردستان هەیە، بەڵام دوای ئەو کۆبونەوەیە، سەرۆکی وەفدی چینی هات، گوتی: "بەناوی ١٢٠ ملیۆن لاوانی چینەوە، پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد ئەکەم، بۆ ڕزگاری و سەربەخۆیی و مافی چارەنوس".

ئێمە دیاریماندا بە نوێنەری هەندێ وەفد، لەوانە لاوانی ئەڵمانیای دیموکرات و ئەوانیش پایسکیلێکیان دایني، هەروەها لاوانی چینیش.

بەڕاستی ئێمە بەشداریمان لە هەمو چالاکیەکاندا ئەکرد، هەتا ئەو چالاکیانەی، کە بەناوی وەفدی عێراقییەوە ئەکران، ناو بە ناو من هەر باسی کوردم تێدەخست، بەڕاستی ئەو چالاکیانە بون بە هۆی ئەوەی، من لەوێ بناسرێم و دەعوەت بکرێم بۆ چین.

## سەفەری چین

*** واتا سەفەری چینتان بەهۆی بەشداریتان لە فێستیڤاڵی وارشۆوە هاتە کایەوە؟**

– بەڵێ، لە عێراق دو کەس دەعوەتی چین کران، یەکێک بەناوی لاوانی دیموکراتی عێراقیەوە و یەکێک بەناوی لاوانی دیموکراتی کوردستان کە من بوم، ئەو سەفەرە سەرکەوتنێکی گەورە بو، بۆ لاوانی عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی.

ئێمە بە شەمەندەفەر لە وارشۆوە چوین بۆ چین، چەند شەو و ڕۆژێکی خایاند، لە مۆسکۆ شەوێک ماینەوە، لە شارەکانی تریش ماینەوە، وڵاتی سۆڤیەتمان بە شەمەندەفەر قەدبڕ کرد، تا گەیشتینە چین.

*** لە چین چ چالاکیەکیەکی سیاسیتان هەبو، کێتان بینی؟**

- لە چینیش بە هەمان شێوە، لەهەمو چالاکیەکدا بەشداریم ئەکرد، ئەچومە یەکێتی نوسەرانەوە، ئەمگوت ئەدیب و شاعیرم، ئەچومە لاوان و قوتابیان، خۆم بە قوتابی نیشان ئەدا، بەناوی ئافرەتانی کوردستانیشەوە قسەم ئەکرد و یەک قات جلی کوردی و یەک عەلەمی کوردستانم برد بۆ (مادام سنیات سەن)، ئەو کاتە جێگری سەرۆکی کۆماری چین بو، ژنێکی زۆر سەلاربو، ئەویش لە یەک کۆبونەوەی گەورەدا بەشداریکرد، هەم ئاڵای کوردستانەکەم و هەم جلە کوردیەکەم پێشکەشکرد و ئەو بەشداربونە دەنگی دایەوە.

لە زوربەی کۆبونەوە سیاسی و ئەدەبی و کۆڕە هەمەجۆرەکاندا بەشداریم ئەکرد، جلی کوردیشم لەبەرکردبو، لەسەر ئێخەم نوسرابو: کوردستان و ئاڵایەکی کوردستانم لێ دابو.

*** چەند لە چین مانەوە و دوایی بەرەو کوێ ڕۆشتن؟**

- زیاتر لە مانگێک ماینەوە، کە لە چین گەڕاینەوە، هاتینەوە سوریا، ئێمە لە ١٩٥٧ دا جارێکی تریش لە فێستیڤاڵی لاواندا بەشداریمان کرد.

# فێستیڤاڵی لاوان لە مۆسکۆ

*** بێ ئەوەی بانگهێشت و میوانداری بکرێن، چۆن بەشداریتان کرد لە فیستیڤاڵی مۆسکۆ؟**

- نەخێر، لە عێراق کۆمیتەی ئامادەکردن هەبو، لەگەڵ کۆمیتەی ئامادەکردن لە شام دائەنیشتن، لەوێوە تەنسیقیان ئەکرد لەگەڵ ئەو لیژنەیەی، کە خەڵکی ئەنارد، ئێمەش هەم لە کۆمیتەی ئامادەکردن بوین و هەم ئەچوینە شام.

**※ حکومەتی عێراق، وەفدی حکومی تایبەتی خۆی هەبو بۆ ئەو جۆرە چالاکیانە؟**

– نەخێر، حکومەتی عێراق زۆر دژی ئەو جۆرە چالاکییانەبو، ئەو سەردەمە ئەو چالاکیانە بە شیوعیەت و بە کوفر ئەزانرا، ئەو کەسانەی ئەچون بۆ فێستیڤاڵ، بە دزیەوە ئەچون، واتا ڕەسم بڵاونەدەکرایەوە، نەدەگوترا کێ چوە، ئەگەر بیانزانیایە هەرکەسێک چوە و لەسەری ئیسپات بوایە، ئەوە ئەگیرا، ئێمە گیراین، من یەکێک بوم لەوانە، گیرام و لەگەڵ چەند لاوێکی تری کۆمۆنیستی عێراقی درام بە دادگا، حکومەت شکیان لێ کردین کە چوبین، ئێمەش حاشامان لێکرد و گوتمان درۆیە و ڕاست نییە.

بەشداری لە فێستیڤالی دوەم، کەمێ زەحمەتتر بو، چونکە ئەو پاسپۆرتەی، کە پێی چوبوم، چەند جارێک وێنەکەی گۆرابو، وێنەکە هی محەمەد موسا سادق بو، دوای من، حەبیب محەمەد کەریم بەکاری هێنابو، چونکە ئەویشمان دەستنیشان کردبو کە بچێت بۆ فێستیڤاڵەکە، بۆیە پەساپۆرتەکە پێوەی دیار بو بەکارهاتوە، هەستام بریارمدا لە ڕێی شەنگالەوە سەفەر بکەم، چونکە ئاسان تربو.

کورێکی ئێزدی کە برای مەعاویە بو، هاتبو، بوبو بە پارتی، بەڵام لە بنەوە جاسوسی حکومەت بو، بۆیە منی برد تسلیمم بکات، بەڵام من لە ڕێگا فێڵێکم لێ کرد و رزگارم بو، چوینە جێگایەکی تر لەوێ خۆم تەسلیمی سوریيەکان کرد و منیان گرت دو جانتا دیاریم پێبو، گوتم من هاتوم ئەچمە میهرەجانی لاوان لە مۆسکۆ.

لە خاڵێکی سنورەوە، منیان برد بۆ قامیشلی و پێیان گوتم، بەرت نادەین هەتا لێکۆلینەوە نەکەین، منیش گوتم: باشە ئەکرێت تەلەفۆن بکەم، گوتیان باشە لە قامیشلیەوە تەلەفۆنم لەگەڵ ماڵی ڕەوشەن بەدرخان کرد و مەسەلەکەم تێگەیاندن، ئەو ڕۆژە لە قامیشلیەوە منیان نەقڵ کرد و ڕۆژی دوەم بە جانتاکانمەوە بە حەپسی بردیانم بۆ (حەسەکە). ئەو کاتە، لە شام ناوی ئەفسەرێکی کوردی ناسراو هەبو عەقید محەمەد بو کە نفوز و دەسەڵاتی هەبو، تەلەفۆنی کرد و بروسکەی لێدا کە بەرم بدەن و ڕێگام بدەن بچم بۆ دیمەشق.

ئێوارەبو، کاتێ بروسکەکە گەیشت، کابرا هات گوتی ئێستا بەرت بدەین یان سبەینێ، گوتم وەڵڵا ئێستا دەرئەچم و ئەمەوێ برۆم.

ئەوکاتە نە شەمەندەفەر هەبو، نە ئۆتومبێل، گوتم: چۆن ئەتوانم بگەمە شام؟ گوتیان هەر بە ئۆتۆمبێلی گەورە، واتا کامیۆنی گەورە کە گەنم نەقڵ ئەکات، گوتیان لەسەر شەقامەکە ڕابوەستە و دەست ڕاگرە، ئەگەر جێ هەبو لە پێشەوە،

ئەگەر نا لە سەرەوە شوێنی خۆت بکەرەوە.

بەو شێوەیە راوەستام، پاش یەک، دو سەعات ئۆتومبیلێک هات دەستم لێراگرت، گوتی لە پێشەوە جێگا نەماوە، منیش چوم لەسەرەوە سوار بوم و ئەو شەوە هەتا بەیانی رۆیشتین و نیوەڕۆ گەیشتینە حەڵەب و لە حەڵەب دابەزیم، لە تەنیشت گەراجەکە کەبابخانەیەکی لێبو، چوم کەبابم خوارد و سواری ئۆتۆمبێل بوم، چوم بۆ شام.

*** لەوێ چۆن خۆت گەیاندە ئەندامانی تری وەفدە عێراقییەکە؟**

- کە گەیشتمە شام، هیچ پێداویستی سەفەرم پێ نەبو، نە پاسپۆرتم هەبو، نە لیزەپاسێ، چومە لای عێراقییەکان، گوتیان: "پێویستە تۆ بچیت پاسپۆرت یا لیزە پاسێ پەیدا بکەیت، ئەگینا ناتوانیت سەفەر بکەیت". ئەوان پێشیان خۆش نەبو، سەفەریان لەگەڵدا بکەم، منیش هەستم کرد کە پێیان خۆش نیە، چومە دوکانێک کە جێگای کۆبونەوەی ئەوان بو، لەوانەی کە لەوێ بون: (عەبدولقادر ئیسماعیل بستانی، عەبدولجەبار وەهبی ناسراو بە ئەبو سەعید، جۆرج تەلۆ)، بەوانەم گوت کە لەوێ بون، هاوکاریم بکەن بۆ مەسەلەی سەفەر، ئەوانیش گوتیان: "ئێمە هیچمان پێناکرێت، هەرکاتێک پاسپۆرت یان لیزە پاسێت پەیدا کرد، ئەوا ئەتوانیت لەگەڵ ئێمە سەفەر بکەیت".

منیش بە ناچاری ئێوارەکەی تەلەفۆنم بۆ عەقید محەمەد کرد و سوپاسی هاوکاریەکەیم کرد و گوتم موشکیلەیەکم هەیە، گوتی خەمت نەبێ سبەینێ ئەتوانین یەک ببینین و جێگایەکی بۆ دەستنیشان کردم بۆ یەکتر بینینەکە. بۆ سبەینێ هات و ئۆتومبیلێکی سەربازی بە ئاڵاوە پێبو، سواری کردم بردمی بۆلای ئەو لێپرسراوەی، لیزە پاسێ دەدات لە دائیرەی جەوازات.

رائیدێک لەوێ بو، لەبەری هەستا و جێگاکەی خۆی دایە، گوتی: "ئێستا لیزە پاسێکم بۆ بکە و بیدە بەم پیاوە، ئەو ئێستا عەریزەیەک ئەنوسێ و ئەتانداتێ و منیش ئەیبەم بۆ سەرۆکایەتی کۆماری و ئەیکەم بە پەنابەری سیاسی و خەمت نەبێت بەرێگای یاسایی خۆی دەیکەم".

*** واتا بە خێرایی بویت بە خاوەنی پەساپۆرتی خۆت؟**

- بەڵێ، ئەفسەرەکە گوتی باشە و ناردیان دەست بەجێ وێنەیەکیان گرتم و لیزە پاسەیەکیان بۆ تەواوکردم و خستمە گیرفانمەوە.

لیزە پاسێکی سوریم وەرگرت، پێی سەفەر بکەم بۆ دەرەوە، منیش لای شیوعییەکان باسم نەکرد کە لیزە پاسێم وەرگرتوە، چونکم گوتم بەڕاستی ڕەنگە کۆسپێکی ترم بۆ دروست بکەن، لەبەرئەوە چومەوە لایان، گوتم باشە ئێستا من چی بکەم؟ گوتیان: کاکە گیان، ئەبێت پاسپۆرت یان لیزە پاسێ پەیدا بکەیت! وتم لیزە پاسێ چیە؟ خۆم وا لێکرد، هیچ نازانم، گوتیان لیزە پاس شتێکی وایە ئەبێت بچیت ئەوە پەیدا بکەیت، پەیداکردنیشی ئەوەندە ئاسان نیە و زەحمەتە، ئەوان وایان ئەزانی کە موستەحیلە دەستم بکەوێت، گوتم: باشە من هەوڵ ئەدەم پاسپۆرتێک پەیدا بکەم، بیکڕم، یا دروستی بکەم، یا بزانم لیزە پاسەیەک پەیدا بکەم، گوتیان ئەگەر لیزە پاسێ، یان پاسپۆرتت هێنا ئەوا ئەتوانیت لەگەڵماندا سەفەر بکەیت.

لەو کاتانەدا لەشام هەندێ برادەری ترم بینی، وەک کاک حەمید دەروێش، ئەویش لە ماڵی سینەم خانی کچی جەلادەت بەدرخان، ئەوانەی لەوێ بون، بریتی بون لە هەژاری شاعیر، عەبدولرەحمان زەبیحی، وارێککەوتین ئەوانیش هەوڵ بدەن، بێن بۆ میهرەجانەکە، زۆر هەوڵیاندا، بەڵام هیچ لایەک قبوڵی نەکردن، نە لە وەفدی عێراقی و نە لە وەفدی سوریدا.

ئەوانیش بڕیاریاندا لەگەڵ سینەم خان بە ڕێگایەکی تایبەتدا بێن، بەشکو بێنە ئەڵمانیا و لەوێوە بێن بۆ مۆسکۆ، ئەوەبو ئەوان سەفەرێکی دور و درێژیان کرد و ڕێگایان پێ نەدرا، لە ئەڵمانیاوە گەڕانەوە بۆ سوریا و توشی کوێرەوەرییەکی زۆر بون، ئەوە خۆی لە خۆیدا داستانێکی تایبەتە.

بەڵام ئێمە گیروگرفتی سەفەرمان نەما و خۆمان ئامادەکرد، من دەنگم نەکرد تا ڕۆژێک پێش سەفەر، ئەو ڕۆژەی، بۆ سبەینێ پێویست بو سەفەر بکەین.

هەمو چون بۆ لازقییە و منیش چوم بۆ لایان و سڵاوم لێکردن گوتم: باشە ئێستا ئێوە من نابەن گوتیان: نەخێر تا پەساپۆرت یان لیزەپاسێ پەیدا نەکەیت،! گوتم باشە کاکە ئەوە لیزەپاسەم هێناوە! کە بینیان سەریان سوڕما و گوتیان چۆن دەستت کەوت؟ ئیتر من لەگەڵیاندا لە لازقییەوە ڕۆیشتم، لەوێوە بە پاپۆڕ چوینە دەریای ڕەش و دەردەنێل بۆ ئۆدیسە. لەوێ هەمو ئەوانەی لە وڵاتانی عەرەبییەوە هاتبون، ژمارەیان زۆر بون، یەکیان ئەگرتەوە، وەک سودانی، لوبنانی، ئوردنی، عێراقی و میسری.

لە یادمە پاپۆڕەکە ناوی گروزیا بو، پاپۆڕێکی سۆڤێتی بو، جارێکی تر پێشتر سواری پاپۆڕێکی تر بوم بەهەمان ناو. لە لازقییەوە چوین بۆ (کۆستانسا) کە

میناپەکی رۆمانیە، لەوێوە بە شەمەندەفەر بە بۆدابێست و بۆخارێستدا چوین، بۆ مۆسکۆ.

لە گەرانەوەدا بە فرۆکە هاتمەوە، ئەو جارە لە پەکینەوە بۆ مۆسکۆ، لە مۆسکۆ، چوم بۆ ڤیەننا و لە ڤیەنناشەوە بۆ شام.

لە ئۆدیساوە بە شەمەندەفەر چوین بۆ مۆسکۆ، لە ئێستگەی شەمەندەفەری مۆسکۆ خەڵک هاتبون بە پیرمانەوە، لەناو کوردە سۆڤێتیەکاندا کە هاتبون: قەناتی کوردۆ و چەند کەسێکی تر بون کە لە ئێمە کۆبونەوە، بە تایبەتی ئێمە جلی کوردیمان لەبەرکردبو، دیاربوین، لە خۆشیاندا هەتا قەناتی کوردۆ ئەوەندە گەش بوبو کە جلی کوردی دیبو، هەڵیکردە لاوک گوتن.

لە مۆسکۆش دیسانەوە سور بوین لەسەرئەوەی کە پێویستە ئێمە وەک وەفدی لاوانی دیموکراتی کوردستان چالاکی بنوێنین، بەڵام وەک گروپێک لەناو وەفدی عێراقیدا، مافی کۆبونەوەمان هەبێ و مافی بانگهێشتکردن و پەیوەندیمان بە گروپی بێگانەوە هەبێت، ئەوانیش لەسەر ئەو داخوازیانەی ئێمە رازیبون.

*** لەو سەردەمەدا یەکێتی لاوانی جیهانی، ئێوەی وەک ئەندام قبوڵ کرد؟**

- ئێمە، وەک لاوانی دیموکراتی کوردستان، وەک چاودێر لە یەکێتی لاوان و قوتابیانی جیهانی قبوڵ نەکراین، بەڵام وەکو وەفدی چاودێر دەعوەت ئەکراین.

ئێمە لە یەکەم رۆژی گەیشتنمان بۆ مۆسکۆ، دەستمانکرد بە چالاکی، من ئەمویست کوردێک ببینمەوە بۆئەوەی دەنگمان بگەیەنێتە لای مەلا مستەفا و برادەرانی تر، باش بو، جارێکی تر (محەمەد عەلی هاشم نەجەفی)م دۆزییەوە و قسەم لەگەڵ کرد، رەزامەندی دەربری، هەواڵمان بگەیەنێتە مەلا مستەفا.

*** بۆچی خۆتان راستەوخۆ لە رێگای روسەکان هەوڵتان نەدا بارزانی ببینن؟**

- بەڵێ، ئێمەش هەروامان کرد، من چومە لای وەفدی سۆڤێتی و گوتم من فلانە کەسم و ئەندامی مەکتەبی سیاسی فلانە حیزبم، سەرۆکەکەمان لێرەیە ئەمەوێت ببینین. بێگومان کەلیمەی نهێنیش لەنێوان من و مەلا مستەفا دا لە ١٩٥٥ ەوە دامنابو، بەو ناوەوە پەیوەندی بەیەکەوە بکەین. رۆژێک پێش میهرەجانەکە، ئیستیعرازێکی گەورە کرا، هەمو وەفدەکان بەشداربون، دو کەس هاتن و بە کرمانجی لەگەڵ ئێمەدا قسەیان کرد، یەکێکیان سەید عەزیز بو، ئێمە هەمو جلی کوردیمان لەبەربو، سەلامی لێکردین و هەواڵی پرسین.

وەفدەکەی ئێمە بریتی بو لە: جەباری پیرۆزخان، محامیەکی کەرکوکی بو، بەعسیەکان شەهیدیان کرد، هۆمەر دزەیی، نەجیب خەفاف، شێخ عەلی بامەرنی و چەند کوردێکی شیوعی وەک دارا تۆفیق، د. ئەحمەد عوسمان، حەمە حوسین مەلا دزەیی و نەسرین خانی ژنی دکتۆر قاسملۆ کە لەگەڵ وەفدی ئێرانی هاتبو.

دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی و یەکێکی تر هاتن و گوتیان: ئێوە کوردی عێراقن، گوتمان: بەڵێ، ناوی خۆمان پێ گوتن و گوتمان باشە ئێوە کێن؟ گوتیان: ئێمە کوردی سۆڤێتین، شێخ عەلی بامەڕنیمان لەگەڵ بو، شێخ عەلی منی جیاکردەوە گوتی: مام جەلال ئەمە سەید عەزیزە، گوتی "ئەیناسم، کاتی خۆی ئەفسەر بوە لە عێراق، لە حیزبی هیوا پێکەوە کارمان کردوە، ئەو نەگۆڕاوە، زۆریش دڵنیام، کە ئەو خۆیەتی".

منیش یەکسەر گوتم: کاکە سەید عەزیز ئەوە بۆ خۆتت کردوە بە کوردی سۆڤێتی لێم؟ بەتایبەتی ئەوەی وای لێکردم، زۆر دڵنیابم ئەوە بو، لە شەخسی دوهەمم پرسی کە دوایی دەرکەوت دکتۆر مراد بو، ئەویش گوتی: منیش کوردی سۆڤێتم.

بە سەید عەزیزم گوت: ئەی تۆ خەڵکی کوێیت. گوتی منیش کوردی سۆڤێتم، بە لەهجەکەیدا دیار بو کە کوردی ئێرانە، بۆیە منیش گوتم: کاکە تۆ کوردی سۆڤێت نیت! ئەوم جیاکردەوە گوتم: کاکە تۆ بۆ خۆتمان لێ ئەشاریتەوە، شێخ عەلیش هاتە لامان و گوتی: کاک سەید عەزیز من فلانم، ئێمە یەکتری ئەناسین.

ئیتر سەید عەزیز کەشف بو، گوتی: دەنگ مەکەن!! ئێمەش گوتمان زۆر چاکە، گوتم: هەواڵێک بگەیەنە مەلا مستەفاش کە من لێرەم و ئەمەوێت ببینم، سەید عەزیز گوتی: مەلا مستەفا لێرەیە، بەڵام بینینی ئەو بەستراوە بە رەزامەندی روسەکانەوە، ئەگەر ئەوان رازی نەبون کە ببینن، ئەوا تەرتیبێکی تری بۆ ئەکەین.

**پەراوێزەکان:**

١- نازم حیکمەت، لە ١٩٠١/١/١٥ لە شاری سالۆنیکی لە یۆنان لە دایك بوە، باوکی فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوەی عوسمانی بوە، لە ١٩٢١ دا دەچێتە روسیا و هەژاری ئەو کاتەی روسیا دەبینێ، هەر لە سەرەتای لاوێتیەوە، بۆچونی چەپانە و فکری سۆسیالیستی هەڵگرتوە، هەر لەویش دەستی کردوە بە خوێندن لە زانکۆ و لە ١٩٢٤وە بوە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی تورکی، کە ئەو کاتە قەدەغە بوە. لە تورکیا توشی گیروگرفت و راونان بوەو لە ١٩٣٥ بۆ ماوەی دو ساڵ زیندانی دەکرێت و لە زینداندا شیعرە جوانەکانی دەهۆنێتەوە، دادگای سەربازی لە ١٩٣٥ حوکمی بە ٢٨ ساڵ زیندانی ئەدا و لە زینداندا رۆمانی شەڕ و ئاشتی تۆلستۆی کردوە بە تورکی.

دوای ئەوەی هەڵمەتێکی گەورەی جیهانی کرا، بۆ رزگارکردنی، دەسەڵاتداران ناچاربون لە ١٩٥٠ دا رزگاری بکەن. لە ١٩٦٣/٦/٣ لە مۆسکۆ کۆچی دوایی کرد، لە کاتێکدا کە رەگەزنامەی تورکی لێوەرگیرابۆوە، تورکیا لە ٢٠٠٩/١/٦ دا رەگەزنامەکەیان بۆ گێڕایەوە.

# یەکەم چاوپێکەوتنی بارزانی،
# دوای چەند ساڵ دابڕان، چۆن بارزانیم بینیوە؟

*** دواجار ئەو بینینە چۆن رێکخرا؟**

- بینینی مەلا مستەفا رووداوێکی گرنگ بو، زۆر رۆژ من هەر چاوەڕوان بوم، لە شوێنی فێستیڤاڵەکە دەرنەئەچوم بۆ گەڕان و کاری تایبەتی، بەڵکو ئەمامەوە بە ئومێدی ئەوەی هەواڵێک ببیستم. رۆژێک لە بەردەمی باخی بیناکە بە جلی کوردییەوە دانیشتبوم، دو کەسی باریک و ئەسمەر هاتن، لێم نزیک بونەوە و بە کرمانجی سڵاویان کرد و گوتیان: تۆ وەفدی چ وڵاتێکی؟ گوتم: کوردی عێراقم، گوتیان: وەڵڵا ئێمە هاتوین بۆ لای برادەرێکی ناسیاومان، لەناو وەفدی عێراقیدایە، چونکە ناسیاومانە کە ئەوان وایان گوت، یەکسەر شکم کرد و گوتم: ئەوەی ئەتانەوێت ببینن ناوی چیە؟.

گوتیان ناوی جەلالە، گوتم: کاکە ئەوە منم، گوتم: ئێوە بارزانین؟ گوتیان: نا نا ئێمە کوردی سۆڤێتین، گوتم: کاکە من جەلالم، من چاوەڕێی ئێوە ئەکەم، گوتیان: دەباشە وشەی نهێنی چیە؟ منیش کە وشەکەم گوت، وتیان راستە، خۆیەتی.

*** چی بو وشە نهێنیەکە؟**

- وشە نهێنیەکە (سۆسکە) بو.

*** ئەوانە کێ بون کە هاتبون بە شوێن تۆدا؟**

- یەکێکیان گوتی، من ئەسعەدی خۆشەویم[1]، ئەسعەدی خۆشەوی لای ئێمە ناسراو بو، گوتی: "من هاتوم بتبەم بۆ لای مەلا مستەفا، ئەو چاوەڕوانمان ئەکات".

یەکسەر سواری تەکسی بوین و گەیشتینە بەردەم باڵەخانەیەک و جەرەسی لێدا، مەلا مستەفا خۆی هات دەرگاکەی کردەوە، سمێڵی تاشیبو، رەسمێکی هەیە بە سمێڵ تاشراویەوە، لام وایە ئەوە هی ئەو کاتەیە. ئیتر نازانم وەکو دەروێشێک بۆ لای شێخی خۆی بچێت، ئاوا بو، باوەشم پێدا کرد، نازانم هەر وەکو بێهۆشی و بێ ئاگایی وابو، بەڕاستی زۆر خۆشحاڵ بوم بە دیتنی مەلا مستەفا.

*** یەکەم هەستت چی بو لە بینینی بارزانیدا؟ ئایا ئەو خەیاڵەی، دەربارەی بارزانی لات دروست بوبو لەو بینینەدا، وا دەرچو؟**

- ئەو خەیاڵەی کە لام هەبو دەربارەی ئەوەی کە مەلا مستەفا زۆر خوێندەوارە و دەربارەی مارکسییەت، دایلەکتیک، ئابوری، شارەزا و رۆشنبیرە، لەبەرچاوم رۆیشت چونکە بەو شێوەیە نەبو، بەڵکو بە پێچەوانەوەبو، هەتا دژی ئەومەسەلانەش قسەی ئەکرد. من وام تەفسیرکرد، ئەو ئەیەوێت من تاقی بکاتەوە، لای ئێمە دژی سۆڤێت قسەی کرد و گوتی: "ئێمە خەریک بوین لەگەڵ ئەمەریکا بەهۆی بابەعەلیەوە پەیوەندی بکەین، چونکە پەیوەندی لەگەڵ سۆڤێتدا هیچ سودی نییە"، من هەر وام ئەزانی من تاقی ئەکاتەوە. لەبەرئەوە منیش بە پێچەوانەوە وەڵامم ئەدایەوە.

هەر لەو سەفەرەدا تێگەیشتم، مەلا مستەفا ئەو پیاوە رۆشنبیرە هاوچەرخە نییە کە من چاوەڕێم ئەکرد! بەڵام وەکو سەرکردەیەکی کوردی هاتە بەرچاوم کە مەشاعیری کوردی زۆر زۆر باش بو، واتا هەستت ئەکرد، خەبات ئەکات لە پێناوی مافی کورد و میللەتی کورددا.

مەلا مستەفا، کۆمەڵێک شتی بۆ گێڕامەوە، هەمویم بە ڕاست ئەزانی، واتا یەک قسەی ئەوم بە خیلاف نەدەزانی لەبەرئەوە، ئەو قسانەی کە بۆی گێڕامەوە وای لێکردم، زۆر معجببم پێی، بۆ نمونە، بۆی گێڕامەوە کە: یەکێتی سۆڤیەت لە هەمو مناوەرەیەکی عەسکەری، ئەو بانگ ئەکەن و وەکو خەبیر بەسەر مارشاڵەکاندا و ئەو لەگەڵ مارشاڵە گەورەکاندا دائەنیشێ. جار جار رەقیبە و ئەو سەرکردایەتی هێزێک ئەکات و هەمو جارێک ئەو سەرکەوتو بوە بەسەر ژیکۆف و مارشاڵەکانی تری سۆڤیەتیدا[٢].

هەروەها بۆی گێڕامەوە، چۆن ئەو ئەکادیمیەی عەسکەری سۆڤیەتی تەواوکردوە و پلەی مارشاڵیان داوەتێ، هەروەها بۆی گێڕامەوە، کە قوتابخانەی حیزبی خوێندوە و بە دەرەجەی ئیمتیاز دەرچوە.

*** بۆچی بارزانی بەو شێوەیە باسی ئەو مەسەلانەی بۆ تۆ ئەکرد؟**

– ئەوانە زۆربەی وانەبون، بەڵام ئەو کاتە ئەوەم نەدەزانی کە وانەبوە، باشە بۆ وا بە ناراستی باسی ئەکرد. ئەوە باش بو لە کاتی خۆیدا لە خۆی بپرسی. ئەگەر بمانەوێت باسی شەخسیەتی مەلا مستەفا بکەین، ئەوە زۆری ئەوێت.

بۆ نمونە، ڕۆژێک جۆرەها حادیسەی گێڕایەوە کە لەگەڵ ستالین دانیشتوە و لەگەڵ خرۆشۆف پەیوەندی هەبوە، لە ژورەکەیدا هێشتا وێنەکانی ستالین، مارکس، ئەنگلس هەڵواسرابو، گوتی: "هەتا خۆیان ئەو وێنانە لانەبەن، من لای نابەم"[٣].

هەروەها بۆی باس ئەکردم بە حساب، زۆر نزیکە لە مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی سۆڤێتەوە، ئەوان لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پرسی پێ ئەکەن، ئەوکاتەی کە ئینزاریان داوە بە میسر لەسەر عدوانی سولاسی، بە مەلا مستەفایان گوتوە: "کە پێیان باشە ئەو سەرکردەی هێزێک بکات".

هەروەها لە دانیشتنەکاندا باسی ژیانی خۆیانی بۆ ئەکردم، کە چۆن گەیشتنە سۆڤیەت و چۆن ئازاری زۆریان لە کازاغستان چێشتوە، هەروەها لە دانیشتنێکدا هەر باسی ماڵەوەی خۆیانی بۆ گێڕامەوە، کە چی بەسەر مناڵەکانیان هاتوە. ئەو زۆر دژی شێخ سلێمان قسەی ئەکرد، شێخ سلێمانی کوڕی شێخ عەبدولسەلامی بارزانیە، کە ئەکاتە برازای خۆی، کە خیانەتی لێکردوە و بۆتە جاسوس بەسەریەوە، من هەواڵێکم دایە و گوتم: "کچێکتان داوە بە کوڕی شێخ عەبدولسەلامی شێخ سلێمانی بارزانی، برای عەبدول موهەیمن"، مەلا مستەفا زۆری پێ ناخۆش بو، منیش گوتم ئەو کوڕە، کوڕێکی باشە و شێخ ئەحمەدیش داوێتی، هەروەها ئاگادارم کرد، کە کوڕێکیان بوە، شێخ ئەحمەد ناوی ناوە سابیر.

هەروەها نامەیەکی دامێ بۆ شێخ ئەحمەد، کە ئینتیباعێکی خراپی دایە هەمومان، چەند کاغەزێکم پێ نوسی بۆ مامۆستا ئیبراهیم و شێخ سادق و هەمزە عەبدوڵڵا و چەند شەخسیاتی کوردی تر.

ئەو مەسەلانە وای لێکردم، کە زۆر پێی موعجبیم، کە هاتمەوە بۆ کوردستان هەواڵەکانم بۆ برادەران گێڕایەوە و گوتم: "کاکە مەلا مستەفا مارشاڵە و ئەکادیمیای عەسکەری سۆڤیەتی و قوتابخانەی کادری حیزبی بە دەرەجەی ئیمتیاز تەواوکردوە".

ئەوان لە نامەکان زۆر تورەبون، بە تایبەتی نامەکەی، کە بۆ شێخ ئەحمەدی

نوسیبو، چونکە وا نوسرابو، وەک مورریدێک، کە نامە بۆ شێخی خۆی ئەنوسێ، نوسیبوی کە ئەو سۆفییەکی وەک سەگی بەرماڵیانە، ئامادەیە پێڵاوی بن پێی ئەو بێت و خۆی وا ڕەزیل و بچوک نیشاندابو، هەتا شێخ سادق و شێخ عوبێد نامەکەیان نەدایە، دژی نامەکە قسەیان کرد، ئەوانەی ئەو کاغەزەیان دیوە، مامۆستا ئیبراهیم و شێخ سادق و هەمزە و من بوین.

*** باشە تۆ چۆن ئەو نامەیەت بینی؟**

- من نامەکەمدا بە شێخ سادقی کوڕی شێخ عوبیدی برازای مەلا مستەفا، ئەو کاتە شێخ ئەحمەد لە زینداندا بو، گوتمان ئەو نامەیەی بۆ بەرن، ئەوان نامەکەیان کردەوە و خوێندیانەوە، دوایی بۆیان نەبرد، ئەوان خۆیان نامەکەیان کردەوە نەک من.

ئەو کاتە ئێمە چەپڕەویەکەمان زۆر بە خەستی و زۆر بەجدی گرتبو، من هەروام ئەزانی، بارزانی ویستویەتی من تاقی بکاتەوە، بۆیە بۆچونم دەربارەی مەلامستەفا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات، ئەوم وەک سەرکردەیەکی وەتەنی گەورە ئەبینی و زۆریش پێی موعجببوم.

*** ئەو موعجیبیەت بۆ ئەو، هەروەک خۆی مایەوە دوای ئەوەش کە زانیت بارزانی نامەی وای بۆ شێخ ئەحمەد نوسیوە؟**

- بەڵێ دوای نامەکەش، بەڵام لە مێشکی مامۆستا ئیبراهیم و هەمزە و چەند برادەرێکی تردا گۆڕان ڕویدا، بیریان ئەکردەوە، چۆن ئەبێت پیاو قسەی وابنوسێت، کاک عومەر دەبابەش ئاگای لەونامەیە هەبو، ئەوانە هەمو ڕەئیان گۆڕا لەسەر مەلا مستەفا، بەڵام من زۆر پێی موعجببوم، وەکو سەرکردەیەکی وەتەنی قەومی سەیرم ئەکرد.

*** پێش ئێوە هیچ هێزێکی کوردی، یان عێراقی لەگەڵ مەلامستەفا کۆبوبویەوە؟**

- حیزبی شیوعی عێراقی دەعوەت کرابون بۆ کۆنگرەی بیستەمی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی لە ١٩٥٦ دا، لەوکاتەدا نوێنەریان ناردبوە لای مەلا مستەفا، دیبویان و وێنەشیان لەگەڵدا گرتبو.

ئەوکاتە منافەسەش هەبو، لەنێوان پارتی و شیوعیدا، ئایا کێ مەلا مستەفا بەلای خۆیدا ڕادەکێشی.

*** با بگەڕێینەوە بۆ فیستیڤاڵەکە، بەشداریتان چۆن بو تێدا؟**

– فیستیڤاڵەکە لە ئابی ١٩٥٧ بو، لەوێ هەمو بە جلی کوردیەوە بەشداریمانکرد، بۆ نمونە لە ڕۆژی ئیستعرازدا هەمو لە تەنیشت یەکەوە راوەستابوین، هەر لەناو وەفدی عێراقیدا چەندین چالاکیمان کرد، یەک دو ئاهەنگیشمان گێرا، هەروەها قاتێک جلی کوردیمان برد بۆ (دایکی زوریا) کە لە جەنگی جیهانی دوهەمدا نازییەکان کچەکەیان (زوریا کوسمودیمیانسکایا) ئیعدام کردبو، ئەو کیژە شۆخوشەنگە نیشتمانپەروەرە، بە پەڕەشوت خۆی هەڵدابوە پشت نازییەکانەوە، بەوکارە، وەک قارەمانی رزگاری نیشتمانی لە سۆڤێتدا ناوی دەرکردوە. دایکی لەگەڵ چەند ژنێکی سۆڤیەتی بەشداری ئاهەنگەکەی ئێمەیان کرد، من گوتارێکم تێدا خوێندەوە، دارا تۆفیق بە رەحمەت بێت کە ئەو کاتە شیوعی بو بەڵام هاتبو لە گەڵماندا، وتارەکەی تەرجومەی ئینگلیزی کرد.

دوای ئەوە بیستم ئەو جلە کوردیە، لە مۆزەخانەکەی تانیا لە مۆسکۆ دانراوە، هەروەها لەو چالاکیانەی کە کردمان، ئەوەبو چەند کۆبونەوەیەکمان کرد و چاومان بە چەندین وەفدی بێگانە کەوت و مەسەلەی کوردمان بۆ باسئەکردن. چوینە سکرتاریەتی لاوانی جیهانی و قسەمان لەگەڵ کردن و هەڵوێستیان بەرامبەرمان زۆر باشبو.

*** هەڵوێستی کۆمۆنیستەکانی عێراق و عەرەب چۆن بو بەرامبەر بەو چالاکیانەی، ئێوە ئەتانئنواند؟**

– شیوعیە عێراقیەکان، لەگەڵ عەرەبەکانی سوریا و لوبنان کۆسپی گەورەبون لە پێشماندا، نەیانئەهێشت بچینە یەکێتی لاوان و قوتابیانی دیموکراتی جیهانیەوە و ببین بە ئەندام تێدا، بۆ نمونە، لە هەمو ئەو موناسەبەتانەی، کە ئەکرا، دەعوەت ئەکراین و ئێمە شایی کوردیمان پێشکەش ئەکرد، نەجیب خەفاف بەراستی زۆر رائع بو لە هەڵپەرکێدا، هۆمەر دزەیی دەنگی خۆش بو، گۆرانی خۆشی بۆ ئەگوتین.

کوردەکانی سۆڤیەتیش هاتن بۆلامان، لەو کوردە سۆڤیتانەی کە هاتبون، قەنانی کوردۆ و ڤاریزۆڤا بون. شتێکت بۆ بگێڕمەوە لەسەر ڤاریزۆڤا، ئێمە لە هۆڵی ئەو بینایەی لێی نیشەجێبوین، دانیشتبوین بە جلی کوردی و ئاڵای کوردستانەوە کە لێی نوسرابو (کوردستان- یەکێتی لاوانی کوردستان) لاوانی ئەڵمانیاش هاتبون، تەماشایان کرد و گوتیان وەرن ئەوانە کۆمەڵی Durch Wilden Kurdistan نن

واتا ئەوانە جەماعەتی (بەناو کوردستانێکی کێویدا) کە ئەوە چیرۆکێکە نوسەری ئەڵمانی (کارڵ مای) نوسیویەتی، زوربەی لاوانی ئەڵمانیا کتێبەکانی کارڵ مایان خوێندوەتەوە، لەو ڕێگایەشەوە ناوی کوردیان بیستوە.

ڤاریزۆڤا، کەمێ تورە بو، گوتی وەرن دانیشن، بە ئینگلیزی قسەی ئەکرد، گوتی: "ئێوە رۆڵەی هیتلەرن و ئەویش دنیای کوشت، ئێوە کێوین، نەک ئێمە"، ئەوانیش گوتیان: "وەڵڵا ئێمە مەبەستمان کێوی نیە، مەبەستمان ناوی ئەو کتێبەیە کە کارڵ مای لەسەر کوردستان نوسیویەتی، ئێمە مەبەستمان تەنها ناوی کتێبەکەیە، مەبەستی کتێبەکەش ئەوەیە، کوردستان دەستی لێ نەدراوە، واتا بە خام ماوەتەوە".

هەرچیەکیان کرد، گوتی "نا، ئێمە میللەتێکی تێکۆشەرین، ئێمە خەباتمان هەیە، ئێوە هیتلەرتان پەروەردە کردوە، ئێوە مرۆڤایەتیتان توشی بەڵا کردوە، کێوی ئێوەن".

* ئەی هەڵوێستی کۆمۆنیستە عێراقیەکان لەوێ چۆن بو؟

- وەک لەوەو پێش باسم کرد، ئێمە لەگەڵ شیوعیەکان هەمیشە موناقەشەمان لەسەر ئەوە بو، ئێمە ئەمان گوت: کورد ئوممەیە و ئەوان ئەیان گوت کورد ئوممە نیە، من دو سێ شیوعی دۆستم هەبون، یەکێکیان نوری عبدولرەزاق بو، ئەوکاتە سکرتێری یەکێتی قوتابیانی جیهانی بو، لەگەڵ دارا تۆفیق، ئەمزانی قەناتی کوردۆ چەند کوردپەروەرە و حەز لە بەرژەوەندی کورد ئەکات، بۆیە منیش بەوانم گوت: "باشە، ئێوە ئەگەر باوەڕ بەمن ناکەن، فەرمو ئەوە کابرایەکی کوردی سۆڤیەتییە، پرۆفیسۆرە، نیشانەی قارەمانی سوڤێتی وەرگرتوە و ئەندامی حیزبی بەلشەڤیکە". ئەوان بەیەکەوە کەوتنە گفتوگۆ، بۆیە دوایی نوری عبدولرەزاق بانگی کردم گوتی: "وەرە کاکە دانیشە، تۆ لەچاو قەناتی کوردۆدا، زۆر ئومەمیت و پرۆلیتاریت، وەرە لەوە ڕزگارمان بکە!!"

پێش ماوەیەک، نوریم لە لەندەن بینی ئەو مەسەلەیەم بۆ گێڕایەوە، مەسەلەیەکی تر هەبو نیشانی ئەدا کە هەستی نەتەوایەتی لای کوردی سۆڤیەت نەفەوتاوە. کۆلۆنێلێکی کورد لە (ئیرکودسکڤ) بە فرۆکە هاتبو، تەنها لەبەرئەوەی، کورد ببینێت و دو کیسە خواردنیشی لەگەڵ خۆی بۆ ئێمە هێنابو، لەگەڵ چەند بوتڵێ شەراب و ڤۆدگاش.

میهرەجانی مۆسکۆ سەرکەوتنێکی گەورەبو بۆ کورد، بە تایبەتی کە مەلا

مستەفاشمان بینی، بۆ یەکەمجاریش سۆڤێتییەکان بە رەسمی لەگەڵماندا دانیشتن.

پێش بینینی مەلا مستەفا، سەید عەزیز هەمو رۆژێک لەگەڵماندا بو، دکتۆر موراد یشمان ناسی و نامەیەکیشم بۆ میرحاج نوسی.

لە دکتۆر مرادم پرسی، مەلا مستەفا لە کوێیە؟ من تەنها ئەمەوێت ببینم، گوتی: "کاکە کێ ئەزانێ مەلا مستەفا لە کوێیە؟ کێ ئەزانێ ها لە تاجیکستان! ها لە لەهستان کەس نازانێ لە کوێیە"!.

ئەو رۆژەی لای مەلا مستەفا دانیشتبوین ئەوەندەمان زانی دکتۆر مراد هاتە ژورێ سەلامی کرد گوتم: "ها کاک دکتۆر موراد، ئێرە لەهستانا"؟ پێکەنی و گوتی "کاکە بە دەستی من نەبو، ئەبوایە ئەوە بڵێم"!

ئێمە بە هەمان رێگا کە لێوەی هاتبوین گەراینەوە بۆ لازقییە، لە سوریا.

## دروستکردنی پارتی کوردی لە سوریا

**※ لە گەڕانەوەتاندا هیچ چالاکییەکتان هەبو لە سوریا؟**

– لە دوای میهرەجانەکە، لە گەڕانەوەماندا، هاتینەوە سوریا، ئێمە ساڵێک پێشتر، واتا لە ١٩٥٥دا کە لەوێوە چوین بۆ دەرەوە، تۆوی ئەوەمان چاندبو، حیزبێکی کوردی وەک پارتی خۆمان لەوێ دروست ببێت.

دوای من، زەبیحی و هەژار چوبونە ئەوێ، چونکە لە عێراقەوە رایان کردبو لە شام جێی خۆیان کردبوەوە، زەبیحی لە تربەسپی لای حەسەن ئاغای حاجۆ جێی خۆی کردبوەوە.

ئەو سەردەمە، بیروباوەری کۆسمۆپۆلیتی باوبو[٤]، زەبیحی لەژێر ناوی محەمەد ئەحمەد شنۆیی کتێبێکی لە دژی کۆسمۆپۆلیتی نوسیبو، ناوەرۆکەکەی ئەوەبو، ئێمە هەمو کوردین و هەمو مرۆڤین، بەڵام هەر میللەتەش مافی خەباتی سەربەخۆی هەیە لە پێناوی رزگاری نەتەوەیی خۆیدا و گەلی کودیش لەو میللەتانەیە.

لەناو کوردی سوریا جوڵانەوە نەبو، زۆربەی کوردەکان سەر بە حیزبی شیوعی بون، حیزبی شیوعی هیچ ماوەی نەئەدا هیچ حیزبێکی کوردی دروست ببێت،

ئێمە بە هۆی (ئاپۆ عوسمان سەبری) یەوە تەئسیرمان لەسەر هەندێک گەنج کردبو، لەوانەی کە ناوەکانیانم لە بیرە، حەمید دەروێش، نورەدین زازا و چەند کوردێکی تریش.

کە من ١٩٥٧ چومە شام، تەماشام کرد بارودۆخێکی گونجاو هەیە بۆ دروستکردنی حیزبی کوردی، چاوەڕێم کرد تا بڕیار لە عێراقەوە بدرێت بۆ دامەزراندنی حیزبێکی لەو جۆرە.

بێگومان، مەلا مستەفام دیوە و لە سۆڤییەت هاتومەتەوە و نوێنەری پارتی عێراقم، ئەمانە هەموی خاڵی بەهێز بون بۆ من، ئەوانیش زۆریان پێدا هەڵئەگوتم و هەمو هەوڵماندا بە یەکەوە پارتی دیموکراتی کوردی سوریامان دروستکرد.

دکتۆر نورەدین زازا، کرا بە سکرتێری پارتی، مەکتەبی سیاسیەکەیان بریتی بو لە: (ئاپۆ عوسمان سەبری، حەمید دەروێش، ڕەشید حمۆ، بەشیر سەبری و خەلیل محەمەد)، کە ماوەیەک لە سۆڤێت خوێندی و دکتۆرای وەرگرت و دوایی هاتە عێراق.

ئەمانە لەوێ حیزبێکیان بە هاوکاری ئێمە دروستکرد، واتا ساڵی١٩٥٧ ساڵی دروستکردنی حیزبی کوردی سوریاش بو. بێگومان شیوعیەکان زۆر زۆریان پێ ناخۆش بو.

لەو کەسانەی ئەوکاتە زۆر دژی کوردایەتی بون و لەژێر کاریگەری شیوعیەکاندا بون، جگەرخوێنی شاعیر بو، جگەرخوێن لە ١٩٥٥ ئەندامی (بزوتنەوەی ئەنساری سەلام) بو، تەسریحێکی زۆر خراپیدا بو بۆ ڕۆژنامەیەک لە حەڵەب، لێیان پرسیبو "راستە ئەڵێن تۆ لە جوڵانەوەی کوردایەتیدا کار ئەکەیت؟" ئەویش ئەڵێت: "نا کوردایەتی خراپە! ئەوە دەستکردی حیلفی سەنتۆیە، ئیستعمارە ئەیەوێ ناکۆکی دروست بکات، ئێمە هەمو سوریین و براین".

بەڵام لە ١٩٥٧ بەرەو کوردایەتی هات، بو بە دۆستی ئێمە، کۆمەڵێک کەسانی کوردی ناسراوی تر هەبون لە سوریا، وەک مەمدوح سەلیم، پیاوێکی زۆر باش بو هەستی کوردایەتی هەبو، پشتگیری پارتی ئەکرد، بەڵام نەبو بە ئەندامی پارتی، هەروەها قەدری جان هەبو، ئەویش لەژێر کاریگەری حیزبی شیوعیدا بو، پشتگیری پارتی نەدەکرد، بەڵام هاتبو بۆ میهرەجانی مۆسکۆ. قەدری جان وەکو ئەدیب و شاعیر ناوی دەرکردبو، ئەو شیعرێکی هەیە بۆ مەدحی بارزانی و بۆ مەلا مستەفای ناردبو.

قەدری جان، سەر بە حیزبی شیوعی بو، وەکو چۆن عەبدوڵڵا گۆران لە عێراق سەر بە حیزبی شیوعی بو، ئەویش لە سوریا سەر بە حیزبی شیوعی سوری بو.

*** تۆ چەند لە سوریا مایتەوە و لەوێ چیت نەکرد؟**

- من لە سوریە بوم بە پەنابەری سیاسی، تا لە میهرەجانەکە گەرامەوە عقید محەمەد، زو کاری پەنابەریەکەی بۆ جێبەجێ کردبوم، بوم بە پەنابەری سیاسی و مانگی ٣٠٠ لیرەم وەرئەگرت، ئەو پارەیە بۆ ئەوکاتە زۆر زۆر بو.

لە ١٩٥٧ دا کە هاتمەوە شام لەوێ بۆ یەکەمجار ڕوبەڕوی کەمال فوئاد بومەوە، کەمال فوئاد، تازە ببو بە پارتی و هاتبوە دەرەوە، بۆئەوەی بچێ بۆ خوێندن.

## جیابونەوەی کادیرە کوردەکان لە حیزبی شیوعی

*** کێ بون ئەوانەی لە ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیست جیابونەوە؟**

- لەو کادێرانەی کە جیابونەوە، کاک کەمال فوئاد، حەمید عوسمان و ساڵح حەیدەری بون، هەرسێکیان ئەندامی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراقی بون، لە ساڵی١٩٥٧ دا گەیشتبونە ئەو ئەنجامەی، پێویستە لە کوردستان یەک حیزبی دیموکراتی شۆڕشگێڕی پێشڕەو هەبێت، شیوعییە کوردەکان بچنە ناو ئەو حیزبەوە، ئەو حیزبەش هاوشان و تەبا بێت لەگەڵ حیزبی شیوعی و پێکەوە خەباتی هاوبەش بکەن.

تەنانەت ئەگەر نەتوانرا بەرەیەک دروست بکرێت، با کۆمیتەیەکی هاوبەش هەبێت بۆ سەرکردایەتی خەباتی هەردولا.

ئەم بیروڕایانەیان لەناو حیزبی شیوعی باسکردبو، بەڵام حیزبی شیوعی بە توندی دژی وەستابو. کوڕاسێکیان دەرکرد، زۆر جنێوی تێدا بو بە پارتی، ئەو کەسانەیان بە تەسفەوی ناو بردبو.

من پێم وایە، چەند ساڵێک لەمەوپێش ئەو بۆچونانەیان لەو کوڕاسەدا چاک کردەوە.

بۆ نمونە، لەو خاڵانەی کە ڕەخنەیان لێ گرتبو، ئەوەبوە، ئێمە گوتومانە نەوتی کوردستان، ئەوان ئەیان گوت، ئەوە جیابونەوەیە، یان گوتومانە (الملك العربي)، ڕەخنەشیان لەوە ئەگرت!.

لە شام، کاک کەمال فواد، زەبیحی، هەژار و من لەوێ هەمو پارتی بوین، کاک کەمال تەئسیری کردبوە سەر عێزەدینی مستەفا رەسوڵیش، عێزەدین موستەفاش ئەو کاتە تەئیدی پارتی ئەکرد، لەو هێڵەبو.

کاتێ کاک کەمال فوادم لەوێ ناسی، بەڕاستی زۆر چوە دڵمەوە، پیاوێکی هێمن، لەسەرخۆ و عاقڵ بو، بەیەکەوە کەوتینە چالاکی لەگەڵ زەبیحیدا.

ڕۆژێک لە شام پیاسەمان ئەکرد، توشمان بوبە توشی پارێزەر (فائق سامرائی و سدیق شەنشەل)ەوە، ئەوان پارێزەر بون و هاتبون بۆ کۆبونەوەی پارێزەرانی عەرەب. هەردوکیان ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی ئیستقلال بون، ئەو کاتە حیزبی ئیستقلال داخرابو، بەڵام دۆستایەتیان لەگەڵ عەبدولناسر هەبو. کاتێ کە توشی یەک بوین، پاش چۆنی و چاکی، ئێمەیان دەعوەت کرد بۆ چایخانەیەک و لەبیرمە دەعوەتی کەبابیشیان کردین.

ئەو کاتە، پەیوەندی نێوان حیزبەکانی عێراقی باش بو، هەرچەندە شێوەی بەرەی بە خۆوە نەگرتبو، بەڵام بە کردەوە شێوەیەک بو لە هاوکاری سیاسی لە نێوان حیزبەکاندا، ئەو هاوکاریە لە هەڵبژاردنی حوزەیرانی ١٩٥٤ دا رەنگی دایەوە، بوە هۆی ئەوەی یەک لیستی بەرەی نیشتمانی لەسەرتاسەری عێراقدا پێشکەش کرا کە لە پاشاندا لە چەندین چالاکی سیاسی لە نێوان ئەو حیزبانەدا رەنگی دایەوە.

# حیزبی شیوعی و گروپە چەپەکانی عێراقی، جیابونەوە، یەکگرتن

*** هەڵویستی نوری سەعید کە نوێنەرایەتی سیاسەتی رەسمی پاشایەتی دەکرد چی بو، بەرامبەر بە هاوکاری نێوان حیزبەکان، ئەی رۆڵی گروپە چەپەکان چۆن بو؟**

– نوری سەعید، هەمو حیزبەکانی داخست، هەمو رێگایەکی چالاکی دەستوریی و قانونی لێ قەدەغەکردن، رۆژنامەکانی، حیزبی وەتەنی دیموکراتی، حیزبی ئیستقلال و حیزبی جەبهەی شەعبی داخست و ئەو حیزبانەش کەوتنە خەباتی نهێنی.

پەیوەندی نێوانی ئێمە و حیزبەکانی عەرەبیش بە گشتی باش بو، ئەو سەردەمە نێوانمان لەگەڵ حیزبە شیوعیەکان و گروپە چەپەکانیش بەرە و باشی ئەچو.

لە ١٩٥٥دا سێ رێکخستن هەبون، بەناوی شیوعیەوە ئیشیان ئەکرد، یەکێکیان حیزبی شیوعی عێراقیە رەسەنەکە بو، بەناوی (مجلة القاعدة)وە ناسرا بو، ئەوی تریان، حیزبی شیوعی، بەناوی (راية الشغيلة) کاری ئەکرد و بە سەرکردایەتی عەزیز محەمەد و جەمال حەیدەری ناسرا بو، ئەوانە لە حیزبەکە جیا ببونەوە، باڵی راستی حیزبەکە بون و لە دژی ئەو دروشمە چەپ و شۆڕشگێڕانە بون کە زەمانی خۆی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی هەڵی گرتبون.

بەشی سێهەمیش (وحدة الشيوعيين العراقين) بو، بە سەرۆکایەتی مامۆستا عەزیز شەریف.

لە هەمویان نزیک تر لە ئێمەوە (وحدة الشيوعيين العراقيين) بو، چونکە هەر لە کۆنەوە پەیوەندی نێوان پارتی و حیزبی شیوعی باش بوە، پاشان هەڵوێستەکانی مامۆستا عەزیز شەریف، دەربارەی مەسەلەی کورد، خۆی لە نامیلکە نایابەکەیدا (المسالة الكردية في العراق) نواندبو، وای کردبو کە زیاتر

پەیوەندی لە نێوانمان پتەوتر بێت.

لە روی ئایدیۆلۆژییەوە، بۆچونی پارتی جیاواز بو لەگەڵ (رایة الشغیلة)، چونکە لە کاتێکدا (رایة الشغیلة) ئەچونەوە بە گژ دروشمی روخاندنی رژێمی پاشایەتی و دامەزراندنی جمهوریەتی دیموکراتی شەعبی و خەبات بۆ مافی چارەنوس، پارتی، هەرسێ دروشمەکەی هەڵگرتبو و خەباتی بۆ ئەکردن.

باشم لە بیرە، جارێکیان لە موناقەشەدا لە گەڵ سالّح حەیدەری کە نوێنەری (رایة الشغیلة) بو، باسی ئەوەم بۆ کرد کە دیموکراتییەتی شەعبی دروشمێکی کۆنە و لە دوای لینینەوە، ماوتسی تۆنگ هەڵی گرتوە، هەروەها باسی ئەوەی لینینم بۆ کرد، لە دو تاکتیکی سۆسیال دیموکراتەکاندا، پاشان کتێبەکەی ماوتسی تۆنگم لە بەردەست بو (حول الدیمقراطیة الحدیثة یان الدیمقراطیة الجدیدة)، پێمگوت: "چۆن ئێستا لە پاش جەنگی جیهانی یەکەمەوە دروشمی دیموکراتی، بۆتە (دیموکراتی نوێ) و (دیموکراتی شەعبی) و یان (دیموکراتی بە شێوەی نوێ)" ئەو شتانەم بۆ خوێندەوە، رەنگی زەرد بو، تێکچو، گوتی: "کەواتە ئەمانە هەمو بناغەی فکری و بنەمای فکری ئێمەی هەڵتەکاندەوە، چونکە ئێمە، لەسەرئەوە دامەزراوین کە دروشمی دیموکراتیەتی شەعبی شتێکی خراپە"، بۆیە منیش گوتم: "کاکە ئەوە مارکسییەت و تاقیکردنەوەی مارکسییەت وا ئەڵێ، ئیتر کەیفی خۆتانە و خۆشتان چۆن بیر لە مەسەلەکان ئەکەنەوە با وابێت".

*** ئەگەر نێوانتان لەگەڵ هەمو لایەنەکان باش بو، بۆچی هەوڵی ئەوەتان نەدا، لەیەک نزیک ببنەوە؟**

- ئێمە لەگەڵ هەرسێ لایەن، بەینمان باش بو، لە ١٩٥٥ دا هەوڵماندا، ئەو گروپانە لێک نزیک بکەینەوە، بە دەستپێشخەری ئێمە و لە وەکرێکی ئێمەدا کە لە نزیک کوللیەی حقوق بو، کۆبونەوەیەک رێکخرا بۆ نوێنەرانی پارتی و حیزبی شیوعی عێراق (القاعدة) و حیزبی شیوعی عێراق (رایة الشغیلة) و (وحدة الشیوعیین العراقیین).

لەو کۆبونەوەیەدا، پێشنیازی یەکخستنەوەی هەرسێ باڵە شیوعییەکە کرا، لە لایەن ئێمەوە، ئەو کەسانەی، لەو کۆبونەوەیەدا ئامادەبون بریتی بون لە: سەلام عادل، محەمەد سالّح عەبدەلی لە جەماعەتی (قاعدە)، محەمەد حەمزە سلیمان، لە جەماعەتی (رایة الشغیلة)، عەبدولرەحیم شەریف، لە جەماعەتی (وحدة النضال).

سەلام عادل، پێشنیازی ئەوەی کرد: "کە پارتیش بە ئیعتباری ئەوەی مارکسی لینینی کردوە بە پرەنسیپی خۆی، با بەشداری بکات لە دروستکردنەوەی ئەو حیزبە تازەیە، بەو مەرجەی هەمو شیوعییە کوردەکان، هی هەمو حیزبەکان بچنە ناو پارتیەوە، پارتیش وەک حیزبێکی نیشتمانی دیموکراتی شۆڕشگێڕ بمێنێتەوە و شیوعیە عەرەبەکانیش لەناو حیزبی شیوعیدا بمێننەوە".

ئێمە، بۆچونمان وابو، "با هەمو شیوعیە کوردەکان لەناو پارتیدا یەک بگرنەوە، پارتی سەرکردایەتیەکی هاوبەش لەگەڵ ئەو حیزبە شیوعیەی، هەمو حیزبە شیوعیەکان لەناو خۆیدا کۆکردۆتەوە دروست بکات".

هەرچۆنێک بێت، بەناوبژیکردنی ئێمە، جەماعەتی (وحدة الشیوعیین العراقین) و حیزبی شیوعی عێراقی (القاعدة) پێکهاتن و بەیانێکی هاوبەشیان دەرکرد و چونە ناو حیزبی شیوعییەوە.

لە بەیانەکەدا، باس لەوە کرابو، حیزبی شیوعی عێراق تەقدیری نەبەزی و خەباتی (وحدة الشیوعیین) و سوربونیان لەسەر خەبات و تێکۆشان بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ماکسیزم لینینزم، بۆ بەربەرەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرەستی دەکات، لەلایەکی تریشەوە، (وحدة الشیوعیین)یش ڕەخنە لە خۆی ئەگرێت کە لە کاتێکدا حیزبی شیوعی هەبوە، کەچی ئەو چوە ڕێکخستنێکی تری دروستکردوە بەناوی شیوعییەوە.

ئەوان خێرا پێکهاتن، بەپێی پێکهاتنەکە، هەم مامۆستا عەزیز شەریف و هەم عبدولرەحیم شەریف لە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی عێراقیدا، لە شوێنی خۆیان مانەوە.

توندوتیژی لێپرسراوەکانی پێشوی قاعیدە، بە تایبەتی باسم و پاشان حەمید عوسمان، دەستێکی گەورەیان هەبو لە پاڵپێوەنانی ئەو جەماعەتە، بۆئەوەی، دورکەونەوە لە حیزبەکەیان. جیاوازیەکی فکری بنەرەتی هەبو لە نێوانیاندا، بەڵام دوای ئەوەی، حەمید عوسمان نەما و سەلام عادل[٦]، قیادەی حیزبی شیوعی کەوتە دەست، جیاوازییەکان کەم بونەوە. سەلام عادل، پیاوێکی نەرم و نیانی زیرەکی گورجوگۆڵی چالاک بو، هەوڵی ئەدا بۆ ڕێکخستنەوەی هەمو باڵەکانی بزوتنەوەی شیوعی، بەڕاستی پیاوێکی لە خۆبوردە و تێکۆشەر و بیرکراوە بو، هەرچەندە سەلام عادل زۆر رۆشنبیر و خوێندەواریەکی زۆری نەبو، بەڵام بە چالاکی، گورجوگۆڵی و زیرەکی خۆی وردە وردە گەشەی ئەکرد و پەرەی ئەسەند، هەوڵێکی زۆری ئەدا بۆ یەکخستنەوەی هەمو باڵەکان، لە ئەنجامدا بەهۆی خالد

بەگداشەوە توانیان (رایة الشغیلة)ش یەک بخەن.

خواستێک لە خواستەکانی سەلام عادل کە هاتەدی، ئەوەبو کە توانی هەمو شیوعیەکان لەناو حیزبێکدا کۆبکاتەوە، هەروەها لەگەڵ ئێمەش پەیوەندی زۆر باش بو.

لە ساڵی ١٩٥٦ دا، خەباتی نەتەوایەتی عەرەب پەرەی سەند، ئەویش دوای پەلاماردانی ئینگلیز و فەرەنسا و ئیسرائیل بو، بۆ سەر میسر و بەربەرەکانی قارەمانانەی میسر و وەستانی جەمال عەبدولناسر لە دژی هەر سێ لایەنیان.

کاتێ میسر سیاسەتی بەربەرەکانی ئیمپریالیزم و بەربەرەکانی پەیمانە عەسکەریەکانی ئیمپریالیستی ئیعلان کردبو، بو بە دوژمنی سەرسەختی ئیمپریالیزم و پەیمانی بەغدا و کۆنەپەرەستانی عەرەبی. لەو کاتەدا، بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەبی پەرەی سەندبو، شەپۆلی هەست و بیری نەتەوایەتی عەرەبی لە سەرتاسەری وڵاتانی عەرەبیدا هاژەی ئەهات.

لەبەرامبەر ئەوەدا، هەستی نەتەوایەتی لەناو کوردستانیش گەشەی کردبو و پەرەی سەندبو، حیزبی شیوعی عێراقی لە سیاسەتی خۆیدا دروشمی پشتیوانی لە خەباتی رزگاریخوازی گەلی عەرەبی هەڵگرتبو. پشتیوانی لە خەباتی گەلانی عەرەب ئەکرد و داوای یەکێتی عەرەبی لەسەر بناغەی دیموکراتی ئەکرد و لەهەمان کاتیشدا دەربارەی مەسەلەی کورد سیاسەتێکیان گرتبو، کتومت سیاسەتەکەی سەرکردایەتی (باسم) بو کە هەڵگری مافی چارەنوس و تا جیابونەوە و دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی بو.

# فەهد و مەسەلەی کورد

*** هەر لە باسی حیزبی شیوعی عێراق و هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد، پێش ئەو بارودۆخە، فەهد چۆن بیری لە مەسەلەی کورد ئەکردەوە؟**

- سیاسەتی دەستنیشان کردنی مافی چارەنوس، دژی سیاسەتە کۆنەکەی فەهد بو، فەهدیش کوردی بە کەمایەتی نەتەوایەتی، وەکو ئێزیدی، ئاشوری و ئەرمەنی دانابو، لەبەرئەوەش باسی مافی چارەنوسی نەدەکرد.

بەڵام دوایی، فەهد بۆچونی خۆی گۆڕی و لە دو وتاردا، لە رۆژنامەی (القاعدة) بڵاوی کردۆتەوە، باسی ئەوە ئەکات کە گەلی کورد مافی چارەنوسی خۆی هەیە، مافی جیابونەوەشی هەیە، لەکاتی رزگاربونی عێراق لە ئیمپریالیزم، یان لە هەر کاتێکدا، کە بەرژەوەندی گەلی کوردی تێدابێت.

لە وتارەکەی دوەمیدا، فەهد داوای ئەوە ئەکات، حیزبێکی پێشڕەو بۆ کوردستان دروست بکرێت، وتارەکە، لەژێر ناوی (الشعب الكردي بحاجة الى حزب عمل لا الى حزب آمل) رەخنە لە حیزبی هیوا ئەگرێت کە کۆنەپەرست بوە، داوا ئەکات هەمو کوردە پێشکەوتنخواز و دڵسۆزەکان، حیزبێک دروست بکەن، بۆ خۆ رێکخستن، سازدان و هوشیارکردنەوە و رابەرکردنی میللەتەکەیان و بزوتنەوە نەتەوەیەکەیان.

ئەو بۆچونە ئەکرا لەکاتی خۆیدا، ببێتە سەرەتایەکی باش، بۆ هاوکاری نێوان پارتی و حیزبی شیوعی، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە حیزبی شیوعی ئەو راستیەی سەلماند کە جمهوریەتی مەهاباد و ئازربایجان هەبون و سۆڤیێتیش پێی باش بو، کورد و ئازەریش حیزبی تایبەتی سەربەخۆی خۆیان هەبێت.

ئەم سیاسەتە سۆڤیێتیەی، لە ئێران پیادە ئەکرا، شکاندنی ئەو پەرژینەی پێشوبو کە ئەیانگوت لەناو یەک دەوڵەتدا، ئەبێ تەنها یەک تاکە حیزب هەبێت، کە هەمو نەتەوەکان کۆ بکاتەوە. من پێم وایە، فەهد لە دوا سەفەریدا بۆ مۆسکۆ، بە ئێراندا تێپەڕیبو، ئەو راستییەی زانیبو. هەروەها دور نیە، سۆڤیێتیەکان ئامۆژگارییان کردبێ، لەبەرئەوەی لە وتارەکەی خۆیدا (الشعب الكردي بحاجة الى

حزب عمل لا الى حزب آمل)، باسی پێویستیی بونی حیزبێکی پێشکەوتنخوازی شۆڕشگێڕی کوردی ئەکات بۆ رێکخستن و سازدان و رابەریکردنی خەڵکی کوردستان و گەیاندنیان بە ئامانجی خۆیان. بانگەوازێک دەرئەکات بۆ کوردە شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتەکان و ئەڵێ، ئێش بکەن بۆ ئەو حیزبە و (ستجدون من حزبنا کل دعم و المساعدة).

بەڵام لە ساڵی ١٩٥٦ دا، مەسەلەیەک هاتەکایەوە، ئایا کوردە شیوعیەکان هەر لەناو حیزبی شیوعیدا بمێنەوە، یان بێنە ناو حیزبێکی کوردستانییەوە. هەندێک لە کوردەکان کە جاران شیوعی بون، بۆ نمونە: خەسرەو تۆفیق، نەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغا، کاکەی فەلاح و لەتیف، کە بە لەتیف جگەرە مەشهور بو، هەندێک کەسی تر کە پارتی بون و بوبون بە شیوعی، وەکو ساڵح دیلان، ئەوانە هەمویان هاتبونە سەر ئەو بۆچونەی، کوردەکان هەمویان لە یەک حیزبدا کۆببنەوە و تەئسیریشیان کردبوە سەر شەخسی حەمید عوسمان کە سکرتێری ئەو سەردەمەی حیزب بو.

ئیقلیمی کوردستانی حیزبی شیوعی ئەو سەردەمە، سێ کادێری شیوعی سەرکردایەتیان ئەکرد، کە هەر سێکیان بیروباوەڕی کوردایەتییان هەبو، وا لە بیروباوەڕی شیوعییەت تێگەیشتبون کە بیگونجێنن لەگەڵ واقیعی کوردستان، ئەم سێ کەسە دکتۆر کەمال فواد و ساڵح حەیدەری و حەمید عوسمان بون.

ئەوانیش کەم و زۆر تەئسیریان کردبوەوە سەر هەمزە عەبدوڵڵا، لە ساڵی١٩٥٧ دا، دوای ئەوەی پارتی دیموکراتی یەکگرتوی کوردستان دامەزرا، بە تایبەتی باڵە چەپەکەی پارتی، کە ناویان لە خۆیان نابو (الجناح التقدمي للحزب الديمقراطي الكردي العراقي)یانی گروپی کاک نەژاد و کاک خەسرەو، ئەوان کە لە حیزبی شیوعی جیاببونەوە.

ئەو بیروباوەڕە، لەناو لقی کوردستانی حیزبی شیوعی پەرەی سەندبو، ئەوەبو لە ئابی ١٩٥٧دا ئەو لقە بڕیاری خۆ هەڵوەشاندنەوەیدا و هاتنە ناو پارتیەوە.

*** هەڵوێست یاخود رۆڵی تۆ چی بو لەو مەسەلەیەدا؟**

- من لەو سەردەمەدا، لە بەغدا نەبوم، ئەو کاتە، کە ئەو بڕیارە دەرچوبو من لە کوردستان نەبوم، لە مۆسکۆ لە میهرەجانی لاوان و قوتابیانی جیهانی بوم، ئاگام لەوەنەبو، رەنگە کاک کەمال فواد زۆر ئاگای لەوە بێت، بەڵام ئەوەندە ئەزانم لە پارتیدا، ئەو کەسەی، کە زۆر دەورێکی چالاکی تێدا بینی، مامۆستا

هەمزە عەبدوڵڵا بو، کە تازە گەڕابۆوە ناو پارتی، بە تایبەتیش کاک نەژاد و کاک خەسرەو، پەیوەندیان لەگەڵیاندا باشبو، هەروەها دیارە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کە بە هەمو لایەک، وەک سکرتێری حیزبە یەکگرتوەکە قبوڵیان کردبو، ئەویش ئامۆژگاری و سەرپەرشتی حیزبە یەکگرتوەکەی ئەکرد. من هیچ دەورێکم تێدانەبوە و ئاگاداری ئەوە نەبوم، کاتێک بەسەر ئەوەدا هاتمەوە، شیوعیەکان هاتبون و کوراسێکی زۆر توندوتیژی ناشرینی پڕ جنێو و پڕ ئیتیهامات و بوختانی بێ لەزەتیان دەرکردبو، لەداخی ئەوەی، کە لقی کوردستانیان لێجیابۆتەوە.

ئەو نامیلکەیە (رد علی المفاهیم التصفویة القومیة البورجوازیة)، پڕ بو لە جنێو و هەرچی تۆمەتێ ناشێ هەیە، بە پاڵ ئەو فکرەیەیان دابو، کە کورد حیزبی تایبەتی خۆی هەبێت، یان پێشڕەوی تایبەتی خۆی هەبێت، یان شیوعیەکان بچنەوە ناو پارتییەوە. ئەوەیان بە جیابونەوە و خزمەتی ئیستیعمار و دوژمنایەتی عەرەب و شۆفێنیزم و بە گژاچونەوەی نەتەوەی عەرەب ئەدایە قەڵەم.

لەبەرئەوە زۆر سەیر بو کە من سەفەرم کرد، بەینمان زۆر زۆر باش بو لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقی، تەنانەت سەلام عادل زۆر جار شەوان ئەهاتە لای ئێمە ئەنوست ومنیش هەندێجار ئەچومە لای ئەوان، من و هەمزە عەبدوڵڵا هەردوکمان ئەو کاتە موختەفی بوین لە بەغدا و هاتوچۆشمان گەرم بو.

ئێمە ناوبژیشمان کردبو بۆ پێکهاتنەوەیان، بەراستی شەخسی سەلام عادل، زۆر پشتگیری رێبازی پێشکەوتنخوازی پارتی ئەکرد و لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم دۆستایەتیان باش بو.

ئەو، زۆر بۆچونی باشی هەبو، هەتا بەدەستپێشخەری و پێشنیازی ئەو، جەماعەتی ئەنساری سەلامی عێراقی، کۆتری ئاشتیان بە خەڵاتدا بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد. کۆترێکی زێڕینی ئاشتی سەبارەت بە دەور و چالاکی لە جوڵانەوەی ئاشتی لە عێراقدا. هەروەها عەزیز شەریف و عەبدولرەحیم شەریف، وەک دو دۆستی دێرینی پارتی، چوبونە ناو حیزبی شیوعیەوە، کاریگەری خۆیان هەبو، لەبەرئەوە زۆر سەیر بو، ئەو نامیلکەیە بەو توندوتیژییە نوسرابو.

نوسەری نامیلکەکە شریف شێخ بو کە پاشان پیاوێکی خائین دەرچو، چۆکی بەرامبەر بە دوژمن داو و ئیعترافی لەسەر هاورێکانی کرد و لە شیوعییەت و لە حیزبی شیوعیش هەڵگەڕایەوە.

هەر چۆنێک بێت، هەڵوێستی حیزبی شیوعی، کۆسپێکی گەورەی هێنایە بەردەم هاوکاری پارتی لەگەڵ حیزبە عەرەبیەکانی ئەو سەردەمە، چونکە حیزبی

شیوعی لەگەڵ حیزبی وەتەنی دیموکراتی و حیزبی ئیستیقلال و حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی نزیک بون. هەروەها حیزبی بەعس، هەڵویستێکی ناڕون و نا ئاشکرای هەبو بەرامبەر بە پارتی و نەیدەزانی پارتی چۆن تەقیم بکات، نەی ئەویست پارتی بەشدار بێت لە بەرەی یەکێتی نیشتمانیدا.

هەروەها، حیزبی شیوعیش لەبەرئەو ناکۆکیەی کە لەگەڵ پارتیدا هەیبو، هەمان هەڵویستی بەعسی هەبو، نەیدەویست پارتی بەشداری بەرە بکات، ئەیویست پارتی گۆشەگیر بکات، لەبەرئەوە حیزبەکانی ئەو بەرەیەش، ئامادە نەبون هیچ دروشمێکی میللی کورد قبوڵ بکەن، نە حوکمی زاتی، نە دروشمی مافی چارەنوس.

پارتیش ئەوەندە گەرم نەبو، بۆ بەشداری لە بەرەی یەکێتی نیشتمانیدا، بەڵام لەگەڵ کامل چادرچی و حیزبی ئیستیقلالدا باسی ئەوەی کردبو، پێویستە باسی حوکمی زاتی یاخود مافی چارەنوس بکرێت.

لەبەرئەوەی حیزبی شیوعیش کەوتبوە دوژمنایەتی پارتیەوە، لە ڕوی مەوزوعی و بابەتیەوە، جێی پارتی لەو بەرەیەدا کە لە نێوان حیزبی ئیستقلال، وەتەنی دیموکراتی، حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراقی دروست بوبو، نەئەبوەوە.

## بەرەی یەکێتی نیشتمانی عێراقی

*** بیری پێکهێنانی بەرەی یەکێتی نیشتمانی عێراقی چۆن هاتە کایەوە؟ ڕۆڵی ئەو بەرەیە چی بو؟**

– پەلاماردانی دڕندانە بۆسەر میسر، هۆیەک بو بۆ نزیکبونەوەی هەوێنی دروستکردنی (بەرەی یەکێتی نیشتمانی عێراقی)، ئەمەوێ بڵێم، کە ساڵی تەقانەوەی خەباتی جەماوەری بو لە عێراقدا، لە ئەنجامی ئەوەبو، ئینگلیز و فەرەنسا و ئیسرائیل سێ قۆڵی پەلاماری میسریاندا. لە سەرتاسەری عێراقدا توڕەیی و ناڕەزایی زۆر پەرەی سەندبو، حکومەتی عێراق هەڵویستێکی زۆر نامەردانەی هەبو، بەرامبەر بەو پەلاماردانە.

تەنانەت، وەک دوایی دەرکەوت، نوری سەعیدیش، دەستی هەبو لە هاندان و تیژکردنی ئینگلیز لە دژی جمال عەبدولناسردا.

لەبەرئەوە مەسەلەی خەباتی چەکداری هاتە کایەوە، ئێمە دەمێک بو لە کوردستاندا ئەو دروشمەمان هەڵگرتبو، بەڵام شیوعیەکان لەژێر کاریگەریی کۆنگرەی بیستهەمی حیزبی شیوعی سۆڤیەتیدا، دروشمی (ئینتقالی سلمی) یان هەڵگرتبو، ئەیانگوت، عێراقیش بەرێگەی ئاشتی ئەگوێزرێتەوە بۆ سۆشیالیزم. ئەمە کاری کردبوەسەر رەفتاریان، بەڵام ئەم روداوانە وای لێکردن، بیر لە خەباتی چەکداریی بکەنەوە و هەندێ کاری چەکداریی ناو شار وەکو بۆمبا تەقاندنەوە و تەق و تۆق بکەن.

دیارە ئەو کارانە زۆرترین لەژێر کاریگەریی رادیۆی (صوت العرب)دا بو کە لە میسرەوە دەنگی زوڵاڵی بڵاودەکردەوە و داوای دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم و پەیمانی بەغدا و حوکمی نوری سەعید و کۆنەپەرەستانی عەرەبی ئەکرد، لەبەرئەوە، ئەوان کە وەکو حیزبە عەرەبیەکانی عێراقی بەبێ کورد، لە ساڵی ١٩٥٧ بەرەی وەتەنیان دروستکردبو، لە بەرنامەکەیاندا هیچ شتێکی دیار و ئاشکرای تێدانەبو دەربارەی مەسەلەی کورد، تەنها باسی برایەتی کورد و عەرەب نەبێت. مەسەلەی بەشداری کورد و عەرەبیش، دوایی چوە دەستوری موەقەتی جمهوری عێراقییشەوە، لە راستیدا، فەقەرەیەک بو لە بەرنامەی حیزبێک بەناوی (المؤتمر الوطني العراقي) کە حیزبی ئیستقلال، حیزبی وەتەنی دیموکراتی و جەبهەی شەعبی، پێکەوە بەرنامەیەکیان پێشکەش بە حکومەتی عێراق کرد.

ئەو سەردەمە، هەستی نەتەوایەتی هەم لە کوردستان و هەم لەناو عەرەبدا هەڵچوبو، خەڵکی کوردستانیش داوای مافی چارەنوسیان هیچ نەبێ زیاتر لە حوکمی زاتیان ئەکرد، یان حوکمێکی فیدراڵێ لە عێراق دابمەزرێت و کوردیش مافی خۆی وەربگرێت. ئەوەبو (بەرەی نیشتمانی عێراقی) کەم و زۆر بەلای مەسەلەی کوردا نەهاتبو، لەبەرئەوە پارتیش زۆر موتەحەمیس نەبو بۆ بەشداریکردن لەو بەرەیەدا، ئەو بەرەیەی، لە چوار حیزب پێک هاتبو، دواییش هەندێ ئەندامی تر بەناوی لاوان و ئەنساری سەلامەوە بەشداریان تێداکرد.

ئەو بەرەیە، زیاتر بەرەی بەیاننامە دەرکردن و خەڵک هاندان و زەمینە خۆشکردن بو بۆ خەبات، لەو کاتەدا لەناو سوپای عێراقیدا ئەفسەرە ئازادەکان خەریکی جموجۆڵێکی شۆرشگێرانە بون، خۆیان ساز ئەدا، بۆ هەڵگەرانەوە لە حکومەت و روخاندنی رژێم و رزگارکردنی عێراق لە حوکمی مەلەکی و لە کۆتو

زنجیرەکانی ئیمپریالیزم.

لە پرۆگرامی ئەو بەرەیەدا، شتێکی ئەوتۆی تێدانەبو لەسەر مافی کورد، زیاتر داوای دیموکراسی و دەستور و پەرلەمان و ئازادی حیزبەکانیان ئەکرد، تەنانەت باسی روخانی رژێمیشی تێدانەبو، بەڵکو باسی لابردنی حکومەت و حیادی ئیجابی، گەڕانەوەی عێراق بۆ باوەشی وڵاتانی سەربەخۆی عەرەب و باسی هاوخەباتی لەگەڵ گەلانی عەرەب و تێکۆشانی عەرەبی ئەکرا.

شایانی باسە، ئەو کاتە سەرۆکی حیزبی وەتەنی دیموکراتی، مامۆستا کامل چادرچی لە زیندان بو، چونکە ئەو لەکاتی پەلاماردانی سێ قۆڵی بۆسەر میسر، چو بو بۆ ئەوێ و لەوێوە بروسکەیەکی لێدابو بەناوی لیژنەی (گەلانی عەرەب) و خۆشی ئیمزای کردبو.

هەواڵێک لە رۆژنامەکانی عەرەبیدا بڵاوکرایەوە، گوایە عێراق لەکاتی پەلاماردانی ئیسرائیل بۆسەر میسر نەوتی بە هێڵی بەغدا، حەیفا لە رێگای ئیسرائیلەوە بۆ ئینگلتەرا ناردوە. ئەو نەوتەی، بە سوریادا تێ ئەپەڕێت، وەستابو، چونکە لە کاتی پەلاماردانی سێ قۆڵیدا بۆسەر میسر، ئەفسەرە ئازادەکانی میسر هێڵەکەیان تەقاندبۆوە و نەیانهێشت نەوت بڕوات بۆ دەوڵەتانی رۆژئاوا، ئەوەش کارێکی گرنگی کردە سەر شەڕەکە.

* **تەمەنی بەرەی یەکێتی نیشتمانی عێراقی چەند بو؟**

- بەرەی یەکێتی نیشتمانی، تا شۆرشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨، حکومەتی مەلەکی ڕوخا و حکومەتی کۆماری عێراقی دامەزرا، مایەوە.

دوای شۆڕشی ١٤ی تەموز، ئەو وەفدەی ئێمە، بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دروست بوبو، منیش ئەندام بوم تێیدا، بۆ گفتوگۆ بو لەگەڵ بەرەی عێراقی، ئەنجامی بەدەستهێنا، ئەویش دوای ئەوەی، هەمو لایەک رەزامەندییان نیشاندا بە تایبەتی بەعسییەکان کە ئێمە لە بەرەکەدا وەربگیرێین، زوربەیان نەیان ئەزانی، ئێمە چین و چیمان ئەوێت.

کە چوین بۆ گفتوگۆ، قسە و بیروڕای خۆمانمان پێگوتن، زۆربەی بۆچونەکانی ئێمەیان پێ باش بو، بەعسییەکان بە حەماسەوە بەشداری پارتییان لە بەرەکەدا قبوڵ کرد.

لێپرسراوی ئەو سەردەمەی بەعسیەکان فوئاد رکابی بو، لە دوای شۆڕشی تەموز بو بە وەزیری ئیعمار و لە سەردانێکدا، چوین بۆ لای، وەک پیاوێکی

روخۆش و زۆر چاک هاتە بەرچاومان کە رەئی لەسەر مەسەلەی کورد زۆر باش بو، تەنانەت هەر لەوێ پێی گوتین، "من خوشکێکم هەیە داومە بە کوردێک، من لەگەڵ کورد پەیوەندیم زۆر زۆر باشە و کوردم خۆش ئەوێت، من چیم بۆ عەرەب ئەوێت، ئەوەشم بۆ کورد ئەوێت". لە پاشاندا کۆبونەوەیەکمان لە مەڵبەندی رۆژنامەی (الجمهورية) لەگەڵیاندا ئەنجامدا.

وەفدی پارتی بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم بو، منیشی لەگەڵدا بوم، وەفدی بەعسیەکان جگە لە فوئاد رکابی، علي سالح سەعدی و دکتۆر سەعدون حەمادی تێدابو، چەند گەنجێکی تریشیان لەگەڵدا بو، لە ئەنجامدا توانیمان رەئی زوربەیان بگۆرین، لە سەردەمی حوکمی دوەمی بەعسدا، سەدام حسێن، فواد رکابی خستە زیندانەوە، لەوێش پیلانێکی بۆ دانا، بە دەستی یەکێ لە زیندانیەکان کوژرا.

*** ئەو کاتە بەعسییەکان بۆچونیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد چۆن بو، ئایا پرۆگرامیان هەبو بۆ چارەسەرکردنی؟**

- بۆچونیان دەربارەی مەسەلەی کورد باش بو، تەنانەت گوتیان ئێمە لەکاتی دانانی دەستوری دائیمیدا، لەگەڵ ئەوەین، مافی ئۆتۆنۆمی بە کورد بدرێت و کاتێکیش، عێراق بچێتە ناو جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوەوە، ئەوا ئێمە رازین، کوردستان ببێتە ئیقلیمی چوارەم لە جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتودا.

ئەوەی راست بێت پروپاگەندەکانی حیزبی شیوعی، هەروەها ئەو چەپرەوییەی لەناو خۆماندا پەیدابو، ئەویش دوای گەرانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤێت، کارێکی زۆری کردەسەر تێکدانی پەیوەندیمان لەگەڵ قەومیەکانی عەرەب. ئەگینا ئەو رۆژە مومکین بو، قەومیەکانی عەرەب بهێنینە سەر ئەو بۆچونەی، کورد پێویستە مافی ئاسایی خۆی بدرێتێ، هەروەها ئەو راستیە لەناو ریزی قەومیەکانی عەرەبدا بڵاوبکەینەوە کە کورد مافی ئاسایی میللی خۆی هەیە، ئەویش لە جیاتی بیروباوەریی شۆڤێنی و نە سەلماندنی کورد و بە گژاچونی کورد و پیلانی لەناوبردنی.

ئەو هەنگاوەی مەکتەبی سیاسی پارتی بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، بەشداربون لە (الجبهة الاتحاد الوطني) دەورێکی باشی هەبو لەناو ئەو بەرەیەدا، لە لایەکەوە سەرەتایەک بو بۆ پەیدابونی پەیوەندی لەگەڵ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی لە عێراق و حیزبی ئیستیقلال و لە رێی ئەوانیشەوە

لەگەڵ عەبدولناسردا.

ئەم کارانە بونە مایەی نارەزایی شیوعیەکان، ئەوان زۆریان پێ ناخۆش بو، بوختانێکیان هەڵبەست، گوایە رێککەوتنێک بوە لە نێوان (م.س)ی پارتی بە سەرپەرشتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و من، لەگەڵ بەعسیەکان و حیزبی ئیستیقلال و عەبدولسەلام عارفدا، ئەوەش ئەوەبوە کە عێراق بخرێتە سەر جمهوریەی عەرەبی یەکگرتو، کوردیش بەرامبەر بەوە، یان سەربەخۆیی وەربگرێت، یاخود بۆخۆی ببێتە جمهوریەتێک، یا ببێتە ئیقلیمی چوارەم لە جمهورەیەتی عەرەبی یەکگرتو.

ئەو هەواڵەیان گەیاندە عەبدولکەریم قاسم، ئەویش زۆر لەوە ترسا، هەروەها هەمان هەواڵیشیان بە مەلا مستەفا گەیاند.

ئەوەی راست بێت هێنانەوەی مەلا مستەفاش هەر لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە بو، دەخوازرا لە قەومیە عەرەبەکان نزیک ببێتەوە، چونکە وەزیری ناوخۆ عەبدولسەلام عارف، بو بەهۆی ئەوەی، تاهیر یەحیا، ئەوکاتە لیوا، یان عەمید بو، کرابو بە بەرێوەبەری پۆلیسی گشتی.

تاهیر یەحیا، بە رەگەز کورد بو، پەیوەندی باشی هەبو لەگەڵ ئەفسەرە کوردەکان، بەتایبەتی لەگەڵ کەریم قەرەنی، بەهۆی ئەوەوە ئێمە ناسیمان. کە چوین باسی ئەوەمان بۆ کرد کە گرنگە پەساپۆرت بۆ مەلا مستەفا دەربهێنین و یارمەتی بدەین بگەرێتەوە.

ئێمە پێشتر لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم قسەمان کردبو، بەڵام ترسمان هەبو، عەبدولسەلام عارف موعاریز بێت. تاهیر یحیا گوتی: من ئەچم لەگەڵ عەبدولسەلام قسە ئەکەم، کە چوبو قسەی لەگەڵیا کردبو، ئەویش رەزامەندی دەربریبو.

## پەراوێزەکان:

١- ئەسعەد خۆشەوی، هاوڕێی خەباتی بارزانی بو، لە ١٩١٨ لە ناوچەی بارزان لە دایك بوە و لەگەڵ بارزانی چۆتە مهاباد و دوایی لەگەڵ هاوڕێیانیان چونەتە یەکێتی سۆڤێت و لەگەڵ بارزانی گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و لە ٣١ مایسی ١٩٧٨ دا لە تاران کۆچی دوایی کردوە.

٢- زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، لە بیرەوەریەکانیدا لە لاپەرە ٢٥٠ ئەیگێڕێتەوە: (کە زۆر کەس پرسیویانە، ڕاستە ئێوە لە شەری کۆریا بەشداریتان کردوە، مەلا مستەفا کراوە بە فەرماندەیەکی پایە بەرز لەو شەڕەدا؟ گوتم: ئەوەی راست بێت وا لە ئێوەی دەزانین و بیستومانە، کاتی شەری کۆریا ئێمە دورخرابوینەوە و نەفی کرابوین بەسەر گوندەکان لە ئۆزبکستان، مەلا مستەفاش وەك هەمومان لە گوندێك دانرابو وەك نەفی). (زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەریەکانم لە ساڵانی ١٩٤٣ – ١٩٧٧) چاپخانەی رەهەند ٢٠٠٢- سلێمانی.

٣- (بارزانیەکان نە هەمیشە هەمویان بەیەکەوە لە شوێنێك نیشتەجێ کراون، نە لەیەك ناوچەش بون، لە ناوچەی جیاواز بون لە کۆماری ئازربایجانی سۆڤێتی، تا کۆتایی ١٩٤٨، لە دوای ئەوەوە نێردران بۆ ئۆردوگایەك لە کۆماری ئوزبکستان و لە نزیك تاشقەندە جێگیربون و دوای ساڵێك جارێکی تر پەرش و بڵاوکرانەوە بەسەر چەند شوێنێکدا و پەیوەندیان لەگەڵ یەك نەما و جارێکی تر لە کاتی ستالیندا لە تاشقەند هەمو کۆکرانەوە). زانیاری زیاتر لە کتێبی "سياسة الاتحاد السوفيتي تجاه الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان الجنوبية ١٩٤٥-١٩٦٨ – مێهفان محمد حسين رشيد البامرني"..

٤- کۆسمۆپۆلیتی، بۆچونێکی سیاسی فەلسەفیە، کە بڕوای بە سنوری جوگرافیای تەسك نیە و هەموو زەوی بە یەك پارچە سەیر دەکات و هەمو شوێنێ بە هی خۆی دەزانێت.

٥- (نوری سەعید، لە بەغدا لە ١٨٨٨ دا لە دایك بوە، لە قوتابخانەی عەسکەری لە ئەستەنبوڵ لە ١٩٠٦ دا دەرچوە و دوای پێنج ساڵ لە کۆلیژی حەربی دەرچوە، تاقە سیاسی عێراقیە کە ١٤ جار بوە بە سەرۆك وەزیران، لە ١٩٣٠/٣/٢٣ تا ١٩٥٨/٥/١.لەو ماوەیەدا دوجار لە عێراق بەهۆی کودەتاوە هەڵهاتوە و دوایی گەڕاوەتەوە، سیاسەتی بەعەرەبکردن لە زەمانی ئەوەوە لە کەرکوك دەستی پێکرد و کورد لەوێوە گواستراوەتەوە بۆ شارەکانی ناوەراست و خواروی عێراق و عەرەبی دەهێنایە شوێنەکانیان، دەربارەی مردنی لە رۆژانی تەموزدا، بۆچونی جیاواز هەیە، لەسەر ئەوەی خۆی خۆی کوشتبێت یان کوشتبێتیان).

٦- سەلام عادل، کە ناوی خۆی حسێن ئەحمەد رازیە و لە ١٩٢٢ لە نەجەف لە دایك بوە، کادێرێکی دیاری حیزبی شیوعی عێراقی بو، لە ١٩٥٦ بو بە سکرتێری ئەو حیزبە تا هاتنی بەعسیەکان لە ١٩٦٣ دا، بەعسیەکان گرتیان و دوای ئەشکەنجەی زۆر هەڵیانواسی. سەلام عادل، رۆڵی دیار و سەرەکی هەبو لەکاتی حوکمە قاسمدا لە عێراق و توانی جەماوەرێکی زۆری دیار لە دەوری حیزبی شیوعی کۆکاتەوە.

٧- فەهد، کە ناوی راستەقینەی یوسف سلێمان یوسفە، بە دامەزرێنەری حیزبی شیوعی عێراقی دائەنرێت، لە ناحیەی بەرتەلە لە پارێزگای موسل لە ١٩٢١ دا لە دایك بوە، گەنجایەتی لە بەسرا و ناسریە بەسەر بردوە، سەفەری چەند وڵاتێکی دراوسێی عێراقی کردوە و ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوان بوە و لە سەرەتای سییەکاندا، دەستی بە جۆرەها چالاکی سیاسی کردوە و جۆرەها نوسینی دەربارەی چەوسانەوەی جوتیاران و کرێکاران و رۆڵی عێراق بڵاوکردۆتەوە. لە ١٩٣٣/٢/٢٠ سجن دەکرێت و یەکەم عێراقی دەبێت، کە دان بەوەدا ئەنێت، کە شیوعییە لە ١٩٣٤/٣/٣١ بە ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی هەڵدەبژێت و دوای ئەوە سەفەر دەکات بۆ مۆسکۆ بۆ خوێندن. دای ئەوەی لە سەرەتای ١٩٣٨ دەگەڕێتەوە بۆ عێراق، دەست دەکات بە چالاکی سیاسی لە شارە جیاوازەکاندا و لە کۆنگرەی یەکەمی حیزبەکەیاندا لە ١٩٤٥ بە سکرتێری حیزب دەستنیشان دەکرێت. لە ١٩٤٧/١/١٨ لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێی خۆی ئەگیرێن و لە دادگادا بەرگرییەکی قارەمانانە لە خۆی دەکات و لە زیندانە دامێنێتەوە، تا لە بەرەبەیانی رۆژی ١٩٤٩/٢/١٤دا لەسێدارە ئەدرێت.

# گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق

*** مەلا مستەفا کەی و چۆن گەڕایەوە بۆ عێراق؟**

- ئێمە پێشنیازێکمان بۆ حکومەت کرد، با مەلا مستەفا لە ڕێگای قاهیرەوە بێتەوە بۆ عێراق، لەوێ عەبدولناسریش ببینێت و باس لە مەسەلەی کورد و عەرەب بکەن، ئەوەی هەردوکیان پێیان باش بو، با بکرێت.

خێرا لە بەغدا پاسپۆرتیان بۆ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، نوری ئەحمەدی تەها، عوبەیدوڵای بارزانی و شێخ سادقی شێخ بابۆی بارزانی دەرکرد، هەر چواریان چون بۆ چیکۆسلۆڤاکیا و لەوێوە، مەلا مستەفایان لەگەڵ خۆیان هێنایەوە بۆ قاهیرە، لەوێ عەبدولناسریان بینی و دوایی هەمو پێکەوە گەڕانەوە بۆ بەغدا[1].

شیوعیەکان، ئەو شێوە گەڕانەوەیان وەک بوختان و پیلان دایە قەڵەم، بە حساب پیلانێکە کە ئێمە و بەعسییەکان لەسەری ڕێککەوتوین و پێکهاتوین لەسەرئەوەی، بەشی عەرەبی عێراق بخرێتە سەر کۆماری عەرەبی یەکگرتو، بەرامبەر بەوە کۆماری کوردستانیش دابمەزرێت.

ئەمەوێ شتێکت بۆ بگێڕمەوە کە مەلا مستەفا هاتەوە، زۆریان دژ بە ئێمە پڕ کردبو، هەتا عەبدولکەریم قاسمیش قسەی دژ بە ئێمەی بۆ مەلا مستەفا گێڕابۆوە.

ئەوە بوەهۆی ئەوەی، باڵێک لەناو پارتیدا پەیدابو، کلکایەتی حیزبی شیوعی ئەکرد و بریتی بون لە: (ئەژاد ئەحمەدی عەزیز، خەسرەو تۆفیق، حەمید عوسمان، ساڵح حەیدەری و هەمزە عەبدوڵڵا) ئەمانە کەوتنە هاندانی مەلا مستەفا لێمان، بە ئیسرارەوە داوایان لێکرد، مەکتەبی سیاسی بگۆڕێت، منیش دەربکرێم، چونکە منیان بە هاندەری سەرەکی ئەو سیاسەتە ئەزانی و ئەشیان ویست کە مامۆستا ئیبراهیمیش پەروباڵ بکرێت و هیچ دەسەڵاتێکی نەمێنێت.

لە کۆبونەوەیەکدا کە هەمومان دانیشتبوین، مەلا مستەفا لێی پرسین، گوتی: ئەوە ئەو هەواڵە ڕاستە. چیە و چۆنە؟ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کەوتە شەرح

کردنی، بۆی باسکرد کە ئەوە ئەسڵی نیە، راستیەکانی گێرایەوە چۆن بوە، بە تایبەتی مەسەلەی ئەوەی، چۆن چوینەتە جەبهەوە، گوتی کە مەوزوعی وا باسنەکراوە و شتی وا نەبوە، زۆر بەرگریشی لەوە کرد، کە ئێمە شتی وامان نەکردوە.

مامۆستا ئیبراهیم گوتی: "پارتی کاتی خۆی موزەکەرەیەکی داوە بە هێزەکان لەسەر یەکێتی و ئیتیحادی فیدراڵی، ئەو نوسراوە، وەسیقەیەکی مێژویی زۆر راست و مەبدەئیە، ئێستەش بەکەڵکی ئەوە دێت بەکاربهێنرێت".

کە نۆبە هاتە سەر من، مەلا مستەفا لێی پرسیم، گوتی: جەلال تۆ ئەڵێی چی؟ گوتم: "وەڵڵا زۆر بەداخەوە ئەزبەنی، شتی وا نەبوە" کە گوتم زۆر بەداخەوە شتی وا نەبوە، دایە قاقای پێکەنین، هەزار رەحمەتی لێبێت گوتی: ئەها فەرمو ئەڵێم (شێتە)! هەر ئێوە باوەڕ ناکەن، گوتم: "وەڵڵا من ئێستا ئەگەر عەرەب بێت و لەگەڵ من ئەو رێککەوتنە مۆر بکات، عەرەب بۆ خۆی یەکێتی عەرەبی دروست بکات و عێراق بچێتە سەر کۆماری عەرەبی یەکگرتو و لە بەرامبەردا سەربەخۆیی کوردستان بسەلمێنن، وەڵڵا ئەمن، مەمنون ئەبم و لەگەڵیشیاندا ئەو رێکەوتنە مۆر ئەکەم و بە راستیشی ئەزانم، کوردو عەرەب وا پێکبێت کە کورد پشتیوانی خەباتی رزگاریخوازی و یەکخستنەوەی نەتەوەی عەرەب بکات و نەتەوەی عەرەبیش پشتیوانی خەباتی رزگاریخوازی و مافی چارەنوس و مافی سەربەخۆیی کوردستان بکات".

ئەو برادەرانەی کە سەر بە حیزبی شیوعی بون و لەناو ئێمەدا بون، ئەو خاڵەیان ئیستیغلال کرد و بە شۆفێنی و راستڕەوییان دایە قەڵەم.

*** بەرەی یەکێتی نیشتمانی عێراقی چی لێهات؟**

– لەدوای ئەوەی کە لەناو (جبهة الاتحاد الوطني) بوین، کەوتینە هەڵگرتنی دروشمی پاراستنی جەبهە، ئێمە ئەوانەی، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد نوێنەرایەتی ئەکردین و من لەو گروپەدا کادێرێکی چالاک بوم، ئەمانگوت: "ئێستا کاتی ئەوە نەهاتوە، یەکێتی عێراق درز بەرێت، کاتی ئەوە نییە، (جبهة الاتحاد الوطني) تێکبچێت، بەڵکو پێویستە ئێمە ئەو بەرەیە بپارێزین، کاتی ئەوە نیە، شەڕ بکەوێتەوە نێوان بەعسی، شیوعی، یا وەتەنی دیموکراتی و ئیستیقلال، یان کورد و عەرەبەوە. ئەبێت ئەمڕۆ هەمو هێزەکان یەک بگرن و کۆماری عێراق بپارێزین و بەرەی دیموکراسی بەهێز بکەین".

"هەروەها پێویستە، گەلی عێراق بە ئارەزوی خۆی و بە سەربەستانە بۆچونی خۆی دەرببڕێت، ئایا یەکێتی ئەیەوێت، یاخود جۆرێکی تر لە پێکەوە ژیانی ئەوێت، ئەمە بەندە بە خواستی میللەتی عەرەبەوە. ئێمە لەو مەسەلەیەدا هەردو خواستەکەمان بە دژی خۆمان نەئەزانی، یەکێکیان: تا چ رادەیەک یەکێتی میللەتی عەرەب مافەکانی کورد بەدی دێنێت، دوەم: تا چ رادەیەک دیموکراسی و ئازادی ئەپارێزن، لەبەرئەوە، ئێمە لایەنگری گەشەدان و جۆشدانی جەبهەی ئیتیحادی وەتەنی بوین".

* بۆچی ئەو بەرەیە هەڵوەشایەوە؟

- لە دوای ئەو کۆبونەوە جەماهیریە گەورانەی، بەناوی بەرەوە ئەکرا، پەیوەندی نێوان شیوعیەکان و بەعسییەکان رۆژ بە رۆژ بەرە و خراپتر ئەچو، حیزبی ئیستقلال و بەرەی قەومی، لەگەڵ بەعسیەکان نزیک ئەبونەوە، ئەوانی تریش خۆیان لە لایەکی ترەوە کۆکردبۆوە. بەرەئی من، چەند هۆیەک هەبون کە بونە مایەی هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەرەیە:

یەکەم: هەڵەی گەورەی بەعسیەکان بو کە ئەیانویست بە زۆری زۆردار، بەبێ ئەوەی کە رەئی گەلی عێراق وەربگرن، بێ ئەوەی رێگەی ئەوە بدەن کە ئەبێ هەڵبژاردنێکی ئازادبکرێت و پەرلەمان دابنرێت و ژیانی دیموکراسی لە عێراق دابمەزرێت، ئەیانویست یەکسەر وەحدەیەکی فەوری بەسەر عێراقدا پسەپێنن.

دوەم: هەڵەیەکی تر، ئەوەبو، دەستیان گرت بەسەر کورسیەکەی عەبدولسەلام عارفەوە، لە خۆپیشاندانەکاندا ئەیانگوت، بژی (جمال العراق، عەبدالسلام عارف)، ئەیانویست ئەو پیاوە، کەم عەقڵ، گێل، سەرکەش، دیکتاتۆر و کۆنەپەرەستە بکەن بە رەمزی خۆیان و رەمزی جوڵانەوەی عەرەب لە عێراقدا، هەروەها گوێ نەدانیان بە مەسەلەی دیموکراسی و مافەکانی دیموکراسی لە عێراقدا.

بەداخەوە تا ئەم دواییانەش جوڵانەوەی نەتەوەپەرەستی عەرەب هەر گرنگی بە مەسەلەی رزگاری لە ئیستعمار ئەدا، دژایەتی زایۆنیزم و مەسەلەی چارەسەری کۆمەڵایەتی، ناوی دەنا ئەزمونی دیموکراتی شۆڕش.

لایەنە سیاسییەکەی دیموکراسییان ئیهمال ئەکرد کە لایەنە هەرە گرنگەکەیە و بریتی بو لە لایەنی ئازادی دیموکراتی، ئازادی حیزبایەتی یان فرە حیزبی، مافی رادەربڕین و دروستکردنی رێکخراوی ئازاد و ئازادی رۆژنامەوانی و سەربەستی لە دەربڕینی بیروباوەڕدا.

ئەوانە بەهۆی کارەکانیانەوە، ئەبونە هۆی تێکدانی (الجبهة الاتحاد الوطني)،

حیزبی شیوعی عێراقیش لەخۆی بایی بوبو، بەوەی کە عەبدولکەریم قاسم ڕوی دابونێ، پەرەیان سەندبو، هەوڵیان ئەدا بەعسیەکان و قەومیەکان ریسوا بکەن و بچن بە گژیاندا.

هیچ بایەخێکیان دانەئەنا بە جەبهەکە، لەژێر دروشمی پاراستنی جمهوریەتدا ئەچونەوە بە گژ دروشمی یەکێتی عەرەب و مەسەلەی نەتەوایەتی عەرەبدا. هەرچەندە بەناو و بەرواڵەت دروشمی ئیتحادی فیدراڵیان ئەویست، بەڵام ئەیانویست عەبدولکەریم قاسم هاندەن دژی جمهوریەتی عەرەبی موتەحیدە و بەعسیەکان.

ئەوە بو، لە ساڵی ١٩٥٩ دا، دوای روداوەکەی (شەواف) لە موسڵ، ئەو کارەسات و کوشتارە ناڕەوایەی دژ بە خەڵکی بێ تاوان کرا لە موسل، جەبهەی ئیتیحادی وەتەنی هەڵوەشایەوە.

*** گرنگترین کاری ئەو بەرەیە لە ماوەی تەمەنی خۆیدا چی بو؟**

- گرنگترین کارەکانی بەرەی ئیتحادی وەتەنی، سازدانی زەمینەی سیاسی بو، بۆ شۆڕشی ١٤ی تەموز، ئەو بەرەیە هاندەرێک بو، بۆ ئەفسەرە ئازادەکان بۆئەوەی، هەڵکوتنە سەر حکومەتی عێراق، رژێمی مەلەکی بروخێنن.

# پارتی و شۆڕشی ١٤ تەموز

*** رۆڵی پارتی لە شۆڕشی ١٤ی تەموزدا چی بو، ئایا پارتی هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ گروپی ئەفسەرە ئازادەکان هەبو؟**

- پارتی دیموکراتی کوردستان، پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ ئەفسەرە کوردەکان هەبو، گروپێک لە ئەفسەرە کوردەکان، لە کەرکوک دروست بوبون کە ئەفسەرە کوردەکانی ناوچەکانی تریشی گرتبۆوە، لەوانە فاتیح جەباری و چەندین ئەفسەری کوردی تر، ئەم جوڵانەوەیە، لەگەڵ پارتی نزیک بو، من لە ئەڵقەی پەیوەندی بوم لە نێوان ئەوان و پارتیدا، پارتی هەندێ زانیاری دەربارەی چالاکی

ئەفسەرە ئازادەكان هەبو، بەڵام پەیوەندی ڕاستەوخۆی نەبو لەگەڵیاندا.

هەندێک زانیاری ئەگەیشتە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، سەبارەت بەوەی، كە ئەو پەیوەندیەكی تایبەتی باشی لەگەڵ دوو ئەفسەر لەو ئەفسەرانە هەبو، یەكێكیان عەقید عەبدوڵڵا سەعید، دوەمیشیان، موقەدم فەتاح شاڵی بو، هەردوكیان نزیک بون لە ئەفسەرە ئازادەكانەوە، زانیاریەكان تەنها ئەوەندە بون كە جوڵانەوەیەک هەیە لەناویاندا، ئەوە ئەزانرا، ئەوانە خەریكی شتێكن، بەڵام بەرەسمی پەیوەندیان لەگەڵیاندا نەبوە، ئاگاداری وردەكاریەكانیش نەبون.

قەومی و شیوعیەكان، لە ئاخر و ئۆخریدا كەوتبونە دژایەتی پارتی، لەبەرئەوەی ئەو ئەفسەرانە، لە بن كاریگەری شیوعی و قەومیی و بەعسیەكاندا بون، هیچ پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ پارتیدا نەبو، بەڵام كە شۆڕشی ١٤ی تەموز رویدا، دەست بەجێ پارتی، لە سەرتاسەری كوردستاندا كۆمەڵانی خەڵكی خۆی ساز و ئامادەكرد بۆ پشتیوانیكردن لەو شۆڕشە، وەفدێكی گەورە دروستكرا بەسەرۆكایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و چونە بەغدا، لەوێ هەم پیرۆزباییان لە سەركردایەتی شۆڕش كرد و هەم لە كۆبونەوەیەكی گەورەدا، لە بەردەمی وەزارەتی دیفاع كرا، پشتیوانی خۆیان بۆ شۆڕشی ١٤ی تەموز دەربڕی و داوای مافەكانی گەلی كوردیان كرد.

ئەوەی ڕاست بێت، چونكە ئەفسەرە ئازادەكان، سەركردەكانیان، یا عێراقچی، یا نەتەوەپەرەستی عەرەبی بون، لە بیروڕای ئێمە ڕازی نەبون، هەر لە یەكەم وتار، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لەبەردەمی وەزارەتی دیفاع خوێندیەوە، باسی ئەوەی كرد، چۆن عێراق كاتی خۆی ئینگلیز دروستی كردوە، چۆن میللەتی كورد بێبەش كراوە لە مافی خۆی و چۆن ئەو كیانەی عێراق لەسەر بناغەی نابەرامبەری و بێبەش كردنی كورد لە مافی خۆی دامەزراوە و چۆن پێویستە ئێستا ئەوە ڕاست بكرێتەوە، دەبێت عێراق لەسەر بناغەیەكی یەكسانی ڕاستەقینە دابمەزرێتەوە كە داننانە بە مافی ڕەوای كورد و سەلماندنی حوكمی زاتییە، ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی بناغەكانی كۆماری عێراقی ساوا بەهێز بكات.

ئەم بۆچونانە، زۆر بە دڵی ئەفسەرەكان نەبو، جارێ عەبدولسەلام عارف ئەفسەرێكی شۆڤینی، عەبدولكەریم قاسمیش عێراقچی بو، پێی وابو، ئێمە هەر دەبێت بڵێین عێراقیین، نە كوردین و نە عەرەبین، پێویست ناكات باسی هیچ مافێكی نەتەوەیی عەرەب و كورد بكەین. بۆیە لە هەردولاوە ئەم بۆ چونانە قبوڵ نەبون، بەڵام وەردە وردە تا دەهات دەوری پارتی و چالاكیەكانی پارتی پەرەی

ئەسەند و سیاسەتی راست و رەوای پارتی زیاتر رون ئەبۆوە، چونکە پارتی بە راستی لایەنگری ئەوەنەبو، ئەفسەرە ئازادەکان بکات بە گژ یەکدا.

هەروەها پارتی ئەیویست، لەگەڵ هەمو لایەک پەیوەندی باشی هەبێت، من مەبەستم لەو پارتیەیە، بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد کاری ئەکرد، تا مەلا مستەفا هاتەوە، بە هاتنەوەی ئەو، بەتەواوی ئەم سیاسەتە گۆڕا، گۆڕانیش لە مەکتەبی سیاسیدا کرا کە لە ئەنجامدا من لابرام لە مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی سیاسیش فراوان کرا و نوێنەری ئەو جەماعەتەی تێدا زۆر کرا کە سەر بە حیزبی شیوعی بون.

*** کە تۆ دەڵێیت نوێنەری ئەو کۆمەڵەیە، ئەو کۆمەڵەیە کێ بون؟**

– هەندێ لەوانە، بریتی بون لە نەژاد ئەحمەد عەزیز، هەمزە عەبدوڵڵا، خەسرەو تۆفیق و حەمید عوسمان، ئەوانە هاتنە پێشەوە و هەندێکیان چونە مەکتەبی سیاسییەوە، وەک نەژاد و هەمزە عەبدوڵڵا، ئەمانە راستەوخۆ سەر بە حیزبی شیوعی بون.

# سڕکردنی مام جەلال لە پارتیدا

*** ئەو ئەندامانە بێ هەڵبژاردن چونە مەکتەبی سیاسیەوە، یان بە هەڵبژاردن؟**

– نەخێر، بە رێگای هەڵبژاردن بو، کۆمیتەی مەرکەزی بە مەلا مستەفاوە ١٥ ئەندام بوین، ئەم برادەرانە کەمایەتی بون، ٥ بەرامبەر بە ١٠، ئەم پێنج کەسە، هاتن رقیان گرت و گوتیان: "ئێمە نایکەین، تاوەکو مەکتەبی سیاسی نەبێت بەو نیسبەتەی کە ئێمە ئەمانەوێت". ئەوان کەڵکیان لەوە وەرگرت کە ئەو تۆمەتە لەسەر ئێمە بڵاوببوەوە، گوایە ئێمە بەشە زۆرەکەی سەرکردایەتی پارتین و لەگەڵ جمهوریەتی عەرەبی موتەحیدە و سەلام عارف و حیزبی بەعس و حیزبی ئیستقلال پێکهاتوین، عێراق بخرێتە سەر جمهوریەتی عەرەبی موتەحیدە، کوردستانیش سەربەخۆیی وەرگرێت و ببێتە جمهوریەتێکی فیدراڵی.

ئەوانە، مەلا مستەفایان راکێشابو بەلای خۆیاندا، ئەویش کەوتبوە ژێر کاریگەری شیوعیەکانەوە، لەبەرئەوە، مەلا مستەفا هات و گوتی: "یا لەگەڵتان نابم، یا ئەبێت ئەو مەکتەبە سیاسییە بگۆڕدرێت". ئێمەش بۆ ئەوەی مەلا مستەفامان لەگەڵ بێت و جیا نەبێتەوە، قبوڵمان کرد.

زۆرمان لەو برادەرانە پرسی، رەئیتان چیە؟ گرنگە کە دیموکراسی لەسەر بناغەی زۆرایەتی و کەمایەتی بێت؟ گوتیان: "ئێمە هیچ رەئیمان نیە، مەلا مستەفا چی گوت ئەوە رەئی ئێمەشە"! منیش گوتم: باشە من ئەوەتان لەسەر تەسجیل ئەکەم، بە هەمزە عەبدوڵڵا، نەژاد ئەحمەدی عەزیز، خەسرە تۆفیق، حەمید عوسمان و ساڵح حەیدەریم گوت: "ئێوە هەر پێنجتان ئەو قسەیە ئەکەن، ئەوە ئێمە ۱۰ کەس ئەو هەڵوێستەتان بۆ مێژو لەسەر تەسجیل ئەکەین، ئێوە رەئیتان نییە، مەبادئی دیموکراتیەتی مەرکەزی، کەمایەتی و زۆرایەتی ئەخەنە ژێر پێتانەوە، ئەڵێن: هەرچی مەلا مستەفا گوتی، ئەوە رەئی ئێمەیە، ئەوە من لەسەرتانی تەسجیل ئەکەم، هەرچەندە ئەوە من خۆم واز ئەهێنم".

ئەوە بو لە مەکتەبی سیاسی دەرچوم، لە پاشان ئەوان داوایان کرد، پێویستە من تەجمید بکرێم، فعلەن من تەجمید کرام، هەتا کۆنگرەی چوار، بە تەجمیدی مامەوە.

*** ئەو سرگردنە ساڵی چەند بو؟**

- ئەوە لە ۳۰/٦/ ۱۹٥۹ دا بو، لە ئەنجامی ئەو کۆنفرانسە، من تەجمید کرام تا ۱۹٥۹/۱۰/٤ کە کۆنگرەی چوار، لە بەغدا لە ماڵی کاکە زیاد بەسترا، بە تەجمیدی مامەوە.

کۆنگرە ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە، بانگیان کردم بۆ کۆنگرە و بڕیارەکەیان بە ناشەرعی و ناڕاست دایە قەڵەم.

هاوکاری نێوان ئەفسەرە ئازادەکان زۆری نەخایاند، چونکە ئەفسەرە قەومییەکان بەلای قەومییەت و یەکێتی عەرەبیدا دایان ئەشکاند، کە پارتی پشتگیری لەوە نەدەکرد، دوەمیشیان عەبدولکەریم قاسمیش بەلای دیموکراتییەت و عێراقچێتیدا دایشکاند، کە پارتی پشتگیری دیموکراتیەتەکەی ئەکرد، بەڵام عێراقچێتێکەی رەت ئەکردەوە.

*** دوای ئەو گۆڕانکارییانە، پارتی چۆن خۆی لەگەڵ بارودۆخی سیاسی تازەدا گونجاند؟**

- پارتی زۆر لایەنگری دیموکراتییەکەی کەریم قاسم بو، پێی زۆر باش بو،

بەڵام لایەنگری عێراقچێتێکەی نەبو، چونکە ئەیان گوت، پێویست ناکات داوای مافی تایبەتی کورد بکرێت، هەتا لە زەمانی کەریم قاسمدا وتارێکی زۆر باش لە خەباتدا بڵاوکرایەوە لەژێر ناونیشانی، (گەلی کورد و مادەی ٣ لە دەستوری عێراقی)، لەوێدا ئەو بۆچونە ڕەتکراوەتەوە، (عێراق بەشێکە لە میللەتی عەرەب)، ڕۆژنامەی خەبات بە ڕونی نوسی، (عێراق بەشێک نیە لە میللەتی عەرەب) ئەو بۆچونەش هەڵەیە، بەڵکو (گەلی عەرەب لە عێراق بەشێکە لە میللەتی عەرەب")، دوایی لەسەر ئەو وتارە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد درا بە دادگا و کۆمەڵێک پارێزەر بەرگرییان لێکرد، لە ئەنجامدا تەبریە کرا، ئەو مەسەلەیە دەنگێکی گەورەی دایەوە.

# ڕاگەیاندنی حیزبایەتی و ڕۆژنامەی خەبات

*** چۆن پارتی و ڕۆژنامەی خەبات مۆڵەتی کارکردنیان لە بەغدا وەرگرت؟**

- ئیجازەی پارتی و ڕۆژنامەی خەبات دو شتی لەیەک جیان، لەپاش ڕوخانی حکومەتی مەلەکی و بونی عێراق بە کۆماری، وەفدێکی گەورەی کورد، بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد چوە بەغدا، ئەو وەفدە چو بۆلای ئەفسەرە ئازادەکان و پیرۆزبایی لێکردن. لە وەزارەتی دیفاع مامۆستا ئیبراهیم وتارێکی باشی مێژویی پێشکەش کرد، لەوێوە بەناوی وەفدی کوردیەوە چون بۆلای هەمو حیزبە عێراقییەکان، توانیان پاش خەباتێکی زۆر، مادەیەک بخرێتە دەستوری عێراقیەوە، ئەڵێ: (کورد و عەرەب هاوبەشن لە نیشتماندا) و (ئەم دەستورە مافە نەتەوایەتیکانیان دەستنیشان ئەکات)، پارتی ئەیویست (على اساس الحكم الذاتي) بخاتە سەری، بەڵام هیچ حیزبێک و هیچ جەماعەتێک لەسەرئەوە ڕازی نەبو، لەبەرئەوە نەچوە ناو دەستوری کاتییەوە.

داڕشتنی دەستور بە خواستی پارتی نەبو، بەڵکو زیاتر بە خواستی حیزبی وەتەنی دیموکراتی و ئیستیقلال و ئەوانەی تر داڕێژرابو، بەو پێیە ڕێگای ئەوە درا، کورد ڕۆژنامەیەکی سیاسی تایبەتی خۆی هەبێت. ئەو کاتە وەزیری ڕۆشنبیری و

راگەیاندن مامۆستا (سدیق شەنشەل)بو، لە سەرکردە عاقڵ و ژیرەکانی حیزبی ئیستیقلال بو، هەروەها پەیوەندییەکی باشی هەبو لەگەڵ کوردا، خۆشی خەڵکی موسڵ بو، ئەڵێن بە رەگەز کوردیش بو، گوایە بە خێزان لە ئامێدی، یان لە دیاریەکرەوە هاتون، بەڵام بە پیاوێکی قەومی عەرەبی مەشهوری عەقڵ کراوە و مەعقول ناسراو بو.

هەردوای شۆڕشی ١٤ی تەموز، حیزبەکان داوای دەرکردنی رۆژنامەیان ئەکرد، بۆیە ئێمەش بەهەمان شێوە داوامان کرد و ئیجازەمان وەرگرت.

لە سەرەتادا، ئیجازەی رۆژنامەی رزگاری و دوایی ئیجازەی رۆژنامەی خەباتمان وەرگرت، وابزانم خەبات بە رەزامەندی عەبدولکەریم قاسم دەرچو، ئەویش مامۆستا ئیبراهیم لە چاوپێکەوتنێکدا پێی گوتبو، بەڵام رزگاری هەر یەکسەر سدیق شەنشەل رەزامەندی لەسەر دەربریبو، بەپێی دەسەڵاتی خۆی ئیجازەکەی داینێ.

هەردو رۆژنامەکە دەرئەچون، خەبات بە کوردی و عەرەبی، خەبات، سەردەمێکی خراپی بەسەرداهات، کەوتە بن دەستی ئەو کۆمەڵەی، لە ژێر کاریگەریی حیزبی شیوعیدا بون، ئەو سەردەمە خەبات بو بە بۆقژەن و زورناژەنی حیزبی شیوعی عێراقی.

بۆ نمونە، خەبات ئەینوسی، "ئەبێ لە کوردستاندا هەرچی کرێکار و جوتیار هەیە بچنە ناو حیزبی شیوعیەوە، مەللاکی نیشتمانپەروەر و بۆرژوازیش بێنە ناو پارتیەوە"، پارتی بۆخۆی داوای لە خەڵک ئەکرد و ئەیگوت ئەی خەڵکینە لەگەڵم مەبن!.

ئەو نوسینانەی خەبات دەنگێکی گەورەی نایەوە، هەروەها بڵاوی ئەکردەوە، حیزبی شیوعی عێراقی پێشڕەوە، بۆ نمونە، لە یەکی ئایاردا، مانشێتی رۆژنامەی پارتی "سڵاو لە چینی کرێکاری عێراقی و پارتە پێشڕەوەکەی حیزبی شیوعی عێراقی" بو! ئەو کاتە ئەو تەییارە لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری کادێر و ئەندامان و ئەندامانی سەرکردایەتیشەوە بەربەرەکانی ئەکرا، من نوکی رمی ئەو بەربەرەکانیە بوم، چونکە من دەرکرابوم و ئەوان حەملەیان لەسەرم بو.

منیش هیچ ئیشوکارم نەبو، تەنها ئەوە نەبێ دژی ئەوگروپە، شار بە شار بگەڕێم، لەناو رێکخستنەکان و هاوڵاتیاندا دژی هەڵوەشاندنەوەی پارتی، دژی ئەوەی، پارتی ببێ بە حیزبی بۆرژوازی و مەللاکین قسەم ئەکرد، ئەمگوت: "پێویستە پارتی بکرێت بە حیزبی پێشڕەو، حیزبی کرێکار و رەنجدەرانی کوردستان و خوێندەواری شۆڕشگێڕ".

هەروەها دژی هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوی لاوان و قوتابیانی کوردستان، دژی هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی ئافرەتانی کوردستان بوم.

بە کورتی، من پارتەکەی ساڵانی ١٩٥٧و ١٩٥٨م ئەویست، و ئەوان ئەیانویست پارتی بکەنە کلکی حیزبی شیوعی عێراقی، ئەوەبو بەهۆی ئەوەی، زۆربەی زۆری ڕێکخراوەکانی پارتی لە سەرتاسەری کوردستاندا، پشتگیری ئەو بۆچونە بون و دژی ئەو سەرکردایەتیەی هەمزە، نەژاد، خەسرەو، ساڵح حەیدەری و حەمید عوسمان وەستان.

ئەو کۆمەڵە هیچ پشتیوانیەکیان لەناو پارتیدا نەبو، تاکە پشتیوانیان مەلا مستەفا بو، ئەو بەزۆر هێنانی، بەزۆر سەپاندنی، ئەو ڕۆژەی لەگەڵ مەلا مستەفا تێکچون، ئەوەبو کە کۆمیتەی سەرکردایەتی یەک کۆبونەوەی کرد و ئەوانی لابرد، مەکتەبێکی سیاسی تری دانایەوە. بەم جۆرە خەبات کەوتەوە دەست باڵی شۆرشگێر لەناو پارتیدا، کەوتەوە دەست تەیاری ڕاستەقینە، ئەو کۆمەڵەش لاچون.

خاوەنی ئیمتیاز و سەرنوسەری خەبات، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بو، بەڵام کە پارتی ئیجازەی وەرگرت، پارتی مافی هەبو، ڕۆژنامەیەک دەربکات، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وەک سەرنوسەر و خاوەن ئیمتیاز لەناوی خەبات تەنازولی کرد بۆ پارتی، ناوی ڕۆژنامەکەی خۆشی کردە (کوردستان) و خۆی سەرنوسەری ڕۆژنامەی پارتی بو، من بوم بە سەرنوسەری ڕۆژنامەی کوردستان کە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی کوردی و عەرەبی بو لە بەغدا دەرئەچو.

*** ڕۆژنامەی کوردستان چەند ژمارەی لێ دەرچوە؟**

– کوردستان پێنج، شەش ژمارەی لێدەرچو، لەوە زیاتر نەبو، هەفتانە دەرئەکرا پاشان ئەویش داخرا.

ڕۆژنامەکە، درێژەدانی ڕۆژنامەی خەباتە کۆنەکە بو کە پێشتر دەرچوبو، بەڵام ڕستەیەکی تازەی زیادکرد ئەویش (زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان) بو، ڕۆژانە لە بەغدا دەرئەچو، سەرنوسەری مامۆستا ئیبراهیم بو کە زوربەی سەروتارەکانی خۆی ئەینوسی.

*** کێ بون ئەوانەی لە خەباتدا ئەیاننوسی؟**

– نوسەرە هەمیشەیەکانی خەبات، کاک حیلمی عەلی شەریف، دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی و من بوین، گەنجێکی سوریش هەبو، بەناوی خەلیل محەمەد،

دوایی بە زەمالەی پارتی چوە مۆسکۆ و ئێستا دکتۆرای هەیە، وابزانم هەر لەوێ مایەوە و نەهاتەوە.

هەروەها حەبیب محمەد کەریمیش بو، پاش نیوەڕوان ئەهات بۆ هەندێ مەسەلەی ناوخۆ و عەبدولمەجید لوتفیش وتاری بۆ ئەناردین بۆمان بڵاوئەکردەوە، لەگەڵ جەرجیس فەتحوڵڵا، ئەوانە بەڕاستی لە نوسەرە سەرەکیەکانی خەبات بون.

*** واتا خەبات لەو کاتەوەی، کە مۆڵەتی رەسمی وەرگرت بو بە ئۆرگانی پارتی؟**

– خەبات لە سەرەتادا هەر تەعبیری لە رەئی پارتی ئەکرد، چونکە لەلایەن پارتیەوە دەرئەچو، خاوەنەکەی پارتی بو، ئەو ئەندامانەی، تیایاندا ئەیانوسی، ئەندامان و دۆستانی پارتی بون، بەڵام بەرەسمی نەئەنوسرا (ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان)، بەڵام بیروڕای پارتی بڵاوئەکردەوە، ئەم ئۆرگانە دواتر خرایەسەر کە مامۆستا برایم تەنازولی لە ناوەکەی کرد.

## بزوتنەوەی شەواف لە موسڵ

*** ئەمەوێت مەسەلەی شەواف باس بکەین، ئایا ئەو روداوە دەستی پارتی تێدابو، یان پارتی ئاگاداری بو؟**

– عەقید عەبدولوەهاب شەواف، یەکێک بو لە ئەفسەرە ئازادیخوازە سەرکەشە توندڕەوەکانی عێراق، ئەوەی سەیرە و جێی داخە، ئەوەیە کە عەقید عەبدولوەهاب شەواف نە قەومی بو، نە یەمینی بو، بەڵکو پیاوێکی چەپی شۆڕشگێڕی دیموکرات بو. پێشتر لەسەر میلاکی حیزبی وەتەنی دیموکراتی و سەردەمێکیش لەسەر میلاکی حیزبی شیوعی حساب ئەکرا، برایەکی وەزیر بو لە کابینەی قاسمدا.

هەتا من زۆر چاکم لە بیرە، ئەو بە ئامری حامییەی موسڵ دائەنرا، ئەو کاتە ئەو جێگایە زۆر گرنگ بو، چونکە کەرکوکی لێ بترازێ هەمو ناوچەی کوردستانی لەبەر دەستدابو.

عەبدولوەهاب شەواف، یەکێک بو لەو ئەفسەر توندڕەوانە، لە زەمانی پێش

شۆڕشی ١٤ی تەموزدا، ئەیویست پەلە بکرێت و شۆڕش زو بکرێت، هەڵپەهەڵپی ئەکرد، لەبەرئەوە، دوریان خستبۆوە لە کار و ئەرکیان پێ نەئەسپارد. کە شۆڕشەکە رویدا، خۆی بە زوڵملێکراو ئەزانی، چونکە ئەو یەکێک بو لە ئەفسەرە چالاک و ئازا و فیداکارانەی کە ئەیویست شۆڕش بکات.

ئەو مەسەلەیە، داخێکی خستبوە دڵیەوە، بەتایبەتی کە عەبدولسەلام عارف و عەبدولکەریم لە بنەوە پێکهاتبون، کە مەجلیسی قیادەی سەورە دروست نەکەن. عەبدولسەلام بە ئەفسەرەکانی گوت، "ئێمە شتی وا دروست ناکەین، برۆن ئێوە شۆڕشتان نەکردوە، ئێمە دروستمان کردوە".

هەندێ کاری چەپڕەوانە و مناڵانەی شیوعییەکانیش لە موسڵ وایکرد کە عەبدولوەهاب دوربکەوێتەوە، بە تایبەتیش رەفتاری نامەوزونانەی عەبدولکەریم قاسم و گوێڕایەڵنەکردنی بۆ ئەفسەرە سەربەست و ئازادیخوازەکانی پێشو، ئەوانە هەمو شەوافیان توڕە ئەکرد، هانیان ئەدا، مەدحیان ئەکرد و فویان تێئەکرد و هەڵیان ئەدا، ئەیانگوت تۆ رزگارکەری عێراقیت!، عێراق لەسەر دەستی تۆ رزگار ئەبێ، ئەوانە هەموی هەڵگەڕانەوەیەکی لە مێشکی شەوافدا دروست کردبو.

شەواف هاتبو بۆ بەغدا، داوای لە قاسم کردبو، لە موسڵ نەقڵی بکات، پێش ئەوەی بچێتەوە بۆ موسڵ، چو بۆلای عەبدولکەریم قاسم داوای لێکرد، گوتی: "تکایە من مەنێرەوە، چونکە کۆنگرەی ئەنساری سەلام لەوێ ئەگیرێت، ئەو رێکخراوەش سەر بە حیزبی شیوعین، ترسی پێکدادان هەیە، رەنگە توشی گیروگرفت بین، چونکە هەمو گروپەکان لە موسڵ بونیان هەیە".

شەواف گوتی: "من خۆم لە ئەنساری سەلام بوم، خۆشم ئەوێن، بەڵام با لە موسڵ ئەو کۆبونەوەیە نەگیرێت، ئەگینا شەڕ و هەڵلا ئەقەومێت، کاتی ئەوەنیە، با ئەوانە نەیەن، چونکە ئەوانە بێن من گەرنتی ئەوە ناکەم، چییان بەسەردا دێت، یان بەسەردا نایەت"؟ شەواف پێی باشبو، کۆبونەوەکە لەوێ نەگیرێت، بەڵام کەریم قاسم هەر سوربو کە کۆبونەوەکە لەوێ بگرن، بۆیە شەواف گوتی: "باشتر وایە من نەنێرن بۆ موسڵ".

قاسم سوربو لەسەرئەوەی کە شەواف بگەڕێتەوە بۆ موسڵ، کەریم قاسم نەزەرییەیەکی هەبو، ئەویش ئەوە بو ئەیگوت: با ئەوان بچن، هەڵاکە بتەقێتەوە، دوایی من دای ئەمرکێنمەوە، هەر ئەو بۆچونە ملی شکاند.

مەلا مستەفا، بەهۆی واحید بامەڕنیەوە، بە وردی ئاگای لەو مەسەلەیە هەبو کە ئەفسەرە قەومییەکان پیلان ئەگێڕن، خەریکی هەڵگەڕانەوەن لە موسڵ. واحید

بامەڕنی عەمیدێکی کورد بو، لە ئیستیخباراتدا بو، ئەو هەواڵەکەی دابو بە مەلا مستەفا، مەلا مستەفاش چوبو، هەواڵەکەی بۆ کەریم قاسم گێڕابۆوە کە ئەو ئەفسەرانە پیلانێکی وایان بەدەستەوەیە.

ئەگەر کەریم قاسم بیویستبایە، ئەو کارەساتە روی نەئەدا، عەبدولوەهابی نە ئەناردەوە بۆ موسڵ، ئەو ئەفسەرانەشی بانگ ئەکرد، یان ئەیگرتن و ئەو روداوش دائەمرکایەوە.

عەبدولوەهاب شەواف، بە نابەدڵی و تورەیی چوەوە موسڵ، بزوتنەوەی ئەنساری سەلامیش چونە ئەوێ و سوربون لەسەرئەوەی کە کۆنگرەکە ببەستن. لە ئەنجامدا خەڵکی موسڵ و قەومییە عەرەبەکان، چون بە گژیەکدا، جوڵانەوەکە دەستی پێکرد.

جوڵانەوەکە ناوی لێنرا حەرەکەی شەواف، کارەکە پەلەپەلی تێداکرا، قەومییەکانی کە پشتگیریان ئەکرد، وەک نازم تەبەقچەلی، خۆیان ئامادە نەکردبو، واتا ئەیانویست بە هێمنی سەربگرێت، دوایی پیلان دژی عەبدولکەیم قاسم دابنێن. ئەو پەلەپەلە وای لێکرد، هەتا لە رادیۆدا بڵاویبکەنەوە و بڵێن کە جوڵانەوەکە بە هاوکاری (جمهوریەتی عەرەبی موتەحیدە) ئەنجام ئەدرێ.

هەروەها، ئەوانە چوبونە بن باڵی شەوافەوە و قەناعەتیان پێ کردبو، ئێمە بریارمان داوە بە هاوکاری لەگەڵ نازم تەبەقچەلی لە دژی دیکتاتۆری و فەردیەت راپەرین.

نازم تەبەقچەلی، ئاگای لەوکارە نەبو، لە ماڵی خۆی بو، کاتێ هەواڵەکەی لە رادیۆوە بیستبو، موئامەرەکە تەقیوەتەوە، دەرکەوت کە بەشداربوان زوربەیان (انصار السلام) بون کە لە موسڵ بون، زۆریان گیراون وهەندێکیان کوژراون.

پێویستە راستێکە بگوترێ، چونکە زۆرجار روداوەکانی موسڵ وەک خۆی باس ناکرێ.

کامل قزانجی[٢] شەخسیەتێکی نیشتمانپەروەری پێشکەوتنخوازی رۆشنبیری مەسیحیی بو، لە سەرکردەکانی بزوتنەوەی ئەنساری سەلام بو، لەوێ لە زینداندا لەگەڵ چەند کەسێکی تر کوژران، ئیتر خەڵک بزوتنەوەی شەوافی کوژاندەوە.

عەبدولکەریم قاسم، نەپەرژا هێز لە بەغداوە بنێرێ، تەنها لە موسڵەوە تەیارە چوە سەریان و لێیدان.

لەوێ، خەڵک خۆی لە ئەفسەرەکان هەڵگەڕانەوە، هێزی سەربازی زۆر عەبدولکەریم و جمهورییەتیان خۆش ئەویست، جەماهیریش لەژێر کاریگەریی

پارتی و شیوعی و ئیتیجاهی دیموکراتی، دژی ئەو هەڵسانە بون، لەبەرئەوە هەم کورد، هەم شیوعییەکان، هەم عەسکەر هەڵگەڕانەوە، تەنانەت عەریفێک عەبدولوەهاب شەوافی کوشت، کاتێ کە شەواف بریندار ئەبێ و ئەچێت بۆ تەداویی.

مەسەلەی عەبدولوەهاب شەواف کۆتایی هات، بەڕاستی جوڵانەوەیەکی کاڵوکرچی هەڵپەهەڵپی، پەلەپەلکەری، نارێکوپێکی، ناوەخت بو. جگە لەوە هەر سەیربو، چونکە عەبدولوەهاب شەواف سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی قەومی کرد، لە کاتێکدا خۆی پێشکەوتنخواز و دیموکراتی چەپ بو، واتا نەتەوەپەرست نەبو. بەم جۆرە ئەو هەڵسانە لەوێ بە کوژرانی شەواف کوژایەوە.

*** ئەوە ڕوداوانە ساڵی چەند بو؟**

– ئەوە لە ٨ی مارتی ١٩٥٩ دا بو، لەیادمە لە ساڵی کۆتایی کوللیەی حقوق بوم، من زەحفەکەم قبوڵ نەبو، چونکە زەحفێک کرا بۆ قوتابیان، من بەو پێیە پێویست بو دەرچومایە بۆ پۆلی چوار، بەڵام ڕازی نەبوین و گوتمان دوایی پێمان ئەڵێن (المحامي الزاحف). لەبەرئەوە من و حەبیب محەمەد کەریم قبوڵمان نەکرد و چوینەوە پۆلەکەی خۆمان.

من، پێش چەند ساڵێک تەفسیرێکم لە میدڵ ئێس ۆچ خوێندەوە، ژنێکی ئەمریکی نوسیویەتی، ئەو تەفسیرەم پێ لەڕاستیەوە نزیکە، ئەڵێ: "هەمو ئەو ناکۆکیانە و ئەو دوژمنایەتیانەی لەبن پێست هەبون و چەندین ساڵ بو برینەکانیان سارێژ نەکرابو، هۆ بون بۆ تەقینەوەکە"، لەوێدا کورد پەلاماری عەرەب، مەسیحی پەلاماری موسوڵمان، فەقیر پەلاماری دەوڵەمەند، شیوعی هی بەعسی، بەعسی پەلاماری شیوعیدا. بۆیە شتێک تەقیەوە، ناتوانم بڵێم لە سەرکردایەتی حیزبی شیوعییەوە ئاڕاستە و تەنزیم و ڕابەری کرابو، بەڵام کادێرە ناوچەییەکانی حیزبی شیوعی دەستێکی باڵایان تێداهەبوە، ئەو سیاسەتە توند و تیژە چەپڕەویەی حیزبی شیوعی لە بناغەوە هەڵە بو، لەوەوە هاتبو، وەکو حاکم حوکمیان ئەکرد، بەمەرجێ حاکمیش نەبون، وەکو حاکم تەسەروفیان ئەکرد و حوکمیشیان بەدەست نەبو، وایان لە خۆیانکرد، هەندێ کاری وایان کرد، کە مەسئولیەتی قانونییان چوەسەر و لە ئەنجامدا کاری زۆر ناشرین لە موسڵ کرا، بەڵام زۆرتری ئەوە، کارێکی عەفەوی بو، ئەتوانین بڵێین ڕەد فیعل بو، هەروەکو ئەو ژنە ئەمریکییە ئەڵێت، هەمو ناکۆکیەکانی بن پێست کە تەداوی نەکرابون تەقینەوە.

هەندێ عەشایەری کورد، بە فەرمانی مەلا مستەفا دەستیان لە کێشەکەدا هەبو، لە ڕاستیدا من ئاگام لێ نەبو، چونکە من لە زانکۆ بوم، ئەو سەردەمەش لە پارتی تەجمید کرابوم، هیچ مەسئولیەت و ڕۆڵێکم نەبو، لە حیزبدا، هیچ ئاگادارییەکم نەبو لە وەزعی ناو پارتی، تەنها ئەمزانی، مەلا مستەفا فەرمانی بە عەشایەری کورد و بە هەمو بارزانی و بەو کەسانەی دەستیان ئەگاتێ گوتوە، "هاوکاری لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم بکەن بۆ کوژانەوەی جوڵانەوەکە".

ئەوەبو کە کورد بەشداری تێداکرد، بەڵام نەک بە ناوی پارتیەوە، نەک وەک کارێکی مونەزەم و ڕێکوپێک.

*** هەر لەو ساڵەدا گرژی و ئاڵۆزی لە کەرکوک ڕویدا، هۆی ئەو جوڵانەوەیە، چی بو؟**

- جوڵانەوەکەی شەواف لە مارتی ١٩٥٩ بو، بەڵام حادیسەی کەرکوک لە ١٩٥٩/٧/١٤ بو، بەڕاستی کە جوڵانەوەکە هەڵگیرسا، من لێپرسراویەتیم نەبو، بەڵام ئاگام لەوە هەبو کە هەندێک لە برادەران هاتن بۆلای من، پرسیان پێکردم، منیش گوتم ئەوە کارێکی زۆر زۆر خراپە، یەکێک لەوانەی کە هاتبو و هەواڵەکەی هێنا، ناوی (حوسامەدین تەیب) بو، بە ئەندامی حیزبی شەعب ناوئەبرا، لەو کاتەدا، کاک عومەر دەبابە لەوێ نەبو، بەپەلە ناردبومان بچێتەوە بۆ کەرکوک، نەهێڵێت کورد بەشداری لەو جوڵانەوەیەدا بکات. بۆچونمان وابو، ئێمە نابێت بەشداری جوڵانەوەی لەو شێوەیە بکەین، بەڵام لەڕاستیدا ئەوکارە بە سەرۆکایەتی و هاندانی حیزبی شیوعی رویدا، کوردیش بەشدار بو تێدا.

هەندێک لە کادێران و ئەندامانی پارتیش بەشداریان تێداکرد، وەک مەلا ماتۆڕ، تەنانەت چو بو دو، سێ ئۆتۆمبێلیشی فڕاندبو کە کاک عومەر دەبابە گەڕابۆوە بە زۆر پێی ناردەوە و سەرزەنشتی کردبو، پێی گوتبو: "چۆن شتی وا دەکەن، ئەوە تاڵانیە بەچ هەقێک، چۆن بتوانین ئێمە کەسبی تورکمان بکەین؟ چۆن باسی برایەتی کورد و تورکمان بکەین"؟

ڕودانی ئەو کارە، وای کرد کە کەریم قاسم زۆر تورە بێت، هەم لە هی موسڵ و هەم لە کەرکوک، ئەوە بو کەریم قاسم لە کەنیسەی مار یوسف لە بەغدا وتارێکی خوێندەوە، بۆ یەکەمجار ئیدانەی ئەو کارانەی کرد، ئیدانەی ئەو تاوانانەی کرد، کە لە موسڵ و کەرکوک ڕویاندابو، گوتی ئەوە دژی شۆڕشە، دژی یاسایە و نابێت شتی وا ڕوبدات. ئەوە سەرەتای تێکچونی پەیوەندی نێوان حیزبی شیوعی و قاسم بو.

# سەرەتای گیروگرفتی نێوان قاسم و پارتی

*** کەی سەرەتای ناکۆکی نێوان قاسم و پارتی دەستی پێکرد و هۆکانی چی بون؟**

- بۆئەوەی بە ویژدان و بە ئینسافەوە باسی پەیوەندی نێوان پارتی و عەبدولکەریم قاسم بکەین، پێویستە باسی ناکۆکی و تەباییەکان بکەین و ئەم خاڵانەی خوارەوە رەچاو بکەین:

١- پەیوەندی نێوان کەریم قاسم و مەلا مستەفا

٢- پەیوەندی نێوان کەریم قاسم و پارتی وەکو حیزبێکی سیاسی

٣- پەیوەندی نێوان کەریم قاسم و پارتی وەکو بیروباوەڕ.

خاڵی یەکەم بە بیرورای من، بەبۆچونی زۆر کەسی ئەو سەردەمەش، پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و عەبدولکەریم قاسم بە شێوەیەکی زۆر ناڕاست و ناڕەوا دارێژرابو، مەلا مستەفا، هەر لە یەکەم رۆژی هاتنیەوە ئیعلانی کرد و گوتی: "من سەربازی عەبدولکەریم قاسمم، تەنها دو کەس هەیە لە دنیادا ئیتاعەی موتڵەقیان بکەم، یەکێکیان شێخ ئەحمەدە و ئەوی تریان عەبدولکەریم قاسمە".

مەلا مستەفا، بەرەسمی، لە رۆژنامەدا بڵاویکردەوە، لە خۆپیشاندانێکی جەماوەریدا لە سلێمانی کە بۆ پێشوازی ئەو رێکخرابو، گوتی: "من سەربازی زەعیم عەبدولکەریمم"، من، بەش بە حاڵی خۆم، یەکێک بوم لەو کەسانەی پێم خۆش نەبو، لە وتاری نەورۆزی ئەو ساڵەدا کە خوێندمەوە، باسی مەلا مستەفام وەک سەرۆکی گەلی کورد کرد، وێنەیەکیم بڵاوکردبۆوە لە پشتی رەسمەکەدا نوسیبوم (سەرۆکی گەورەی گەلی کورد جەنەراڵ مستەفا بارزانی).

مەلا مستەفا، بڵاوکردنەوەی ئەو وێنەیەی پێ ناخۆش بو، لە ئاهەنگی نەورۆزەکەدا، هەژاریش شیعرێکی خوێندەوە، بۆیە مەلا مستەفا زۆر ناڕازی بو لە من و هەژار، لە ترسی ئەوەی، نەوەکا لە ئاهەنگەکەدا بێتە سەرمان، ئێمە دوای خوێندنەوەی وتار و شیعرەکە، هۆڵی مەلیک فەیسەڵمان بەجێ هێشت کە ئاهەنگەکەی تێدا گێڕدرا.

مەلا مستەفا، لە زۆر جێگا ئەیگوت "من زەعیم نیم! من عەسکەری عەبدولکەریم قاسمم"، ئێمەش ئەمانویست بڵێین تۆ سەرۆکی پارتییەکی کە نەتەوەی دوهەمە لە عێراقدا، عەبدولکەریم قاسمیش سەرۆکی هەمو عێراقە، ئێمە لاریمان نیە، ئەو سەرۆکی سەرۆکەکەمان بێت، بەڵام نابێت تۆ سەربازی ئەو بیت! بەڵام مەلا مستەفا ئەیگوت، نەخێر من سەربازی عەبدولکەریم قاسمم!.

ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو بۆچونەبو، بۆیە جارێکیان رەحمەتی لێ بێت، کاک عەونی یوسف پێگوت: "ئەرێ جەنابی مەلا مستەفا تۆ تەرفیعت نەکرد، نەبویت بە نایب عەریف؟، هەر بە سەرباز مایتەوە، ئەوە بو بەچەند ساڵ ئەچێت".

مەلامستەفا، کاتی خۆی لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم وا رێکی خستبو کە زۆر رۆژ ئەچو بۆ وەزارەتی دیفاع، هەرچی عەبدولکەریم قاسم بیگوتایە وای ئەکرد، هەوڵی ئەدا عەبدولکەریم قاسم قانیع بکات، دێهاتەکانی بارزان ئاوەدان بکاتەوە و چەک بداتە بارزانییەکان.

*** ئەگەر پەیوەندی هەردولا ئەوەندە باش بوبێت، هۆی تێکچونی نێوانیان چی بو؟**

– تێکچونی پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفا، لە کوشتنی ئەحمەد ئاغای زێبارییەوە دەست پێ ئەکات. ئەحمەد ئاغای زێباری[٣] یەکێک بو لە دەرەبەگە خوێن رێژەکانی عەشیرەتی زێبار، زۆر کەسی لە بارزانییەکان بە ناهەق کوشتبو. یەکێک لەوانە، لاوێک بو کوڕی ئۆلۆ بەگی قارەمانی شۆڕشی بارزان بو کە شەوێک ناردی و کوشتیان.

ئەو کوشتنە، کارێکی زۆری کردەسەر مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد، ئەوان زۆر دژی عەشیرەتی زێباری بون. شێخ عەبدول سلێمانی کوڕی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، مونافەسەی مەلا مستەفای ئەکرد، هەمیشە شێخ ئەحمەدی هان ئەدا لە مەلا مستەفا، بەناوی ئەوەی، گوایە مەلا مستەفا لە ژێر تەئسیری دایکی کاک مەسعود دایە، حەمایل خان محمود ئاغای زێباری[٤] کە بەڕاستی ژنێکی سەلارە.

مەلا مستەفا، لە بەغدا لە، شوێنی تایبەتی خۆی، پێشوازی لە مەحمود ئاغای زێباری کرد و یارمەتیدا، ئەوە وایکرد کە شێخ ئەحمەدیان لە مەلا مستەفا هاندا، مەلا مستەفا بۆ رازیکردنی شێخ ئەحمەد، بە توندی کەوتە دژایەتی زێبارییەکان و پەیمانی بە شێخ ئەحمەد دابو، کە تۆڵەی ئۆلۆ بەگ بکاتەوە.

# ناکۆکی نێوان قاسم و بارزانی

*** پەیمانەکەی مەلا مستەفا چی بو کە دابوی بە شێخ ئەحمەد؟**

- مەلا مستەفا، دو، سێ کەسی لە پیاوەکانی خۆی نارد، (نەگەی نەبی سەر ئاسن و عیسا سوار و مەلا حەسەن) ئەمانە، دوایی بون بە مورافیقی بارزانی، چون لە موسڵ ئەحمەد ئاغای زێباریان کوشت، هەر کە ئەویان کوشت حکومەتیش فەرمانی گرتنی ئەوانی دەرکرد.

ئێمە وەکو پارتی پێمان وابو، ئەوانە پێویستە بدرێن بە دادگا، لە رێگای دادگاوە چارەسەریی کێشەکە بکرێت. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، ئامادەیی خۆی نیشاندا کە وەک پارێزەرێک بەرگرییان لێبکات، کۆمەڵێک پارێزەری تر ئامادەبون، کە بەرگرییان لێبکەن.

مەلا مستەفا، بە رێگایەکی تر چارەسەری کرد، من خۆم شاهیدی کارەساتەکەم.

کاتێ کە کەریم قاسم تەقەی لێکرا، ئێمە چوین بۆلای بۆ نەخۆشخانە، من لەگەڵ مەلا مستەفادا بوم کە چوینە ژورێ عەبدولکەریم قاسم چاک بوبۆوە، خۆشحاڵ بو بە هاتنەکەی مەلا مستەفا، دانیشت و باسی ئەو کارەساتە کرا، مەلا مستەفا باسی ئەوەی کرد کە خەڵک گیراون، کەریم قاسمیش وەک سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی ئەنجومەنی وزیران قسەی کرد، گوتی: "ئەوە تاوانێکە کراوە و کوژراو هەیە، پێویستە لەرێگای دادگاوە چارەسەر بکرێت، با بزانین دادگا چی بریار ئەدا"(*).

مەلا مستەفا گوتی: "وەڵڵا ئەوە من کردومە! من ئەوانەم ناردوە"، کەریم قاسمیش گوتی: "نا مەلا مستەفا تۆ نەت ناردون، تۆ پیاویت و کاری وا ناکەیت، تۆ دۆستی منیت، تۆ دژی یاسا ئیش ناکەیت، بێگومان ئەو گەنجانە کۆنە رقیان لە دڵدابوە". مەلا مستەفا لەسەری رۆیشت و گوتی: "نەخێر من ناردومن، ئەگەر ئەو گەنجانە ئەوەیان کردبێ ئەوە من پێم کردون".

کەریم قاسم قیژاندی بەسەر مەلا مستەفادا، یەکەمجار بو، من قاسم بە تورەیی

ببینم و گوتی: "تۆ نەت ناردون".!!

بە تورەییەکی زۆرەوە وەڵامی دایەوە، بەراستی مەلا مستەفا چاوەڕێی ئەمەی نەئەکرد کە کەریم قاسم وا بقیژێنێ بەسەریدا، مەلا مستەفا ماتبو، بەڵام زۆری پێ ناخۆشبو، گوتی: "قانون و عەدالەت هەیە، عەدالەت لەسەر هەمو کەسێکەوەیە، ئەوانە ئەدرێن بە دادگا".

بە بۆچونی خۆم، ئەمە سەرەتای تێکچونی پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و عەبدولکەریم قاسم بو.

*** ئەوە کەی بو؟**

ئەوە ئەو رۆژانە بو کە کەریم قاسم لە (راس القرية) لە ١٩٥٩/١٠/٧ تەقەی لێکرا، لەدوای ئەوە، عەشائیری زێباری و هەندێ عەشایری تر هاتنە لای عەبدولکەریم قاسم و گوتیان، ئەچەوسێنرێنەوە، بارزانیەکان ئەمانکوژن و گلەییان کردبو کە قاسم چەکی داوە بە بارزانی و بەوانی نەداوە.

پەیوەندی قاسم و ئەو عەشائیرە کوردانە، دەگەرێتەوە بۆ ئەوکاتەی عەبدولکەریم قاسم لە بزوتنەوەی بارزانی ساڵی ١٩٤٥ دا ئامیری رەتلی جاشان بوە، ئەم جاشانەی زێباری، هەرکی، سورچی، کاتی خۆی شەڕی بارزانیان کردوە، لەبەرئەوە لەو ساڵەوە ئەیانناسی و ئەیناسین و هاتبونە لای گوتیان ئێمە: "لەکاتی خۆیدا لە ژێر قیادەی تۆدا بەیەکەوە ئیشمان کردوە".

ئەو پەیوەندییە، کاریگەری خۆی هەیە لای خەڵکانی عەسکەری کە یەکێکیان لە بن دەستدا بوبێت و لەگەڵیاندا ئیشی کردبێت. ئەوان کردبویان بە هەرا، گوایە ئەخورێن و لێیان ئەکوژرێت و هەرەشەیان لێئەکرێت و ئیبادە ئەکرێن. عەبدولکەریم قاسمیش دڵی دابونەوە، ١٠٠ پارچە چەکی دابو بە زێباریەکان و گوتبوی ئەم چەکانە بۆ پارێزگاری خۆتانە.

بەخشینی ئەو چەکانە، مەلا مستەفای زۆر تورەکرد، چونکە مەلا مستەفا خۆی بە سەربازی کەریم قاسم ئەزانی، وای ئەزانی، کەریم قاسم بە ئاسانی بە جاشەکان نایگۆرێتەوە.

ئینجا من ئەمەوێ شتێک بڵێم، لە نەخۆشخانە کە کەریم قاسم هێمن بۆیەوە، هەندێ قسەی بە بیر مەلامستەفا هێنایەوە و پێیگوت: گوتی: "مەلامستەفا لە بیرتە یەکەم رۆژ کە لە میسر هاتیتەوە، هاتیتە لای من، پێم گوتی: ئەبێ پاش ئەوەی کۆماری عێراق جێگیربو، پێویستە هەمو برا بین؟ ئەبێ ئەحقاد نەمێنێ،

ئەبێ دوژمنایەتی کۆن نەمێنێ، پێویستە تۆ ئێستا وەکو سەرۆکی حیزبێک و سەرۆکی نەتەوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت، نەک وەکو سەرۆکی عەشیرەتێک، پێویستە بچی دڵی هەمو ئەو عەشیرەتانە بدەیتەوە کە کاتی خۆی شەڕیان لە دژی تۆ کردوە، تۆ ئەبێ خەڵک کۆبکەیتەوە، ئاشتیانبکەیتەوە، برایەتی لە نێوانیاندا دروست بکەیت، نەک دوژمنایەتی بژێنیتەوە".

کەریم قاسم، زۆر قسەیەکی عاقڵانەی پێگوت، بەڵام دوای ئەوە وردە وردە پەیوەندی نێوان مەلامستەفا و حکومەت تێکچو، حکومەت کەوتە هاوکاری زێبارییەکان.

هۆی دوەمی تێکچونی کەریم قاسم و مەلامستەفا، ئەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە سەرۆک عەشیرەتەکانی کورد، هەمو ئەوانەی کە لە ئەنجامی ئیسلاحی زەراعی زەرەرمەندبون و دەسەڵاتیان لە دەست چوبو، وردە وردە کۆبونەوە، ئەهاتنە لای مەلامستەفا و شکاتیان ئەکردو پەنایان بۆ ئەبرد.

زۆر بە داخەوە، مەلا مستەفاش گرنگیەکی زۆری بە سەرۆک عەشیرەت، ئاغا، شێخ و ئەو جۆرە کەسانە ئەدا. من لە بیرمە، جارێک هەمو سەرۆک عەشیرەتەکان کۆ کرابونەوە هەر لە شێخی ئێزدی شێخ تەحسینەوە بگرە، تا شێخ و ئاغاکانی خۆشناوەتی، دزەیی، پشدەر و هەندێ شوێنی تر، ئەوانە هەمو هانایان بۆ مەلا مستەفا هێنا کە "تۆ گەورەی ئێمەیت، تکایە بمانپارێزە و هاوکاریمان بکە".

بەداخەوە، مەلا مستەفا ئەوانەی لە دەوری خۆی کۆئەکردەوە و ئەیهێنان لە مەجلیسی خۆی دایدەنان، بەرگری لێئەکردن و باسی ئەکردن. ئەمانە بەو پشتیوانییەی مەلا مستەفا کەمێک لە خۆیان بایی بون، ئەمانە وەفدێکیان دروستکرد بۆ بەغدا و داوای چاوپێکەوتنی کەریم قاسمیان کرد، ئەمە لە کاتێکدا بو، کێشەی کۆمپانیای نەوتی عێراق تەقیبۆوە، کەریم قاسم بەرگری لە بەرژەوەندی عێراق ئەکرد و کۆمپانیا نەوتەکانیش گوشاریان ئەهێنایە سەر حکومەت.

*** ڕۆڵی ئێوە وەک کەسانی دیموکرات و چەپ، چی بو لەو کێشەیەدا؟**

– ئێمە هەستاین وتارێکمان دژی ئەو ئاغا، دەرەبەگ و پیاوەکانی نوری سەعید نوسی، ڕونمانکردەوە کە ئایا ئەمە دەستی ئینگلیزی تێدایە؟ دەستی ئیستیعماری تێدایە؟ بۆچی لەم کاتە ناسکەدا، دێن و هەڵوێستی وا لە کۆمارێکی تازە وەرئەگرن؟ گوتمان ئەوانە دەوریان نەماوە، قەت دۆستی کورد نەبون، قەت کورد پەروەر نەبون، هەمیشە کۆنە جاسوس، نۆکەر و خائنی کورد بون و دۆستی

نوری سەعید و سالّح جەبر و ئەو جۆرە کەسانەبون.

ئەم وتارە، هەم مەلامستەفا، هەم ئەو ئاغایانە و هەم ئەو کەسانە، لەگەڵ ئەو ئاغایانە بون پێی دڵگران بون، هەندێک لەوانەی، پێیان ناخۆشبو بریتی بون لە: زەید ئەحمەد عوسمان، مەسعود محەمەد، کاکە حەمەی خانەقا، ئەوانە هەمویان بە بیروباوەڕ راسترەو بون و هەندێکیشیان کۆنە نائیبی نوری سەعید بون وەک: کاکە حەمە و کاکە زیاد لەبەرئەوە ئێمە بە چاوێکی گومانەوە تەماشای ئەو مەسەلەیەمان ئەکرد.

بەڵام مەلامستەفا پشتیوانی لەوان ئەکرد، ئەمەش کەریم قاسمی تورە کردبو، لێکی ئەدایەوە، بۆ مەلامستەفا وا ئەکات؟ بۆ ئەوانە ئەجوڵێنێت و ئاغاوات و کۆنەپەرست کۆئەکاتەوە؟.

وردە وردە ساردی لە نێوان مەلامستەفا و کەریم قاسم پەرەی سەند و تەشەنەی کرد، تا گەیشتە تەقینەوە.

لەوکاتانەدا، مەلامستەفا بانگکرا بۆ بەشداری یادی شۆرشی ئۆکتۆبەر لە یەکێتی سۆڤێت، سەردانەکەی لە ٦ تشرینی دوهەمی ١٩٦٠ تا ١٣ کانونی یەکەمی ١٩٦١ ی خایاند، چونی مەلا مستەفا بۆ سۆڤێت بۆئەوە بو داوای پشتگیری و یارمەتیان لێ بکات، سۆڤیەتیش بانگیکرد بۆئەوەی ئامۆژگاری بکات، لەگەڵ کەریم قاسم تێکی نەدات و دۆستایەتی بکات. وابریاربو کە منیش لەگەڵیدا بچم، بەڵام پاسپۆرتیان نەدامێ و مەلامستەفا بە تەنیا رۆیشت.

لەوێ، سۆڤێتیکان ئامۆژگاریان کردبو کە پەیوەندی لەگەڵ کەریم قاسم تێک نەدات کە گەڕایەوە هەندێ پارەیان دابویە، بەڵام مەلامستەفا تەنانەت لەوە ئەترسا نەوەک پارەکەی لە فرۆکەخانە لێوەرگرن، بۆیە ئێمە چوینە ناو فرۆکەخانەوە، لەوێ دو جانتای پێبو لێم وەرگرت، بە لارێگایەکدا هێنامە دەرێ، نەشم هێشت بچێ بۆ پشکنین، کاتێ کە پۆلیس هات، گوتم: "ئەوە مەلامستەفایە، سەرۆکی حیزبی دیموکراتی کوردستانە و سەرۆکی میللەتی کوردە، پێویست بە پشکنین ناکات".

دوایئەوە، مەلامستەفا چو بۆلای کەریم قاسم و پێی گوت، "سۆڤێت پارەی داومەتێ، حەقی تفەنگەکانمانە کە کاتی خۆی تەسلیمی ئەوانمان کردوە"، بەڵام چونکە پەیوەندیەکە لە نێوان مەلا مستەفا و قاسم وا تێکچوبو، بەو کارانە چاک نە ئەبۆوە.

لەو کاتانەدا، هەندێک سەرۆک عەشیرەتی کورد بەهۆی مەلا مستەفاوە

پەیوەندییان بە ئێرانەوە کردبو، یەکێک لەوانە، پەیوەندی کردبو ئاغاکانی پشدەربون، وەک هەباس ئاغای مامەند ئاغا، بەهۆی عەبدولرەحمانە ڕوتەوە کە خزمایەتی هەیە لەگەڵ کاک عەلی عەبدوڵڵا، ئەویان ناردبو بۆلای جەنەڕاڵ دەرەهرام، ئەوکاتە، حاکمی ناوچەی مەهاباد و ورمێ بو.

ئەو، وەعدی دابونێ، ئەگەر جوڵانەوەیەک بکەن، ئێران یارمەتیان ئەدات، دوایی وەسائیقەکان دەریانخست، سەفیری ئینگلیزی ئەو سەردەمە، یەک، دو جار مەلا مستەفای بینیبو.

عوبەیدوڵڵای بارزانی، بۆ کاک حیلمی گێڕابوەوە کە پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکانیش هەبوە، دوجار ئەو پەیوەندیە ڕویداوە، جارێکی شێخ ئەحمەد و باوکم بردۆتە لای سەفیری ئینگلیزی و جارێکیش سەفیری ئینگلیزم هێناوەتە لای باوکم.

پاشان، بەپێی موزەکەراتی سەفیری ئینگلیزی کە بڵاوکرایەوە دەرئەکەوێت، کە ئەوان چون و داوایان لە ئینگلیز کردوە، بیانپارێزێت و یارمەتییان بدات. سەفیریش پێی گوتبون: "ئێستا ئێمە وەکو جاران دەسەڵاتمان نیە، دەستمان بەسەر عێراقدا ناشکێت"، بەڵام هانی داون دژی حکومەت کاربکەن[٦].

هەندێک کەس ئەڵێن، ئینگلیز و هەندێ وڵاتی تر ئەیانویست کورد و مەلامستەفا هاندەن لە دژی عەبدولکەریم قاسم، تاکو عەبدولکەریم قاسم بکەوێتە ژێر زەخت و بتوانن لای بەرن، وەکو دوایی پیلانیان دژی بەرپاکرد، یا ملی پێشۆڕ کەن بۆ مەرجەکانی خۆیان. دوای ئەوەی مەلا مستەفا لە مۆسکۆ گەڕایەوە، کەریم قاسم، وەکو جاران روی نەدایە، ئەو ساردیە وای لە مەلا مستەفا کرد، بچێتەوە بۆ بارزان و لەوێ دانیشێت.

پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و کەریم قاسم وا تێکچوبو، قاسم لە زۆر شوێن بە باشی باسی مەلا مستەفای نەدەکرد.

*** مەسعود بارزانی لە کتێبی "بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد" بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم،ل. ٣٠ دەنوسێ: (روسەکان پەیمانیان دابو بە بارزانی، لە سەفەری یەکەمیدا بۆ مۆسکۆ، کە چەک و جبەخانەی بە باڵەفرە بۆ بنێرن )؟**

- نەخێر، شتی وا نازانم، روسەکان بە پێچەوانەوە، لایەنگری ئەوەبون کەوا کورد لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم پێکبێت، هەتا بارزانی دوای سەفەری بۆ مۆسکۆ، ترسی ئەوەی هەبو، لەوێ گلی بدەنەوە و نەهێڵن بێتەوە بۆ عێراق، بۆیە ئێمە

پیلانێکمان دانا، بانگی بکەینەوە بەناوی ئەوەی، کۆنفرانسی حیزبیمان هەیە، عادەتەن روسەکان بە پارە یارمەتیان دەدا، نەک بە چەک.

*** هەر لەو کتێبەدا باس لەوە ئەکرێت، لە مایس و ئەیلولی ١٩٦١ دا بارزانی سێ هەزار پارچە چەکی بە پارەی روس کڕیوە؟**

– ئەسل و ئەساسی نیە، هەمو شۆڕشی کورد هەتا ١٩٦٣ سێ هەزار چەکی نەبوە، ئەوەندە چەکداریشمان نەبوە، روس پارەی ئەدا، بەڵام بایی ئەوەنەبو کە ئەو هەمو چەکەی پێ بکڕیت(٧).

# بارزانی و ئینگلیز

*** پەیوەندی پارتی، یان بارزانی و ئینگلیز چۆن بو، کەی ئەو پەیوەندیە دروست بو؟**

– جارێکیان عەزیز عەقراوی کە ئەفسەر بو لە ئیستیخباراتی فیرقەی ٣، لە هەمان کاتیشدا ئەندامی پارتی بو، منیش لێپرسراوی بوم، بەپەلە هات بۆلام، هەرچەندە پێمان گوتبو، نابێ بە جلی سەربازییەوە بێتە بارەگای حیزب، بەڵام رۆژێک خۆی پێ نەگیراو بە جلی سەربازییەوە خۆی کرد بەوێدا و گوتی: "ئەوە بۆیە هاتوم، چونکە کاتم نەبوە خۆم بگۆڕم و قسەیەکی زۆر گرنگ هەیە ئەمەوێت پێت بڵێم، ئەویش ئەوەیە: ئەمرۆ ئێمە زابتەکانی فرقەی ٣، لای کەریم قاسم بوین و گوتی: "کە مەلا مستەفا پیاوێکە لەگەڵ ئینگلیز پەیوەندی هەیە، وەسائیقی لەسەرە و هەمویم خوێندۆتەوە"، ئەوەبو دوایی کەریم قاسم ئەو وەسایقە و نامانەی، مەلا مستەفا بۆ زابتەکانی ئینگلیزی نوسیبو بڵاویکردەوە.

کەریم قاسم گوتبوی: "هەمو وەسائیقەکان دەریئەخەن، ئەم پیاوە لەگەڵ ئینگلیزە، بە فیتی ئینگلیز ئیشی کردوە، دژی سوپای عێراقی بوە، کاتی خۆی من عەفوم کرد و هێنامەوە کەچی سودی نییە، کەوتۆتەوە جموجۆڵی خۆی، پەیوەندی لەگەڵ ئاغا و دەرەبەگ کردوە، من ناچارئەبم رۆژێک لە رۆژان ئەو بەڵگەنامانە بڵاوبکەمەوە".

پاش ئەوە، کەریم قاسم لە وتارێکدا باسی لەوەکرد، "ئینگلیز هەمیشە دژی سوپای عێراقی بون، سوپای عێراقیش هەمیشە دژی ئینگلیز بون، ئینگلیز هەمیشە ویستویێتی سوپای عێراقی بێ هێز بکات، ئەوەبو لە ١٩٣٦ دا جولانەوەی بەکر سدقی دامرکاند، لە ١٩٤١ دا جارێکی تر هەولی لێدانی سوپای عێراقیدا، واتا هەمیشە ویستویەتی سوپای عێراقی مەشغول بکات، هەندێ بزوتنەوەی لادانیش کە لە کوردستان رویدا، بۆ ئەوەبوە، سوپای عێراقی بێ هێز بکات".

هەروەها گوتی: "ئەگەر ئەو بەڵگەنامانە بلاوبکەمەوە، ئەوە هەندێک لەو کەسانەی کە لافوگەزافی نیشتمانپەروەری لێ ئەدەن، روی خۆیان و کورەکانیشیان رەش ئەبێت، رویان نابێت بێینەوە ناو خەڵک و جەماوەرەوە، چونکە هەمو تۆکەرایەتییان بۆ ئیمپریالیزم و ئینگلیز دەرئەکەوێت".

ئێمە وەلاممان دایەوە، بەلام نەمان ئەزانی کە بەڵگەنامە هەیە، راستییەکەی ئێمە لە رۆژنامەی خەباتدا بەتوندی وەلاممان دایەوە، ناومان وەک (زعیم) نەبرد، بەڵکو وەک (سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران)، هەروەها باسی ئەو بزوتنەوانەمان کرد کە "ئەوانە تۆکەری ئیستیعمار نەبون، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەو بزوتنەوە کوردیانە هەمو دژی ئیستیعمار بون، ئیستیعمار ئەو بزوتنەوە کوردییانەی کوژاندۆتەوە".

زۆری ئەو وتارانە مامۆستا ئیبراهیم و من نوسیمانن، هەروەها باسی ئەوەمان کردوە، چۆن جەنەرال فرایزەر خۆی چوە ئەو بزوتنەوەیەی شێخ مەحمودی کوژاندۆتەوە.

ئەوکاتە سوپای عێراقی بە شێوەیەکی رێکوپێک نەبو، فەوجی موسای کازم ٢٠٠-٣٠٠ کەس بون و تاقەتیان نەبو لە بەغداش بێنە دەرێ، ئینگلیز بە زۆری زۆردار چو بزوتنەوەکەی کوژاندەوە و ژمارەیەکی زۆر هاولاتی کورد بونە قوربانی و سلێمانی بۆردومان کرد و کوردستانی بەزۆر خستۆتە سەر عێراق.

هەروەها شۆرشی بارزانیش هەر بەهۆی فرۆکەی ئینگلیزەوە کوژایەوە، بۆیە کەس مافی ئەوەی نیە، لافوگەزاف لێبدات، بەوەی کە بزوتنەوەی کوردیان کوژاندۆتەوە، چونکە ئەوی کە سەرۆکی جاش بوە- مەبەستمان کەریم قاسم بو- مافی نیە بەوە شانازی بکات، یان ئەوە فەخر نیە، لەژێر سەرکردایەتی جەنەرال رینگنی ئینگلیزی بچێت بارزان داگیربکەن.

نوسیمان، ئێمە تەحەدا ئەکەین هەر بەڵگەنامەیەک هەیە با بلاوییکەنەوە، لە راستیدا نەماندەزانی کە بەڵگەنامە هەیە! وامان ئەزانی کە هەموی پروپاگەندە و درۆیە!

کەریم قاسم، پەیوەندیی لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی و بەتایبەتیش مامۆستا ئیبراهیم باش نەبو، چونکە مامۆستا ئیبراهیم، داوای حوکمی زاتی ئەکرد، کەریم قاسمیش زۆر عێراقچی بو، مامۆستا ئیبراهیم زۆر دژی عێراقچێتی بو، باسی ئەکرد، عێراق لە بناغەدا کیانێکی ئیستیعماریە و ئینگلیز دروستی کردوە.

بەڵام پاش ماوەیەک، پەیوەندیان کەمێ باشتر بو، بەتایبەتی دوای ئەوەی، کە پارتی سەرەپەتێکی دەربارەی موئامەرەیەک دەست کەوت کە ئینگلیز و ئێران لە دژی جمهوریەتی عێراقی بەدەستیانەوەیە، مامۆستا ئیبراهیم چو هەواڵەکەی بە کەریم قاسم گەیاند.

کەریم قاسم، ئەوکارەی زۆر پێ باشبو، بە نیشانەی دڵسۆزی و پەیوەندی دۆستانەی دایە قەڵەم، بۆ جمهوریەتی عێراقی، ئەوەش لای کەریم قاسم هەموشتبو، مامۆستا ئیبراهیم، وێنەی ئەوکاتەی مابو کە کەریم قاسم لێی نوسیبو (الی الاخ الاستاذ ابراهیم آحمد تقدیرا لاخلاصة الکبیر للجمهوریة العراقیة الخالدة).

*** چۆن بیر لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نێوان پارتی و قاسم کرایەوە؟**

– کە ساردی کەوتە نێوان مەلا مستەفا و کەریم قاسمەوە، دو بۆچون لەناو پارتیدا پەیدابون، یەکێکیان بۆچونی عەونی یوسف بو، بەرەئی من کاتی ئەوە هاتوە پیاو بیڵێت و با نەوەکانی داهاتو بڕیاری لەسەر بدەن.

عەونی یوسف، ئەو کاتە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بو، بە فەرمانی مەلامستەفا، هەڵبژێردرا و بوە وەزیریش، عەونی یوسف هات گوتی: برادەرینە ئەو مەلامستەفایە کاری خراپ ئەکات:

یەکەم: کۆکردنەوەی عەشایەر و ژیانەوەی ئاغا و دەرەبەگ، دژی بیروباوەڕی ئێمەیە، دژی هەمو ئەو خەبات و تێکۆشانەیە کە دەیان ساڵە پارتی کردویەتی، واتا ئەو ١٥– ٢٠ ساڵە، خەبات ئەکەین دژی ئەو کار و بۆچون و رەفتارانەیە.

دووەم: دژی بیروباوەڕی ئێمەیە.

سێیەم: دژی جمهوریەتە

چوارهەم: دژی پێشکەوتنخوازییە.

لە پاشان مەلامستەفا ناکۆکیەکەی لەگەڵ کەریم قاسمدا لە چوارچێوەی مەسەلەی بارزان و دژایەتی زێباری و سورچی هێشتۆتەوە، ئەوە هیچ مافێک نادات بە ئێمە وەکو پارتی، یان وەکو کوردپەروەر، پێویستە حسابێک بۆئەوە بکەین، بۆیە پێویستە ئێمە سنورێک بۆ ئەو مەسەلەیە دابنێین، پێی بڵێین: ئەم

بۆچون و هەڵسوکەوتانە راست نین.

بۆچونی دووەم، بۆچونی مامۆستا ئیبراهیم بو، ئەیگوت کەریم قاسم ئەیەوێت جیاوازی بخاتە ناو حیزبەکانەوە، ئەوەبو حیزبی وەتەنی دیموکراتی کەرت کردبو، محەمەد حەدیدی جێگری سەرۆکی جیاکردبۆوە لە کامل چادرچی، ئەیگوت ئێستا ئەو ئەیەوێت واش لە ئێمە بکات، ئێمە جیابکاتەوە لە مەلامستەفا و مەلامستەفاش لە ئێمە دابرێت، هەریەکەمان بەلایەکدا بەرێت، ئەوە سیاسەتی فەرق تەسودە، لەبەرئەوە ئێمە نابێت رێگا بدەین، کەریم قاسم ئەو یاریە بەسەر ئێمەدا تێ پەڕێنێت.

من و ئەوانەی مەکتەبی سیاسی، بە تەحەموسەوە لەگەڵ بۆچونەکەی مامۆستا ئیبراهیم بوین، لەگەڵ ئەوەبوین، واز لە مەلامستەفا نەهێنین و پشتی بەرنەدەین، لەگەڵیدابین.

# بارزانی و حیزبایەتی

*** بارزانی وەک سەرۆکی پارتی چۆن مامەڵەی لەگەڵ پارتیدا ئەکرد؟**

– ئێمە چاوەڕێمان کرد، تا ساڵی ١٩٦٠ کە پارتی ئیجازەی وەرگرت و کۆنگرەی پێنجەمی لە ٥ مایسی ١٩٦٠ گرت، مەلا مستەفا لە بارزانەوە نەهاتە بەغدا بۆ بەشداری کۆنگرە، ئەوەبو وەفدێک چو شێخ ئەحمەدی قانیع کرد، شێخ ئەحمەدیش ئەمری بە مەلا مستەفا کرد، بەشداری کۆنگرە بکات. پاشان مەلا مستەفا لەو کۆنگرەیەدا قسەی زۆر ناشرینی کرد، زۆر دژی حیزب قسەی کرد، گوتی: "حیزب بەڵایە، حیزب تەفرەقەیە، حیزب تێکدانی میللەتی کوردە".

مەلا مستەفا، روی کردە کوڕێک، ناوی عەبدوڵڵای مام رەسوڵ بو، عەبدوڵڵا خەڵکی قەڵادزێ و یەکێک بو لە کادێرەکانی پارتی لە پشدەر، پێی گوت: "تۆ سەگباب، کەران باوک، بێ شەرەف، ناپیاو، بۆچی ئاغا دێتە مەقەڕی پارتی دەری ئەکەیت"، ئەویش گوتی: "کێم دەرکردوە"؟ ئەویش گوتی: "میناغات دەرکردوە"، عەبدوڵڵا گوتی: "میناغا سوممەی زۆر خراپە قوربان، ئەگەر میناغا بێتە مقەری

پارتی و خەڵک بزانێت، ئێمە حیزبی ئەمسالی میناغاین کەسمان پێوە نامێنێت"!
مەلا مستەفا گوتی: "سەگبابی وەکو تۆمان پێوە نامێنێت"، هەزار جنێوی پێدا لەسەر ئەوەی ئاغایەکی دەرکردوە.

پاشان لە کۆنگرەکەدا گوتی: ئەوانەی ئێوە پێیان ئەڵێن دەرەبەگ و ئاغا، من خۆشم ئەوێن، ئەوانە کوردن و گوتی "وەڵڵاهی پێم بڵێن... بە، پێم مەڵێن حیزبی بە، پێم بڵێن برۆ بۆ.... پێم خۆشترە لەوەی پیم بڵێن برۆ بۆ مقەڕی حیزب! کاکە وازم لێ بێنن"![٨].

بێگومان کۆبونەوەکە تێکچو، کۆمەڵێک لە گەنجەکانی کەرکوک لە کۆبونەوەکە کشانەوە.

عەونی یوسف رەئی وابو، گوتی: "باشە با لە کۆنگرەدا پێی بڵێین خوا حافیزت بێت و برۆ". راستییەکەی مامۆستا ئیبراهیم هەر لەسەر سیاسەتە کۆنەکەی خۆی ئەرۆشت، کە کەریم قاسم ئەیەوێت تفرەقەمان تێ بخات، بە تایبەتی عەونی یوسف لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە هاتبۆوە، وامان ئەزانی کە حکومەت پێی گوتوە، راستییەکەی کەریم قاسمیش لەولاوە جوابی بۆ مامۆستا ئیبراهیم ناردبو گوتبوی: "من دژی حیزب نیم و مەلا مستەفا بەرەو خراپی ئەڕوات، حەقە ئەوان خۆیان لە کاروباری عەشایەریەوە تێکەڵ نەکەن"، مامۆستا ئیبراهیم وەڵامی دایەوە، کە "مەلا مستەفا سەرۆکی ئێمەیە، ئێمە هەمومان یەکین".

*** بۆچی پارتی لە پەنجا و شەستەکاندا بە شان وباڵی بارزانی دائەهات و تا گەیشتە عیبادەتی شەخسی؟**

– ئەو وەختە ئەو فیکرە باوبو، من خۆم یەکێک بوم لە جیلی تازە، کە زۆر معجیب بوم پێی!.

# یەکەم پیلانی قاسم دژ بە بارزانی

*** قاسم تۆی ئەناسی؟ ئایا قاسم لەگەڵ تۆش هەوڵی داوە، دژی بارزانی بتجوڵێنێت؟**

- کەریم قاسم منی ئەناسی، لە دو موناسەبەتدا یەکتریمان بینیبو، یەکێکیان من هەندێجار بۆ چاوپێکەوتنی رۆژنامەنوسی ئەچوم، پاشان کە زابت ئیحتیات بوم، مەلا مستەفا و مامۆستا ئیبراهیم چوبون بۆ لای قاسم، داوایان کردبو، تەسریحم بکەن چونکە کاری حیزبیمان پێیەتی.

مەلا مستەفا، پێی گوتبو: "سوپای عێراقی چوار فرقەیە، پارتیش فیرقەی پێنجەمی جەنابتە، بهێڵە با مام جەلال لە فیرقەی پێنجەمدا ئیش بکات، لە جیاتی ئەوەی لە فیرقەی چوار بێت".

من لە فیرقەی چوارەمی مودەرەعە بوم، ئیتر ئەمری کرد و گوتی: "بینێرن بۆ فیرقەی پێنجەمی شاخاوی"، عەفوی کردم و دواییش چوم بۆلای بۆ سوپاس کردن، بەو بۆنەیەوە ئەی ناسیم.

لەپاشاندا، ئەو پیلانە ئیستیعمارییەی کە گوتمان کەشف بو، کابراکە هاتە لای من، من بردمە لای مامۆستا ئیبراهیم، بۆیە قاسم ئاگاداری ئەو مەسەلەیەش بو، ئەیزانی کە من ئەو کەسەم کە موئامەرەکەم دژی ئەو کەشف کردوە و هەواڵەکەم گەیاندۆتە مامۆستا ئیبراهیم.

جگە لەوەش، لە نوسین لە رۆژنامە و گۆڤاردا چالاک بوم، ئەندامی دەستەی ئیدارەی نەقابەی رۆژنامەنوسانی عێراقی بوم.

لەبەرئەوە ئەیناسیم، جوابێکی بۆمن نارد و منیش زۆر بە توندی وەڵامم دایەوە، راستییەکەی ئێستا پەشیمانم بەو کەسەم گوت، کە هەواڵەکەی بۆ هێنابوم، پێی بڵێ، "وەڵڵا کوردستانی لێ ئەکەین بە ڤێتنام، ئەگەر باش دانەنیشێ! باشترە کە پەیوەندی لەگەڵ مەلامستەفا تێک نەدا و مەلامستەفا سەرۆکی ئێمەیە".

ئەگەر ئەو رۆژە ئێمە نییەتمان لەگەڵ مەلامستەفا خراپ بوایە، یا زۆر

دڵسۆزی ئەو نەبوینایە، ئەوە فرسەتێکی وا هاتبوە پێشەوە کە بە ئاسانی مەلا مستەفا خۆی ئەڕۆیشت و لە حیزب جیا ئەبوەوە، کەریم قاسمیش بەو شێوەیە دژایەتی پارتی نە ئەکرد، چونکە دژایەتیەکەی تەنها لە ڕقی مەلا مستەفا بو، بەڵام کە حیزب شان بە شانی مەلامستەفا وەستا، بەڕاستی کەریم قاسم کەوتە دژایەتی پارتی، ئەوە بوەهۆی تێکچونی سەرکردایەتی پارتی.

* **هۆی ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و قاسم لە بواری فیکرییەوە چی بون؟**

- جیاوازی فکری نێوان پارتی و کەریم قاسم هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دیاربو، کەریم قاسم پیاوێکی عێراقچی بو، نە باوەڕی بە نەتەوەیەتی عەرەب هەبو، نە باوەڕی بە نەتەوەی کورد، ئەیگوت (الجمهورية العراقية الخالدة) ئێمە هەمو عێراقیین، عێراق خاکی نیشتەجێبونی عەرەب و کوردبوە، لە عێراقەوە کورد ڕۆیشتوە بۆ جێیەکانی تری دنیا و بەهەمان شێوە لە عێراقەوە عەرەب ڕۆیشتوە، ئەو عێراقە هەتاهەتایە ئەمێنێتەوە، لەبەرئەوە نابێت جیاوازی لەنێوان کورد و عەرەبدا هەبێت.

بەراستیش کەریم قاسم جیاوازی نەدەکرد، واتا پیاوێک بو، باوەڕی بە یەکسانی کورد و عەرەب هەبو، جیاوازی لە نێوان شیعە و سوننە نەدەکرد، جیاوازی لە نێوان مەسیحی و موسوڵمان نەئەکرد، عێراقچیەکی بە واتای وشە عێراقچی بو. ئێمەش بێگومان وانەبوین، ئێمە کۆسمەپۆلەتیمان پێ خراپ بو، حیزبێکی نیشتمانپەروەری کورد پەروەر بوین، پێمان وابو کە نەتەوەی عەرب و نەتەوەی کورد بونیان هەیە، لەوێوە ناکۆکی فکری لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم دەستی پێکرد.

ئەو ناکۆکیە شۆڕ ئەبۆوە بۆ زۆر جێگای تر، هەتا ڕەنگی لە دەستوریشدا دابۆوە، کۆمەڵێک مەسەلەی تریش، وەک دیموکراتیی، کەریم قاسم هەرزو پەیمانیدا ساڵی ١٩٦٠ دیموکراتی بچەسپێنێ و ساڵی ١٩٦١ هەڵبژاردن بکات، بەڵام ئەم بەڵێنانەی نەهێنایە دی.

ئێمە باسی ئەو مەسەلانەمان ئەنوسی و ئەماندایەوە بەچاویدا و بەرگریمان لە دیموکراتی و مافی ڕەوای گەلی کورد ئەکرد، هەتا گەیشتە ئەوەی، کە وتارێکی (کلۆفیس مەقسود) کە پاشان ماوەیەک ئەمینداری گشتی جامیعەی عەرەبی بو، لە ڕۆژنامەی سەورەی عێراقی، بێ ئەوەی بزانێت ناوەڕۆکەکەی چیە و چۆن باسی کەمایەتیە نەتەوەیەکان دەکات، هاتبو قسەکەی میشیل

عەفلەقی وتبۆوە و نوسیبوی "کەمە نەتەوەیەکان لە نیشتمانی عەرەبیدا، ئەگەر نەبون بە عەرەب ئەوا پێویستە سەحق بکرێن".

ئێمە لەسەر ئەو وتارە کردمان بە هەڵڵایەکی گەورە، عەریزە و ناڕەزایی و بروسکەمان لەهەمو لایەکەوە نارد و زۆرمان گەورەکرد، وامانکرد، کە کەریم قاسم ئەو ناڕەزایی و تورەبونە بە دژی خۆی بداتە قەڵەم.

## پەراوێزەکان:

١- مەلا مستەفا لە ٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ دا گەیشتە بەغدا و پێشوازییەکی گەورەی حکومی و جەماوەری لێکرا. هاورێیانی بارزانی، کە لە سۆڤێت مابونەوە، ئەوانیش بەسواری کەشتیەك لە ١٧ نیسانی ١٩٥٩ دا گەیشتنە بەسرا و بە هەمان شێوە پێشوازییان لێکرا.

٢- پارێزەر (کامیل بترس قزانجی) بەدەستی یاریدەرێکی عەبدلوەهاب شەواف کوژرا، ئەوە دوای ئەوەی، کە بارەگای سەرەکی شەواف بۆردومان کرا.

٣- ئەحمەد ئاغای زێباری لە ١٩٥٩/١١/٤ لە موسڵ کوژرا.

٤- حەمایل خان لە ٢٠١١/٧/٢٧ لە تەمەنی نزیك ٨٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٥- بە فەرمانی بارزانی، سەرۆک عەشیرەتی خۆشناو، سدیق میرانیان لە رێگای نێوان کۆیێ — شەقلاوە کوشت، ئەو پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ قاسمدا هەبو، کوشتنی سدیق میران و ئەحمەد ئاغای زێباری، وەك دو سەرۆك عەشیرەتی دۆستی قاسم، بە دژایەتیەکی حکومەتی قاسم درایە قەڵەم.

٦- باڵوێزی بەریتانیا لە عێراق (هامفری تریلڤیلیان) لە ٢١ شوباتی ١٩٦٠ دا سەردانی مەلا مستەفا دەکات و لە نامەکەیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی نوسیویەتی: (پاش چەند دەقیقەیەک تاخیرکردنم، شێخ ئەحمەد بارزانی برا گەورە، لە دوایەوە مەلا مستەفا بە بەرگی کوردییەوە هاتن و شێخ ئەحمەد وتی: "کە ئەو هەمیشە هەوڵی داوە، کە یارمەتی بەریتانیەکان بدات.. بەڵام بەهۆی لەیەك نەگیشتنەوە بەوە پاداشت کرا، کە دوانزە ساڵ لە بەندیخانەی بەسرادا زیندانی بکرێ. ئینجا دەوری مەلا مستەفا هات، کە قسە بکات و دانیشتنەکەی خۆشکرد، چاوپێکەوتنەکە گۆڕا بە دەربرینی بەوەی، کە دۆستایەتی (بەریتانیا - بارزانی) تازە بکرێتەوە.. من زۆر بە ترسەوە قسەم دەکرد، بەبێ ئەوەی کارێکی وا بکەم، کە ئێمە ئامادەین بۆ دروستکردنی هەر پەیوەندیەك، گەر لە رێی حکومەتی عێراقەوە نەبێت. دۆستایەتی ئێمە لەگەڵ هەمو گەلدایە لە عێراق). (کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا. نوسینی د.ولید حمدی ل.٢٣٠).

٧- دەربارەی ئەوەی کە بارزانی یارمەتی "پارە"ی لە یەکێتی سۆڤێت وەرگرتوە، عیسی پژمار، ئەو کاتە نوێنەری ساواك بوە لە عێراق و ئەڵقەی پەیوەندی بوە لەگەڵ بارزانی، بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: (ژنە روسێك کە خێزانی یەکێك لە بارزانیەکان بو، مانگانە دەچوە سەفارەتی سۆڤێت و پارەی وەردەگرت، دوای بەدواچونم، دەرکەوت کە مەسەلەکە راستە، من زۆرم پێ ناخۆشبو، چونکە من وەك نوێنەری ئێران لەگەڵ بارزانی رێکەوتبوین، کە لە هەمو پەیوەندیەکی دەرەوەی ئاگادارمان بکاتەوە، بارزانی قورئانی بۆ

خواردین کە راستمان لەگەڵدا بکات. بۆئەو مەسەلەیە چوم بۆ لای بارزانی، ئەویش وتی: "چەند کەس لە بارزانیەکان کە لەگەڵ من هاتبون بۆ سۆڤێت، ژنی روسییان هەیە، ئەم کەسانە لە رێگای پۆستی ئاساییەوە ناتوانن پەیوەندی بە کەسوکاریانەوە بکەن. جارجار لە رێگای باڵوێزخانەوە دیاری، یان پارەیان بۆ دێت و یەکێکیان بە نوێنەرایەتی هەموویان دەچێ بۆ باڵوێزخانە و ئەو شتانە وەردەگرێ". پاشان بەردەوام سوێندی دەخوارد و نکۆڵی لە وەرگرتنی پارە لە سۆڤێت دەکرد). (دوای شەست ساڵ..عرفان قانیعی فەرد.ل. ٧٤٧).

٨- لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەنوسی ئینگلیزی، دیفید ئادمسن، لە سەرەتای ناکۆکیەکانی نێوان م.س. و بارزانی، لە وەڵامی پرسیارێکدا، ئایا ئەو سەرۆکی پارتیە، بارزانی دەڵێت: من سەرۆکی حیزب نیم، قاسم بەزۆر ئەمەی بەسەردا سەپاندم) (الحرب الكردية وانشقاق ١٩٦٤، دیفید أدمسن. ترجمەی جرجیس فەتحوڵا، ل. ٢٤٩).



لەگەڵ دەستەیەک ئەفسەر و سەربازدا



لە یادکردنەوەیەکدا لەگەڵ مامۆستا برایم ئەحمەددا



سەرەتای پێشمەرگایەتی



سەرەتای سییەکانی ژیان



هاوینی ١٩٥٥ دیمەشق

# زەمینەی خەباتی چەکداریی

*** کەواتە، ئەو ناکۆکییە بە سەرەتای دەسپێکردنی شۆرشی ئەیلول دائەنرێت؟**

- وردە وردە، پەیوەندی نێوان پارتی و کەریم قاسم تێکچو، گەیشتە ئەوەی کە ساڵی ١٩٦١ هەندێ عەشائیری کوردستانی، بە کاریگەری مەلا مستەفا، هەڵسانێکیان دروستکرد، ئەو تەجەموعاتانە چون و لە دەرەبەندیخان کۆبونەوە، لەولاشەوە شەڕێک لە نێوان زێباری و بارزانیدا رویدا، ئێمە لەو شەڕەدا، عەشائیرمان کۆکردەوە کە بچینە سەر زێبارییەکان، ئەوەبو لەهەمو لایەکەوە گرژی کەوتە نێوان بارزانی و زێباری، حکومەت کەوتە نێوانیان و خەتای هەردولای گرت، ئیتر ئەوە بوەهۆی ئەوەی، پەیوەندی نێوان مەلامستەفا و حکومەت بە تەواوی تێکبچێت.

پارتی لەو کاتانەدا، هێشتا بە تەواوی قەدەغەنەکرابو، ئەمری گرتنی مامۆستا ئیبراهیم لەسەر کوشتنی سدیق میران دەرچوبو، ئەویش بە هاندانی مەلامستەفا کرابو. ئەو ئـــەمری دابـــو بە برادەرانی وەک، مەحمود کاوانی، مام تەها، مەلا ماتۆڕ و شەمسەدین موفتی، ئەو کارەیان بۆ جێبەجێ کردبو، بەڵام بێ ئاگاداری حیزب.

حکومەت فەرمانی گرتنی مامۆستا ئیبراهیمی دەرکرد، ئەوەبو ئێمە خۆمان شاردەوە، کاک عومەر دەبابە و ساڵح یوسفی گیران.

پارتی، لەو کاتەدا، بە ئاشکرا و نیمچە ئاشکرا کاری ئەکرد، لەبەرئەوەی کە ئەو تەجەموعە عەشایریە دروست بوبو، حیزب کەوتە نێوان دو ئاگرەوە، دو بۆچون هەبون، لەسەر ئەو تەجەموعە عەشایریە، بۆچونێکیان ئەوەبو، مامۆستا ئیبراهیم، دکتۆر شەمزینی، دکتۆر موراد و نوری شاوەیس دەریان ئەبڕی و ئەیانگوت: "ئەم تەجەموعە عەشایەریە تەجەموعێکی گومانلێکراوی کۆنەپەرستانەی بێ سەروبەرە، ئەوە ماوەیەک دەوام ئەکات و مێژوی کورد دەری خستوە، هەمو بزوتنەوەیەکی عەشایری، سەرکەوتو نابێت، ئەگەر بەدەستی بێگانە هەڵگیرسابێت، لەبەرئەوە نابێ ئێمە پشتگیری ئەو جۆرە بزوتنەوانە بکەین".

بۆچونێکی تر هەبو، بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بو، کە ئەیگوت: "با ئێمە ئەوانە لەچەند شوێنێک ماندەین، نەک بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش، بەڵکو بۆئەوەی حکومەت هەوڵ بدات، ئەو جوڵانەوانە بکوژێنێتەوە، بەڵام پێیان ناکوژێتەوە و دوایی ناچارئەبن، کە ڕەچاوی ئێمە بکەن و داوای یارمەتی لە ئێمە بکەن".

*** بۆچی ئێوە نەچون، بۆئەوەی لەگەڵ بارزانی گفتوگۆ بکەن؟**

– حیزب منی نارد بۆ لای مەلا مستەفا، پێمان ڕاگەیاند "با گیروگرفتەکان یەکلابکەینەوە، ئەگەر ئەتەوێت ئێمە شۆڕش بکەین، ئەوا با ئێمە دەستپێشخەریی بکەین و ئەتوانین چەند شوێنێک بگرین، وەکو هەولێر، سلێمانی، ڕەواندز، کۆیە و چەند شوێنێکی تر، هەم چەکمان دەست ئەکەوێت و هەم پارە، ئەگەر ناتەوێت شۆڕش بکەیت، ئەم جۆرە کارانە ئەبێتە هۆی پێکدادان لەگەڵ حکومەتدا"، کاتێ من چوم بۆلای مەلا مستەفا، گوتی: "نەخێر ئەم جۆرە کارانە باشن با دەوام بکات و پەرەبسێنێت، با تەلی تەلەفۆن ببڕن، پرد بتەقێننەوە، ئینجا حکومەت ناچارئەبێت داوای هاوکاری لە ئێمە بکات، بۆ چارەسەریی ئەو کێشانە".

*** یاسای ئیسلاحی زەراعی، هیچ کاریگەریەکی لەسەر ئەو جوڵانەوەیە هەبو؟**

– ئێستا بۆت باسدەکەم: من کە لەلایەن مەکتەبی سیاسیەوە نێردرام بۆ لای بارزانی، وەرزی هاوین بو، لە چیای شیرین بو، کە چومە لای، مەلا ماتۆڕی لابو، مەلا مستەفا ئەویشی لە هەولێرەوە بانگ کردبو، دیارە مەلا ماتۆڕ ئەوکاتە هەرچەندە ئەندامی کۆمیتەی مەرکەزی بو، بەڵام ڕاستەوخۆ فەرمانی لە مەلا مستەفاوە وەردەگرت، هەرچی مەلا مستەفا پێی بگوتایە، وای ئەکرد، پرسی بە مەکتەبی سیاسی نەدەکرد.

کە چوم ڕاسپاردەکەی مەکتەبی سیاسیم پێ ڕاگەیاند، کە ئەڵێت ئێمە چی بکەین؟ "ئەگەر ئەتەوێت شۆڕش بکەین، ئەوا ئێمە ئەتوانین چەند شارێک بگرین و چەکمان دەست ئەکەوێت و پارەمان دەست ئەکەوێت، ئەگەر شۆڕشیش ناکەین، ئەو جۆرە کارانە خراپن، دەبنە هۆی ماندانی خەڵک و لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی پێکدادان لەگەڵ حکومەتدا".

مەلا مستەفا، بەشێوەیەکی خراپ وەڵامی دایەوە و گوتی: "نا، مەکتەبی سیاسی سەهوە، ئەو جۆرە کارانە زۆر باشن، ئەبێتە هۆی ئەوەی، حکومەت ناچاربێت گفتوگۆمان لەگەڵدا بکات". سیناریۆکەی وا هێنایەوە گوتی: "حکومەت

بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵسانانە، بەتایبەتی کە پەرەی سەند، کەمال عوسمان ئەنێرێت بۆ کوردستان، ئەو پێی چارەسەر ناکرێت، پاش ماوەیەکی تر مەسعود محەمەد ئەنێرێت، ئەویش پێی چارەسەرناکرێت، هەوڵ ئەدەن خەڵکی تر بنێرن، ئەوانیش پێیان چارەسەر ناکرێت، بۆیە لە کۆتاییدا ناچارئەبن، داوا لە ئێمە بکەن، کە ئیبراهیم ئەحمەدیان بۆ بدۆزینەوە و بینێرین بۆلایان، ئەو کاتەش ئێمە ئەڵێین ئیبراهیم بچۆ کە ئیبراهیم چو بۆ لای قاسم پێی ئەڵێ: کێشەکە چیە و چۆن چارەسەر ئەبێت؟ ئەویش ئەڵێ ئەوە بە من چارەسەر ناکرێت، باشترە بچن لەگەڵ مەلا مستەفا چارەسەری بکەن، ئەو کاتە کەریم قاسم، ئیبراهیم ئەحمەد و ئەحمەد ساڵح عەبدی، بە فرۆکە ئەنێرێتە ئێرە، دەستی درێژ کرد و گوتی: بۆ ئەو گۆرەپانە، دێن لەوێ و بەیەکەوە دادەنیشین، ئەو کاتە خۆمان شەرتیان بەسەردا ئەسەپێنین و چارەی کێشەکان ئەکەین".

*** ئەی بۆچونی ئێوە سەبارەت بەم بۆچونەی بارزانی چی بو؟**

- من و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری لایەنگری ئەوەبوین، ئەوە راپەرینی خەڵکییە، ئەگەر بێت و ئێمە لێی دابرێین، ئەوا لە جەماوەر عەزل ئەبین، چونکە ئەو راپەرینە، عەتفی خەڵکی راکێشاوە، بەهەمان ناونیشان بەربەرەکانی مقاوەمەتی حکومەتی بەخۆیەوە گرتوە و مەلا مستەفاشیان لەگەڵدایە.

ئەگەر دژبین، ئەوا ئەوکاتە پارتی، وەک تاقمێک ئەفەندی ترسنۆکی بێکارە، ئەدرێتە قەڵەم و وا نیشان ئەدرێت کە نامانەوێ خەباتی چەکدار و شۆرش بکەین لە پێناوی کوردا، بەتایبەتی لەناو خۆشماندا خەڵک هەبو وەک مەلا ماتۆر و عوسمانە ئەفەندی، ئەو بیروباوەرانەیان بڵاوئەکردەوە و بێ بیرکردنەوە پشتگیری مەلا مستەفایان ئەکرد.

لەبەرئەوەی ئێمە ئەترساین، حیزب ئینشقاق بکات، ئەوان لایەنە شۆرشگێر و کورد پەروەرەکە بەرن و ئێمە لایەنە ئەفەندی و سەرکز و سەرشۆرکردنەکانمان پێ ببرێت، لەبەرئەوە، ئێمە رەئیمان وابو، کە بچین و خۆمان ئەو کارانە بگرینە دەست.

کە هاتمەوە، ئەو هەواڵەمدا بە مەکتەبی سیاسی، ئەوانیش نامەیەکیان نارد بۆ لقی سلێمانی، من ئەو کاتە لێپرسراویان بوم، وابزانم وێنەیەک لەو نامەیە لای کاکە حەمەی حاجی تایەر مابێت کە زۆر شتێکی نایابە، باسی ئەوە ئەکات، "کاری عەشایەری خراپە، ئەنجامی چی ئەبێت و چۆنە، هەروەها ئەو ئاغایانە لە دژی ئیسلاحی زراعی هەڵساون و رەنگە هەندێکیان بە هانی بێگانە جوڵابن".

ئەوەی ڕاست بێت ئەو ئاغایانە لە دژی ئیسلاحی زەراعی دروستبون، پارتی لەگەڵ ئیسلاحی زەراعی بو، بەڵام مەلا مستەفا دژی ئیسلاحی زەراعی بو، مەلا مستەفا پشتیوانی ئەو ئاغایانەی ئەکرد، دژ بە یاسای ئیسلاحی زەراعی و بە کارێکی خراپ و بە خیلافی شەرعی ئەدایە قەڵەم.

# شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١

*** کەی و لە کوێ یەکەم تەقەی شۆڕشی ئەیلول کرا و چۆن دەستی پێکرد؟**

- کاتێ کە پارتی بڕیاریدا، یادی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی١٩٣٠ بکاتەوە، کەریم قاسم ئینزاری کردن، بەڵام لەپڕ برادەرانی بادینان بەبێ پرسی لیژنەی مەرکەزی، لە ٩ ئەیلولی ١٩٦١ پەلاماری زاخۆ و ئامێدی و هەندێ شوێنی تریاندا و گرتیان. کەریم قاسم کە زانی لەوێ ئەو کارانە ڕویداوە، ترسا نەوەک لە جێی تریش هەمان شت ڕوبدات، ئێمە ئاگامان لەو برادەرانە نەبو، ئێمەشیان ئاگادار نەکردبۆوە، کە ئەوەیان کردوە.

ئەوە بو لە ١١ی ئەیلولدا، کەریم قاسم بە فڕۆکە و سوپاوە کەوتە پەلاماری ئەو تەجەموعاتەی کە لە دەربەندیخان و خەلەکان هەبون. بە دو سێ ڕۆژ تەفروتونای کردن، هەمویان هەڵاتن، هەر کەسێک چوەوە ماڵێ خۆی و کەوتە بروسکە لێدان ودەربڕینی ئیخلاس و وەفا بۆ کەریم قاسم.

ئێمەی حیزبییەکان، ژمارەیەکی کەم لە کەوادری حیزبی بێ چەک ماینەوە، دو نمونەت بدەمێ لەسەر ئەو ڕوداوانە: یەکێکیان من پێش ١١ی ئەیلول چومە شارەزور، لە گوندی (تەپی سەفا) هەمو عەشایەری ئەو ناوچەیەم کۆکردەوە، قورئانم بۆ هێنان و قورئانیان خوارد کە بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا دۆستی شۆڕش و پارتی ئەبن و لەگەڵماندا ئەبن، یەک کەس قورئانی نەخوارد ئەویش حاجی موشیر بو، باوکی شەوکەتی حاجی موشیری خۆمان، هەمو لەو مەجلیسدا دانیشتبوین، ئەو هەڵساو گوتی: "مام جەلال من قورئان ناخۆم، بەڵام بەڵێنت ئەدەمێ تا تۆ هەیت، من لەگەڵ تۆدا دەبم و تا مردن پشتت بەرنادەم، بەڵام

ئەمانەی سوێندیان خوارد هەموویان درۆ ئەکەن، قورئانەکەشیان خواردو کەسیان لەگەڵتاندا نین".
ئەوەبو کە تەقە دەستی پێکرد، کەسمان لەگەڵدا نەما، هەر ئەومان لەگەڵ مایەوە، هەروەها لە ناوچەی دۆڵی خەلەکان و بازیان، زۆری عەشایەر بون، هەمو هەڵاتن و چونە ماڵی خۆیان، حیزبییەکان مانەوە و بەبێ ئەوەی ئامادەییان هەبێت، چەک و پارەیان هەبێت.

*** دوای ئەو شکان و شکستیەی پێشمەرگە و پارتی، بارزانی چ هەڵوێستێکی هەبو؟**

– مەلامستەفا، لەگەڵ شێخ ئەحمەد بروسکەی پشتگیریان بۆ حکومەت لێدا و گوتیان: "ئێمە تەئیدی حکومەت ئەکەین، لەگەڵ جمهورییەتین"، ئێستا بروسکەی پشتگیرینەکە ماوە، حکومەت هەستا بەیانی دەرکرد و بە فرۆکە بەیانەکەی بەسەر عەشایەری پشدەر و رانیەدا بڵاوکردەوە، تێدا نوسرابو: "مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد ئیعلانی وەلائیان کردوە بۆ جمهوریەت و بۆ زەعیم کەریم قاسم، ئێوەش هیچ مەجوڵێن، کار مەکەن و دانیشن وەک هەمو هاوڵاتیانی ئاسایی".

# بروسکەی شێخ ئەحمەد بۆ قاسم

*** ئەو بروسکەیەی بارزانی بۆ عەبدولکەریم قاسم دوای ۱۱ ئەیلول بو؟**

– بەڵێ، بروسکەکەی شیخ ئەحمەد و مەلا مستەفا دوای پەلاماردانەکەی حکومەت بڵاوکرایەوە، جوڵانەوە لە بارزان لە ۹ مانگەوە تا ۱۸ مانگ بێ دەنگبو، ئەو هەڵوێستەی مەلا مستەفا وایکرد، بادینان بروخێت. ئەو کاتە عەلی حەمدی، عەلی عەسکەری، ئەحمەد عەبدوڵڵا لەوێ بون و هێزێکی زۆریان هەبو. ئەو کاتە ئامێدی و زاخۆ و چەندین شوێنێکی تر گیرابون، چەندین پۆلیس و سەدان کەس ئیلتیحاقی کردبو، هێزێکی گەورەمان هەبو.
شۆڕشەکە، بەناوی پارتی و مەلامستەفاوە دەستی پێکردبو، بەڵام کە

مەلامستەفا ئەو بروسکەیەی لێدا، خەڵکەکە بە برادەرانی ئێمەیان گوت: "ئێوە قۆڵتان بڕین، ماڵی ئێمەتان شێوان و کاولتانکرد، فێڵتان لێکردین. بۆیە ئەوانە لێمان هەڵگەڕانەوە و چون تەسلیم بونەوە بە حکومەت"[1].

# یەکەم بۆردومانی کوردستان

*** کەی شەڕ دەستی پێکردەوە و هۆکارەکەی چی بو؟**

- نازانم هۆی دەسپێکردنی شەڕ چی بو، بەڵام لە هەژدەی ئەیلول، کەریم قاسم یەک هەڵەی گەورەی مێژویی کرد، ئەویش ئەوەبو، بەفڕۆکە بۆردومانی ناوچەی بارزانی کرد و گوتی: ئەبێ مەلا مستەفا لەوێ دەرکرێت، ئینزاری شێخ ئەحمەدی کرد، پێی راگەیاند: "پێویستە مەلا مستەفا لەوێ نەمێنێت، یان تەسلیم ببێت، یان ئەبێ لەوێ بڕوات".

ئەگەر کەریم قاسم بۆردومانی ناوچەی بارزانی نەکردایە و پەلاماری نەدایە، هیچ نەدەقەوما و مەسەلەکە کۆتایی ئەهات.

دوایی مەسەلەیەک رویدا و بوە هۆی ئەوەی کە مەلا مستەفا زۆر لە کاک نوری ئەحمەد تەها بە گلەیی بێت، کاک نوری لێپرسراوی قۆڵی پێنجوین بو، عەشایەری ئەو ناوچەیە لێی کۆبونەوە و گوتیان: "ئێوە پەندتان بەئێمە دا، گوتتان مەلا مستەفامان لەگەڵە و شۆڕش ئەکەین، کەچی وادەرنەچو، کوا مەلا مستەفا؟ ئێمە واهەستاین، دەربەدەرکراین و ماڵمان وێرانکرا، کەچی مەلا مستەفا دانیشتوە و بروسکە لێ ئەدا"، کاک نوری ئەحمەد بە پێکەنینەوە گوتبوی: "مەلا مستەفا تۆڵەی خۆی لێکردنەوە، ئێوە لە ١٩٤٥ وەعدتان بەودا، کە شۆڕش بکات، بەڵام هاوکاریتان نەکرد، ئێستاش ئێوە هەڵساون و ئەو بەدەنگتانەوە نەهات و نەیکرد و ئەوە تۆڵەی ئەو کاتەیە".

*** ئەی هەڵوێستی شێخ ئەحمەد چی بو بەرامبەر بە داخوازییەکەی قاسم؟**

- مەلا مستەفا خۆی و نزیکی سێ سەد چەکدار، لەسەر داوای شێخ ئەحمەد،

بارزانیان بەجێ هێشت و بەرەو بادینان ڕۆیشتن، شێخ ئەحمەدیش ئیعلانی وەلای بۆ قاسم کرد، بروسکەی پشتگیری لێدا و چو سەردانی کەریم قاسمی کرد و گوتی: "ئێمە موخلیسین و حەقمان بەسەر هیچەوە نییە"[٢].

*** واتا ڕوداوی گرنگ لە ماوەیەکی کورتدا ڕویدا؟**

– لە ٩ی ئەیلولدا پارتی لە بادینان پەلاماری شارەکانیدا، لە ١١ی ئەیلول، قاسم بە فرۆکە پەلاماری دەربەندیخان، دەربەندی بازیان، دۆڵی خەلەکانیدا کە تەجەموعاتی عەشایەری لێبو، هەروەها لە ١٨ی ئەیلولدا، کەریم قاسم بۆردومانی بارزانی کرد.

لە ئەنجامی ئەو شەڕ و پێکدادانە، پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی پارتی و کەریم قاسم بەتەواوی پچڕا و تێکچو، هەرچەندە دوای چەند مانگێک کەریم قاسم داوایکرد کە یەکێک لە سەرکردایەتی پارتی ببینێ. کەریم قاسم، لەدوای ١١ی ئەیلول کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی گرت و هەندێ بەڵگەنامەی لەسەر مەلا مستەفا بڵاوکردەوە و پارتی حەلکرد و گوتی: "ئەوانە لە دەرەوەی یاسان" و موسادەرەی مومتەلەکاتی پارتی کرد.

پاش چەند مانگێک، کەریم قاسم ناردی بەدوای یەکێک لە سەرکردەکانی پارتیدا، ئەوەبو بەرەزامەندی مەکتەبی سیاسی، مەرحوم نوری شاوەیش چو. ئەو قسانەی کە نوری شاوەیس کردی، کەریم قاسم قبوڵی نەکرد، ئەو قسانەی نوری شاوەیسیش هێنایەوە، لە کەریم قاسمەوە، مەکتەبی سیاسی قبوڵی نەکرد، لەبەرئەوە لە کۆتاییساڵی ١٩٦١ دا پەیوەندی نێوان کەریم قاسم و سەرکردایەتی پارتی بە تەواوەتی پچڕا و کۆتایی پێهات.

# خۆ ئامادەکردن و دەستپێکردنی خەباتی چەکداریی

*** ئەتوانین بڵێین کۆتایی هێنانی پەیوەندی نێوان قاسم و پارتی، بە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا ئەنرێت؟**

- وەک لەوەوپێش بۆم باسکردی، ماوەیەک پێش هەڵگیرساندنی شۆڕش، عەشایەری کورد لە زۆر شوێنی کوردستاندا، بەهاندانی مەلا مستەفا هەڵسابون، لە ناوچەی سلێمانی عەشایەری جاف لە ناوچەی سورداش، بازیان، هەمەوەند، حاجی ئیبراهیمی چەرمەگا، حاجی قادری سمایل عوزێری، شێخ تەیفوری سەرگەڵو، کوێخا سمایلی تەلان، شێخ مەحمودی کارێزە، لە ناوچەی شارباژێر و خۆشناوەتی و شاخی سەفین کۆمەڵێک عەشایەری تر هەڵسابون.

هەندێک بە سەرۆکایەتی مەلا ماتۆر و هەندێکی تریان بە سەرۆکایەتی مەحمود و ئەحمەد کاوانی و پاشان لێپرسراوی لیژنەی پارتی لە شەقڵاوە مام تەها و چەندین کەسی تر لەگەڵیاندابون.

هەروەها چەندین پۆلیسیش لە هەولێرەوە پەیوەندیان پێوە کردبون و چەکیان بردبو، بونە هێزێکی چەکدار و لە سەفین کۆبوبونەوە.

لە قۆڵێکی ترەوە، لە دۆڵی خەلەکان ئاغاکانی پشدەر، شێخ حوسێنی بۆسکێن و هەباسی مامەند ئاغا و ئەوانیش کۆببونەوە.

لە کۆیە، مەحمود ئاغای کاکە زیاد ئاغا و چەندین کەسی تر بارەگایان لە هەیبەت سوڵتان و لە زۆر شوێن دانابو، خەڵک بە نامە و راسپاردەی مەلا مستەفا هەڵسابون.

مەکتەبی سیاسی تەنها ئاگای لە جوڵانەوەی بادینان هەبو کە ئەویش بەبێ رەزامەندی مەکتەبی سیاسی بو، عەلی عەسکەری لێپرسراوی ئەوێ بو، ئەو و عەلی حەمدی و ئەحمەد عەبدوڵڵا، خەڵکیان هاندابو بۆ راپەرین و ئیشەکانیان گرتبوە دەست.

لە ناوچەکانی تر، ئێمە دەوری رابەریمان نەبو، تەنها لە لیوای سلێمانی،

من ئەو کاتە لێپرسراوی لقی پارتی بوم، لەوێ تەنها کادێرەکانمان ناردبوە ناو خەڵکەوە، رۆژانە نان و خواردەمەنی و ئازوقەمان بۆ دەناردن، ئەگینا خۆمان نەهیچ چەکدارمان هەبو، نە دەسەڵات، سەرکردایەتیشمان بەدەستەوە نەمابو!.
لەبەرامبەر ئەو حاڵەتەدا، مەکتەبی سیاسی، سیاسەتێکی هەبو، بریتی بو لەوەی، کاری عەشایەری خراپە، مێژو نیشانی داوە کە هەمو جوڵانەوەیەکی عەشایەری لە کوردستان ئەنجامەکەی شکستە، جگە لەوەی، زوربەی ئەو کەسانەی کە هەڵسابون ئاغا و دەرەبەگ بون، داخ لە دڵ بون، لەسەر مەسەلەی ئیسلاحی زەراعی، ئەیانویست دەسەڵاتی ئاغایەتی، دەرەبەگایەتی و عەشیرەتی خۆیان بژێننەوە.

لەبەرئەوە، مەکتەبی سیاسی ئەم جۆرە هەڵسانەی بە گشتی پێ باش نەبو، هەرچەندە دژایەتیشی نەدەکرد، بەڵام پێی وابو، ئەوە کارێکی باش نیە. بە پێچەوانەی مەکتەبی سیاسیەوە، مەلا مستەفا ئەوانەی هەڵساندبو، هانی ئەدان، تەشویقی ئەکردن، قورسایی خۆی و ناوبانگی خۆی خستبوە پاڵیانەوە.

خۆشی، بۆهەر جێیەک بڕۆیشتایە، پشتگیری ئەکردن، هەر پارتییەک و لێپرسراوێکی حیزبی پەیوەندی پێوە بکردایە، ئەمری پێ ئەکرد کە یارمەتی ئەو راپەرینە بدات و لەگەڵیان بێت.

دیارە من وەکو بۆم باسکردی، مەلا مستەفا، رەئی وانەبو، ئەو راپەرینە ئەتەقێتەوە و ئەبێت بە شۆڕش، پێی وابو ئەوە جۆرێکە لە گوشار و لە تین بردن بۆ کەریم قاسم، لە ئەنجامدا کەریم قاسم تەنازول ئەکات، داندەنێ بە داخوازیەکاندا و ملکەچ ئەبێت.

لەلایەکی ترەوە، مەکتەبی سیاسی ویستی ناڕەزایی و تورەبونی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، لە حکومەتی دیکتاتۆری و لە ئەنجامی بێبەش بونی کورد لە مافەکانی و لەو رەفتارانەی کە لە دژی کورد کراون وەربگێڕێت بۆ خەباتی سیاسی.

مەکتەبی سیاسی هەلی یادی ٦ی ئەیلولی قۆستەوە، پێشنیازیکرد، کە لە سەرتاسەری کوردستاندا بەوبۆنەیەوە مانگرتن لە شارەکاندا دەست پێ بکات و خەبات بگوێزرێتەوە بۆ شارەکان، لە جیاتی ئەوەی لەدەست لادێدا بێت.

ئەوەبو لە ٦ ئەیلولدا، لەسەر داوای پارتی، لە شارەکانی کەرکوک، سلێمانی، هەولێر، کۆیسنجەق، رانیە، زاخۆ، دهۆک، ئامێدی، شێخان، ئەتروش و هەمو شارەکانی تری کوردستاندا مانگرتنێکی گشتی سەرکەوتو ئەنجامدرا. جەماوەر لە

شارەکاندا چالاکیان ئەنواند لەشێوەی مانگرتن و خۆپیشاندان، داخوازییەکانیان بەشێوەی عەریزە و بروسکە بۆ حکومەت لە بەغدا بەرزکردەوە.

***ئەی پاش ئەم هەمو ڕوداوانە، هێزی پێشمەرگە چۆن دروستبو؟**

- هێزە چەکدارەکان بەم شێوەیەبون، بۆ نمونە: هەباس ئاغا لە ناوچەکەی خۆی، بە نزیکەی ١٥٠ تا ١٨٠ چەکدارێکی کۆکردبۆوە، ئێمە لە ناوچەی چەمی ڕێزان ١٢ کەس بوین و تەنها ٣ چەکمان هەبو، من تاپڕێکم هەبو، مامۆستا جەلال عەبدولرەحمان تفەنگێکی ئینگلیزی کۆنی کڕیبو، یەکێکی کەش کە ناوی حەسەن کەوڵەبو، سەربازی هەڵاتوبو، ئەویش تفەنگێکی ئینگلیزی لەگەڵ خۆی هێنابو. ڕەمەزان تۆراغی، دەمانچەیەکی پەرەپێلێکی گەورەی پێبو، ئیتر ئەوانی تر بێ چەک بون.

لەوێ، لە هیچ دێیەک جێمان نەدەبۆوە، عەشایەر دەری ئەکردین، ئەچوینە هەر گوندێک، ئەیانگوت ئێوە گیروگرفتتان ناوەتەوە، ئەوەنیە فڕۆکە بەدواتانەوەیە، لەبەرئەوە، کەس لە هیچ دێیەک ڕای نەدەگرتین، ناچار چوینە چەمی ڕێزان، کە جێیەک بو هیچ کەس و هیچ گوندێکێ لێ نەبو.

لەوێ خۆمان گرتەوە، بنکەیەکمان دانا، برادەرانی تریش، وەک حەمەی حاجی تایەر و کوێخا عەبدولکەریمی ماوەتی لێبون، ئەوانەش لێیان قەومابو، چونە ناوچەی قامیش و درێ خۆیان گرتەوە، لەوێ ئەوانیش ١٠- ١٥ کەسێ بون، کادێرەکانی تریش پەراگەندە و راکردو لە قەرەداغ و دەشتی شارەزور بڵاوەیان لێکردبو.

حیلمی عەلی شەریفیش بەخۆی و هێزێکەوە لە ناوچەی خانەقینەوە کە لێپرسراوی ئەوێ بو، چوبوە ناوچەی هۆرین و شێخان، لە شاخی بەمۆ خۆی گرتبوەوە، نزیکی ٣٠ چەکدارێکی ئێمە، لەو ناوچەیە بڵاوبوبوەوە، بەڵام هێشتا بەرەسمی فەرمانمان نەبو، ئایا ئێمە شۆڕش و خەباتی چەکدار ئەکەین، یا نایکەین.

# وازهێنانی بارزانی لە شۆڕش و سەفەرکردنی بۆ تورکیا

*** لەکاتی ئەم روداوانەدا مەلا مستەفا لە کوێ بو؟**

– ئێمەنەمان ئەزانی کە مەلا مستەفا چی ئەکا و چی ناکا؟ بەهۆی رێکخستنی پارتیەوە لە بادینان و لە رێگای عەلی عەسکەری، ئەحمەد عەبدوڵڵا و عەلی حەمدییەوە هەواڵمان بۆ هات، مەلامستەفا گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە، بەڵام بەنیازی ئەوەیە بڕوات و ببێت بە پەنابەری سیاسی لە تورکیا، یاخود لە سوریا.

ئەو هەواڵانەی بە دەستمان گەیشتبو، ئەی گوت "مەلا مستەفا بەتەمای شەڕکردن و شۆڕش نییە"! هەر لەوێ، زۆر کەس هەوڵی لەگەڵ مەلا مستەفادا کە سەفەر نەکات و واز لەو فکرەیە بهێنێت، بە تایبەتی عەلی عەسکەری، عەلی حەمدی، ئەحمەد عەبدوڵڵا، ئەسعەدی خۆشەوی و عەلی خەلیل و ئەوانەی تر، زۆر هەوڵیاندا، مەلامستەفا قانع بکەن نەچێت بۆ تورکیا، بەڵام ئەو لەسەر فکرەی خۆی سوربو، هەتا وەڵامی نارد و وەڵامەکە هاتەوە کە تورک قبوڵ ناکات، هەوڵیاندا بچێت بۆ سوریا ئەویش بەهۆی محەمەد عەلی سوریە، لەویشەوە وەڵام هاتەوە و گوتیان: نەخێر ئەوانیش قبوڵ ناکەن، لەبەرئەوە بەناچاری لە کوردستان مایەوە[٣].

ئێمە لە ناوچەی لیوای سلێمانی و هەولێر مابوینەوە، نەماندەزانی چی بکەین، بۆیە داوای کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی پارتیمان کرد، بۆئەوەی بڕیارێک بدات و بارەکە بەلایەکدا بخات.

دوای ئەوەی ماوەیەک بەسەر بارودۆخەکەدا رۆیشت، کەمێک تەپوتۆزەکە نیشتەوە و ئارامیەکی بەخۆیەوە بینی، لە کانونی یەکەمی١٩٦١ دا، بەشی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەدێی عەودالان، لە نزیک چەمی رێزان کۆبونەوە. لەو کۆبونەوەیەدا بە گشتی دەنگ بڕیاردرا، دەست بە خەباتی چەکدار بکرێت، بەڵام نەک بەناوی شۆڕشەوە، بەڵکو بەناوی (بزوتنەوەی چەکداری بۆ بەرگری) تەنها دو دەنگ دژی شۆڕشکردن و دژی خەباتی چەکدار دەنگیاندا، ئەویش عەلی عەبدوڵڵا و نوری ئەحمەد تەها بون.

عەلی عەبدوڵڵا، پێی وابو، رەنگە کەریم قاسم ناچاربێت و بەلای دیموکراتییەتدا بابداتەوە و ببێتە پیاوێکی دیموکرات و دیموکراسی بێنێتەوە بۆ عێراق، پێی وابو کە با هەوڵی پێکهاتن و گفتوگۆ بدەین لەگەڵیدا، نەک هەوڵی شەڕ و خەباتی چەکداریی.

کاک نوری ئەحمەد تەهاش، گوتی "هەر شتێک بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بێت، ئەنجامەکەی شکاندن و تێکچونە، من تاقیکردنەوەی پێشوم لەگەڵ مەلا مستەفا هەیە، چونکە ئەنجامی هەر کارێک بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بوبێت، ئەوا شکست و تێداچون بوە. تاقیکردنەوەی لەوکاتەوەی کە لە سۆڤیەت گەڕاوەتەوە، تا ئێستا دەری دەخات، مەلامستەفا حیزبایەتی ناوێت و دژی حیزبە. دەرەبەگ بە دۆستی خۆی و بە هێزی خۆی ئەزانێت، لەبەرئەوە من ڕەئیم وایە ئێمە خەباتی چەکدار نەکەین، هەوڵ بدەین لەگەڵ حکومەت پێکبێین، رێک بکەوین و چارەسەرێکی سیاسی بدۆزینەوە بۆ مەسەلەکەمان".

*** ئەمە بۆچونی ئەوان بو، ئەی ئێوە راتان چی بو دەربارەی هەڵگیرساندنی شۆرش؟**

– هەمو برادەرانی تری سەرکردایەتی، ئەوانەی کە لەبیرمە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، مەلا ماتۆر، عومەر دەبابە، جەلال عەبدولڕەحمان و من، هەمو دەنگماندا بۆ شۆڕش و بۆ خەباتی چەکدار، لەوێ بۆ یەکەمجار، ئەو دروشمانەمان دانا، زۆری من نوسیبوم، هەندێکی بە عەرەبی و هەندێکی بە کوردی بو، چونکە کۆبونەوەکە لای ئێمە بو، هەروەها من کۆنوسی کۆبونەوەکەم دەنوسی، بەڵام مامۆستا ئیبراهیم کۆنوسەکەی چاککرد.

# دروشمی شۆڕش و ناوی (پێشمەرگە)

*** دروشمەکان چی بون بۆ هەڵگیرساندنەوەی خەبات و شۆرشی چەکداریی؟**

– لە رۆژنامەی خەباتی ئەو سەردەمە، دروشمەکان نوسرابون، وەک: "هیچ چارەیەک نیە بەبێ دیموکراتی، دیموکراتیش نابێت بەبێ مافی گەلی کورد"، هەروەها هەندێ دروشم دەربارەی ئۆتۆنۆمی راستەقینە، دروشمی "کوردستان

یا نەمان" لە پاشاندا زۆر دەنگی دایەوە، ئەوەش دیسان من پێشنیازمکرد، بەشێوەیەکی تر، نەک وەکو ئەوەی ئێستا، راستییەکەی ئەو دروشمەم لە شۆڕشی کوبا وەرگرتبو، دروشمەکەیان "نیشتمان یا مردن" بو. منیش ئەوەم کورداند و جلی کوردیم لەبەر کرد و گیانی کوردیم کرد بەبەردا، ئەوەیش بە هاوکاری مامۆستا ئیبراهیم بو، لە جیاتی نیشتمان گوتم کوردستان، لە جیاتی مردن کردم بە نەمان "یان کوردستان یان نەمان" وام نوسی.

هەروەها جلی پێشمەرگانەشمان دانابو، جۆرێک قوماشی خاکی بو، هەر لەوێش مامۆستا ئیبراهیم ناوی کوردی دانا بۆ یەکەکانی هێزی پێشمەرگە، وەک پەل، لق. هتد، بەو شێوەیە هێزەکان دابەشکران.

## چۆن دارایی بۆ شۆڕش پەیداکرا؟

*** ئەی ئێوە سەرچاوەی پارەتان لە کوێوە بو، کێ هاوکاری دارایی دەکردن؟**

- بڕیارماندا کە هەوڵ بۆ پارە پەیداکردن بدەین، دەمێک بو پرۆژەیەک بەدەستەوەبو، پارەی ڕێگای کۆیە و هەولێر دەستی بەسەردا بگیرێت، ئەویش، هەمو سەری مانگێک ئەهات.

مەلا ماتۆر لێپرسراو بو، زۆر جار گیروگرفتی ئەهێنایە پێشەوە، ئەی گوت: "ئەبێ لە پێشەوە دو کەس بنێرین و ئاگامان لێبیێت، ئینجا کە هات هەواڵمان بدەنێ و دەست بەکاربین". ئەو کارەکانی وا زەحمەت ئەکرد کە بەراستی نەکرێ، من لەو کۆبونەوەیەدا گوتم: "کاکە بەو ڕێگایەی مەلا ماتۆر باسی ئەکات، قەت ناکرێت، دەسەلات بدەن بە من، کارەکە بۆ خۆم ئەنجامی ئەدەم".

ئەوەبو زۆر گفتوگۆکرا، لە کۆتاییدا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد گوتی: "کاکە ئەوە خۆی ئەو پیاوە پێشنیاز ئەکات، بچێت و ئیشەکە بکات، بینێرن با بچێت، ئەگەر سەرکەوت زۆر باشە و قازانج ئەکەین و پارەکە دێنێت، ئەگەر سەرنەکەوت، ئەوا ماندو ئەبێت و ماندو بونەکەی بۆخۆی ئەمێنێتەوە".

هەرلەوێدا ٢٠ تا ٣٠ پێشمەرگەیان دامێ، خۆشم چەکم نەبو، شەمسەدین

موفتی لە هەولێرەوە هاتبو، نەخۆش بو، ئەچو بۆ بەغدا بۆ چارەسەر، ئەو تفەنگێکی پەرەشوتی دامێ. رۆیشتین و بەیەک رۆژ گەیشتینە لای کۆیە، لەوێوە رۆیشتین بۆسەر رێگای نێوان کۆیە و هەولێر.

لەوێ دکتۆر خالیدیشمان توش هات، ئەویشمان لەگەڵ خۆمان برد، لە ٢٥ کانونی یەکەمی ١٩٦١ دا کەمینێکمان دانا بۆئەو پارەیەی کە مودیر مالی کۆیە تاهیر عەبدوڵڵا لە هەولێرەوە ئەیهێنا. ئێمە خۆمان ئامادکردبو، ئاگادارم کردن، ئەگەر من یەکەم تەقەمکرد، ئەوانیش هێرش بکەن، چونکە یەک ئۆتۆمبیلی چەکدار و ٦ پۆلیسیان لەگەڵدابو، ئۆتۆمبیلەکە رەشاشێکی لەسەربو، من یەکەم فیشەکم نا بە دەستی ئەو پۆلیسەی کە رەشاشەکەی گرتبو، بۆئەوەی نەتوانێت بەکاری بهێنێت، ئیتر تەقەکرا و پۆلیسێکی کۆیی بەناوی زرار ئەمین و عەریف و نائیب عەریفێکی تریش کوژران و ئەوانی تر گیران.

پارەکەمان هێنا، یەک گونیەی تەواوبو، ئێمە وامان ئەزانی کە ١٥٠ هەزار دیناربێ، چونکە گونیەیەک پڕاوپڕبو، بەڵام تومەز دینار و پێنج دیناری بو، بۆیە واپڕبو خۆی پارەکە ٣٠ هەزار دینار بو، بە زەلامێک هەڵنەئەگیرا و ئیللا یەکێکی زۆر بەهێز نەبێت.

من دەمامکم کردبو، ئەوکاتە کڵاوێکی شکاکیم هەبو لەسەرم نابو، هەتا نەمناسنەوە. لێپرسراوی دارایی کۆیە، خۆشی ئەندامی پارتی بو، بەڵام نەیدەزانی مەسەلەکە چییە، مەستییش هێشتا بەری نەدابو. لەسەر شاخ لێم پرسی، گوتم: "پارەکە چەندە"؟ گوتی: ٣٠ هەزار دینارە، منیش بەبێ ئاگا زللەیەکم لێدا! چونکە من توشی خەیبەت ئەمەل بوم، وام دانابو کە پارەکە ١٥٠ هەزار دینار بێت، کەچی ٣٠ هەزار دەرچو، هەرچەندە ئەو کاتە ٣٠ هەزار یەکجار زۆر بو، گوتی: "بابە لۆ لێمان دەدەی؟ کەممان هێنایە، درەنگ هاتینە"، جا ئەو قسەیە دوایی مەشهور بو لەناو شۆرشدا، (کەممان هێنایە درەنگ هاتینە).

پارەکەمان برد و رۆیشتین، گەیشتینە ناوچەی دۆڵی پشت کۆتەڵ کە هێزی عومەر دەبابە و برادەرانی خۆمانی لێبو.

٣٠ هەزار دینارەکەمان دابەشکرد، ١٠ هەزارمان نارد بۆ مەکتەبی سیاسی، ١٠ هەزارمان نارد بۆ مەلا مستەفا، لە بادینان بو، ١٠ هەزاریشمان بۆ خۆمان دانا. بەو پارەیە ژیاینەوە، چونکە بەراستی ئێمە هیچمان نەبو، پارەمان نەبو، جلمان نەبو، نانمان نەبو، ئینجا قاتمان کرد بۆ پێشمەرگە، پێڵاومان کڕی، سەرو ٣ دینارمان دانێ، ئەو کاتە ٣ دینار گەلێک زۆر بو.

*** ئەتوانین بڵێین ئەو قۆناغەی ئێوە دەستان پێکرد، بە سەرەتای ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە دائەنرێت؟**

- بەڵێ وایە، لەسەر بڕیاری کۆمیتەی ناوەندی پارتی، دەستمانکرد بە دروستکردنی هێزی پێشمەرگە و چەک پەیداکردن و خۆ ئامادەکردن بۆ شۆڕشی چەکداری.

مەلامستەفا لە بادینان بو، ئێمە لە سەرەتای ١٩٦١ ەوە نەخشەمان دانا بۆ گرتنی شاری سلێمانی، هەوڵێکی زۆرماندا، هەتا شەوی جێبەجێ کردنەکەشیمان دانا، بڕیار بو لە مارتی ١٩٦٢ دا بیگرین، بەڵام کە شەو چوین و بیگرین، پێشتر نوری شاوەیس، مامۆستا ئیبراهیم و ئەوان لەناو شاربون، نوری ئەحمەد تەهاو نوری شاوەیس لەگەڵ پۆلیسەکانی سەر بە پارتی قسەیان کردبو، وەعدیان دابو کە هاوکاریمان بکەن.

ئێمە نزیکی١٨٠ پۆلیسێکمان لەگەڵدابو کە لە ناو شاربون، هەندێک خەڵکیشمان هەبو لەناو دەبۆی حکومەتدا، هێزی ئێمەش نزیکی ٧٠ کەس بوین، عومەر دەبابە و برادەران هەندێ چەکیان لە ناوچەی دۆڵی بالیسان و دۆڵە ڕەقەوە کۆکردبۆوە، بەهەموی نزیکی١٥٠ کەسێک کۆبوبوینەوە و هاتینە ناوشار و دابەشیش بوین، لە دواساتدا پۆلیسەکانی سەر بە پارتی پەشیمان بونەوە، عەریف مەجید نوری ناوێک هەبو پیاوێکی زۆر ترسنۆک و بێ کەڵک بو، پەشیمان بوەوە، هەرچەندە نوری شاوەیس هانیداو و جۆرەها بەڵێنی دایە، بەڵام هیچ سودێکی نەبو.

لەپاش ئەوەی بێ هیوا بوبو، نوری ئەحمەدی تەها کۆڵێک جنێوی پێدابو، لە ئەنجامدا کارەکە نەکرا، لەوێ بە داماوی و بە ماندویی گەڕاینەوە.

ئەبوایا بەو شەوەش بگەڕێینەوە بۆ دۆڵەڕوتە، لە پشت سەرچنارەوە بە ماندویی لاماندا، چاک بو، حکومەت پێی نەزانی کە ئێمە خەریکی کاری وەهاین.

دوایی گەڕاینەوە بۆ ناوچەی شەدەڵە، هێزمان کۆکردەوە، من نزیکی هەشتا، نەوەد پێشمەرگەی خۆمانم لەبەردەستدابو، هەندێ عەشائیریشم کۆکردبۆوە، وەک هێزی شێخ عەبدولخالقی شەدەڵە، هێزی حاجی ئیبراهیمی چەرمەگا و مەجید ڕۆستەمی برای، بە گشتی بوین بە نزیکەی ١٥٠ کەسێک.

هەستام چومە ناوچەی شارباژێڕ، نەخشەیەکم دانا بۆئەوەی لە شەوی نەورۆز دا ئەو ناوچەیە بگرین، من تەماحم زۆربو، چونکە ئێمە لەناو عەشایری ئەوێدا زۆر دۆستمان هەبو، ئەوانمان بە پشتیوانی خۆمان ئەزانی.

# یەکەم چالاکی پێشمەرگانە لە ناوچەی سلێمانی

*** چالاکی پێشمەرگانە لە ناوچەی سۆران چۆن دەستی پێکرد؟**

- بەوشێوەیە بو، کاکە حەمەی حاجی تاهیر بە پانزدە، بیست چەکدارێکەوە لە ناوچەی دۆڵبێشک بو، خۆشم ١٢٠—١٣٠ کەسێکم لەگەڵ بو، لەوە گرنگتر، ئەندامێکی تر هەبو بەناوی عەریف مەجید شوانی کە دوایی بارزانی کوشتی، ئەو ئامر مەخفەری گاپیلۆن بو، نزیکی دە پۆلیسێکی لەگەڵدابو، هەروەها پێنج شەش پۆلیسی دیکەشی لە مەخفەری مۆکەبە رێکخستبو.

پیلانێکمان دانابو کە ئەو مەخفەرەکەی خۆی بگرێت، بە پۆلیسەکانی خۆی و بە جلی پۆلیسیەوە بەرەو مۆکەبە رابکات و بچێت و پێیان بڵێت: "ئەوە هەڵهاتوین لە دەست یاخییەکان"، خۆی بکات بەناو مەخفەرەکەدا و لەوێش بەیارمەتی پۆلیسەکانی تر ئەو مەخفەرە بگرێت.

ئەوکاتە، نزیکەی چل چەکێکمان ئەکەوتە دەست، بیست کەسێکمان ئەبردە لای خۆمان، بیستەکەی تریش چاوەڕێی شێخ مەحمودی کارێزەمان ئەکرد، چەکیان بەسەردا دابەش بکات، ئەوکاتە، ئەبونە چل کەسێک و شێخ مەحمود پەنجا کەسێکی لەگەڵ ئەبو و ئەیتوانی ئەزمڕە روتە بگرێت.

من خۆشم لە چوارتاوە چومە شاربازێڕ، کوێخا کەریمی ماوەتیمان ناردبو بۆ سەر شاناخسێ کە بیگرێت، هێزێکی تری پێشمەرگەشمان بە سەرۆکایەتی عەریف حەمە سالح لەگەڵ عەبدوڵڵای ئەحمەدی رەسوڵ ناردبو بۆ گرتنی باسنێ.

بڕیاردرابو کە شەوی نەورۆز ٢٠ لەسەر ٢١ هەمو ئەو شوێنانە بگرین، وامان دانابو، چوارتا ناگیرێت، بەڵام گوتمان چوارتا گەمارۆ ئەدەین بۆئەوەی مەخفەرەکانی تر هەمو بگرین. کاتێ کە رۆژی دوایی حکومەت دێت، لە چەمی تەگەران سەنگەرمان لێدا و هێزێکی گەورەمان دانابو لەوێ، هەرکاتێ حکومەت هات بکەونە کەمینەوە، چونکە کە دێن ئاگادارنین لەوەی کە کێی لێیە؟.

شەوی ١٩ لەسەر ٢٠ دێی مۆکەبە گیرا، گاپیلۆن خۆی پەیوەندی کرد و هاتن،

ڕۆژی بیستی مانگ، بەپێی ئەو نەخشەیەی دانرابو، ئەزمرە ڕوتە گیرا، لەولاترەوە، کوێخا کەریم ئەرکی خۆی جێبەجێکرد.

شەوی ٢١ چوارتامان بۆ نەگیرا، چونکە مەخفەرەکەی زۆر قایم بو، عەبدولوەهاب ئەتروشی معاونی پۆلیس بو، وەکیلی قایمقامیش بو، قایمقام سەلاحەدین مستەفا بو، خوشکەزای شەمسەدین موفتی بو، لە ئیجازە بو، مەئمور مەرکەزەکە کامل مجید بو کە پارتی بو، هەروەها چەکی قورسیشمان نەبو، لێیدەین، ئابلۆقەماندا، هەر پۆلیسێک کە ئەهاتە دەرێ لە مەخفەرەکە ئەمانگرت، لەو کەسانەی کە گرتمانن، شەهابی شێخ نوری بو، بۆ فەحسی توتن هاتبو، بەلام ئەوانەی برادەری خۆمان بون، هاتنە لامان و دوایی ئازادمان کردن.

نیوەڕۆ حکومەت ئاگادار بۆوە، جێگری بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی گوتبوی "آکو جماعة سرسرية جايين لمركز شرطة جوارتا هسة آروح اكلبجهم و اجيبهم" بەو جۆرە "اروح اكلبجهم و اجيبهم" هێزی کۆکردبۆوە و هات، تا گەیشتە ناو چەمی تەگەران، لەو کاتەدا بۆ بەدبەختی حاجی شێخەیەک هەبو، خەڵکی ناوچەی حاجی ئۆمەران بو، نوێژ ئەکات کە فەرماندەکە ئەبینێ یەکێک نوێژ ئەکات و چەکدارە، ئەبێت بە تەقە، ئێمە تا ئێوارە زۆر سەرکەوتوبوین. هێزی حکومەتمان ئابلۆقەدا، کوژراو و برینداریان زۆربون، ئۆتۆمبێلەکانیشیان کەوتە بەردەستی خۆمان، کە چواردە ئۆتۆمبیل لەبەردەستی خۆمان بو، بە چەک و فیشەکەوە.

ئەوان خۆیان لە پەنادا حەشار دابو، ئێمەش دامانئابو، ئێوارە هێرش بکەینە سەریان و بیانگرین، بەلام پێش ئەوەی ئێوارە بێت، فرۆکە هات و حەمید کاوانی لەو شەڕەدا شەهیدبو، لێپرسراوی ناوچەکەبو، ئەوکاتەش ئێمە لەشەڕدا تاقیکردنەوەمان کەمبو، بۆیە لە هەر شەڕێکدا سەرکردە بکوژرایە، خەڵک ورەی ئەروخا و ناوچەکەی چۆڵ ئەکرد.

بەهۆی شەهیدبونی حەمید کاوانییەوە، لایەک چۆڵکرا، بۆیە حکومەت توانی دەرباز بێت و گەڕایەوە سلێمانی، بەلام زیانیان زۆربو، هەندێ لە ئوتومبیلەکانمان سوتاند و ئاگری نەورۆزمان پێکردەوە. هەروەها هەزاران فیشەک، بۆ یەکەمجاریش، هاوەن و رەشاشی دیکتاریۆفمان گرت، بە گشتی چەک و تەقەمەنی زۆرمان کەوتەدەست.

شەوی نەورۆزی ١٩٦٢ باسنێمان گرت، ١٩ کەس و شاناخسێ ٤٢ کەسی تێدابو، ئەو سەرکەوتنانە دەنگی زۆری دایەوە، چونکە یەکەم چالاکی گەورەبو، چەک و پارە و تەقەمەنیمان دەستکەوت، ئێمەبوین بە هێزێک لای خەڵک کە هەیبەت و حورمەتمان زیادیکرد.

لەوێوە بەرەو پێنجوین ڕۆشتین بۆئەوەی بیگرین، لە ناوچەکە کۆبوینەوە، زۆر لە پۆلیسەکان هاوکاریان کردین و دوایی پێنجوینیشمان گرت، کەمالی شێخ غەریب، معاونی پۆلیسی پێنجوین بو، ئەویش تەسلیم بو، لەو هێرشەدا لە ناڵپارێز مەلا ڕەسول گورون، شەهیدکرا.

بەم جۆرە، شۆڕش لای ئێمە کڵپەی سەند و گەشەیکرد، لە لیوای هەولێریش سەرکەوتنی باش بەدەستهات، ئەو برادەرانەی خۆمان لە بەهاردا چونەوە سەفین و هیران و نازەنین و ئەو ناوچانە. کاک عومەر دەبابە و برادەرەکان لەو ناوچانە هێزەکەیان کۆکردەوە، جۆشیاندایەوە، ناوی شۆڕش و ناوبانگی شۆڕش دەستی کردەوە بە گەشەکردن.

ئێمە لە چەمی ڕێزان کەوتینە گەشەکردن و پەرەسەندن، لە دوانزە کەسێ بێ چەکەوە بوینە هێزێکی گەورە، وردە وردە چەکمان زیادیکرد، ئیلتیحاقاتمان زۆربو، هەمو جۆرە خەڵکێک ئەهاتە لامان، تا وایلێهات لەو ساڵەدا هێزمان نارده قەرەداغ و کەمال موفتی سەرپەرشتی ئەکردن، بۆیە ناوچەی دەسەڵاتمان زیادیکرد. لە ناوچەی بەمۆ کاک حیلمی هێزی پەیداکرد، ئیتر وردە وردە سەدان هاوڵاتیمان لێ کۆبوەوە و شۆڕش دەستی پێکرد.

# لە خەباتی سیاسییەوە بۆ شۆڕشی چەکداریی

***ئەگەر بمانەوێت قۆناغی پێش شۆڕش هەڵسەنگێنین، ئایا، پارتی چ ڕۆڵێکی سیاسی دیاری بینی، بە تایبەتی لەو کاتەوەی، بە ئاشکرا دەستی بەکارکرد، تا سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕش؟**

– خەباتی سیاسی ئاشکرای پارتی، لە پاش ١٤ی تەموزەوە دەست پێدەکات، دیارە پێشتر خەباتی سیاسی هەبو، بەڵام بەشێوەی ئاشکرانەبو، هەر لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەموزەوە، یەکسەر پارتی هاتە پێشەوە و دەستی بەکار کرد، ئەویش بە دەرکردنی بڵاوکراوە و پەیوەندی کردن و هەڵوێست نواندن و پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە.

لەبەرئەوە ئەتوانین بڵێین لە شۆڕشی چواردەی تەموز بەولاوە، تا هەڵگیرسانی شۆڕشی ١١ی ئەیلولی ١٩٦١، قۆناغی خەباتی سیاسی بو، لەم قۆناغەدا، پارتی شێوەی خەباتی سیاسیەکەی خۆی بە بڵاوکردنەوەی رۆژنامە، بڵاوکراوە، پەیوەندی و هاوکاری کردن لەگەڵ حیزبەکانی تر لە بەرەی (ئیتیحادی وەتەنی) دا دەستپێکرد و گەشەیکرد.

پێش شۆڕشی چواردەی تەموز، پارتی خۆی ئامادەئەکرد بۆ خەباتی چەکداری، خەریک بو لە گەلێک شوێنی کوردستان دەستەی چەکدار دروستبکات، تەنانەت پەیوەندی کرابو بە سوریاوە، ئەو سەردەمە، من خۆم یەکێک بوم لەوانەی کە لەگەڵ مامۆستا زەبیحی و کەمال فوادا هەندێک کاربەدەستی سوریمان بینی، بۆئەوەی ئەگەر کە دەستمان بە خەباتی چەکدار لە کوردستانی عێراق کرد، ئەوانیش بە چەک و رادیۆ و بەهەمو شێوەیەکی تر یارمەتیمان بدەن.

بەڵام کە شۆڕشی چواردەی تەموزی بەسەرداهات، ئیتر ئامانجی سەرەکی خەباتی هەمو هێزە پێشکەوتنخوازەکان، بە پارتیشەوە، بو بە پاراستنی شۆڕش و کۆماری ساواو و گەشەپێدانی ئەو کۆمارە، بە ڕێبازێکی دیموکراتیانە، هەروەها پارتی ئامانجێکی تریشی هەبو، ئەویش ئەوەبو کە عێراق ببێت بە دیموکراسی و کوردیش بتوانێت لە سایەیدا بە مافە نەتەوایەتیەکانی خۆی بگات.

شێوەیەکی گرنگی خەباتی ئەو سەردەمە بریتی بو لە خەباتی فکری و سیاسی، بەهۆی رۆژنامە، گۆڤار و چالاکییەکانی ترەوە خۆی ئەنواند، بۆ ئەوەبو، کۆماری عێراق بپارێزرێ و سیستەمێکی دیموکراتی بچەسپێت. بەڵام لەسەر دیموکراتی، بیروڕای جیاواز هەبون، هەرچی پارتی بو، دیموکراتی ئاراستەکراوی تەبەنی ئەکرد، داوای ئەوەی ئەکرد، ئەو دیموکراسییە ئاڕاستە کراوە فراوان بکرێت و گەشەی پێبدرێت کە مافی کوردیش بگرێتەوە.

لە ئەدەبیاتی پارتیدا، وا باس ئەکرا، چارەی مەسەلەی کورد، تەنها لە رێگای دیموکراسییەوە دێتەدی، بەبێ سەلماندنی مافەکانی کورد، دیموکراسی کەموکوری تێدا ئەبێت، دیارە ئەوە گۆڕانێکی گرنگ بو لە دروشمەکانی پارتیدا.

# کێشەی کورد و دیموکراتی

*** پارتی، چ جۆرە دیموکراتییەکی پێ باشبو، نمونەی کام وڵاتی لا پەسەند بو تا پەیرەوی بکات؟**

– پارتی داوای دیموکراتی شەعبی و دیموکراتی ئاراستە کراوی ئەکرد، ئەویش بە کاریگەریی شۆڕشی ئەندەنوسیا، خەباتی ئەندەنوسیا، بە سەرۆکایەتی ئەحمەد سوکارتۆ، هێزەکانی چەپ، دیموکرات و پێشکەوتنخوازەکان هاوکاریان ئەکرد، بۆ پاراستنی حوکمی پێشکەوتنخواز، ئەوەبوە هۆی گەشەکردنی.

لە عێراقیشدا، سەبارەت بەو دەورە مێژوییەی، کە عەبدولکەریم قاسم نواندبوی لە شۆڕشی چواردەی تەموز و سەبارەت بەوەی، عەبدولکەریم قاسم بە رزگارکەر و پێشەوای شۆڕش و پیاوێکی سەردەم و کەسێکی دیموکراتخواز و پێشکەوتنخواز ئەزانرا، پارتی و چەندین حیزبی تری پێشکەوتنخوازی عێراقییش، مەسەلەی دیموکراتی ئاڕاستە کراویان (الدیمقراطیة الموجهة) هێنایەکایەوە.

جیاوازییەکانمان لەگەڵ هێزەکانی تری عێراقدا ئەوەبو، ئێمە هەمیشە ئەمانگوت، بەبێ سەلماندنی مافەکانی کورد، بەبێ حوکمی زاتی، بەبێ مافە نەتەوایەتی و ئیداری و سیاسییەکانی کورد، هەرگیز عێراق نابێتە دیموکراسی و ئیفلیج و شەل و گێڕئەبێت.

ئێمە، هەمیشە یەک لایەنمان لە مەسەلەی دیموکراسی بەدی نەدەکرد، بەڵکو هەردو لایەنمان بەدی ئەکرد، ئێستاش ئەو هەڵەیە لە فکری زۆر لە هێزە پێشکەوتنخوازەکانی عێراقدا بەدی ئەکرێت. هەمیشە ئەڵێین بەبێ دیموکراسی چارەی مەسەلەی کوردی ناکرێت، بەڵێ دیموکراسی تەئسیرێکی زۆری هەیە، بۆ چارەی مەسەلەی کورد، چەندین مافی دیموکراتی و نەتەوایەتی کوردیش بە دیموکراسی دێتەدی. بەڵام ئەوە لایەنێکی مەسەلەکەیە، لایەنەکەی تریشی ئەوەیە کە بەبێ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد، بەبێ سەلماندنی مافەکانی کورد، بەبێ داننان بە مافەکانی کوردا، دیموکراسی نایەتەدی.

ئەگەر دیموکراتی یەک لایەن بێت، ئەوا ئەوکاتە دیموکراسیەکی ناتەواو و ئیفلیج ئەبێت. جا پارتی ئەم لایەنەی زۆر بەرجەستە ئەکرد لە نوسین و بڵاوکراوەکانی خۆیدا. پارتی ئەیویست سەر لەنوێ برایەتی کورد و عەرەب لەسەر بناغەی وەک یەکی، برایەتی و سەلماندنی مافی هەردولا و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و ئاواتەکانی دور و نزیکی هەردولا، دارێژرێتەوە.

تەنانەت ئێمە، لە مەسەلەی یەکێتی عێراقدا، بۆچونی خۆمانمان دەربڕی و باسمان ئەکرد، ئەو (وەحدەی عێراقی)یەی لەکاتی پاشایەتیدا هەبوە، وەحدەیەکی بەزۆر پێکەوەلکێنراو و قەسری و ئیلحاقی و کۆنەپەرستانەبوە، بۆیە تەنانەت ئەو هەڵوێستانە، کاری کردبوە سەر عەبدولکەریم قاسم، لەبەرئەوە ئەویش لە وتارەکانی خۆیدا ئەیگوت: (الوحدة العراقية الصادقة — نەک الوحدة العراقية القديمة).

ئێمە پێمان وابو کە دوارۆژی عێراق پێویستە لەسەر بناغەی برایەتی کورد و عەرەب و وەک یەکی هەردولا و رەچاوکردنی مافەکانی دور و نزیکی هەردولا، وەک یەکی سیاسی، ئابوری و نەتەوەیی دابرێژێتەوە. ئێمە پێمان وابو، لە گۆڕینی شۆڕشی چواردەی تەموزەوە، گۆڕانێکی گەورە هاتۆتەکایەوە، هەتا لەدڵ و دەرونی کوردیشدا بەدی هاتوە، چونکە جاران کورد پەرۆشی حوکمی عێراق نەبو کە عەبدولکەریم قاسم هات و شۆڕشی کرد و دانی بە شەراکەتی کورد و عەرەبدانا و باسی چارەسەری کشتوکاڵی ئەکرد، بەشی هەرە زۆری گەلی کورد، لە ساڵی یەکەمدا پشتیوانی لە جمهوریەت و لە کەریم قاسم ئەکرد.

*** بەدەر لەم لایەنانەی خۆت باسکردن، پارتی چ جۆرە شێوەیەکی تری خەباتی گرتەبەر؟**

– شێوەیەکی تری خەباتی سیاسی پارتی، بریتی بو لە پەیوەندیکردن بە حیزبەکانی ترەوە، ئەوکاتە لە بەغدا چەندین سەرکردەی پارتی و حیزبەکانی تر لەوێ کۆببونەوە، بۆیە، هاتوچۆ، پەیوەندی لەناویەکدا کارێکی ئاسایی بو، بۆ نمونە، لەگەڵ حیزبەکانی وەک، وەتەنی دیموکراتی، وەتەنی تەقەدومی، حیزبی شیوعی و لەگەڵ ئازادیخوازەکانی تردا کە ئەیانویست جمهوریەی عێراقی دروست بکەن، لەگەڵ ئەوانەدا، هەفتانە و ناو بەناو پەیوەندی، دانوستاندن، دانیشتن، هاوکاری و پێکەوە بیرکردنەوە و کارکردنی هاوبەشمان هەبو.

شێوەیەکی تری چالاکی سیاسی پارتی، بریتی بو لە بەشداریکردن لە رێکخراوە

عێراقیەکاندا، وەک سەندیکای پارێزەران، ئابوریناسان، ئەندازیاران، مامۆستایان و ڕۆژنامەنوسان کە خۆم نوێنەری پارتی بوم لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتیدا. هەروەها پارتی هەوڵی ئەدا، ڕێکخراوی کوردستانی وەکو یەکێتی لاوان، قوتابیان و ئافرەتان دروست بکات، بەڵام بەداخەوە ئەوانە سەریان نەگرت، چونکە عەقڵییەتی عێراقچێتی عەبدولکەریم قاسم، ڕێی بەوەنەئەدا، حیزبی شیوعیش دژایەتی ئەو هەوڵەی ئەکرد، هەڵمەتێکی زۆر گەورەی دژی ئەم ڕێکخراوانە ئەنجامدا، ئەو ڕێکخراوانەی بە جیاوازخواز، تەفرەقە و دوبەرەکینانەوە و تێکدانی ریزەکان و خزمەتکردنی دوژمنانی جمهوری ئەدایە قەڵەم.

بەراستی لەو سەردەمەدا، حیزبی شیوعی لەروی سیاسییەوە هەرچەندە ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ پارتیدا ئیمزا کردبو، دانیشی بە حوکمی زاتیدا نابو، بەڵام لە داخوازییە نەتەوەیەکاندا زۆر ناراست و نارەوابو، بۆ نمونە، پارتییەکان داوای مەعاریفی کوردستانیان ئەکرد، ئەوان بە گاڵتەپێکردنەوە ئەیانگوت (مەعاریفی قلیاسان)، گاڵتەیان بە وشەی کوردستان و داخوازیەکانی کورد ئەکرد، لەجیاتی ئەوەی، هاوکاری پارتی بکەن، تەنانەت لەجیاتی ئەوەی ڕێز لەو ڕێککەوتنە بگرن کە لەگەڵ پارتی بە دوقۆڵی ئیمزایان کردبو.

هاوکاریی دوقۆڵی لەسەر داخوازی و ئیلحاحی حیزبی شیوعی بو، گۆڕانی بەسەر دروشمەکانی پارتیدا هێنا، دروشمی حوکمی زاتی خرایە جێی ئیتیحادی فیدراڵی، یان مافی چارەنوس، ئەمەش دیسان گۆڕانێکی گەورەبو لە سیاسەتی پارتیدا، چونکە پارتی لە مافی چارەنوس و دەوڵەتی فیدراڵی و کۆنفیدراڵییەوە هێنایە سەر قبوڵکردنی حوکمی زاتی، دیارە لێکدانەوەکە وابو کە عێراق، جمهوریەتی کورد و عەرەبە و قەڵایەکی دژ بە ئیمپریالیست و کۆنەپەرەستیە لە ناوچەکەدا، بۆیە بۆ پاراستنی ئەو کۆمارە، پێویستە رەئی خۆمان بگونجێنین، لە هەندێک داخوازی خۆمان بێینە خوارێ، تا بتوانین لە چوارچێوەی ئەم جمهورییەتەدا ئەو ئاواتانەی، کە مومکنە بەدی بێت، کە خۆی لە حوکمی زاتیدا ئەبینیەوە.

گەڕانەوەی دروشمی حوکمی زاتی بۆناو جوڵانەوەی رزگاری خوازی خەڵکی کوردستان، هەم لە ئەنجامی شۆڕشی ١٤ ی تەموز و هەم لە ئەنجامی گوشار و هەڵوێستی ناراست و نارەوای حیزبی شیوعی عێراقیدا بو. دیارە سەرکردایەتی پارتیش لەو سەردەمەدا، بە تایبەتی مەلا مستەفا، زۆرجار دژی باسکردنی کوردستان و کوردایەتی قسەی ئەکرد.

کاتێ کە مەلا مستەفا لە سۆڤێت هاتەوە، لە پێشوازی خەڵکدا و لە وتارەکانیدا،

هەمیشە باسی ئەوەی ئەکرد، ئێمە هەمو عێراقیین، هەمومان براین، جیاوازی لە نێوان کورد، عەرەب، موسوڵمان و مەسیحیدا نیە و هەمومان سەربازی عەبدولکەریم قاسمین.

لەزۆر جێگادا ئەیگوت داواکردنی هەرشتێک کە ببێتە هۆی جیابونەوە و ناکۆکی، ئەوە تەفرەقەیە، تەنانەت جارێکیان چوبو بۆ سلێمانی و لەوێ لە پێشوازی وەفدی لاوان و قوتابیان و ئافرەتاندا باسی ئەوەی کردبو "ئەو جیاوازیەی بۆ چیە؟ لاوانی کوردستانی پێناوێت و ئێمە هەمومان عێراقیین".

مەلا مستەفا، بۆچونی دەربارەی برایەتی گەیشتبوە ئەو دەرەجەیە، ئامادەنەبو هیچ داخوازیەکی کوردی کە بۆنی جیابونەوەی لێبێت داوای بکات.

کاتێ کار گەیشتە سەر ئیجازەی پارتی، عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفا گفتوگۆیان دەربارەی ناوەکە کرد، مەلا مستەفا لایەنگریی ئەوەبو کە تەنانەت مەرج نیە، ناوی کورد یا کوردستانیشی پێوەبێت.

ئەم هەڵوێستەی مەلا مستەفا لە لایەک و لە لایەکی ترەوە گوشاری حیزبی شیوعی و هەڵوێستی عێراقچێتی کەریم قاسم وایکردبو، هەندێک لەو دروشمە کۆنانەی پارتی بگۆڕدرێت و شێوەیەکی وا بەخۆوە وەبگرێت کە بگونجێت لەگەڵ باری تازەی عێراق و خەباتی سیاسی پارتیدا. ئەوەبو، (یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان) و (یەکێتی گەنجانی عێراق) بون بەیەک، ناونران (یەکێتی لاوانی دیموکراتی عێراق) بە ناوە تازەکەوە بەشداری یەکەم کۆنگرەی (الشبيبة)یان کرد لە هاوینی ١٩٥٩ دا.

*** بەدەر لە پەیوەندی ناوخۆیی، ئەی ئەو کاتە پەیوەندی پارتی لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیست چۆن بو؟**

- پارتی، لەو کاتانەدا پەیوەندی لەگەڵ سەفاراتەکانی وڵاتانی سۆسیالیست لە بەغدا هەبو، زوربەی ئەو وڵاتانەی کە سەفارەتیان لە بەغدا هەبو، پارتی لەگەڵیاندا پەیوەندی دروستکردبو، هاتوچۆی یەکتریان ئەکرد، دەعوەت و دەعوەتکاری هەبو، تەنانەت هەندێجار وەفدی پارتی دەعوەتی ئەو وڵاتانە ئەکرا.

هەروەها ڕۆژنامەکانی خۆمان هەواڵی ئەو وڵاتانەیان بڵاوئەکردەوەو کە پەیوەندیان لەگەڵ پارتیدا باشبو، بە تایبەتی ئەو سەردەمە پارتی، گرنگییەکی زۆری دابو بە پەیوەندی لەگەڵ سۆڤیەت و چین، لەناو دەوڵەتە سۆشیالیستەکاندا ئەڵمانیای دیموکراتی گرنگیەکی تایبەتی هەبو لای پارتی، چونکە ئەو هێشتا

ئیعترافی پێ نەکرابو، لەبەرئەوە قونسولیەتی هەبو لە بەغدا، ئێمە هەمیشە هەواڵی ئەڵمانیای دیموکراتمان بڵاوئەکردەوە، داوامان ئەکرد، ئەبێ ئەڵمانیای دیموکرات بە رەسمی بناسرێت و ئیعترافی پێ بکرێت، ئەوەش وای کردبو کە پەیوەندیەکی تایبەتی لە نێوان پارتی و ئەڵمانیای دیموکرات دروست ببێت، ئەنجامەکەی دەعوەتکردنی مامۆستا ئیبراهیم بو، بۆ بەرلینی رۆژهەڵات.

وەفدی ئێمە، بەناوی ئەنساری سەلامیش بە سەرۆکایەتی عومەر دەبابە، چون بۆ ئەڵمانیای دیموکرات.

پێش ئەوەی پارتی بە رەسمی ئیجازە وەرگرێ، لەهەمو شوێنێکی کوردستان بە ناوی رۆژنامەی خەباتەوە بارەگا کرایەوە، ئەو بارەگایانە لە راستیدا، بارەگای پارتی بون، لەوێ چالاکی پارتی، کۆبونەوەکان و رێکخستن ئەکرا، بەڵام کاتی ئەوە نەهاتبو، بنوسرێ بارەگای (پ.د.ک)، بەڵام کە ئەگوترا بارەگای خەبات هەمو کەس ئەیزانی کە خەبات، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانە و ئەوشوێنە بارەگای پارتییە.

چالاکی حیزبیی پەرەیسەند، هەزاران کەس بون بە ئەندامی پارتی، هەزارەها خەڵک لە دەوری رێکخراوانی لاوان، قوتابیان و ئافرەتان کۆبونەوە، ئەوانەش لە هەمو لایەکدا چالاکی خۆیان ئەنواند. لە زۆر شوێنیشدا، لەناو جوتیاراندا، پارتی چالاکییەکی زۆری ئەنواند. لە ئەنجامدا زوربەی زۆری یەکێتی جوتیاران لە کوردستان کەوتە دەست پارتییەوە و لایەنگیرانی پارتی لە هەڵبژاردندا سەرکەوتن.

ئەو سەرکەوتنانە، گرنگییەکی زۆری هەبو، چونکە جوتیاران بەشی زۆری خەڵکی کوردستان بون، جوڵانەوەی نیشتمانی ئەو سەردەمە، لە ناوەرۆکیدا بە جوڵانەوەی جوتیاران ئەناسرا.

بەشێکی گرنگی جوتیارانیش لەژێر کاریگەری (حشع) دابـــون، بەڵام لە هەڵبژاردندا لەزۆر جێگا پارتی ئەیبردەوە، بۆیە یەکێتی جوتیاران لە هەولێر، سلێمانی و تا رادەیەکیش لە کەرکوک و لە موسڵ کاریگەری زۆری پارتی پێوەدیاربو.

چالاکی حیزبایەتی ئەو سەردەمە، بریتی بو لە کۆبونەوە لەگەڵ هاوڵاتیاندا، کۆکردنەوەی خەڵک و رێکخستنیان، هەروەها کۆبونەوەی گەورە لە یادەکانی نەورۆز، دامەزراندنی پارتی، شۆرشی بارزان، شۆرشی ١٤ی تەموز، راپەرینەکان و زۆر یادی نیشتمانی و عێراقی و نەتەوایەتی تردا. لەو کۆبونەوە و یادانەدا، لێپرسراوانی پارتی ئەچون و بەشدارییان ئەکرد، وتاریان ئەخوێندەوە، بیروڕای

پارتی و هەڵوێستی پارتییان روندەکردەوە.

بارەگای پارتیش، دەوری هەبو لە کۆکردنەوەی جەماوەردا، پارتی بارەگای هەبو لە بەغدا، لەناو فەیلییەکان، لەناو کوردەکانی بەغدا، هەروەها دەورێکی گرنگی ئەنواند لە رێکخستنی ئاهەنگی نەورۆز و یادە نیشتیمانییەکاندا.

لە ساڵی یەکەم و دوهەمدا، سەرۆکی ئـەنجومەنی وەزیران، عـەبدولکەریم قاسم، خۆشی ئامادەی ئـەو یادانە ئەبو، وتاری ئەخوێندەوە و بەگەرمی پێشەوازیی لێدەکرا، هەروەها نەورۆزیش کرا بە جەژنی رەسمی بەناوی جەژنی بەهارەوە[٤].

ئەو سەردەمە، پارتی لایەنگری ئەوە بو کە پێویستە حیزبە عێراقییەکان هاوکاریی و دۆستایەتیان لەنێواندا هەبێت، هەوڵیشی ئەدا، بۆ نزیک کردنەوەیان، بەڵام بەراستی هەڵوێستی حیزبی شیوعی وایکردبو کە حیزبەکانی تریش وەک (وەتەنی دیموکراتی) باش بەدەنگ مەسەلەکەوە نەیەن.

حیزبی شیوعی، پەیوەندی لەگەڵ ئەوان باشنەبو، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ وەتەنی دیموکراتی، وەتەنی تەقەدومی و لەگەڵ نەقاباتدا هەبو، حیزبی شیوعی خۆی وایکردبو، پەیوەندی لەگەڵ ئەو حیزبانە تێکبدات، بەتایبەتی دو شتی زۆر خراپی کرد، یەکێکیان ئەوەبو، کاتێ حیزبی وەتەنی دیموکراتی بڕیاری وەستاندنی چالاکی سیاسی خۆیدا، هەستا تاقمێکی بچکۆڵەی لەوان جیاکردەوە و دایتاشین و گوتی: ئەمانە حیزبی وتەنی دیموکراتین و بڵاویکردەوە (الحزب الوطني الديمقراطي يواصل نضاله)، ئەوانەیان کرد بە وەتەنی دیموکراتی، وەتەنیە دیموکراتییە رەسەنەکە کە زۆرینەبون، رەتیان کردەوە.

هەروەک چۆن ئەو وڵاتانەی دوایی، کە پێیان ئەگوترا سوسیالیزم، کۆمەڵێک ئەحزابی داتاشراویان دروستکردبو، ئەوانیش ئەیانویست تا دەسەڵاتیان وەرنەگرتوە، حیزبی سەربەخۆیان داتاشن، تەنانەت لە پارتیشدا ویستیان هەمزە، نەژاد، خەسرەو و ئەوانە کە لە کۆنگرەی پارتی دەرکرابون، بیانهێننە پیشەوە و بڵێن ئەمانە پارتیە رەسەنەکەن.

من چاکم لە بیرە، لە کۆنفرانسی ١٠/٧/ ١٩٥٩ دا، کە لە ماڵی مامۆستا ئیبراهیم لە بەغدا، لە گەرەکی وەزیریە گیرا، وەفدێکی پارتی بە سەرۆکایەتی عومەر دەبابە چو بۆلای حیزبی شیوعی بۆئەوەی لە بڕیارەکانی کۆنگرە ئاگاداریان بکاتەوە، بریتی بو لە دەرکردنی هەمزە عەبدوڵڵا، حەمید عوسمان، ساڵح حەیدەری، نژاد ئەحمەدی عەزیز، خەسرەو تۆفیق، جەمال حەیدەری، زۆر بەتوندی و نادۆستانە

وەرەقەکەی پارتیان فڕێدابو، گوتبویان "ئێمە هەر ئەسڵەن ئیعتیرافتان پێ ناکەین، ئێوە هەر حیزب نین، حیزبی ئەسڵی هەمزە و برادەرەکانیانن"، عومەر دەبابە بە توندی وەڵامی دابۆوە، هەستابو بڕوات، لەوکاتەدا عەزیز محەمەدیش، لە کۆبونەوەکەدا ئامادە بوبو، وادیاربوە، ئەو قسانەی بە دڵنەبو، چوبو هەواڵەکەی بە سەلام عادل گەیاندبو، یەکسەر ئەویش هاتبو عومەر دەبابەی دانابۆوە و گوتبوی: "نەخێر ئێوە حیزبن، ئەمە ڕەئی شەخسیە، ئەوە کۆنگرەی ئێوەیە، هەر بڕیارێکتان دابێت، ئێمە ڕێزی لێ ئەگرین".

ئەگەر ئەو هەڵوێستەی سەلام عادل نەبوایە، ئەوا پەیوەندی نێوان پارتی و حیزبی شیوعی بە یەکجاری تێک ئەچو، بێگومان سەلام عادل و عەزیز محەمەد دەوری باشیان هەبو لە بەردەوامی پەیوەندی نێوان پارتی و شیوعیدا.

یەکێکی تر لە چالاکییەکانی پارتی، بۆ یەکەمجار کۆنگرەی ئاشکرای خۆی بە ئامادەبونی چەندین ئاژانسی بێگانە گرت، بە داخەوە من نەمتوانی لەو کۆنگرەیەدا بەشداربم، چونکە من ئەفسەربوم، ئەوکاتە زابتی ئیحتیات بوم، لە کەتیبەی دەباباتی چوارەم لەگەڵ د.عەزیزی شەمزینی، ئەوکاتە موقەدەم بو، هەروەها لەگەڵ کاک نوری ئەحمەد تەها کە نەقیب بو، هەرسێکمان بەجلی عەسکەریەوە لە دەرەوە تەماشامان ئەکرد، مافمان نەبو بچینە ناو کۆنگرەوە، بەڵام لە لاوە دەوری خۆمان ئەنواند و ئیشی خۆمان ئەکرد[٥].

# گەشەکردنی شۆڕش و مەسەلەی جاشایەتی

*** شۆڕش لە کام بواردا، بە باشی گەشەی کرد، یان کێشەی بۆ هاتە پێشەوە؟**

– جارێ لە پێشەوە ئەمەوێ بڵێم: هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ بەو شێوەیە ڕویدا کە پێشتر باسم کرد، واتا پیلانی، بۆ دانەنرابو، پارتی شۆڕش بکات، هێزی بۆ ئامادەبکات و خۆی بۆ ساز دابێت، بەڵکو ئەوە لە ئەنجامی ئەو کۆبونەوە عەشائیریانە بو کە شەڕی بەسەر پارتیدا سەپاند، لەبەرئەوە، پارتی هیچ ئامادەییەکی لەوەوپێشی نەبو. ئەگەر مەلا مستەفا ئەو سیاسەتە

ناراستەی نەگرتبایەبەر، ڕەنگە بمانتوانیایە لە چەند مانگێکدا خۆمان ئامادەبکەین بۆ شۆڕشێکی زۆر باشتر، واتا ئەمانتوانی چەندین شار و چەندین فەوجی عەسکەری بگرین، یاخود داویان لێبکەین، ئیلتیحاقمان پێوەبکەن و هەزاران پارچە چەک، دەیان تۆپ، تەقەمەنی زۆرمان بکەوێتە دەست و شۆڕشەکە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و باش دەست پێ بکەین، نەک بەو شێوەیە کە سەرەتاکەی تەجەموعێکی عەشایەری بێت و پاشان بە هەڵهاتن و شکان کۆتایی بێت.

هەمو ڕاپەڕینێکی چەکدار کە توشی شکست هات، هەڵسانەوەی زۆر ئاسان نییە، گرنگە لە سەرەتاوە پیلانی گونجاوی بۆ دابڕێژرێت، چونکە یەکێک لە مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕش، ئەوەیە کە ئەبێ هەنگاوەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەوسەرکەوتن و بەرەوپێشکەوتن ببرێت. ئەگەر لە سەرەتادا نوشست، داشکان و ئاشبەتاڵ ڕوبدات، وەکو لە تەجەموعە عەشایەرییەکان بە سەریانهات، ئەوە خۆی لەخۆیدا، هەم دەبێتە ڕوخاندنی ورەی جەماوەر و هەم دەبێتە هۆی نەمانی مەرجەکانی شۆڕش، چونکە یەکێک لە مەرجەکانی شۆڕش، هەڵچون و ناڕەزایی جەماوەرە، لەکاتێکدا ئەگاتە ڕادەیەک کە خەڵک بەشێوەی کۆن تەحەمولی ژیان و گوزەرانی پێنەکرێت، واتا هەڵچونی جەماوەر و هاتنە جۆش و خرۆشی خەباتی کۆمەڵانی خەڵک وای لێهاتبێت، ئامادەیی تەواوی هەبێت بۆ خەبات و فیداکاری.

بە پێچەوانەوە، ئەو تەکتیکەی مەلا مستەفا بەکاریهێنابو، بۆ کۆکۆدنەوەی عەشائیری کوردی، سەرەتایەکی دوربینانە نەبو، هەربۆیە کۆمەڵێک کۆسپ هاتنە پێشەوە، لەوانە:

یەکەم: لەپێش دەستپێکردنی شۆرش، کۆبونەوە عەشائیرییەکان بە ئاسانی، لە ئەنجامی هێرشێکی ئاسایی حکومەت شکان و هەڵهاتن، ئەو هەڵچون و جۆشدان و خرۆشانە زو ساردبۆوە.

دوەم: مەلا مستەفا زو، لەکاتی خۆیدا لە یازدەی ئەیلول، پشتگیری تەواوی جەماوەری نەکرد، شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا بەیانی پشتگیریان بۆ کەریم قاسم لێدا، لە پاشاندا کە حکومەت پەلاماریدا، ئینجا مەلا مستەفا ناوچەی بارزانی بەجێ هێشت.

سێیەم: مەلا مستەفا نەهات بە هاوکاری و ڕاوێژ لەگەڵ پارتیدا، پیلان دانێ بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، بەڵکو ڕۆیشت بۆئەوەی پەناگە بۆخۆی پەیدا بکات لە تورکیا و لە سوریا.

چوارەم: هەڵەیەکی تر کە دیسان بو بە کۆسپ لە پێش گەشەپێدان و

پەرەپێدانی شۆڕش ئەوەبو، لە جیاتی ئەوەی لەو شوێنانەدا کە ڕێکخراوەکانی حیزب بەهێز بکات و ئەو هێزە چەکدارەی دروست ئەبێ لەژێر سەرپەرشتی و چاودێری ئەندامانی حیزبدا بێت، ئەوەی نەکرد، بەڵکو ئەو هێزە چەکدارییەی دروست ئەبو، یان ئەیخستە ژێردەستی بەرزانیەکانەوە، یان ژێر دەستی عەشایەرەکانەوە.

لەبەرئەوە دروستبونی هێزی پێشمەرگە، نەبو بە هۆی پەرەسەندنی ڕێکخستنەکانی پارتی، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە گەلێک روەوە بوبەهۆی شکاندن و کەمبونەوەی دەسەڵات و نفوزی ڕێکخستنەکانی پارتی. بۆ نمونە، لە ناوچەکانی بادینان، پارتی ڕێکخستنی فراوان و پانوبەرینی هەبون، خۆ ئەگەر مەلا مستەفا ئەو سیاسەتەی قبوڵ بکردایە، وەک مەکتەبی سیاسی لە ناوچەکانی خۆیدا دایرشتبو، پشتی بە ڕێکخراوەکانی حیزبی و هێزی پێشمەرگە لەسەر بناغەی ئەندامانی حیزبی و لایەنگیران و دۆستانی حیزب و جەماوەری جوتیاران بەستبو، ئەوکاتە ئەو سیاسەتە ئەبوە هۆی پەرەسەندنی سەرجەم حیزب و شۆڕش لەهەمو کوردستاندا.

لەبەرئەوە تەماشا ئەکەین شتێکی دوفاقی لە کوردستاندا رویدا، لە ناوچەی سلێمانی و کەرکوک، هێزی پێشمەرگە بە دەستپێشخەری پارتی و خەباتی پارتی هەڵسایەوە، خەباتەکە جۆش درایەوە، ڕێکخستنی حیزبی گەشەیکرد و بوژایەوە، یاخود ئەو ڕێکخراوانەی، کە روخابون سەرلەنوێ دروستکرانەوە.

# بارزانی و حیزبایەتی

*** واتا بارزانی لەو کاتانەدا باوەری بە حیزبایەتی نەبو؟**

- لە کاتێکدا هێزی پێشمەرگە بە شێوەی نوێ لە زۆر ناوچەی کوردستان دروستبو، بەڵام لە ناوچەی بادینان بە شێوەی عەشایەری و لەژێر سەرکردایەتی مەلا مستەفا خۆیدا، دروستبو.

بارزانی کەسانی دەوروپشتی خۆی هەریەکەی کردنە لێپرسراوێک، عەلی خلیلی کرد بە لێپرسراوی ناوچەی دهۆک، عیسا سواری کرد بە لێپرسراوی ناوچەی زاخۆ، حەسۆ میرخانی کرد بە لێپرسراوی ناوچەی شێخان، ئەسعەدی خۆشەوی کرد بە لێپرسراوی هەمو ناوچەکە.

بارزانی، هەمو رێکخستنی حیزبی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و خەڵکانی سەربە خۆیەوە، تایبەتمەندییەکی تری خراپی مەلا مستەفا ئەوەبو، لەهەر جێگەیەک، کە دائەنیشت لە جیاتی ئەوەی وەکو سەرۆکی حیزب بەرگریی و پشتگیری لە حیزب بکات، هێرشی ئەکردە سەر حیزب.

ئەگەر کادرێکی حیزبی خراپەیەک یان لادانێکی بکردایە، لە هەمو مەجلیسێکدا بە ئاشکرا باسی ئەکرد کە فلان کادێر وایکرد، فلان کادێر وایگوت. بەراستی مەجلیسی مەلا مستەفا بوبو بەشوێنی جنێودان، سوککردنی پارتی و کادرێرەکانی و باسکردنی ئەوەی، کە حیزب مانای تەفرەقەیە.

زۆر دژی ئەوە بو، باسی ناکۆکی نێوان دەرەبەگ و جوتیار، کرێکاران و سەرمایەدار بە خراپی بکرایە، ئیسلاحی زەراعی زۆر پێ خراپ بو، باوەڕی بەوەبو کە پێویستە عەشایەر ببوژێتەوە، لەهەر جێیەک بۆی بکرایە ژیانی عەشایەری ئەژیاندەوە.

دو سێ نمونەت ئەدەمێ: مەلا مستەفا لە ١٩٦٢ دا هاتە ناوچەی باڵەکایەتی، لێپرسراوی ئەو ناوچەیە کابرایەکی حیزبی بو، پاڵپشتێکی زۆری هەبو، ناوی مەلا تەها بو، مەلا مستەفا، مەلا تەهای لابرد و ئاغایەکی هێنا لەجێی ئەو داینا و

کردی بە لێپرسراوی ناوچەی بێتواتە و دۆڵی باڵەییان.

هەروەها کاک عومەر دەبابە کە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی بو، لایبرد، ئەنوەر بەگی بێتواتەی جاشی مەشهوری هێناو لە شوێنی ئەو داینا.

لە سەفین حیزبیەکانی لابرد، مەحمود کاوانی هێنا، کردیە لێپرسراوی ئەو ناوچەیە، ئەچوە هەرجێیەک دەسەڵاتی لە حیزبیەکان ئەسەندەوە، ئاغا و عەشایەری دائەنا.

مەلا مستەفا، شکاندن و لابردنی ئەندامانی حیزبی کردبو بە ئەرکێکی گرنگ بۆخۆی، لەبەرئەوە رێکخستن و کاری حیزبایەتی زۆر ئاسان نەبو لە شۆڕشی ئەیلولدا، هەم لە دەستپێکردن و هەم لەکاتی هەڵگیرسانیدا، بەڵام لەگەڵ ئەو هەمو گیروگرفت و کۆسپانەشدا، لە لیوای کەرکوک و سلێمانی کە من لێپرسراوی بوم، لە لایەنی پێشمەرگایەتیەوە گەشەی کرد، تا رادەیەکیش لیوای هەولێریشی گرتەوە، تا ئەوکاتەی مەلا مستەفا نەهاتبو کە ئەوهات وەزعی ئەوێش تێکچو.

*** رادەی خوێندەواریی بارزانی چەند بو؟ ئایە ئەو نامە، بەیان و بڵاوکراوانەی، بەناوی ئەوەوە بڵاوکراونەتەوە، خۆی ئەینوسی؟ یان بۆیان ئەنوسی؟**

- بزانە، بارزانی پیاوێکی زیرەک بو، گرنگە ئەو راستیە بزانین کە مەلا مستەفا پیاوێک بو لە سیاسەتی دەولی و ئیقلیمی ئەگەیشت، بارزانی بەوشێوەیە نەبو کە چوار ئەفسەرەکە باسی ئەکەن، بەڵام بارزانی نوسەر نەبو کە شت بنوسێ و خۆی دایبرێژێت، پێموایە گەلێک لە سەرکردەکانی دنیاش، کاربەدەستیان هەیە نوسراویان بۆ ئەنوسن، بە یەکێک ئەڵێن بۆیان بنوسێت. من پێم وایە، وەکو گەلێک لە سەرکردەکانی دنیا، نوسینەکانی بەو کەسانە ئەنوسی کە باوەڕی پێ ئەکردن، سەردەمێک لە بەغدا من یەکێک بوم لە نزیکەکانی، هەندێ نوسینی بەمن ئەنوسی.

کە رۆژنامەنوس پرسیاریان لێدەکرد، ئەهات پێ ئەگوتم کە بەوجۆرە وەڵامیان بدەمەوە، منیش بەپێی ئامۆژگاری ئەو، وەڵامەکانم دادەڕشت.

سەردەمێک هەمزە عبدوڵڵا لێی نزیکبو، ئەو وەڵامی نوسراوەکانی ئەدایەوە، لەم دواییەی شۆڕشدا نازانم کێ وڵامی نامە و نوسینەکانی ئەدایەوە. واتا خۆی نوسەرنەبو، بتوانێت بە زمانی کوردی و عەرەبی، بە باشی بنوسێ، بەڵام خاڵە سەرەکیەکان خۆی دایدەنا و ئەبو جارێک بۆی بخوێنیتەوە کە بەدڵی نەبوایە ئەیگوت فلان رستە دانێ و ئەوەی تر رەش کەرەوە.

# گەشەکردنی هێزی پێشمەرگە و ئەنجومەنی گوندەکان

*** چۆن هێزی پێشمەرگە رێکخرا و گەشەی کرد؟**

- لە ماوەی کەمتر لە ساڵ و نیوێکدا، توانرا لە لیوای کەرکوک و سلێمانی رێکخستن گەشەی پێ بکرێت، هەزاران پێشمەرگە بەشێوە و جلوبەرگ و ناوی نوێوە رێکبخرێن، هەروەها توانرا لق، پەل و دەستەی بۆ دابنرێت، بۆ کاری پێشمەرگانە دەزگای بێتەلی نوێ، شێوەی پەیوەندی نوێ دابمەزرێت.

مەلا مستەفا، لە ساڵی یەکەم و دوهەمدا لێی قەدەغەکردین کە بێسیم وەک پێویست بەکاربهێنین، ئەیگوت بێ سیمتان بۆچیە؟ حکومەت گوێی لێ ئەگرێت، نەی ئەهێشت، هەواڵی لێوە بڵاو بکرێتەوە.

تا هاتنی مەلا مستەفا، کاروبار لە ناوچەکانی لیوای هەولێر باشتر بو، لە لیوای سلێمانی، لەبەر ئەوەی ئەندامێکی زۆری لێبو، هەروەها دەسەڵاتی پارتی لە روی عەسکەریەوە بەهێزبو. بەڵام کە مەلا مستەفا هات، بارودۆخەکە گۆڕا، بە تایبەتی مەلا ماتۆر کەوتە چەندین هەڵەوە، مەلا ماتۆر کابرایەکی سەرکەشی و جنێو فرۆشبو.

رەفتاری مەلا ماتۆر و ئیجرائاتی مەلا مستەفا زیانێکی گەورەی لێداین، ئەو کارانەی کە ئێمە توانیمان لە لیوای هەولێر و سلێمانی و کەرکوک بیکەین، هێنایانەوە سەر سفر، ناچاربوین جارێکی تر دەستمان پێکردەوە.

هێزێکی باشی پێشمەرگەمان دروستکردبو، چالاکی زۆر باشمان لە شاخ و لە شارەکان پەرەی سەندبو، رێکخستنی حیزبی لە دێهاتەکانیش گەشەی کردبو. ئەو کادێرانەی کە بیروباوەڕی پارتییان بڵاو ئەکردەوە و ژمارەیان زیادی ئەکرد، هەروەها کارێکی باشی تریش ئەوەبو کە سەر لەنوێ ئەنجومەنی لادێکان گەشانەوە، لە هەر گوندێک ئەنجومەنێک هەڵدەبژێرا بۆئەوەی کاروباری گوندەکان بەرێوەبەرێت، ئەمە دو سودی هەبو، یەکەمیان خەڵکی فێری دیموکراتی و حوکمکردنی خۆیی ئەکرد، دوەمیشیان نەیدەهێشت تیۆری دەرەبەگایەتی، ئاغایەتی و عەشیرەتی بژێتەوە.

هەروەها بە ڕێکخستنی تازە توانیمان خەباتی شار بە لادێوە ببەستین و گرێی دەینەوە.

دروستکردنی ئەم ئەنجومەنانە، پێشنیازی من بو لە کۆمیتەی ناوەندیدا، مامۆستا ئیبراهیم و نوری شاویس زۆر بەگەرمی پشتیوانیان لێکرد، لە ئەنجامدا بە زۆربەی دەنگ بڕیاردرا و دەستکرا بە جێبەجێکردنی.

لە ڕێگای ڕێکخستنی خۆمانەوە توانیمان ڕێکخستنی شارەکـــان گەشە پێ بدەین، بـــە تایبەتی لـــە هاندانی سەرباز و پـــۆلیس، بـــۆ وازهێنان و هـــاتنە ناو ریزی پێشمەرگەوە، پـــۆلیس دەورێکی زۆریان هەبو لە سەرەتای شۆرشدا، زۆریان ئەندامی پارتی بون، رۆڵی باشیان هەبو، لە هاوکاری و لە تەسلیمکردنی مەخفەرەکاندا، یارمەتیان ئەداین و چەندین مەخفەریان تەسلیم کردین.

# دو هێڵی سیاسی لەناو یەک حیزبدا

*** ئایا جەماوەر هەستی ئەکرد، جیاوازی هەیە لەناو سەرکردایەتی شۆرشدا، یاخود لە نێوان حیزب و بارزانیدا؟**

- بەڵێ، خەڵک بە ئاشکرا تەماشای ئەکرد، دو سیاسەت هەیە لە شۆڕشدا، سیاسەتێک کە مەلا مستەفا بەڕێوەی ئەبات، دژی گیانی حیزبایەتی و شۆڕشی نوێ و ڕێکخستنە بە شێوەی نوێ، لایەنگیریکردنە لە عەشایەر و جوڵاندنەوەی عەشایەری و دەسەڵاتی موتڵەق.

ئەوەی تریشیان، سیاسەتی پارتی بو، سیاسەتێکی حیزبی بو کە ئەیویست بە شێوەیەکی نوێ پێشمەرگە ڕێکبخات، کۆمەڵانی خەڵک ساز و هان بدات و ڕێبەرایەتیان بکات بۆ خەبات. بە داخەوە، ماوەیەکی ئەوتۆی بەسەرا نەچو کە مەلا مستەفا هاتە ناوچەی سۆرانەوە، بەڕاستی ئەگەر مەلا مستەفا نەهاتایە و لە بادینان و لەوێ بمایەوە، ئەوا لیوای هەولێریش وەکو لیوای سلێمانی لێدەکرا و بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و مۆدێرن شۆڕش و حیزب گەشەی ئەکرد، بەڵام کە ئەو هات، ئەنجامەکەی ئەوەبو کە بینیمان.

جۆرێک لە دوفاقی هەم لە سەرکردایەتی و هەم لە رێکخستن و هەم لە رەفتار لەگەڵ خەڵکدا هاتەکایەوە.

لە ماوەیەکی کورتدا، جیاوازی لەنێوان مەلا مستەفا و حیزب هەست پێ ئەکرا، بۆ نمونە، عەبدولکەریم قاسم جارێک لێبوردنی دەرکرد بۆ کورد، بەمەرجێ ناوی خۆیان بنوسن بۆ رزگارکردنی کوێت، ئەو وەختە، کوێت سەربەخۆیی خۆی راگەیاندبو، عەبدولکەریم قاسمیش سەربەخۆیی کوێتی رەتکردەوە و گوتی: کوێت بەشێکە لە عێراق و فەرمانێکی ئیداری دەرکرد و ئەمیری کوێتی کرد بە قائمقام.

پارتی بەیانێکی دژی ئەولێبوردنە دەرکرد، نوسی کە ئەوە هەڵخەڵەتاندنە، مەسەلەی کورد مەسەلەی لێبوردن نیە و مەسەلەی سەلماندنی مافی کورد و دیموکراتی و ئازادییە، بەڵام بە پێچەوانەوە، مەلا مستەفا لە بادینان عەفوەکەی قبوڵکرد، وەفدێکی نارد بە ئەندامێتی عەلی عەسکەری و دو کەسی تر بۆ لای قائمقامی شێخان، ئاگاداریان کردەوە کە ئێمە ئامادەین ناوی خۆمان بنوسین و بە خۆبەخشی بجەنگین بۆ رزگارکردنی کوێت. لە ئەنجامی ئەو هەڵویستەی مەلا مستەفادا، عەبدولکەریم قاسم هەڵسا حەسەن عەبودی نارد بۆلای مەلا مستەفا، ئەوە بو دوای ئەوەی کە حەسەن عەبود ناوچەکەی بەجێهێشت، قاسم ناوچەکەی بۆردومان کرد و بەوکارە نائومێدی و بێ باوەڕی خستە نێوان خۆیی و مەلا مستەفاوە.

## پەراوێزەکان:

١- بارزانی لە ١٩٦١/٩/١٢ بروسکەیەکی بۆ قاسم لێدا و تێدا، ئامادەیی خۆشی بو ناوبژی دەربڕیبو-

٢- (شێخ ئەحمەد بروسکەیەکی بۆ عەبدولکەریم قاسم نارد، دڵسۆزی خۆی و عەشیرەتی بارزانی، بۆئەو و حکومەتی عێراقی و نارەزایی توندی بەرامبەر بە مەلا مستەفا و دەسپێکردنی شۆرش دەربری. هەروەها بە دەنگی خۆی لە ئیستگەی رادیۆی بەغدادەوە داوای لە گەلی کورد کرد: "ئالۆز بالۆز" نەکەن. دوای مەلا مستەفا نەکەون و بگەرێنەوە ناو "عیل و عەیالی خو" یان. هەوڵیدا ئەهیلێنی زۆرایەتی بارزانییەکان لە جولانەوەکەدا بەشداربن، ناوچەی بارزانی لە روی چالاکی و هاتوچۆی پێشمەرگەدا داخست بۆئەوەی کاربەدەستانی عێراق رازی بکات). (پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن. نەوشیروان مستەفا.ل.٦٣).

٣- لەسەر زمانی د.مەحمود عوسمان، دەڵی، بارزانی وتی: (شێخ ئەحمەدی برام وتی: من ئامادەنیم، جارێکی تر ناوچەکەم کاول بێتەوە.. وازمان لێبێنە، بریارمدا بچم بۆ سوریا، لە رێگا، زۆربەی عەشائیرەکان و بەرواریەکان رێگایان لێگرتین، و ناچاربوین بکەوینە شەر لەگەڵیاندا، هەندێکیان هەڵهاتن بۆ تورکیا، هەندێکیان خۆیان تەسلیمی حکومەت کرد و بون بە جاش و هەندێکیشیان هاتنە لای ئێمە، منیش بیرمکردەوە و وتم شەرمە وڵات بەجێ بهێڵم و گۆرەپانی خەبات وازلێبێنم، بۆیە گەرامەوە ناوچە باڵەکایەتی) (التیارات السیاسیة کردستان العراق- صلاح خرسان.ل. ٩٦).

٤- حکومەتی عێراق لە ٢١ مارتی١٩٥٩ دا بریاریدا، کە یادی نەورۆز بکرێت بە یادێکی رەسمی بەناوی جەژنی درختەوە.

٥- (هەڵوێستی یەکێتی سۆڤێت دەربارەی سەرهەڵدانی شۆرشی کورد بەم شێوەیە بو: یەکێتی سۆڤێت پشتگیری هەڵگیرسانی شۆرشی ئەیلولی دژ بە عبدالکریم قاسم نەکرد، پێوابو کە ئەم شەرە لە کاتێکی نەگونجاوە رویداوە، ئەتوانرا و پێویست بو، چارەسەری کێشەکان لەگەڵ قاسم لە رێگای ئاشتی و سیاسی و گفتوگۆوە چارەسەر بکرایە، نەك رێگای سەربازی بگیرێتەبەر. سەرەرای ئەم هەڵوێستەش، یەکێتی سۆڤێت پشتی نەکردە بزوتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کورد، بەڵکو تا رادەیەکی زۆر هاوکاری کرد). (سیاسة الاتحاد السوفیتي.. میهڤان محمد محمد حسین.ل. ١٨٩).

# پەیوەندی بەعس بە پارتییەوە

*** ئایا پێش کودەتای بەعسییەکان لە ١٩٦٣دا، هیچ هەوڵێک لە ئارادا هەبو، بۆ بەستنی پەیوەندیی بەعس و پارتی؟**

- من لە بیرمە، لە هاوینی ١٩٦٢دا کۆمەڵێک ئەفسەری ئازادیخوازی عێراقی پەیوەندیان پێوە کردین کە زوربەیان ئەفسەری قەومی بون، زوربەیان بریتی بون لە ناسری و بەعسییەکان، کەسانی وەکو، تاهیر یەحیا، ئەمانە بەهۆی کەریم قەرەنیەوە پەیوەندیان بە مامۆستا ئیبراهیمەوە کرد، وایان نیشاندا، ئەوان وەک ئەفسەری ئازاد، خەریکن خۆیان سازئەدەن بۆ هەڵگەڕانەوە لە کەریم قاسم، داخوازیان ئەوەبو، پارتی و کورد هاوکاریان بکات، هەروەها ئەیانویست بزانن، مەرجی ئێمە چییە بۆ ئەو هاوکارییە.

بۆئەوەی وەڵامی ئەو گروپە بدەینەوە، مەکتەبی سیاسی وەفدێکی دروست کرد، بە سەرۆکایەتی مامۆستا ئیبراهیم و ئەندامێتی نوری شاوەیس، عومەر دەبابە و من، ئێمە سەردانی مەلا مستەفامان کرد کە هاتبۆوە بۆ ناوچەی هەولێر، کە چوین بۆلای عەلی عەسکەریشی لەگەڵدابو. مەبەستی ئەو وەفدە ئەوەبو، ئێمە بچین بۆلای مەلا مستەفا، قسەی لەگەڵدا بکەین و ئەو شتانەی پێ بڵێین کە چوین بۆئەوێ، راستەوخۆ، هێرشێکی زۆری کردە سەر حیزب و جنێوێدا بە کادێرەکان و بە رێکخستن.

ئینجا هاتینە سەر ئەو مەوزوعانەی کە دامانابو بۆ باسکردن، گوتمان کە چەند ئەفسەرێک داخوازیەکی وایان پێشکەش بە ئێمە کردوە، ئێمەش هەمو مەسەلەکانمان داناوە بۆ جەنابت و بزانین تۆ ئەڵێیت چی؟ ئەویش گوتی: "وەڵا پێیان بڵێن ئێمە هەژارین، موسوڵمانین، مەزڵومین و زوڵممان لەسەرە و پێویستە ئەو زوڵمە لابیرێت، وەکو تر ئێمە هیچی ترمان ناوێت".

ئێمە گوتمان، ئەمانەوێت داوای حوکمی زاتی و دیموکراتی بکەین، ئەویش گوتی کاکە ئەوە خەیاڵی بەنگ کێشانە، ئەو قسەقۆڕانە چیە؟ حوکمی زاتی چی؟ باهەر ئەو زوڵمەمان لەسەر لابەرن و بەس!.

# ناوی یەکەم وەزیرانی کورد

***دوای ئەو ڕوداوانە، پێشنیازی پارتی بۆ حکومەتی بەعسییەکان چی بو؟**

– مەلا مستەفا، بە قسەکانی ئێمە قانیع نەبو، ناچاربوین کە دەسەڵات بدەین بەو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. ئەو ئەفسەرانە داوایان کردبو، ناوی چوار کەسیان بدەینێ، ئێمەش چوار ناومان دەستنیشانکرد، بۆ ئەو وەزارەتانەی کە ئێمە بەشداری تێدادەکەین، دیارە ئێمە تکامان لێکرد کە خەڵکی حیزبی تێ نەخات، گوتمان ئەو کەسانەی کە حیزبین خۆت داینێ ئەویش هەستا ناوەکانی بەو جۆرە نوسی (بابە عەلی، فواد عارف، بەکر عەبدولکەریم، جەلال تاڵەبانی و عەلی عەسکەری) و گوتی: با حکومەت لەو ٥ ناوە چوار کەس هەڵبژێرێت. ئێمە زۆرمان تکا لێکرد کە ناوی من و عەلی عەسکەری لێدەربهێنێت، گوتی: نەخێر ئیللا ئەبێت ئێوەشی تێدابن.

ناوەکانمان نارد بۆ حکومەت، بەڵام وەک ئەوەی خۆمان ئەمانویست.

*** وەڵامی ئێوە بۆ بەعسیەکان چیبو؟**

– لە کۆتایی تشرینی دوهەمیی١٩٦٢ بو کە لای ئەو هاتینەوە گوێمان نەدایە، بۆخۆمان مەکتەبی سیاسی کۆبوینەوە بڕیارماندا، مەرجەکانمان بە جۆرێکی تر بنێرین بۆ تاهیر یەحیا، بریتی بو:

یەکەم: ئەگەر ئێوە سەرکەوتن، پێویستە مەلا مستەفا بکەن بە لێپرسراوی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، ئەویش کە ئەو لێپرسراویەتیەی وەرگرت، ئەحکامی عورفی لابەرێت.

دوهەم: ئۆتۆنۆمی بسەلمێنن.

سێهەم: دیموکراتی، ئازادی بدەن بە خەڵکی کوردستان و بە هێزەکانی تر، حەلکردنی جاشیشمان تێدا باسکردبو.

تاهیر یەحیا، وەڵامی دایەوە کە ئەوان، داخوازیەکانی ئێمەیان قبوڵە.

# سەرەتای ناکۆکی نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانی

*** کەواتە ناکۆکی نێوان بارزانی و ئێوە دەستی پێکرد؟**

– لەم مەسەلەیەدا، ناکۆکی نێوان حیزب و مەلا مستەفا زیاتر ئاشکرابو، لە هەمو کۆبونەوەیەکدا خەڵک باسی ئەکرد، ناکۆکیەکە بە نهێنی نەمایەوە. ئەو ساڵە، واتا ١٩٦٢ رۆژنامەنوسێکی ئەمریکی هات و یەکێک لە هۆ گرنگەکانی هاتنی، ویستی بزانێت کە هۆی ناکۆکی نێوان ئێمە و بارزانی چیە[1].

بەراستی ئێمە لە پەیوەندی دەرەوەدا، پێمان خۆش نەبو، پەیوەندی بە ئەمەریکاوە بکرێت، مەلا مستەفا بەهەمو دڵێکەوە هەوڵی ئەدا، لەگەڵ ئەمەریکا پەیوەندی پەیدابکات، ئێمە پێمانوابو کە ئەبێت لەگەڵ سۆڤیەت پەیوەندی بکرێت و بەبێ پرسی سۆڤیەت هیچ پەیوەندیەک نەکەین.

*** دێمەوە سەر باسێکی تر، ئەویش مەسەلەی جاش و مێژوی دروستبونی جاشە؟**

– جاش پێش هەڵگیرسانی شۆڕشیش هەبوە، حکومەتی عێراقی کۆمەڵێک دوژمنی بارزانی چەکدار کردبو، وەکو زێباری، هەرکی، سورچی. حکومەت بڵاوی کردەوە کە مەلا مستەفا یاخییە و دژی جمهوریەتە، هەمو ئەو عەشایەرانەی، دوژمنایەتی کۆنیان لەگەڵ مەلا مستەفا هەبو، چون و داوای چەکی جاشێتیانکرد.

کەریم قاسم، جاشێتی سەرلەنوێ داهێنایەوە، ئەو خۆی تەجروبەی هەبو لەو بوارەدا، کەریم قاسم لە سەرەتادا بەوە دەستی پێ کرد، هەمو ئەو عەشایەرانەی کە کۆن دوژمنی بارزانی بون، وەکو نێروەیی، سورچی، زێباری، هەرکی، برادۆستی. لە هەندێ شوێنی تر وەک لە ناوچەی سۆرانیش جاشی کۆکردەوە، بۆ نمونە لە ناوچەی سلێمانی محمودی فەقێ محەمەدی هەمەوەندی یەکەم کەس بو، جاشی قەیدکرد.

جاش بە هەندێ شێوەی تریش دروست بو، بۆ نمونە کۆمەڵەی جوتیارانی سەر بە حیزبی شیوعی چەکیان وەرگرت و بەناوی بەرگری لە جمهوریەت، شەڕی شۆڕشیان ئەکرد.

بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی جاش لە سلێمانی، ئێمە خێرا نەخشەیەکمان دانا، ئەویش حوکمی گەلمان بەسەر مەحمودی فەقێ محەمەدی هەمەوەنددا جێبەجێکرد، ئەوەبو پێشمەرگەیەکی قارەمان بەناوی سەلامی مەلا سابیر چو لەناو شاری سلێمانی کوشتی، بە کوشتنی ئەو، شوێنەواری جاشایەتی کەمێ کزبو، بەڵام لە ناوچەکانی تر، جاشایەتی هەڵیدایەوە و زۆر پەرەی سەند و زۆر خەڵکی لێ کۆبوەوە. هەزاران کەس بون بە جاش، بە تایبەتی عەشایەرەکانی دوژمن بە مەلا مستەفا، بەڵام لە شوێنەکانی تری وەکو سلێمانی و کەرکوک، جاش زۆر کەم بون، دیاردەی جاش دوای هاتنی بەعسیەکان پەرەی سەند و ناویان لێنا (فرسان صلاح الدين).

بەعسییەکان، زۆر عەشایەری عەرەبیان لە کوردستان و ناوچەکانی تر نیشتەجێ کرد، هەروەها هەرچی عەشایەری کوردی دژی بارزانی هەبو تەجنیدیان کردن، خەڵکیان بەزۆرهێنا، چەکداریانکردن و سەربەست بون لەوەی، هەرچیان دەست ئەکەوێت تاڵانی بکەن و بۆ خۆیانی ببەن.

زۆر کەس بەتایبەتی عەشایەری عەرەبی بۆ تاڵان و ڕاوڕوت هاتن بۆ کوردستان، ڕاوی کوردیان حەڵاڵکرد، هەموشی بەناوی جاشایەتییەوە، ناویان نرابو (فرسان الوليد).

دیارە هۆیەکی گەورەی سەرهەڵدانی جاش، ناکۆکی نێوان بارزان و ئەو عەشیرەتانەبو، چونکە لە ساڵی یەکەم و دوەم و سێیەمی شۆڕشدا، جاش بریتی بو لە دوژمنانی کۆنی بارزانی وەک سورچی، برادۆست، سۆفییەکانی شێخ ڕەشیدی لۆلان، هەرکی، زێباری، ڕێکانی.

هەندێک لەو کەسانەی، تەسلیمی حکومەت ئەبونەوە لە سەرۆک عەشیرەتەکانی کە کاتی خۆی مەلا مستەفا پشتی پێ بەستبون، حکومەت ئەیکردن بە جاش و پارەی ئەدانێ.

*** بابێینەوە بۆ سەرەتای ناکۆکی نێوان پارتی و بارزانی و ڕۆڵی جاشەکان لەو کێشەیەدا؟**

– پەیدابونی جاش لە کوردستان ئەگەڕێتەوە بۆ پایزی ١٩٦٢، کاتێ کە ناکۆکی نێوان پارتی و مەلا مستەفا گەیشتبوە ئاستێکی ترسناک، گەیشتبوە ئاستێک کە بەڕاستی مەترسی تەقینەوەی هەبو، مەترسی ئەوەی هەبو، مەلا مستەفا لە هەر جێیەک ئەهات ڕێکخستنی پارتی لائەبرد و کادێرەکانی ئەگرت،

یان راویدەنان، هێزی پێشمەرگەی پارتی هەڵئەوەشاندەوە، ئەیخستە بندەستی عەشایەر و ئاغایەتی ئەژیاندەوە.

لەبەرئەوە کار گەیشتە ئەوەی، پێویست بو هەڵوێستێک وەربگیرێت، بۆیە کۆمیتەی ناوەندی پارتی لە ئەشکەوتی مالومە کۆبوەوە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان.

# بارزانی و نازناوی (مامۆستا)

*** با هەندێ پرسیاری تر بکەم: ئایا راستە، مەلا مستەفا پێی ناخۆشبوە، پێی بوترێت (مامۆستا)؟**

- بەڵێ وایە، چیرۆکەکەی بەم شێوەیەیە: کۆبونەوەی مالومە بریاریدا، وەفدێک دروست بکات بە ئەندامەتی عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، عەبدولحسێن فەیلی، هاشم عەقراوی و من کە بچین بۆ لای مەلا مستەفا و هەوڵدەین خاوی کەینەوە، عەبدولحسێن یەکێک بو لەوانەی زۆر ئیعجابی هەبو بە مەلا مستەفا، نەشی ئەزانی چۆن لەگەڵ مەلا مستەفا بجولێتەوە! لەبەرئەوە شتێکی سەیرت بۆ ئەگێرِمەوە، هەرچەندە رەنگە بەکەڵکی نوسین و بڵاوکردنەوە نەیەت:

مەلا مستەفا، لە دێیەک بو لە نزیک بێتواتە، لام وایە ناوی (وەرێ)بو، دێیەکی بچکۆلەبو، ئێمە ئێوارە گەیشتینە دێیەکە و چوین بۆلای مەلا مستەفا کە لە ماڵێک بو، مەلا مستەفا لەبەرمان هەڵسا، عەبدولحسێنی لە بەرامبەر خۆی دانا، ئەو ئەیزانی کە عەبدولحسێن لەوانەیە کە زۆر موعجیبە پێی، لەخوار عەبدولحسێنەوە من دانیشتبوم و ئیتر برادەرانی تریش بەو شێوەیە.

مەلا مستەفا ماندونەبونی لە عەبدولحسێن کرد، عەبدولحسێنیش نەی ئەزانی، مەلا مستەفا بە وشەی (مامۆستا) تورە ئەبێت. مەلا مستەفا گوتی: "عەبدولحسێن چۆنی"؟، ئەویش گوتی: "دەستت ماچ ئەکەم مامۆستا زۆر باشم"!! هەر کە گوتی "مامۆستا"، مەلا مستەفا پێی گوت: "جا تۆ خۆت (سەگبابی)"عەبدولحسێنیش ترسی لێنیشت، لەو کاتەدا کە لەسەر چۆک دانیشتبو، لنگە و قوچ کەوت و گوتی:

"جا مامۆستا خۆ من هیچ بێئەدەبییەکم نەکردوە لە ڕوی جەنابتا"، مەلا مستەفا گوتی: "نەخێر بۆ خۆت سەگبابی".

من ئەمویست تەداخول بکەم و بەو بڵێم پێی مەڵێ مامۆستا، عەلی عەسکەری ئیشارەتێکی بۆکردم کە لێیگەڕێ، با تۆزێ جنێو بخوات! نەختێکی تری پێچو خۆی کۆکردەوە و ڕەنگی زەردبو گوتی: "باشە مامۆستا من چیم گوت، جەنابت وا لێم تورە بویت"؟ گوتی: "بۆ خۆت سەگبابی، حەز دەکەی، تا ئێوارە ئەتۆ بەمن بڵێ سەگباب، ئەمنیش بە تۆ ئەڵێمەوە بۆ خۆت سەگبابی"، عەبدولحسێن گوتی: "ئاخر من کەی وامگوتوە"؟. گوتی: "ئەوەی بەمن بڵێ مامۆستا، وەک ئەوە وایە بەمن بڵێ سەگباب ئەمن مامۆستا نیم. مامۆستا وایە وایە"![2].

هەباس ئاغا ئەیگوت، بۆیە پێی ناخۆشە پێی بڵێن مامۆستا، چونکە مامۆستا زۆربوە ئەو شتێکی ئەوێ، کە زۆر کەم بێت و هەر بەخۆی بگوترێت.

لەو کاتەدا نان هات، عادەتەن لە پێش نانخواردندا مەسینە ئەهێنن بۆ دەست شتن، مەلا مستەفا نەختێک ساردبۆوە، مەسینەکە لای دەستی من داندرابو دەستی دەشت و ڕوی لەمن کرد و گوتی: " (جەلالە شێت) توخوا حەقم نیە! ئەوەندە بە خەڵک ئەڵێم، کە مەڵێن مامۆستا، بەڵام هەر پێم ئەڵێن، منیش وایان پێ ئەڵێم"، منیش گوتم "بەرێ وەڵڵا ئەزبەنی حەقتە: لای ئێمەش لە مالومە دەروێش قادرێک هەیە هەرچی پێی بڵێ دێگەڵ ئەڵێ لە... دایکت بەم"، ئیتر ڕەحمەتی بارزانی دایە قاقای پێکەنین، بارزانی نوکتەی پێ خۆشبو.

*** لەوە دەچێت ئەوکاتە پەیوەندی شەخسیت لەگەڵ بارزانی خراپ نەبوبێت؟**

- ئەو وەختە، من پەیوەندیم زۆر باشبو، شتی لە من بە باش تەفسیر ئەکرد، تەنانەت لەو مەسەلەیەی عەبدولحسێن، کە گێرامەوە، ئەوەی کە باسی دەروێش قادری مالومەمکرد و گوتی: "یەعنی من دەروێش قادرم"، گوتم: "نەخێر جەنابت دەروێش قادر نیت، بەڵام ئینسان رادێت، هەندێ جار بەیەک وشە ئیستفزاز ئەبێت"، ئینجا نمونەی سەید بیسمیلاکەی سلێمانیم بۆ هێنایەوە کە بابی عومەری سید عەلی خۆمان بو، بە پێکەنین جەوەکە گۆڕا و خۆشبو.

*** ڕاستە بارزانی تۆی وەکو سکرتێری پارتی پێشنیازکرد، بەڵام دوایی پەشیمان بویتەوە؟**

- سەڵاحەدین، مەسەلەکە بەم شێوەیەبو: بارزانی لەلایەن خۆیەوە گۆڕانکاری لەناو

هێزی پێشمەرگە کرد، بڕیاریدا من ببمە جێگری فەرماندەی گشتی، واتا جێگری خۆی، من ئەو ئیشەم نەکرد، دوەمینیان کە پێشنیازیکرد کە من ببم بە سکرتێری گشتی لە جێگای مامۆستا ئیبراهیم، من بە باشمنەزانی و قبوڵم نەکرد.

* **ئایا سەردانەکەتان بۆ لای بارزانی ئەنجامی هەبو؟**

– لە ئەنجامی ئەو قسانەی کە کردمان، چارەسەرێکمان دانا، کەوا داوا بکرێ جیاوازی لەنێوان پێشمەرگە و غەیری پێشمەرگە نەمێنێت، گوتمان بابە بە عەشیرەتێکمان حسابکە، لەگەڵ خۆتین.

ئەو کاتە من لەلای مەلا مستەفا مامەوە بۆ هەندێ ئیش و کاری تر، لەو کاتانەدابو، جارێکی تر هەواڵێک هات کە ئینقیلاب ئەکرێت، من لە یادمە، رۆژی چواردەی رەمەزان بو، ئێمە لە ناوچەی هەباس ئاغا لەسەرکەپکانەوە لەگەڵ مەلا مستەفا بەیانی زو بەرێ کەوتین بەرەو پشدەر، ئەو ناوچەیە پێی ئەڵێن (دوگۆمان)، ناوچەیەکی بەردەڵانە، مەلا مستەفا بارەگای خۆی هەڵدابو، من لە دواوە بوم، مەلا مستەفا زوتر رۆیشتبو دانیشتبو، لە دورەوە جامانە سورەکانی عومەرئاغا و ئەوانم بینی، مەلا حەسەن کە کاتی خۆی لە موسڵ لەگەڵ نەبی سەر ئاسن و عیسا سوار، ئەحمەد ئاغای زێبارییان کوشت، راوەستابو منیش رادیۆیەکم بەدەستەوە بو گوێم لە هەواڵی سەعات نۆ ئەگرت.

مەلا مستەفا گاڵتە و گەپی پێ خۆش بو، وەختی خۆی ئێمە مەلا مستەفامان لەناو خۆماندا ناو نابو (حەمەدۆک)، دۆک لە کۆیە بە پیاوێکی قسە خۆشی باش ئەوترێت، پیاوێکی باشبو، سەرۆکی عەشیرەت بو، لەناو خۆماندا پێمان ئەگوت حەمەدۆک، خۆشی ئەیزانی، ئێمە پێی ئەڵێین حەمەدۆک.

کە نزیک بومەوە لێیان، بانگی مەلا حەسەنم کرد و گوتم: "ئەری حەمەدۆگ نوستوە یا هەڵساوە"؟، ئەویش جوابی داوە و گوتی وەرە شێتە، ئەوە هەڵستاوە و دانیشتوە، گوتم: "ئاخر ئەوە دێم، مژدەم بەرێ و مزگێنیم پێیە، خەبەرێکی خۆشم پێیە"، گوتی چییە؟ گوتم وەڵڵا ئەوە ئینقیلابە! گوتی دە وەرە راکە، ئیتر رادیۆیان کردەوە، ئەوەبو فیعلەن ئینقیلابی شوبات بو، کە کەریم قاسمیان لابرد.

# کودەتای شوباتی ١٩٦٣

*** ئایا پێشتر پارتی ئاگای لە کودەتای شوبات هەبو؟**

- بەڵێ ئاگای لێ هەبو، دوایی بۆت باس ئەکەم، بەڵام حەز ئەکەیت باسێکی تایبەتی ئینقیلابی شوبات و هەڵوێست لە ئینقیلابەکەت بۆ دەکەم.

*** کەواتە پێم باشە وا دەست پێ بکەین، ئایا پارتی چەند ئاگاداری ئینقیلابی شوبات بو؟ پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئینقیلابچیەکان چۆن بو؟**

- پارتی دو جۆر پەیوندی هەبو لەگەڵ ئەو کەسانەی کە ئینقیلابی شوباتیان ئەنجامدا، یەکێک لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەی کە بەخۆیان ئەگوت (ئەفسەرە ئازادەکان) لە رێگای کەریم قەرەنیەوە پەیوەندیان کردبو بە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدەوە، کەریم قەرەنی ئەفسەرێکی کوردی خەڵکی سلێمانی بو، لە کۆنەوە دۆستی تاهیر یەحیا بو، لام وایە لە پرسیارێکی تردا وەڵامم داویتەوە.

مامۆستا ئیبراهیم پەیوەندی بە تاهیر یەحیاوە کردبو، ئەویش رەزامەندی دەربڕیبو لەسەرئەوەی، حوکمی زاتی بدەن بە کورد.

لەوەو پێشیش پەیوەندییەک لە نێوان حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتیراکی و پارتیدا دروستبوبو، بە تەحدید لە نێوان ساڵح یوسفی و عەلی ساڵح ئەلسەعدی هەبو، ئەم دوانە یەکتریان ئەدی، وابزانم بەهۆی فوئاد عارفەوە یەکەم پەیوەندی دروست بوبو. ساڵح یوسفی، هەمان مەرجی ئێمەی پێ گوتبونەوە کە بریتی بو، لە ئۆتۆنۆمی و سەلماندنی مافی دیموکراتی، هەروەها کاروباری کوردستان بدرێتە دەست پارتی و مەلا مستەفاش بکرێت بە حاکمی گشتیی کوردستان.

هەردولا مەسەلەی ئۆتۆنۆمیان وەکو (مبدء) قبوڵکردبو، گوتبویان بەڵێ باشە، ئێمە ئامادەین، ئۆتۆنۆمی بدەین و ئیجازەش بدەین بە پارتی.

ئەوان گوتبویان: "لە کوردستاندا دەوری ئێمە چی دەبێت، لە عەرەبستان، هی ئێوەش بەهەمان شێوە ئەبێت"، بۆ تەئیدی ئەو بەڵێنانەیان کە دابویان، شاهیدێک

دێنمەوە ئەویش دکتۆر جەمال ئەتاسییە، لە پێشەکی کتێبەکەی "عەرەب و کورد، تێروانێکی عەرەبی دەربارەی مەسەلەی کورد" دا ئەڵێ: "شۆڕشی شوبات رویدا (ئەو پێی ئەڵێت شۆڕش)، ئێمە وەفدێک بوین لە شامەوە چوینە بەغدا، عەلی ساڵح سەعدیمان بینی، من لێم پرسی: ئایا هیچ دەربارەی مەسەلەی کورد هەیە؟ ئەویش گوتی: ئێمە بەڵێنمان داونەتێ، کە ئۆتۆنۆمیان بدەینێ، بەڵام ئێستا نایان دەینێ، شتی کەیان ئەدەینێ، ئەگەر رازی بون باشە، ئەگەر رازی نەبون، ئەوا لەماوەی دو هەفتە، یان چوار هەفتە لەناویان ئەبەین، پێم گوتن، کورد بەو شێوەیە لەناو ناچێ، ئەوە رێگایەکی هەڵەیە".

ئەوە بەڵگەیەکە، شایەتەکە کابرایەکی بەعسی ناودار و بەرێزە کە راستی هەڵوێستی ئەو کاتەی بەعسیەکان رون ئەکاتەوە، چونکە ئێمە بەڵگەی نوسراومان نیە ئەوان تەنها لە رێگای کەریم قەرەنیەوە پەیوەندیان کردبو، شاهیدی تریش هەیە کە لە حزوری عەبدوناسردا باسیکردوە.

کە ئینقیلابی شوبات رویدا، ساڵح یوسفی و فوئاد عارفیش بروسکەی پیرۆزبایان لێدا، ساڵح یوسفی پەلەی کرد لە لێدانی بروسکەکە، ئەوە دو خاڵی سلبی تێدابو، یەکەمیان بروسکەکە نەدەگونجا لەگەڵ سیاسەتی مەکتەبی سیاسی ئەو سەردەمە، دوهەمیان، ئەو بروسکەیە بوە هۆی ئەوەی، ئەفسەرە کوردەکان لە هەرکوێیەک هەن، پشتیوانی لەو ئینقیلابە بکەن.

بۆنمونە بۆت بێنمەوە، شاری بەسرە لە دەست مرحوم عەقید عەبدولقادر فایق بو، عەقید عەبدولقادر روناکبیرێکی دیاربو، دوای بروسکەکە، ناچاربو ئەویش بروسکەی پیرۆزبایی لێبدات، چونکە بروسکەکە وای ئەگەیاند کە هەردو شۆڕشەکەمان پێکەوە لەحیمکرا، ئەمە جگە لەوەی، لای زوربەی خەڵکی عێراق بروسکەکەمان قبوڵ نەبو.

هەروەها کاریگەریی خراپی ئەو بروسکەیە ئەوەبو، ئەو ئەفسەرە عەرەبانەی لە کوردستان بون و دۆستی عەبدولکەریم قاسم بون، بۆچونێکی پێشکەوتنخوازانەی دژی بەعسیان هەبو و ئەیانویست بەرگری بکەن، بەهۆی ئەو بروسکەیەوە، بێ هیوا و خاو بونەوە. من خۆم لە عەقید نەبەویم بیست، ئەوکاتە لە ناوچەی مێرگەسور ئامر لیوابو، بەتەمابو خۆی و لیواکەی هەڵگەڕێتەوە، بەڵام کە بروسکەکە لێدرا، ئیتر وازی لە هەڵگەڕانەوە هێنا، خۆی و چەند نەفەرێک فیراریانکرد، گوتی: "ئەگەر ئەو بروسکەیە نەبوایە و بمزانیایە کە پارتی دژی ئەو ئینقیلابەیە کە لەلایەن بەعسییەکانەوە پێی ئەگوترا سەورە، ئەوا هاوکاریمان ئەکرد و هەڵدەگەڕاینەوە".

من بەش بە حاڵی خۆم پێموایە:

یەکەم: ساڵح یوسفی ئەو بروسکەیەی لە ژێر، کاریگەری جۆش و خرۆشی ئەو رێککەوتنەدا لێدابو کە پێشتر لەگەڵ بەعسییەکاندا کرابو، هەمان جەماعەت بون و پێیان وابو، ئەوانە وەعدەکانیان ئەهێننەدی و قسەی زۆر خۆشیان بۆ کردبو، وەعدی زۆر باشیان پێ دابو، بە فرسەتیان زانیبو، وایان لێکردبو، هەتا زوە با دەورمان هەبێ لە بەشداریکردن، بۆئەوەی دوایی بتوانین نازبکەین بەسەریاندا و دەسکەوتێک بە دەست بهێنین. ئێمە هیچ کاریگەریەکمان لەسەر ئەو راپەڕینەی بەعسییەکان و ناسرییەکان نەبو.

دوەم: من پێموایە ئەگەر ئەوکاتە، لە نێوان پارتی و حیزبی شیوعیدا هاوکاری تەواو هەبوایە و پێکەوە نەخشەیەکمان بکێشایە بۆئەوەی ئەگەر لە بەغدا، ئینقیلابی عەسکەری رویدات، چۆن بەیەکەوە لە کوردستاندا کاربکەین، ئەوکاتە ئەتوانرا دەست بەسەر زۆربەی زۆری کوردستاندا بگیرێت.

کاتێ ئینقیلابەکە رویدا، بەراستی دیسان دو بۆچونی جیاواز لەناو پارتیدا هەبون، وەکو هەمو جارێک، یەکێکیان رەئی مەکتەبی سیاسی بو کە مامۆستا ئیبراهیم لە بروسکەیەکدا، بۆ مەلا مستەفای نارد، نوسیبوی: "ئەگەر ئەو شەڕە دەوام بکات لەنێوان عەبدولکەریم قاسم و بەعسییەکاندا، واباشە ئێمە بچینە ناو شارەکانی کودستانەوە، داگیریان بکەین و زۆربەی ناوچەکان بخەینە ژێر دەسەڵاتی خۆمان و خەڵک چەکداربکەین".

ئەگەر حکومەتی بەعسی مەرجەکانی ئێمەی جێبەجێکرد، خۆ هەر باشە، ئەگەر جێبەجێی نەکرد، ئەوا چەک و پارە و شتی زۆرمان دەستکەوتوە، هەمو ئەو ئەفسەرانەی کە دژی ئەو حکومەتەن لە دەورمان کۆدەبنەوە.

سێیەم: مەلا مستەفا رەئی وابو، "کاری وا نەکەین، هەلێک بدەین بەو حکومەتەی کە تازە هاتۆتە سەرکار"، من ئەو کاتە لەگەڵ مەلا مستەفا بوم و هەمان بۆچونم هەبو.

منیش پێموابو، ئەو بۆچونەی مەکتەبی سیاسی عەمەلی نییە، قابیلی جێبەجێکردن نییە، بەڵام بەراستی دوایی روداوەکان دەریان خست، رەئی مەکتەبی سیاسی زۆر دوربینانە و شۆڕشگێڕانەبو.

ئەگەر ئەو رۆژە پارتی بە بانگەوازێکەوە چوبایە ناو خەڵک و ناوشارەکانەوە، ئەوا لەو دو، سێ رۆژەی کە لە بەغدا لە نێوان کەریم قاسم و بەعسییەکاندا شەڕبو، رەنگبو گەلێ کەس پەیوەندی بە پارتییەوە بکردایە و گەلێک کەسیش

یارمەتی بداینایە، رەنگە بمانتوانیایە هەندێ شاریش بگرین، بەتایبەتی ئەگەر ساڵح یوسفی ئەو بروسکەیەی لێنەدایە.

ئەو کاتە، ئێمە لەگەڵ مەلا مستەفا لە ناوچەی پشدەر بوین، دوای ئەوەی کە سێ رۆژی پێچو و عەبدولکەریم قاسم کوژرا، دەستیان بەسەر بەغدادا گرت، ئەوەندەمان زانی ساڵح یوسفی هاتوە و لوقمانی مەلا مستەفای لەگەڵ خۆی هێنابو کە لە بەندیخانە رای کردبو، هەروەها کەریم قەرەنیش هات و گەیشتنە ئەو ناوچەیەی کە مەلا مستەفای لێبو. ئەو کاتە مەلا مستەفا لە ناوچەی مەنگوڕەکان بو، من باشم لە بیرە ئێوارەبو، مەلا مستەفا میوان بو لە ماڵی عەلی حەسەن ئاغا لە دێی (شەروێت)، ئاگاداریان کردەوە، میوانی هاتوە و داوایان ئەوەیە کە پارتی وەفدێک بنێریت بۆ بەغدا بۆ ئەوەی بچێ لەگەڵ کاربەدەستاندا گفتوگۆ بکات، چیتان هەیە و چیتان ئەوێ لەگەڵیانا باسی بکەن.

# گفتوگۆ لەگەڵ بەعس

*** واتا بەعسیەکان نیازی گفتوگۆیان هەبو لە گەڵ کورد؟**

– بەڵێ، بە کەریم قەرەنیمان گوت: کە وەک نوێنەری حکومەتی تازە هاتبو، "ئایا حکومەت چی ئەدات بە کورد"؟ کەریم قەرەنی گوتی: "من پێش ئەوەی بێم بۆ ئێرە، تاهیر یەحیام بینیوە"، تاهیر یەحیا سەرۆک ئەرکانی جەیش بو، یەکێک بو لە ئەندامانی مەجلیسی قیادەی سەورە، گوتی: گوتویێتی "ئێمە لەسەر پەیمانەکانی خۆمان سورین و جێبەجێی ئەکەین".

ساڵح یوسفیش هەر رەئی وابو، کە ئەوانە لەسەر وەعدەکانی خۆیان سورن و جێبەجێی ئەکەن.

پرسیارەکە ئەوە بو، کێ بچێ و کێ نەچی بۆ گفتوگۆ؟ مەلا مستەفا رەئی وابو کە وەفدێکی عەشایەری بچێ، شێخ حسێنی بۆسکێنی، عەباسی مامەند ئاغا و هەندێک لە پیاو ماقوڵانی ئـەو ناوچانەی ئیقتراح کرد و گوتی: با ئەوان بچن.

باش لە بیرمە، شێخ حوسێنی بۆسکێنی هەڵی دایە و گوتی: "وەڵا جەنابی

مەلا موستەفا ئێمە بۆهەر کوێیەک بڵێیت ئامادەین و ئەچین، بەڵام ئێمە ئاگاداری مەسەلەکان نین، سیاسەتیش نازانین، ئەوانە حیزبین کە هاتونەتە سەر حوکم، ئەوە وەفدێکی شارەزا و لێزانی حیزبی ئەوێت"، مەسەلەن گوتی: "پیاوێکی وەکو مام جەلال باشە بۆ ئەو ئیشە"، عەباسی مامەند ئاغاش، لەوێ بو، ئەویش تەئیدی کرد و عەشایەرەکانی تریش کە ئامادەبون تەئیدیان کرد، مەلا مستەفا گوتی: "کەواتە با جەلال بچێت".

بەو جۆرە من بە پێشنیازی عەشایەر، بومە نوێنەری پارتی و بارزانی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تازەی بەغدا، هەروەها من بروسکەم لێدا بۆ (م.س)، ئەوانیش رازی بون، بەو شێوەیە من رۆیشتم، هەم نوێنەری مەلا مستەفا و هەم نوێنەری مەکتەبی سیاسیش بوم.

لە بیرمە، چوین بۆ قەڵادزێ لەوێ ئەفسەرێکی کوردی خەڵکی کۆیەی لێبو، ناوی حەمیدی حاجی تایەر چەلەبی بو، ئامر حامیەی ئەوێبو، چوینە لای ئەو، ئەویش لەوێوە ئوتومبیلی بۆ گرتین بۆ سلێمانی. شەو لە سلێمانی ماینەوە، بۆ بەیانی چوین بۆ بازاڕ بۆ جلوبەرگ کڕین، من هەر بە جل و پێڵاوی کوردییەوە هاتبوم، پێڵاوی لاستیکم لە پێدابو.

خەڵکێکی زۆرمان لێ کۆبوەوە، هوتافات دەستی پێکرد، بژی و بڕوخێ.

*** ئایا ئەوە یەکەم وەفدی فەرمی پارتی بو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سەرانی کودەتاکە؟ یان پێشتر وەفدی کوردی بە نهێنی و ئاشکرا گفتوگۆیان لەگەڵ کردبون؟**

- بەڵێ، هەردوای ئەوەی کە جلوبەگمان کڕی، چوینە حامیە، ئەوکاتە زەعیم سدیقە مەشهورەکە ئامیری حامیە بو، لەوێ بە هەلیکۆپتەر رەوانەیان کردین بۆ کەرکوک، لەویشەوە بە ئۆتۆمبێل بۆ بەغدا کە چوینە بەغدا، من و ساڵح یوسفی و کەریم قەرەنی پێکەوە بوین، بەڵام وەفدەکە لە راستیدا تەنها دو کەس بوین، واتا من و سەیدا ساڵح کە بۆ شارەزایی لەگەڵمدا هاتبو، بەڵام وەفدەکە بەناوی منەوەبو، ئێوارە ئێمەیان بردە ئوتێل بەغدا، ئەوکاتە چاکترین ئوتێلی بەغدابو[٣].

هەرهەمان ئێوارە، فوئاد عارف و تاهیر یەحیا هاتن بۆ سەردان و بەخێرهاتنمان، تاهیر یەحیا، گوتی "دیارە بۆ جێبەجێکردنی وەعدەکان هاتون" گوتم بەڵێ، گوتی "هەرئەوەیە کە ئێمە لەسەری رێکەوتوین، ئەویش حوکمی زاتییە، شتی تازەنییە"، گوتم: "نەخێر هەر حوکمی زاتیە و جێبەجێکردنێتی"، گوتی: "ئەوانە کاری ئاسانن، زۆر بەخێر بێیت" و زۆر گەرم گوڕیی نیشاندا. منیش گلەییم کرد و گوتم:

"مەجلیسی قیادەی سەورە کەسی کوردی تێدا نییە"؟ گوتی شتی وانییە "شلون ما بیها آکراد، لعد شنو انا، آنا کرد": ئینجا دواتر دەرکەوت کە تاهیر یەحیا بە رەگەز کورد بو.

بەیانی زو هێشتا هەر بە جلی کوردییەوە منیان بردە لای سەرۆکی کۆمار، عەبدولسەلام عارف، ئەوە یەکەمجار بو کە من عەبدولسەلام عارف ببینم، پێشتر ئەم بینیبو، هەر دوربەدور نەبێت. بەخێر هاتنی کردین، بۆ یەکەمجار گوێم لێبو باسی کوردستان ئەکات و ئەیگوت: "شعبنا في كردستان" و "آخوان شلونهم" و ئەو جۆرە قسانە.

لام سەیر بو، عەبدولسەلام قسەی وا بکات، چونکە ئەو مەشهور بو بە قەومی، قەومییەکی ناسیۆنالیست و بیرتەسک و شۆڤێنی. بەڵام کە ئەو قسانەی بەسەر زاردا هات و گوتی "ئێمە ئەو رێککەوتننامانەی کە کاتی خۆی کردومانە، مولتەزمین پێوەی، لەگەڵ ئێوە دادەنیشین جێبەجێی ئەکەین".

دوابەدوای ئەوە، چومە لای ئەحمەد حەسەن بەکر و ساڵح مەهدی عەماش کە وەزیری دیفاع بو، ئەوان پێکەوە دانیشتبون، زۆر بەگەرمییەوە پێشەوازیان لێکردم و گوتیان "ئێمە لەسەر بەڵێنەکانی خۆمانین، پێکەوە دادەنیشین ئینشەڵا کارەکان ئەنجام ئەدەین".

کاتێ موجامەلات تەواوبو، گوتیان با ئێمەش دانیشین و گفتوگۆ بکەین، ئێمەش گوتمان زۆر باشە. من بەباشم نەزانی خۆم بە تەنیا بەشداربم لە گفتوگۆکردندا، بۆیە جگە لە ساڵح یوسفی داوام لە بابا عەلی و فوئاد عارفیش کرد کە (هەردوکیان کرابون بە وەزیر لە وەزارەتە نوێکەی بەعسیەکاندا) ئەوانیش بەشدار بن[٤].

*** ئەوان بێ ئاگاداری پارتی کرابون بە وەزیر، یاخود کاندیدی پارتی بون، بۆ وەزیر لە حکومەتی بەعسیەکان؟**

– کاتی خۆی، مەلا مستەفا ناوی چوار کەسی بۆ ناردبون، ئەوان دوانیان لە چوارەکە هەڵبژارد، باباعەلی و فوئاد عارف بون، ئەوانی تریان وەرنەگرتبو، شوکور ئێمەمانانی تێدا نەبوین، دەنا حەیامان ئەچو، چونکە ئەو حکومەتە کۆنەپەرست و خوێنرێژە دەرچو.

کە دانیشتین، من و ساڵح یوسفی و بابە عەلی و فوئاد عارف بوین، ئەوانیش بریتی بون لە: عەلی ساڵح سەعدی، ساڵح مەهدی عەماش و دو، سێ کەس بون. من باسی داخوازییەکان و رێککەوتنی خۆمانم بۆکردن، عەلی ساڵح سەعدی

مەوزوعەکەی گۆڕی و هێنایە سەر ئەوەی، کە ئێستا هەرچی شیوعییە رادەکات و دێتە لای ئێوە، ئێوەش داڵدەیان ئەدەن، نازانم ئەوە چۆنئەبێت، ئەوە هەڵوێستێکی دوژمنانەیە! منیش گوتم:

یەکەم: من هاتوم بۆ مەسەلەی حوکمی زاتی خۆمان، نەک بۆ مەسەلەی شیوعی!

دوهەم: لای ئێمە عورفی عەشایەری هەیە، خەڵکێک پەنای بۆ ئێمە هێنا، ئێمە ناتوانین بیگرین و تەسلیمی کەینەوە.

سێهەم: ئێمە دژی ئەو سیاسەتەین، سیاسەتی ئیبادەی شیوعیمان پێ باش نیە، سیاسەتی قڕان بە شیوعی سیاسەتێکی خراپە و چەوتە، خۆشتان رۆژێ دێ لێی پەشیمان ئەبنەوە، ئەوە سیاسەتێکی کۆنەپەرستانەیە، خۆشتان ئەزانن، ئێمە چەند جیاوازیمان هەیە لەگەڵ حیزبی شیوعیدا، ئەوان لە زەمانی کەریم قاسمدا چەند دژی ئێمە بون؟ چیان بە ئێمە کردوە؟ بەڵام ئەو کوشتن و بڕین و لەناوبردنە چارەسەر نیە، کارێکی خراپە.

*** ناوەڕۆکی کۆبونەوەکان چی بون، گیروگرفتەکان چی بون؟**

- لە کۆبونەوەکەدا، باس لەسەر مەسەلەی شیوعی کرا، ئەو مەسەلەیە هۆیەک بو بۆ تێکدانی کۆبونەوەکان، هەربۆیە بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشتین. رۆژی دوەم دانیشتینەوە، دیسان ئەمجارە ئەحمەد حەسەن بەکر و ساڵح مەهدی عەماش و چەند کەسێکی تر ئامادەبون، گوتیان: "ئێمە زۆر ئامادەین، پەیمانەکان جێبەجێ بکەین"، قسەی زۆر چاکیان کرد، بەراستی ساڵح مەهدی عماش بە پێچەوانەی ئەو وتارەی کە دوایی دای و گوتبوی: "هێرش بۆ کوردستان وەکو سەیرانێک وایە بۆ شیمال"، باسی ئەوەی کرد، "میللەتی کورد هیچ کاتێ لەناوناچێت، ئینسان زەلامێک دەکوژێت هەتا رۆژی قیامەت بەسەریدا ئەبڕێت و ئەڵێن: قاتلە، چۆن بەگژ میللەتێکدا بچین، لەبەرئەوە، گرنگە کە میللەتی کورد مافی خۆی بدرێتێ، ئێمە دژی ئەوە نین، کورد مافی خۆی وەربگرێت، تەنانەت ئێمە هیوادارین رۆژێک لە رۆژان کوردستان هەموی رزگاری بێت و یەک بگرێتەوە و جمهوریەتی کوردستان دروست ببێت".

قسە زۆرکرا، ئەوەی کە زۆر جوانتریش قسەی کرد، حازم جەواد بو(٥)، حازم جەواد ئەو کاتە بە شەخسێکی دیاری حیزبی بەعس دادەنرا، گوتی: "وەڵڵاهی من لەسەر حوکمی زاتی هیچ موناقەشەم نییە، چونکە لایەنگری ئەوەم، جمهوریەتی

کوردستانی ئیشتیراکی دروست بێت، لەبەرئەوە من بەراستی هیچ موناقەشەیەکم نییە لەسەر حوکمی زاتی، من پشتگیری داخوازی زیاترم بۆ ئەم برادەرانە. لەبەرئەوە بەلای منەوە موشکیلە نییە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە، چۆنی ئەکەین و کەی؟ موناقەشەکە لەسەر ئەوە ئەسورایەوە ئێستا بێ یاخود دوابخرێت، یان نەکرێت".

**پەراوێزەكان:**

١- ئەو رۆژنامەنوسە، دانا ئادەم شمیت بو كە سەردانی كوردستانی كرد و دوایی كتێبێكی بەناوی (رحلة الی رجال شجعان في كردستان)، نوسی.

٢- لەگەڵ ئەوەی بارزانی پێی ناخۆش بوە، پێی بوترێت "مامۆستا" بەڵام زۆر نامەی م.س. و دەزگاكانی تری پارتی و كەسایەتی ناسراوی تر هەن كە نامەیان بۆ بارزانی نوسیوە و بە "مامۆستای بەرێز" دەستیان پێكردوە، هەروەها بارزانیان بە چەند نازناوێكی تر، بانگ كردوە، یان نامەیان بۆ نوسیوە، وەك: شێخ مستەفا، جەنەراڵ، هاورێی سەركردوە، زەعیمی ئازادی، پێشەوای مەزن، سەرۆكی باڵا، كاك و هتدد.

٣- وەفدەكە لە ١٩٦٣/٢/١٩ گەیشتنە بەغدا، لە مام جلال و ساڵح یوسفی، پێكهاتبون. مام جەلال خۆی لە كتێبی رحلة الی رجال شجعانی دانا ادەم شمیت.ل. ٣٦٢ بە درێژی باسی ئەو سەفەرە دەكات.

٤- بارزانی لە چەند چاوپێكەوتنێكدا لەگەڵ رۆژنامەنوسانی بێگانە وتویەتی: "بەعسیەكان پەیمانیان داینێ بۆ پێدانی حوكمی زاتی، بەڵام بەڵێنێكی نوسراو نەبو، نەچوە سەر كاغەز و ئیمزا نەكرا" (التیار السیاسیة في كردستان العراق - صلاح خرسان.ل. ١٠١).

٥- حازم جواد لە ١٩٣٦ لە ناسریە لەدایك بوە و ئەندامێكی چالاكی حیزبی بەعس بوە، لە ١٩٥٨ گیراو دوایی توانی رابكات بۆ سوریا، دوای كودەتای ١٩٦٣، بو بە وەزیری ناوخۆ، بە یەكێك لە میانرەوەكانی ناو حیزبی بەعس دادەنرێت، لە دوای تەمەنیدا لە شاری لەندن گیرسایەوە.

# عه‌بدولناسر و مه‌سه‌له‌ی کورد

*** بۆچی حکومه‌ته‌که‌یان توانای بریاردانیان نه‌بو؟**

- له پاش ئیحراجکردن و دوای ئه‌وه‌ی که من زۆر سور بوم له‌سه‌ر داخوازییه‌کان، گوتیان، ئه‌ترسین ئێمه ئه‌و ئیشه گرنگانه به‌بێ عه‌بدولناسر بکه‌ین، ئێمه هیچ له عه‌بدولناسر ناشارینه‌وه، ئه‌بێت پرس به‌و بکه‌ین.

ئه‌حمه‌د حه‌سه‌ن به‌کر گوتی: سبه‌ینێ (یکسر رکبتنا) و ئه‌ڵێ ئه‌وانه عێراقیان ته‌قسیمکرد، جیایان کرده‌وه، واو وایان کرد.

له‌به‌رئه‌وه ئه‌بێت بچین بۆلای عه‌بدولناسر، ئه‌و وه‌خته ١٧نیسانی ١٩٦٣ بو، یادی (وه‌حده‌ی سوری و میسری) ئه‌کرایه‌وه، هه‌مو گوتیان: "با بچین بۆ میسر و تۆش له گه‌ڵمان وه‌ره، له‌وێ ئه‌و مه‌سه‌له‌یه باس ئه‌که‌ین له‌گه‌ڵ عه‌بدولناسر و دوایی ئه‌چینه جه‌زائیر لای بنبیلاش، له‌گه‌ڵ ئه‌ویش باسی ئه‌که‌ین، ئه‌گه‌ر پشتیوانی عه‌ره‌بیشمان هێنایه‌وه، ئه‌وا به‌یانێک ده‌رده‌که‌ین و ئیعلانی ئه‌که‌ین".

راستییه‌که‌ی من نه ته‌له‌فونم هه‌بو بیکه‌م، نه به‌رقییه و لاسلکیم لابو، بۆئه‌وه‌ی خه‌به‌ر به مه‌لا مسته‌فا بده‌م، ماوه‌که که‌مبو، بێ پرسی مه‌لا مسته‌فا و مه‌کته‌بی سیاسی پێمخۆش نه‌بو بچم، به‌ڵام سه‌فه‌ره‌که‌شم زۆر پێباشبو.

سه‌فه‌ره‌که هه‌ڵێک بو هاتبوه پێشه‌وه، له‌و سه‌فه‌ره‌دا ئه‌مان توانی عه‌بدولناسر و بن بیلا ببینین، ره‌ئی خۆمانیان بۆ باسبکه‌ین، بۆئه‌وه‌ی هه‌ر ئه‌وان به ته‌نێ نه‌چن و ئه‌وه‌یان له‌گه‌ڵدا باس.بکه‌ن که له سودی خۆیان بێت، جگه له‌وه، من ئێستا و ئه‌وساش له‌و قه‌ناعه‌ته‌دا بوم، له پێناوی به‌رزکردنه‌وه‌ی مه‌سه‌له‌ی کورد، له کێشه‌یه‌کی عێراقی ناوخۆوه به‌رین بۆ ئاستی عه‌ره‌بی و له پاشاندا بۆ ئاستی جیهانیی، ئه‌مه پێشخستنی مه‌سه‌له‌ی کورده. دیاره من جگه له‌و خاڵه‌ش ئه‌مه‌وێت لێره‌دا ئه‌وه بڵێمه‌وه، دانا ئاده‌م شمیت[1] له‌کتێبه‌که‌ی دا که له ١٩٦٥ ده‌رچوه به‌ناوی (Journey Among Brave Men) که جه‌رجیس فه‌تحوڵلا ته‌رجومه‌ی کردوه به (رحله الی رجال شجعان فی کردستان)، دانا ئاده‌م شمیت

ئەڵێ: "دو ڕەئی هەبو لەناو بزوتنەوەی کوردیدا: یەکێکیان جەلال تاڵەبانی بەرجەستەی ئەکرد، یەکێکیان مەلا مستەفا"، هەروەها باس ئەکا و دەڵێ "مەلا مستەفا دژی ئەو جۆرە پەیوەندییە و چونە بو بۆ لای عەبدولناسر، تورە بو کە بیستی جەلال چوە، گوتوبوی کە ئێمە چیمان بەسەر عەبدولناسر و بین بیلاوە هەیە؟ چ عیلاقەمان هەیە بەسەر عەرەبەوە، ئەمە چییە، بۆ ئەچێت؟ من ئەوم بۆ کاری وا نەناردبو"، نارەزایی نیشان دابو، هەتا ئەڵێ: "من لە فرۆکەخانەی بەغدا بوم کە جەلال تاڵەبانی ئەگەڕایەوە، پێمگوت مەلا مستەفا ناڕازییە، ڕەنگی تێکچو مشەوەش بو، ڕەنگی زەرد بو لە ترساندا".

ڕەئی دوەم: ڕەئی جەلال تاڵەبانی بو، کە پێی وابو: "ئەو سەفەرە زۆر گرنگە بۆ کورد، ئەگەر بتوانێت مەسەلەی خۆی بە عەرەب بناسێنێت و پشتیوانی کەسانی وەک عەبدولناسر و بین بیلای بۆ رابکێشێت، ئەو لەوێدا ئەو هەڵوێستە بە دوربینی حسێب ئەکات، ئەڵێ ئەوە دوربینی و زیرەکی جەلال تاڵەبانی لەوەدا خۆی ئەنوێنێت".

# سەفەری قاهیرەی بێ پرسی بارزانی

*** کەواتە ئەوەی دانا ئادەم شمیت باسی کردوە، کە تۆی لە فرۆکەخانە بینیوە و باسی هەڵوێستی بارزانی بۆ کردویت راستە؟**

- بەڵێ هەر بەڕاستی وابو، من کە دوایی هاتمەوە زۆر ترسام، چونکە هەڕەشەی بۆ ناردبوم، منیش ترسام نەوەک مەلا مستەفا لای ڕۆژنامەنوسان بڵێ ئیتر ئەو نوێنەری ئێمە نیە، ئەوکاتە هەمو مەسەلەکە تێکدەچو.

لای دانا ئادەم شمیت و یەک، دو ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی گوتبوی، بەڵام زۆر ئاشکرا نەبو، من کە ئەو هەستەم هەبو لە لایەکەوە پێم باشبو بچم بۆئەو سەفەرە، لە لایەکی تریشەوە ئەترسام، چونکە بەعسیەکانیش زۆر ئیلحاحیان ئەکرد، بابە عەلی و فواد عارفم بینی، بەوانم گوت: ئایا من بێم بۆ ئەو سەفەرە؟ چونکە من پرسم نەکردوە، گوتیان: هاتنت بۆئەوێ زۆر باشە و گوتم منیش پێم

باشە، بەڵام راستیەکەی سڵ لە مەلا مستەفا ئەکەمەوە، گوتیان: مەلا مستەفا لەسەر ئێمە! من ئەشمزانی کە مەلا مستەفا زۆر رێز لە بابە عەلی و فواد عارف ئەگرێت، لەبەر ئەوەی ئەوان گوتیان لەسەر ئێمە، منیش گوتم دەباشە، هەواڵی پێ بگەیەنن کە ئێمە ناردومانە، ئەوانیش رازی بون و گوتیان باشە.

من سەفەرەکەم لەسەر ئەو ئەساسە قبوڵکرد کە چوم بۆ قاهیرە هەر بە جلی کوردیەوە بوم، فریا نەکەوتم هیچ شتێک لەگەڵ خۆم بهێنم، هێشتا نە پەرژابوم قاتێک چاکەت وپانتۆڵ بکرم.

دوڕۆژبو لە بەغدا نەپەرژابوم بچمە بازار، هەتا نەپەرژابوم بیجامە بکرم! باوەڕکە بیجامەم نەبو، تاقمی تەراشم نەبو، نازانم چۆن ریشم ئەتاشی!.

کە ئێوارەکەی گەیشتینە قاهیرە ئێمەیان بردە ئوتێل، ئێستاش لەبیرمە من و حسێن جەمیل لە ژورێکی دونەفەری بوین، بیجامەم نەبو چاوەرێم کرد، تا ئەو بنوێت و منیش بە جلی ژێرەوە چومە جێگاکەوە. رۆژی دوەم سەعدی حەمەد ئەمین دزەیم نارد و گوتم سەعدی نەپەرژاوم، بیجامە، تاقمی تەراش و ئەو شتانە بێنم، بەشکو بچیت بۆم بکریت، ئەویش بۆی هێنام بۆ ئوتێلەکە.

*** کەی عەبدولناسرتان بینی، هەڵوێستی چی بو بەرامبەر بە کێشەی کورد و بەرامبەر بە کوشتنی شیوعییەکان؟**

- هەر کە گەیشتینە ئەوێ، عەبدولناسر پێشەوازی لێکردین و چەند شتێکی گوت، بە باشی ئەزانم لێرەدا باسی بکەم، خۆزگە لە فرسەتێکدا ئەمنوسی، چونکە ئەو هەڵوێستانە لە دنیای عەرەبیدا گرنگە:

یەکەم: ناسر گوتی: "هیچم پێخۆش نییە ئەو خەڵکانە لە عێراق کوژراون"، گوتی "هەتا بە کوژرانی کەریم قاسم، مەسرور نیم، خۆشحاڵ نیم، چونکە کابرایەک بوە شۆرشی بەرپاکردوە، دەوری هەبو لە دروستکردنی ئەفسەرە ئازادەکان، هەق نەبو ئەوە ئەنجامی بێت"، گوتی: "من پێم ناخۆشە عەبدولکەریم قاسم خەڵکی کوشتوە، یان دژی ئێمەبوە، بەڵام بەراستی مەسرور نیم بە کوشتنی"، گوتی: "دڵگرانیشم نەک دڵخۆش، تەنها بۆ کوشتنی یەک کەس دڵگران نیم، بەڵام دڵخۆشیش نیم، ئەویش مەهداویە (لانه سب فی آعراضنا و شرفنا)".

من جلی کوردیم لەبەرابو، عەبدولرەحمان بەزاز تەقدیمی کردم و گوتی: "ئەمە پارێزەرە، فلانە، بەجلە کوردییەکەی سەرتان لێنەشێوێت، ئەو راستەوخۆ لە سەفەرەوە هاتوە"، منیش بێگومان هەلم قۆستەوە، بەزاز گوتی: "قوتابی خۆشم

بوە لە كولیەی حقوق"، گوتم: بەڵێ فەسڵیشی كردم لەسەر تۆ، عەبدولناسر گوتی لەسەر من؟ گوتم بەڵێ، "كاتێ عدوانی سولاسی بو، من قوتابی بوم لە حقوق، موزاهەرەمان كرد، لە موزاهەرەكەدا وتارم خوێندەوە، بۆیە لەسەر ئەوە فەسڵیان كردم، خۆی بانگی كردم، گوتی تۆ ساڵێک فەسڵ بە، چونكە لە موزاهەرادا بەشداریت كردوە".

لەپاشان كە دانیشتین عەبدولرەزاق زاهیر، نەقیبی محامیین كە لە هەڵبژاردنی قەومییەكاندا دەرچوبو، وەڵامی دایەوە گوتی: "جەنابی سەرۆک هەرچەندە من بەعسیش نیم و قەومییم، بەڵام شیوعی زۆر زوڵمیان كردوە، زۆر خراپەیان كردوە، لەبەرئەوە بەرەئی من شیوعی ئەبێ ئەوها موعامەلە بكرێن. سەرۆک و لێپرسراوەكان ملیان بپەرێنرێ، واتا ئیعدام بكرێن، كادیرەكانیان موعەسكەراتی كاریان بۆ بكرێتەوە، تا مێشكیان پاک ئەبێتەوە، جەماهیرەكەشیان لە بەندیخانە بەندبكرێن".

منیش تەعەلیقەكەم ئەوەبو، گوتم: "جەنابی سەرۆک، ئەوە مامۆستا عەبدولرەزاق وەک نقیبی پارێزەران ئەو قسەیە ئەكات، كاری پارێزەر ئەوەیە، بەرگری بكات لە پرنسیپی (المتهم برئ حتی یدان)"، بێگومان گاڵتەم پێكرد، گوتم: ئەو بە سیفەتی ئەوەی نەقیبی محامییە ئەو قسانە ئەكات، عەبدولناسر پێكەنی و گوتی:

یەكەم: من لەگەڵ ئەو بۆچونانە نیم.

دووەم: كوشتنی شیوعیم زۆر پێ خراپە، وڵاتانی سوسیالیستیمان ئەكات بەگژا، جیهانمان لێهەڵدەستێ، لەبەرچاوی دنیادا بە بزوتنەوەیەكی كۆنەپەرستی خراپمان ئەدەنە قەڵەم.

سێیەم:خەڵک فەسڵ مەكەن (عندما تحاربون الناس في آرزاقهم و معیشتهم) رێیان نامێنێ ناچار ئەبن دژایەتیتان بكەن، ئەوەش كارێكی خراپە، جگەلەوە گەمارۆی كۆمەڵایەتی كارێكی خراپە.

لەسەر مەسەلەی ئێمەش گوتیان، ئەوە كاكە جەلال هاتوە قسەت لەسەر مەسەلەی كورد بۆ ئەكات، دوایی رەئی جەنابیشتمان ئەوێت. لەسەرئەوە رێكەوتین كە لە دانیشتنێكی تایبەتدا، من و فواد عارف ببینێ و قسەی بۆ بكەین، سڵاوی بارزانی و مەكتەبی سیاسیم پێ راگەیاند، لەبەرچاوی هەمویان گوتم: "ئومێدێكی زۆرمان بە جەنابت بەستۆتەوە و هیوامان زۆرە كە ئێوە وەک سەركردەیەكی گەورەی عەرەب تێگەیشتنێكی راستەقینەتان بۆ مەسەلەی كورد و عەدالەتی مەسەلەكەی هەبێت و پشتیوانمان بن".

# ناسر وەک ناوبژیکەر لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقدا

*** لەو کۆبونەوە و یەکتربینینەدا، داخوازی ئێوە لە ناسر چی بو؟**

– ئێمە ئەمانویست ئەو حەکەم بێت، من گوتم ئێمە پێمانوایە ئێوە حەکەمێکی لایەنگیرین بۆ ئێمە، چونکە ئێمە برا بچکۆلە و مەزلومەکەین کە هەقمان هەیە بەسەر ئەوانەوە، گوتی من ئەتانبینم و فیعلەن رۆژی دوەم، فواد عارف و منی بینی، لە سەرەتادا هەندێک قسەی کرد، بەڵام ئەو تێی نەدەگەیی، فواد عارف عەرەبییەکەی و تەلەفوزەکەی وەک پیویست نەبو، عەبدولناسر بەتەنها نەبو کە ئێمەی بینی، یاریدەدەری سەرۆک کۆمار زەکەریا محێدین و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران عەلی سبریش ئامادەی کۆبونەوەکە بون، من دەستمکرد بە قسە و باسی مەسەلەی کورد و باسی رێککەوتنامەی نێوان خۆمانمان بۆ کرد.

ئەویش لەسەر شێوە و چۆنیەتی حوکمی زاتی پرسیاری لێکردم، گوتی: "ئایا سوپا و پەیوەندی دەرەوە ئەگرێتەوە، گوتم: "نەخێر، سەرۆکایەتی وڵات، دارایی گشتی، سوپا، پەیوەندی دەرەوە، پارە و هەندێ شتی تر، هەمو ئەمانە لەژێر دەسەڵاتی بەغدایە، بەڵام ئێمە لە کاروباری ناوخۆدا دەورمان ئەبێت، گوتی: "واتا وەکو یوگسلافیا"، گوتم "بەڵێ ئەگەر کەمتریش بێت لە یوگسلافیا، ئەوا ئێمە رازین.

گوتم: ئێمە سێ تاقیکردنەوەی وڵاتانی ترمان لەبەردەستایە، هەر کامێکی بگونجێ ئێمە قبوڵی ئەکەین و ئەمانەوێت، یەکەم، یوگسلافیا، دوەم، هندستان، سێهەم، ئەو لیبیایە، لیبیا، لە زەمانی سنوسی سێ ویلایەت بو، ویلایەتی بەرقە، بەنغازی و تەرابلوس، لەبەرئەوە گوتم ئەوان هەر کامێکیان لەو سێ نمونەیان پێ باشبێت، ئەوا ئێمە رازین.

ئەوە نمونەی عەرەبی، ئەوە نمونەی ئاسیایی، ئەوەش نمونەی ئیشتراکی کە دۆستی خۆتانە.

عەبدولناسر، نیشانەی رەزامەندی لەدەموچاویدا بەدی ئەکرا، بەڵام قسەی

نەکرد و گوتی: من دراسەی دەکەم هەتا دێنەوە، پرسیاری کرد، کە ئایا ئێمە پەنای شیوعییەکان ئەدەین. هەروەها دەربارەی تەسریحاتی عیسمەت شەریف وانلی پرسیاری کرد، هەندێک قسەی حەلەق و مەلەقی کردبو، گوتم: ئێمە لە قسەکانی بەرپرس نین، ئەو لەخۆیەوە قسە ئەکات. گوتی: "ئەو قسانە زۆر زیان لەئێوە ئەدات، تەسریحاتێکی خراپە"، گوتم: "وەڵڵا ئەوە لەخۆیەوە قسە ئەکات و رای تایبەتی خۆیەتی".

لەو دانیشتنەدا ئینتباعێکی باشم دایە، بە نیشانەی ئەوەی دوای بینینی من گوتبوی جەلال تاڵەبانی ئینتباعێکی باشی دامێ، مەفهومی ئەو بۆ ئۆتۆنۆمی، پەیوەندی عەرەبی و کوردی بەلای منەوە پەسەندە، بێگومان من باسی برایەتی مێژویی کورد و عەرەبم کرد، گوتم "ئێمە ئومێدمان ئەوەیە تۆ ببیت بە سەلاحەدینی ئەم سەردەمە، کورد و عەرەب هەمیشە برابون، هەروەها بە دان پێدانانی ئۆتۆنۆمی و سەلماندنی مافی کورد، برایەتی کورد و عەرەب بەهێزئەبێت، نەک نەزعەی لێکجیابونەوە زیادئەکات، بەڵکو نەزعەی یەکێتی بەهێزئەبێت، بە پێچەوانەوە ماف خواردن و ماف پێشێلکردن و ماف زەوتکردن، بۆچونی جیابونەوە بەهێزئەکات".

ئەوکاتە کورد، عەرەبی وەکو داگیرکەر دێتە بەرچاو، لەبەرئەوە ئەیەوێت لەدەستی رزگاربێت و رابکات.

عەبدولناسر ئەو قسانەی زۆر پێباشبو، هەتا بۆ پشتگیری ئەوە شایەدێکی تریشم هەیە کە زۆر هەڵوێستی باشبو، ئەویش دکتۆر جەمال ئەتاسیە، دیسان لە پێشەکی کتێبەکەی مونزیر موسڵیدا نوسیویەتی: دوای بینینەکەیان "جەمال عەبدولناسرم بینی، تەماشام کرد زۆر مورتاحە لەو باسانەی، جەلال تاڵەبانی بۆیکردبو، چونکە لەگەڵ دید و ستراتیجی خۆیدا یەکی ئەگرتەوە، بە ئێمەی گوت: ئەم قسانەی ئەم کورە لاوە بۆیکردوم (ئەو وەختە وەکو ئێستا پیر نەبوبوم!) لەگەڵ مەشروعی ستراتیجی قەومی عەرەبیدا ئەگونجێت".

ئێمەش رەزامەندیمان تێدا بەدی ئەکرد، بەڵام وەڵامی راستەوخۆمان وەرنەگرت، میسرییەکان گوتیان لە مەسەلەکان ئەکۆڵینەوە، هەتا بەمنی گوت: "تەعەجوب مەکە لەوەی ئێستا، مەسەلەن ئێمە وەک حەرەکەی قەومی عەرەبی زۆر باسی ئیشتراکییەت ئەکەین، باسی بەیانێکی قەومی ئەکەین کە هێشتا سیاغەی ئەفکاری خۆمانمان نەکردوە، مەسەلەن ئێستا تۆ لە مارکسییەک بپرسە بڵێ مەوقیفت چیە لە مەسەلەی قەومی، هەڵدەستێت کتێبێکی لینین یان ستالینت بۆ ئەهێنێتەوە و ئەڵێت ئەوان وایان گوت، بەڵام ئێمە شتی وا ئامادەکراومان نیە، لەبەرئەوە ئەبێت

دراسەی بکەین، تا ئێوە ئەگەڕێنەوە لە جەزائیر ئینشەڵڵا من دیراسەی ئەکەم و ئەتانبینم و قسەی لێدەکەین" و زۆر بە گەرمیەوە بەڕێی کردین.

بۆ نیوەڕۆکەی دەعوەتی کردین لە نادی جەزیرە، سەرۆک خۆشی هاتبو، بەرامبەری عەلی سالّح سەعدی بو لەولاوە وەزیری دیفاع، وەزیری دیفاعی عێراقی سالّح مەهدی عەماشیش ئامادەبو.

(فریک)یشیان هێنا، فریک بلحەمام لەو شوێنە هەبو، من لە ئەمین هویدیم پرسی، ئەوکاتە سەفیربو، گوتم ئەوە فریکە یان فەریکە؟ چونکە لە کوردستانیش هەمانە بەناوی (قەرەخەرمان)، واتا خەرمانی تازە، عەبدولناسر دیاربو ئاگاداربو لە قسەکەی من، گوتی: بۆ؟ گوتم: وەڵڵا فەریک بە کوردی مانای پێش ئەوەی بگات، عەبدولناسریش هەڵی دایە و گوتی: "ئێ جەلال ئەوە رەنگە کاتی خۆی سلاحەدین لەگەڵ خۆی هێنابێتی بۆ ئێرە" و هەر بەو بۆنەیەوە گوتی: "بیبەن با شوێنەواری باپیرانی ببینێت و شتەکانی پێ پیشاندەن"، گوتم: "ئیشەڵڵا شتی باشمان بەجێهێشتوە"، گوتی: "بەڵێ ئاساری زۆر زۆر باشتان بەجێهێشتوە"، یەعنی هەندێک موجامەلەی کردین.

## سەفەر بۆ جەزایر

*** کەی و بۆچی و چۆن بو گەشتی جەزایرتان کرد؟**

– لەدوای سەفەری قاهیرە، چوین بۆ جەزایر، لە جەزایر ئەحمەد بین بیلامان بینی[٢]، لام وایە ٢٤ یان ٢٥ی نیسانی ١٩٦٣ بو، لەبیرمە یەکەم رۆژی جەژنی رەمەزان بو، هەتا ئێمەیان بردە شارێک پێی ئەڵێن، بلێدە بۆ نوێژی جەژن. لەوێ هاتینەوە و بین بیلا کە سەرۆک کۆماری بو، زۆر موتەوازیع و سادەبو، زیاتر وەکو پێشمەرگایەتیم ئەهاتە بەرچاو.

کە دانیشتین و قسەکرا، پرسی و گوتی ئەوە کێیە؟ گوتیان فلانە و من کە باسی مەسەلەی کوردم کرد، بەڕاستی ئەو لە عەبدولناسر خێراتر و سەریح تر قسەی کرد، رانەوەستا لەسەر ئەوەی، بڵێت من دراسەی ئەکەم، گوتی: "برادەرینە

کورد میللەتێکی موسوڵمانە، لە دێرزەمانەوە دۆستی ئێمەن، لە گەڵماندابون، بەرەئی من هەرچی زوە مافی خۆیانیان بدەینێ، هەقە حوکمی زاتی وەربگرن، ئەگەر حوکمی زاتیان نەدەنێ، ئەوا شەڕ دەوام ئەکات، لە پاشان ئێران و وڵاتانی تر دێنە ناو مەسەلەکەوە، لە پاشاندا کورد بە حوکمی زاتی رازی نابێت و داوای سەربەخۆیی ئەکات، ئێمە لە جەزایر لەگەڵ فەرەنسا، بە حوکمی زاتی رازی بوین، لەدوای جەنگ نەیاندایێ هەتا سەربەخۆیمان وەرنەگرت رازی نەبوین".

گوتی: "من رەئیم وایە هەرچی زوترە حوکمی زاتیان بدەنێ"، قسەکانی زۆر سەریح و لای ئێمە پەسەندبو، من زۆر مەمنون بوم و پێم خۆشبو کەوا بە ئاشکرا و بە باشی لەسەر میللەتی کورد قسەئەکات.

*** دوای جەزایر بەرەو کوێ رۆشتن؟**

– دوای تەواوبونی سەفەرەکە لە جەزایر، گەڕاینەوە بۆ قاهیرە، عەبدولناسرمان بینیەوە، عەبدولناسر گوتی: "من دراسەی داخوازیەکانی ئێوەم کردوە، رەئیم بەم شێوەیە:

یەکەم: پێموایە ئێوە ئەبێت بەهەمو نرخێک برایەتی کورد و عەرب و یەکێتی تێکۆشانی کورد و عەرەب و یەکێتی خاکی عێراق بپارێزن.

دوەم: پێویستە حکومەتی عێراق حوکمی زاتیتان بداتێ، بەو مەفهومەی کە تۆ بۆمنت شەرحکردوە.

سێیەم: پێویستە هەردولاتان بە ئاشتی مەسەلەکە چارەسەر بکەن، بە رێگای سیاسی حەلی بکەن، نە ئێوە بیر لە شۆڕشکردنەوە بکەنەوە، نە ئەوان بیر لە شەڕکردن و پەلاماردانتان بکەنەوە، هەر کەسێکیش شەڕ بکاتەوە و دەست پێکەرەوەبێت، ئەوە پشتیوانی جمهوریەتی عەرەبی موتەحیدە وەرناگرێت، ئەبێت ئێوە و حکومەتی عێراقی ئەوە باش بزانن.

چوارەم: ئامۆژگاریم بۆ ئێوە وەکو برا، نەک وەکو سەرۆکی جمهوری عەرەبی، ئەوەیە کە ئاگادارین و هوشیارین لە شای ئێران، ئەو دوژمنی کوردە، چونکە بەشێکی زۆری میللەتی کوردی لەبەردەستدایە، ئەیەوێت بەکارتان بهێنێت، رەنگە بیەوێت و هەوڵبدات پەیوەندیتان لەگەڵدا دروست بکات، یارمەتیتان بدات، هەندێک شتان بۆ بکات، تەنها بۆئەوەی بتانکات بەگژ عەرەبدا، تا ئەو رۆژەی ئامانجەکانی خۆی بەدی ئەهێنێت، ئەوجۆرە پەیوەندیانە سودی کوردی تێیدانیە، ئاگاتان لەوەبێت".

منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: "ئەوەی تاکو ئێستا دیارە، ئەوەیە کە حکومەتی عێراق لەگەڵ ئێران و تورکیا لە دژی ئێمە هاوکارییان کردوە، ئێستا دەرئەکەوێت، حکومەتی عێراق خەریکە پشی پشی بۆ ئێران و تورکیا دەکات و خەریکە لەگەڵیاندا پێکدێت بۆ گەمارۆدانی ئێمە.

ئێمە هیچ پەیوەندیەکی ئەوتۆمان لەگەڵ ئێراندا نیە، تا ئێستاش بەڕاستی تەنها لە چوارچێوەی گفتوگۆ دەرنەچوە، هیچ ئەنجامێکی نەبوە، بەسەرچاوان ئامۆژگاریەکانت هەڵدەگرین و ئەیبەینەوە بۆ برادەرانی خۆمان".

*** ئایا باسی ئەوەتان کرد کە رۆڵی کورد چی ئەبێت، لە کاتێکدا ئەگەر یەکێتی سێ قوڵی نێوان قاهیرە، بەغدا و دیمەشق هاتەکایەوە؟**

- بەڵێ لە کۆبونەوەیەکی گشتیدا باس لەوەکرا، ئەگەر یەکێتی عەرەبی دروست ببێت، واتا ئەگەر یەکێتی لە نێوان میسر و سوریا و عێراقدا ببێت، ئەوە پێویستە کورد چی بکات؟ هەڵوێستی کورد چیبێت؟ من بە پێکەنینەوە گوتم: "جەنابی سەرۆک ئەم برادەرانە عەرەبن و ئێمەش کوردین، ئەوان بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب، ئێمەش بەشێکین لە نەتەوەی کورد، هەرکاتێک میللەتی عەرەبی برا، بەو ئامانجە نەتەوەیەی خۆیان گەیشتن، ئەوا جێی خۆشحاڵی میللەتی کوردە، عەرەبی عێراقی چەند زامنی ئەوێت لە وەحدەی عەرەبی، ئێمە نیوەی ئەوەمان ئەوێت، ئیتر زۆر پێکەنی".

*** رەنگدانەوە و کاریگەریی سەفەرەکەتان چی بو، لەسەر گفتوگۆی نێوان پارتی و حکومەت؟**

- کە لە میسر گەڕاینەوە و هاتینەوە بەغدا، زۆر پەلەم کرد لە حکومەتی عێراقی و گوتم ئەبێت زو بگەڕێمەوە بۆ لای برادەران، بەشکو زو وەڵامم بدەنەوە. کۆبونەوەیەکمان کرد، بێجگە لەخۆم و ساڵح یوسفی، دو دۆستی کۆنمان لەگەڵدابون، عەقید موستەفا عەزیز و حەمە سەعید خەفاف کە پیاوی مەعقول و رۆشنبیریی کورد بون.

لە کۆبونەوەکەدا کە لای ساڵح مەهدی عەماش بو، بابە عەلی، فواد عارف و چەند وەزیرێکی تری بەعسی ئامادەبون، ساڵح مەهدی عەماش گوتی: "ئێمە داخوازییەکانی ئێوە بۆ حوکمی زاتیمان قبوڵە، بەڵام پێویستمان بە فرسەتێک هەیە، وەختێکمان ئەوێت و بەشکو بماندەنێ"، گوتی: "تۆ سیغەیەک بنوسە بۆ

حوكمی زاتی من بۆت ئیمزا ئەكەم، مەجلیسی قیادەی سەورە بۆت ئیمزا ئەكات، بەڵام ئێستا راینائەگەیەنین، شەش مانگی تری ئەوێت، چوار مانگمان لێ راوەستن بۆ ئیعلان كردنی".

من ئەوەم پێباش بو، كە قبوڵی بكەین، چونكە، یەكەم: ئەوە وەک بەڵگەنامەیەكی مێژویی ئەبێت، ئەكەوتە دەستمان، دوەم: داخوازی حوكمی زاتی حەلاڵ ئەكرا كە هەمو ئەندامانی مەجلیسی قیادەی سەورە ئیمزایان ئەكرد.

بەڵام گوتم "پێویستە پرس بە مەلا مستەفا بكەم، بێ پرسی ئەو ناتوانم هیچ بەڵگەنامەیەک ئیمزا بكەم" كە هاتمەوە، مەلا مستەفا هەواڵی بۆ ناردبوم و ئەڵێ بەپەلە پێیان بڵێ، "یان ئێستا بەیانامەكە رادەگەیەنن، یان بە پەلە وەرەوە و هیچ لەسەریان رامەوەستە".

دوای هاتمەوە بۆلای مەلا مستەفا و هەواڵەكانم بۆگێڕایەوە، ئەو بەو جۆرە تورە نەبوبو كە باسكرا، دەنگوباسی جەزائیرم بۆ باسكرد، ئەویش پێی خۆشبو، زۆر دژی سەفەرەكە نەبو، وەكو دانا ئادەم شمیت باسی ئەكرد.

*** ئایا حكومەت هیچ هەنگاوێكی نا كە لە بەرژەوەندی كوردا بێت؟**

- كە من گەڕامەوە لای مەلا مستەفا، حكومەتی عێراق هیچی ئیعلان نەكرد، ساردییەک كەوتە نێوان كورد و حكومەتەوە، مەكتەبی سیاسیش ئامۆژگاری دەركردبو، دودڵی خستبوە سەرئەوەی، حكومەت ماف بدات بە كورد. حكومەت بەوەی زانیبو، لەبەرئەوە لەپڕ وەفدێكی بە سەرۆكایەتی تاهیر یەحیا ناردە لای مەلا مستەفا، لە دێی كانیماران یەكتریان بینی و هەندێ قسەوباس كرا، ئەنجامەكەی دیسان هەر ئەوەندە بو كە گوتیان: "ئێمە ئەچینەوە و وەفدێک ئەنێرین".

رژێم وەفدێكی میللی نارد، بریتی بون لە پیاو ماقوڵانی عێراقی، لە كورددا، زەیدی ئەحمەد عوسمانیان لەگەڵدابو، هاتن بۆ رانیە و چوارقوڕنە بۆ لای مەلا مستەفا[٢]، هەندێک قسە و باس كرا. مەلا مستەفاش داخوازی زۆر رێكوپێک و فراوانی پێشكەشكردن، وەک حوكمێكی فیدراڵی وابو كە لە لایەن چەند كەسێكی نزیک خۆیەوە ئامادەكرابو، لەوانە: من و عەقید كافی و عومەر دەبابە.

كە ئەو داخوازیانە پێشكەشكرا، وەفدەكە سەرسام بون، چونكە ئەوە زۆر زیاتر بو لە حوكمی زاتی، چونكە باس لە سوپا و كاروباری ناو سوپای تێدابو.

ئەوان رۆیشتنەوە و گوتیان باشە با وەفدی كوردیش بێت بۆ بەغدا، ئێمەش

بڕیاری ناردنی وەفد و گرتنی کۆبونەوەیەکی گەورەمان لە ١٨ ی مارتدا لە کۆیە، کە بریتی بێت لە عەشایر، شەخسیات، ئەندامانی حیزب و لێپرسراوانی پێشمەرگە.

لە ئەنجامدا کۆبونەوەیەکی گەورە کرا، لەو کۆبونەوەیەدا مەلا مستەفا پێشنیازی کرد و گوتی: "با جەلال سەرپەرشتی کۆبونەوەکە بکات"، ئەوەبو من بوم بە سەرۆکی سەرپەرشتیکەری کۆبونەوەکە.

کۆبونەوەکە، بڕیاریدا وەفدێک بچێت بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتدا، دیسان بارزانی تەدەخولی کردەوە و گوتی: "وەڵڵا من پێموایە جەلال ببێت بە سەرۆکی وەفدەکە". هەروەها کۆبونەوەکە بڕیاریدا، چواردە کەس هەڵبژێرێن وەک ئەندامانی وەفد، حەوتیان وەفدی ئەسلی و حەوتیشیان وەفدی ڕاوێژکار، ئەندامانی وەفدەکە بریتی بون لە خۆم، ساڵح یوسفی، مستەفا عەزیز، لە شەخسیاتی کوردیش، کاکە حوسێنی خانەقا، محەمەد سەعید خەفاف، ڕەشید عارف، مەسعود محەمەد، بابەکری مەحمودی حاجی ئاغا، یەدوڵڵا، حەبیب کەریم و چەند کەسێکی تر[٤].

وەک بڕیاردرابو، من سەرۆکی وەفدەکەبم، ئەو کاتە سەرەتای بەهاربو، من لە کۆتایی نەورۆزدا لەگەڵ وەفدەکە چوم بۆ بەغدا، لەو کاتانەدا کۆبونەوەیەک لە کۆیە کرا، ئەویش کاک عەزیز محەمەد لەوێ بو، عەزیز محەمەد لێپرسراوی شیوعییەکان بو، جوابی نارد گوتی: "ئەمەوێ بێم بۆلای مام جەلال و هەندێ ئیش وکارم هەیە لەگەڵیدا باسی بکەم"، منیش گوتم: نابێت، من دێم بۆ لات.

لەو کاتانەدا حیزبی شیوعی بە لێقەوماو دائەنرا، پێم باشبو کە پێویستە ئێمە بیان گرینەخۆ، بیاندوێنین، یارمەتیان بدەین و پشتیوانییان بکەین، لەو بۆچونەدا من جیاواز بوم، هەم لە گەڵ (م. س) و هەم لەگەڵ مەلا مستەفاش.

کە من چوم بۆلای، زۆر کەیفی پێهات، پێم گوت: "کاک عەزیز لەمەودوا وادابنێ کە من هەرچیم لەدەست بێت لە خزمەتی ئێوەدا ئەیکەم و چیم پێ ئەکرێت بۆتان ئەکەم، من حساب کە بە نزیکترین دۆستی خۆتان، ئەمە هەڵوێستی من ئەبێت، تا ئێوە هەڵدەستنەوە. من دۆستی دێرین و ڕاستەقینەتان ئەبم، بەڵام دڵنیام، کە هەڵسانەوە، ئێوە شتێکی تر ئەبن و ئەگۆڕێن!" پێکەنی و گوتی پیاوی چاک بە وانیە!، بەراستی عەزیز محەمەد ئەوجارە گێڕایەوە و زۆر بە مەمنونیەتەوە گوتی ئەوەم هەر لەبیرە، تا ڕۆژی خۆی.

# سەردانێکی تر بۆ بەغدا

*** دەستکەوتی سەفەری دوەمتان بۆ بەغدا چی بو؟**

- ئەمجارە کە وەفدەکە چوینەوە بۆ بەغدا و لەپێشەوە هەستمانکرد لە گەڵماندا ساردن، بۆ نمونە مستەوای ئوتێلەکەی لێی دابەزیبوین، هێنایانە خوارێ، ئێمە جاران لە ئوتێل بەغدا دائەبەزین، ئەمجارە ئێمەیان هێنابو بۆ ئوتێل سەمیر ئەمیس، هەروەها ئەوانیش وەفدێکی میلیان دروستکردبو بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵماندا، پێک هاتبون لە: محەمەد رەزا شەبیبی، فایەق سامەڕایی، حوسێن جەمیل، د.عەبدولعەزیز ئەلدوری، فەیسەڵ حەبیب خەیزەران و چەند کەسێکی تر.

کە دانیشتین، لێم پرسین: "ئێوە کێن، ئایا نوێنەری رەسمین، دەسەڵاتتان چیە؟ سیفەتتان چیە، ئەگەر ئێمە لەگەڵ ئێوە بگەینە ئەنجامێک، چی دەبێت؟ ئایا مولزەمن بەو رێککەوتنامەیەی، لەگەڵتاندا مۆری ئەکەین"؟ گوتیان: "نەخێر، ئێمە ئەو دەسەڵاتەمان نیە، شتەکان ئامادەئەکەین و ئەیبەینە لای حکومەت"، گوتمان: "کەواتە ئەوە مەسەلەکە زۆر دوا ئەخات، چۆن ئەبێت ئێمە لەگەڵ ئێوە تەمهیدی گفتوگۆ بکەین ودوایی بچین لەگەڵ حکومەت قسە بکەین و ئینجا حکومەت بچێتە مەجلیس قیادەی سەورە و بریار بدات"؟.

تەماشامان کرد وردە وردە ئاستی مەسەلەکەیان هێناوەتە خوارێ، لەبەرئەوە گوتمان لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەگەڵتاندا دائەنیشین. لە کۆبونەوەکەدا باسمان لە حوکمی زاتی کرد کە گەیشتینە باسکردنی سنوری ناوچەی حوکمی زاتی، سەرۆکی وەفدەکەیان، فایەق سامەڕایی بو، من گوتم: "مادام ئێوە مامۆستا فایەق سامەڕایتان بە حەکەم قبوڵە، بۆ مەسەلەی سنوری کوردستان، ئەوا منیش ئەوم قبوڵە، بەناوی وەفدی کوردییەوە رایدەگەیەنم، ئەو ئەکەین بە حەکەم".

خەریک بو ئەو قسە بکات، من گوتم: تۆ قسەی خۆت لە شوێنێکی تر کردوە، چونکە فواد رکابی دەقی ئەو موزەکەرەیەی دابومێ کە فواد رکابی و فایەق سامەڕایی پێکەوە لەگەڵ کۆمەڵێک لە شەخسیاتی قەومی عەرەبی لە قاهیرە

لەسەر مەسەلەی کورد دابویان بە عەبدولناسر.

من موزەکەرەکەم دەرهێنا و گوتم: "ئەمە ئەو موزەکەرەیەیە، مامۆستا فایەق سامەڕائی لەجیاتی ئەوان ئیمزای کردوە، خۆی ئەڵێ کە سنوری کوردستان لە (جەبەل حەمرین)ەوە دەست پێ ئەکات هەتا خواروی مەندەلی".

گوتیان: نابێ، گوتم: "چۆن ئەی نەتانگوت ئێمە رازین بە مامۆستا فایەق سامەڕایی، ئەوە ئیمزای خۆیەتی" گوتیان: با ئەو وای گوتبێت، منیش گوتم: "ئەوە نوسراوەتەوە، ئەوە یاداشتە بۆ سەرۆک عەبدولناسر بوە، بۆ گاڵتە نیە! من لای عەبدولناسریش هەمان هەڵوێستم هەبوە و باسمکردوە، ئێمە شتێک داوا ئەکەین کە قەومیەکانی عەرەب پێش ئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست سەلماندویانە، ئێستا کە هاتونەتە سەر حوکم خەریکن لێی پەشیمان ئەبنەوە! ئەوە بۆچون و بیروباوەرەکەیانە"، زۆرم ئیحراجکردن، لە کۆتاییدا نەئەوان بۆچونی فایەق سامەڕائیان قبوڵکرد و نە ئێمەش بۆچونی ئەوانمان پێ قبوڵبو.

مەسەلەکەیان بە ئەنقەست دواخست و هەر ئەیانهێنا و ئەیانبرد، ڕۆژێک بانگیان کردین بۆلای عەلی ساڵح سەعدی، هەرچەندە ئەو لەو دوایەدا بوبو بە دۆستمان و زۆر پەشیمان بوبوەوە لەو هەڵوێستانەی پێشوی، بەشەخسیش لەگەڵ من زۆر دۆست بو.

کاتی خۆی چومە لای کە وەزیری ناوخۆبو، لەپشتی کورسیەکەی دانیشتبو لەبەرمان هەڵنەستا، ساڵح مەهدی عماشیش دانیشتبو، ئەو لەبەرمان هەڵنەستا، بەراستی منیش نەچوم تەوقەی لەگەڵ بکەم و ڕۆیشتم لە کورسیەکی سەرەوە دانیشتم، هەندێک برادەرانی تر وەکو منیانکرد، ئەوانی تر، بەتایبەتی رەشید عارف و هەندێکی تر، تەوقەیان لەگەڵ کرد.

من قاچم خستەسەر قاچ و بۆی دانیشتم، بە شێوەیەکی زۆر مەغرورانەوە دەستی پێکرد و گوتی: "ئێمە چەندجار پێمان گوتون، ئێمە دۆست و دوژمنی خۆمان دیاری کردوە، وڵاتانی شیوعی دوژمنی ئێمەن"، منیش گوتم: "ئێمە داخوازی خۆمان هەیە، داوای مافی ئۆتۆنۆمی ئەکەین، ڕێککەوتنامەیەک لەنێوان ئێمە و ئێوەدا مۆرکراوە، کاتی خۆی تۆ لەگەڵ مامۆستا ساڵح یوسفی ڕێکەوتون"، ئەوکاتە تاهیر یەحیا لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ڕێکەوتبون.

گوتم: "ئێمە هەمومان خەریکین دەگەینە ئەنجامێک، تۆ بەرەو مەوزوعێکی لابەلاو و لاوەکی ئەیبەیت و بە مەسەلەی لاوەکیەوە مشغوڵمان ئەکەیت"، ئەویش گوتی "نەخێر ئەوە مەسەلەی سەرەکییە لای ئێمە، هەتا ئێوە هەڵوێستی خۆتان

دیاری نەکەن، ئێمە هیچ ناکەین".

منیش گوتم: "نەخێر، ئەوە هیچ مەسەلەی سەرەکی نیە، ئەوە مەسەلەیەکی لاوەکییە"، قسەیەک لەو، قسەیەک لە من، گفتوگۆکە توندبو، منیش گوتم: "کەواتە ئێوە ناتانەوێت بە ئاشتی مەسەلەی کورد چارەسەر بکەن و ناتانەوێت بە رێگای سیاسی مەسەلەکە چارەبکەن، دیارە نیازی خراپتان هەیە، بەتەمان بەشەڕ چارەسەری بکەن، بەڵام بە هەڵەدا چون، مەسەلەی میللی بەشەڕ چارەسەر ناکرێت، گەلی کوردیش خەڵکی بەغدا نیە بەکڵاو بیگرن، ئەو هەمو شاخ و داخ و دۆڵەمان هەیە، مێژوش دەری خستوە، کە ئێمە بەهێز لەناوناچین".

خەریک بو عەلی ساڵح سەعدی قسە بکات، ساڵح مهدی عماش قۆستیەوە و دەستی کرد بە قسەی باش و گوتی: "کاکە ئێمە ئەو نیازەمان نییە، ئێمە تەنها هەوڵی لە ناوبردنی یەک زەلاممان داوە کە کەریم قاسمە، ئێستا بوە بە خاڵی سلبی لەسەرمان، ئەڵێن وایە و وایە، پێمان ئەڵێن، ئەمانە پیاوکوژن، ئەگەر هەوڵی کوشتنی میللەتێکی وەکو کورد بدەین، ئەوساتە چیمان پێ ئەڵێن، ئێمە بیروباوەڕ ناکوژین و بە کاری خۆمانی نازانین، ئەوکارانە لە بیروباوەری ئێمەوە دورە، پاشان ئێمە لەگەڵ ئەو رەئیەدا نین، ئێمە ئەمانەوێت چارەسەری گیروگرفتەکان بکەین و پەیمانمانداوە، کە ئەو رێککەوتنامانەی لە نێوانماندا هەیە جێبەجێی بکەین".

روی تێکردم و گوتی: "ئەو رۆژەت لە بیرە، خۆم پێم گوتی، ئێمە سیغەی حوکمی زاتی قبوڵ ئەکەین، تۆ سیغەیەک بنوسە ئێمە بۆت ئیمزا ئەکەین، بەڵام شەش مانگمان لێ راوەستن، مەسەلەکە پەیوەندی بەکاتەوە هەیە"؟.

ئەو بە پێچەوانەوە بایدایەوە، کۆبونەوەکەی ئاسایی کردەوە و دەستمان بە گفتوگۆکردەوە، گوتیان: باشە سبەینێ وەفدێکی تر دائەنێین، لەبەرئەوەی ئێوە لە گەڵ مامۆستا علی ساڵح ناتوانن بگەنە ئەنجام. سبەینێ وەفدێکی تریان بە سەرۆکایەتی حازم جواد وەکیلی وەزیری دەرەوە دانا.

*** ئایا مانەوەتان لە بەغدا و ئەوکۆبونەوانە هیچ ئەنجامێکی هەبو؟**

- زۆر کەم، ئێمە سەرۆکی وەفدی تازەمان بینی و گوتی: "وەڵڵاهی کاکە بەرەئی خۆم هەر ئەوەیە، جارەکەی تر پێمگوتن، من لەگەڵ جمهوریەتی کوردستانی ئیشتیراکیم، من گیروگرفتم لەسەر حوکمی زاتی نییە، موشکیلەکە ئەوەیە کەی و چۆن جێبەجێ ئەکرێت؟ ئەگینا وەک ئەزانن ئەمەوێت، حوکمی جمهوریەتی

کوردستانی ئیشتیراکی بێتەکایەوە، من پشتگیری ئەکەم، بەڵام ئەوە حیزب و دەوڵەتی ئێمەیە، مەجلیسی قیادەی سەورە رازی نین لەسەر ئەو ناوەرۆکەی، مەلا مستەفا پێشکەشی کردون، پێیان باشنیە، ئێمە ئەمانەوێت ماوەیەکمان بدەنێ بۆ جێبەجێکردنی"، منیش گوتم: "باشە پێمان بڵێن چۆن چارەسەریی بکەین؟ ئێستا ئەڵێن شەش مانگمان پێویستە، بە هەمان شێوەش پێمان بڵێن چیتان قبوڵە و چیتان قبوڵنیە لەو داخوازیەی کە مەلا مستەفا پێشکەشی کردون، تا ئێمەش لەو روانگەیەوە وەزعی خۆمان بزانین"، گوتی باشە ئەوە قسەیەکی مەعقولە.

ئەوان وەفدێکیان دروستکرد بۆئەوەی سیغەیەک ئامادەبکەن و وەڵاممان بدەنەوە.

*** لەو ماوەیەی کە لە بەغدا بون، بۆ هەوڵی پەیوەندیتان نەدا لەگەڵ هێز و شەخسیاتی تری عێراقی؟**

-چۆن هەوڵمان نەدا، ئێمە لەو کاتانەدا کە لە بەغدا بوین سەردانی زۆر کەسایەتیمان کرد، لەوانە سەردانی کامل چادرچیمان کرد، لە ماڵی خۆیان، لەوێ نوکتە مەشهورەکە بڵاو بۆوە کامل چادرچی لە رەشید عارفی پرسی "آنتم تطالبون موصل"، ئەویش گوتی: لاوەڵا.

ئیتر لەدوای ئەوە زۆر رێزمان گرت، موجامەلاتمان کرد و سڵاوی مەلا مستەفا و مامۆستا ئیبراهیم و برادەرانی ترمان پێراگەیاندن، دواییش لە ئوتیل سەردانی کردین، هەروەها سەردانی مەهدی کوببەمان کرد، لە سەردانە گرنگەکاندا چوین سەردانی ئایاتوڵڵای عوزما سەید موحسین ئەلحەکیمان کرد، ئەو کاتە سەید موحسین ئەلحەکیم ئایاتوڵڵای عوزمای موقەللیدی هەمو شیعەکانی دنیا بو، بەهۆی سەید مەهدی کورییەوە کە بەعسییەکان لە سەرەتای ١٩٨٨ لە سودان کوشتتیان، توانیمان چاومان پێبکەوێت.

ئێمە لە نەجەف سەردانمان کرد، من و دو، سێ کەس چوینە لای سەید موحسین حەکیم، لەوانە کاکە حوسێنی خانەقا، مەلا جەمیلی رۆژبەیانی و زەید ئەحمەد عوسمان، کە چوین زۆر بە گەرمی پێشەوازی لێکردین، ئەو جۆرە کەسانە لە دانیشتنی گشتیدا کەم قسە ئەکەن، بەڵام دوعای خێری بۆ کردین و گوتی: "مافی خۆتانە کە داوای داخوازی خۆتان بکەن، ئێوە میللەتێکی لێقەوماون، ئینشەڵا زوڵمتان لەسەر لائەچێت، پێویستە مافی خۆتان بدرێتێ، شەڕیش لە دژی ئێوە خراپە، کاتی خۆی من دژی ئەوە بوم شەڕ دژی ئێوە بکرێت".

ئێمەش زۆر سوپاسمان کرد، سڵاوی بارزانی، مەکتەبی سیاسی و کوردمان پێگەیاند و گوتمان: "ئێمە ئومێدمان بە کورد و شیعە هەیە، هەمیشە ئێمە برا بوین، هەردولامان زۆڵم لێکراوین، ئێمە لە کوردستان و ئێوە لە خواروی عێراق، هەقە هاوکار و تەبابین". ئەویش زۆری پێباشبو، گوتی گرنگە کە پەیوەندی لە نێوامانـدا دەوام بکات، ئەو پەیوەندیەی لەنێوان مەرحوم بارزانی و سەید حەکیم دا هەبو، هەتا دوایش دەوامی کرد، ئەوە لە ئەنجامی ئەو سەردانە دروستبو، بەلای منەوە ئەو سەردانە کارێکی زۆر باشبو، هەنگاوێکی گرنگ بو، بۆ دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان هەردولادا، پاش ئەوەش ئێمە ماوەیەک لە بەغدا بێ وەلام ماینەوە.

حکومەت وەفدێکیان دروستکرد و چون بۆ قاهیرە، لەو کاتانەشدا یەکێتی سێ قۆڵی نێوان عێراق، سوریا و میسر جولانی تێکەوتبو، وەفدی عێراقی لە سەردانەکەیاندا کەسی کوردیان لەگەڵدانەبو. لەبەرئەوە ئێمە یاداشتێکمان لە ٨ نیسانی ١٩٦٣ دانێ، تێدا بۆچونەکانی خۆمانمان دەربارەی چارەسەری کێشەی کورد خستبوەرو، سیاغەکە مەسعود محەمەد کردبوی.

وەفدەکەمان کۆبونەوەیەکی لە ئوتێل سەمیر ئەمیس کرد، بۆئەوەی کە چی بڵێین، داخوازیەکانمان باش سیاغەکرد، من ئیمزامکردوە لە کتێبەکەمدا (الحركة القومية الكردية) وێنەیەک لەو داخوازیانەی تێدایە کە ئێمە دامان بە کۆبونەوەی (محادثات الوحدة الثلاثية) لەوێدا بە رونی گوتومانە، ئێمە ئەگەر عێراق وەکو خۆی مایەوە، ئەوا حوکمی زاتیمان ئەوێت، بەوە رازی ئەبین کە مەجلسی قیادەی سەورە بریاری لەسەرداوە، چونکە پێشتر مەجلیسی قیادەی سەوەرە، دوای گەڕانەوەی من لە قاهیرە، بەیانێکی دەرکرد و ئەڵێ: "کورد و عەرەب هەر برابون، گەلی کورد لە کۆنەوە مەزلومە و تا ئێستا چەوساوەتەوە، ئێمە دان بە مافی گەلی کورد لەسەر بناغەی لامەرکەزی ئەنێین".

ئەو کاتە، لامەرکەزی سیاسی لە میسریش باسی لێوەئەکرا، لە زەمانی عوسمانیشدا لامەرکەزییەت بریتی بو لە حوکمی زاتی، بەلام ئەوانە نەیاندەویست بڵێن حوکمی زاتی، بەلام مەبەستیان هەمان ناوەرۆک بو.

ئێمە گوتمان، ئەگەر عێراق وەکو خۆی مایەوە، ئەوە حوکمی زاتیمان ئەوێ، ئەگەر عێراق بو بە بەشێک لە (ئیتیحادی فیدرالی عەرەبیی)، ئەوا لامەرکەزیی و حوکمی زاتیەکی راستەقینە و فراوان و باشمان ئەوێ، ئەگەر عێراقیش بو بە بەشێک لە کۆماری عەرەبی یەکگرتو، ئەوا ئێمەش ئەمانەوێت ئیقلیمی چوارەم

بین، وەک ئیقلیمی میسری، سوری، عێراقی و کوردستانی، هەروەها نیشانماندا، ئێمە دژی خواستەکانی میللەتی عەرەب نین، بگرە هەمیشە پشتیوانی ئەوەبوین کە عەرەب مافی خۆی وەربگرێت، یەکێتی خۆی بهێنێتەدی و ویستومانە دەور ببینین بۆ ئاسانکردنی ئەو خواستەی کە دێتە رێی خەباتی نەتەوەی عەرەب لە پێناوی رزگاری و بەدیهێنانی وەحدەی عەرەبیدا.

ئەوەمان نارد بۆ میسر و دامان بە هەمو کوردەکانیش، لەگەڵ سەفارەتی میسریش، لە بەغدا قسەمان کرد و وێنەمان دانێ، ئەوە یەکێک بو لەو کارە گرنگانەی کە لەو سەفەرەدا کردمان.

# پەیوەندی کورد و ئەمەریکا

*** زۆر باس لەوە ئەکرێت، بەعسییەکان بە هاوکاری ئەمریکیەکان هاتونەتە سەر حوکم، ئایا ئەم بۆچونە چەند راستە؟ ئایا ئەمریکییەکان هیچ هەوڵێکیاندا بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ئێوە؟**

- بەڵی هەوڵیاندا، ئەویش بەوجۆرەبو، من رۆژێک لە ئوتێلەکە دانیشتبوم، عەلی حەیدەر سلێمان کە جێگری وەزیری دەرەوەی عێراق بو هات بۆ لام، عەلی حەیدەر سلێمان یەکێک بو لە کەسایەتییە رۆشنبیرەکانی کورد، بە کەفائەتی خۆی پێگەیشتبو. ئەوسەردەمە چەند جار بوبو بە وەزیر و نوێنەری عێراق لە نەتەوەیەکگرتوەکان و سەفیر بو لە واشنتۆن، دواجار بو بە وەزیری دەرەوە، هات بۆلام گوتی: "کاک جەلال ئەمەریکاییەکان بە رەسمی یاداشتێکیان داوە بە حکومەتی عێراق و ئەیانەوێت بێن تۆش ببینن"، منیش گوتم: باشە بەسەرچاو با بێن. رۆژێکمان بۆ دانان، وابزانم رۆژی دواتربو، عەلی حەیدەر سلێمان و دو ئەمریکی هاتن، یەکێکیان ولیەم ئیگلتن و ئەوی تریان جێمس هیکس، ئەو کاتە سکرتێری یەکەم بو لە سەفارەتی ئەمریکی، گوتیان ئەمانەوێت خۆت ببینین، من خۆم لەگەڵیان دانیشتم، پێیان گوتم: "حکومەتی ئەمریکی یاداشتێکی رەسمی داوە بە وەزارەتی دەرەوەی عێراق، بۆت ئەخوێنینەوە، بەڵام ناتدەینێ، ئەتوانی

تێبینی لێوەرگرێت و بینێرێتەوە بۆلای سەرکردایەتی خۆتان".

یاداشتەکە ئەڵێ: "حکومەتی ئەمەریکا خۆشحاڵی خۆی نیشانئەدا لە سەرکەوتنی شوبات و حکومەتی عێراق، بە حکومەتێکی باش و دۆستی خۆی ئەزانێت، رەغبەتی خۆی نیشانئەدا کە ئەو حکومەتە سەر بکەوێت، جێگیر بێت و بمێنێ. بۆئەوەی ئەو مەسەلانە جێبەجێ ببێت، پێویستە مەسەلەی کورد بە شێوەیەکی عاقڵانە چارەسەر بکرێت و حکومەتی عێراق پێویستە بچێتە پێشەوە لێیان"، لەو کاتەوە لەگەڵ ئەو دو پیاوەدا دۆستایەتیم هەیە، زۆرجار لە سەفەرەکانمدا بۆ ئەمەریکا هەردوکیان ئەبینم، یەکێکیان بو بە سەفیر لە سعودیە و لە پاشان بو بە راوێژکاری نیکسۆن لە کۆشکی سپی، ئەوەی تریشیان خانشینە، بەڵام ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی لۆرکیس(٥).

*** هەڵوێستی ئەمەریکا چی بو بەرامبەر بە هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەگەڵ حکومەتدا؟**

– لەو چاوپێکەوتنەدا گوتیان: "پێویستە کوردیش بیر لە شەڕکردنەوە لەگەڵ ئەم حکومەتە نەکاتەوە، ئەگەر شەڕی حکومەت بکاتەوە پشتگیری ئەمەریکای نابێت". بە کورتی نامەکەیان بریتی بو لەوەی، داوا لە هەردولامان ئەکات بە ئاشتی پێکبێین و لەرێگای عەقڵەوە چارەسەری گیروگرفتەکان بکەین(٦).

من سوپاسمکردن کە ئەو زانیاریانەیان داینێ، گوتم: "ئێمە ئەوە بە نیشانەی دۆستایەتی دائەنێن، هیوادارم کە ئەمەریکا گوشار بخاتە سەر حکومەت، بۆئەوەی داخوازیەکانمان بە ئاشتی جێبەجێ بکات، چونکە ئێستا ئێوە کاریگەریتان زۆرە لەسەر حکومەت، خەڵک، حکومەت بە دۆستی نزیکی ئێوە ئەزانێت"، پێکەنی گوتی: "ناوەڵڵا سەیرە خەڵک وائەڵێ"، گوتم: "پێویستە ئێوە هەرچۆنێک بێت گوشار بکەن، ئێمە بەڵێنتان ئەدەینێ شەڕ لە ئێمەوە دەست پێناکات، بەڵام ئێمە ئەترسین عێراق شەڕ بکاتەوە"، بۆم باس کردن کە عێراق چۆنە و چۆن ماوەیەکە گوێمان نادەنێ، ئێمە هاتوینەتە ئێرە هیچ کارێکمان نیە و هەر رۆژە حەواڵە بە گەواڵەیەکمان پێئەکەن، ئەوان خەریکن یەکێتیەکی سێ قۆڵی دەکەن، کەچی نوێنەرێکی ئێمەیان نەبردوە لە وەفدەکەدا بۆئەوەی رەئی خۆمان بدەین و بەشداری بکەین. ئەو قسانەم هەموی بەو شێوەیە بۆ باسکردن، بۆم رونکردنەوە "ئێمە چارەسەری سیاسیمان پێباشە و شەڕ رەتئەکەینەوە، بەڵام ئەگەر شەڕمان پێ بفرۆشن ئەوا شەڕ ئەکەینەوە و بەرگری لە خۆمان ئەکەین، مافی بەرگریی، مافێکی پیرۆزە، باوەڕیش بکەن کە گەلی کورد بە حکومەتی عێراق ناشکێت و لەناوناچێت".

*** دوای ئەو دانیشتن و یەکتر بینینە لەگەڵ شاندی عێراق، ئێوە تاکەی لە بەغدا مانەوە؟**

– کە ئەوان (واتا وەفدی عێراقی) چونە قاهیرە، منیش گەرامەوە کوردستان کە ئەوان هاتنەوە منیش جارێکی تر گەرامەوە بەغدا، ئەمجارە ئەحمەد حەسەن بەکر و ساڵح مەهدی عەماش پێشەوازییان لێکردین، ئەوان ئەو کاتە لایەنە نەرمەکەیان نیشان ئەدا، ئەوانی تر لایەنە توندوتیژەکە بون. هەندێک قسەکرا لەنێوان من و ئەحمەد حەسەن بەکردا، زۆری ئەو قسانە لە کتێبەکانی دانا ئادەم شمید دا نوسراوە، چونکە شەوکەت عەقراویم لەگەڵ بو، ئەویش بۆی گێڕاوەتەوە کە بەمجۆرەبو، ئەحمەد حەسەن بەکر قورئانێکی پێبو، دەستی بە قورئانەکەدا و گوتی: "بەو قورئانە ئێمە نیازمان خراپ نییە لەگەڵ ئێوەدا، پێمان خۆشە بە ئاشتی چارەی گیروگرفتەکان بکەی"، منیش دەستمدا بە قورئانەکەدا و گوتم: "بەو قورئانە ئێوە نیازتان باش نیە لەگەڵ ئێمەدا و خۆتان ئامادەئەکەن بۆشەڕ لەگەڵماند".

# سەفەرێکی تری قاهیرە و تاهیر یەحیا و حکومەت

*** بۆچی ئێوە نەتان توانی لەگەڵ وەفدەکەدا بچن بۆ قاهیرە، کێ ڕێگربو؟**

– مەسەلەکە بەم شێوەیەبو، هەر لەو دانیشتنەدا ڕەخنەم لێگرتن، بۆچی نەتانهێشتوە ئێمە بێین بۆ ئەو دانیشتنە سێ قۆڵیە لە قاهیرە، گوتی: "باشە جا وەرە برۆ کێ ڕێی لێگرتوی"؟ گوتم: "بێنە پاسپۆرتم بدەنێ""، گوتیان: "بەسەرچاو"، دوای چەند ڕۆژێک پەساپۆرتیان بۆکردم و گوتیان: "برۆ تۆش لەگەڵ عەبدولناسر قسەی خۆت بکە، ئێمە لاریمان نییە".

من ئەوەم بە هەل زانی بۆئەوەی بچم بۆلای عەبدولناسر و بزانم کارەکانمان گەیشتۆتە کوێ، لە پاشانیش لە بەغدا بێ هیوا بوبوین، گوتمان بەشکو بەهۆی عەبدولناسرەوە جوڵەیەک بکەوێتە پەیوەندی نێوانمانەوە. جا لێرە شتێکی زۆر

گرنگ هەیە کە تاکو ئێستا قەت باسم نەکردوە و نەم گوتوە، ئەم نهێنییە بۆ تۆی ئەڵیم سەلاحەدین ! ئەمە شتێکی مێژویی زۆر گرنگە.

تاهیر یەحیا، سکرتێرەکەی خۆی نارد، پاسپۆرتەکەمی برد و خروجیەی لێدا، بیتاقەیەکیشی بۆ کڕیبوم، زەرفێکی خستبوە ناوی وابزانم هەزار دیناری تێدابو، بۆ ئەوە منیش تەلەفونم لەگەڵ کرد و گوتم ئەبو زوهێر حەز ئەکەم سکرتێرەکەت بنێریت، سکرتێرەکەی نارد و زەرفەکەم بۆ ناردەوە و سوپاسی بیتاقەکەم کرد، دوایی تەلەفۆنی بۆکردم و گوتی: حەز ئەکەم یەکتر ببینن، گوتم: زۆرباشە، هات بۆلام بۆ ئوتێل و بە تەنیا جیای کردمەوە و گوتی: "من وەکو رەفیق لەگەڵ تۆ تەسەڕوف ئەکەم، بە شەرەفم من، تۆ بە برادەری خۆمان ئەزانم، من خۆم بە دۆست ئەزانم، من خۆم کوردم، عەبدولناسریشم خۆش ئەوێت، ئەزانم تۆش عەبدولناسرت خۆش ئەوێت، من لەگەڵ ئەم حکومەتە نیم، لەگەڵ نەهجیان نیم، بەڵگەی ئەوەش کە بڕوام بە تۆیە، ئەو راسپاردەیەم هەیە بۆم ئەبەی بۆ عەبدولناسر"؟ گوتم بەسەرچاو، وتی بەشکو بە عەبدولناسر بڵێی، ڕستەیەکی پێ لەبەرکردم، عەبدولناسریش دوجار پێی گوتمەوە کە بۆی تەئکید بکەم، ماناکەی ئەوەبو، ئەو لەگەڵ ئەو حکومەتە نییە، خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ ڕۆژێک لێی رزگار بن، ئەوان هەر دۆست و دڵسۆزی عبدولناسرن، ئەو حکومەتە نیەتی لەگەڵ عبدولناسر باش نیە، بە هەمان شێوە لەگەڵ کوردیش.

*** رستەکە چی بو؟**

– دەقەکەم بیرنەماوە کە چوم بۆ قاهیرە شەوکەت عەقراویم لەگەڵهات، لە لوبنان یەکمانگرتەوە، لەوێ خۆی تێوەگلاند، شەوکەت عەقراوی ڕەحمەتی لێبێت هەرچۆنێک بو، بە زۆری زۆردار خۆی تێوەگلاند و لە لوبنانەوە لەگەڵمهات بۆ قاهیرە بەناوی ئەوەی با بەتەنیا نەبم! کە چومە قاهیرە سەرەتای مانگی مایس بو، عەبدولناسر زۆر مەشغوڵ بو، خەبەری بۆ ناردین کە ئەو زۆر مەشغوڵە، ئەچێتە ئەسکەندەریە، کۆنگرەی وڵاتانی عەرەبی هەبو لەوێ، پاشان دەچێتە ئەدیس ئەبابا، لەوێ کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقی هەبو، گوتی: ئەگەر ئەو زۆر پەلەیەتی، ئەوە بە عەبدولحەکیم عامرم گوتوە، خۆ ئەگەر پەلەشی نییە کە هاتمەوە خۆم لە کۆتایی مانگی ئابدا ئەیبینم، دادەنیشین، ئەو ماوەیە با لە قاهیرە ئیستراحەت بکات.

منیش کە عەبدولمەجید فەرید هەواڵەکەی بۆ هێنام، ئەو ماوەیەک لەمەوپێش

دراساتی عەرەبی دانا لە لەندەن و پارەی لە حکومەتی عێراقی وەردەگرت و بۆتە دۆستی عێراق. ئەو کاتە سکرتێری عەبدولناسر بو، هەواڵەکەی بۆ هێنام پێم گوت: "کابرایەکی کورد لێیان پرسی گوتیان خورما ئەخۆیت یا مێوژ، گوتی من خورمژ، واتا هەردوکیانم ئەوێت، لەبەرئەوە منیش هەم ئەوەی موشیر عەبدولحەکیم عامرم قبوڵە و هەم چاوەڕێ ئەکەم تا سەرۆک بێتەوە، واتا منیش خورمژم پێ باشە"، گوتی زۆر باشە چوین موشیر عەبدولحەکیم عامرمان لە ماڵی خۆی بینی، زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردین، زۆر عەتفی هەبو لەسەر کورد، گوتی: "ئەو بەعسییە ساختەچییانە درۆ دەکەن، هیچتان نادەنێ، بەڵام ئێوە شەڕ مەکەنەوە، ئاشتیخوازبن، با لێپرسراوێتی لە بەرامبەر نەتەوەی عەرەب و جیهان لە ئەستۆی ئەوان بێت، ئەگینا منیش گەیشتومەتە ئەو قەناعەتەی هیچتان نادەنێ و نیەتیشیان باش نیە لەگەڵتاندا".

منیش لە قاهیرە مامەوە، لەو ماوەیەدا لە قاهیرە دو شتی گرنگ لە ژیانمدا رویدا، یەکێکیان محەمەد حیلمی پاشام دیت کە شەخسیەتێکی کوردی مەشهوری تورکیا بو. کاتی خۆی وەزیر بوە لە دەوڵەتی عوسمانلیدا، و پاشان بە ناوی کوردەوە لە چلوحەوتدا یاداشتی دابو بە نەتەوە یەکگرتوەکان و داوای مافی کوردی کردبو، هەروەها ئەو خزمی عائیلەی مالیکە بو لە میسر، لەوێ مابوەوە، گەلێک کتێب و شتی هەبو داینێ، دوهەمیش کوڕەکانی محەمەد عەلی عەونی یەکێکیان ناوی سەلاحەدین و یەکێکیان ناوی عسامەدینە، خوشکێکیان هەیە ناوی دوڕیەخان (دوریە عەونی)، ئەوانیشمان بینی، کۆمەلێک کتێبیان داینێ، بەداخەوە کەوتنە لای شەوکەت عەقراوی و نازانم چی لەو کتێبانە کرد کە چاکترین بەڵگەنامەی مێژویی بون.

ئەوکاتە خەریکی نوسینی ئەوکتێبە بوم کە دوایی بەناوی (کوردستان و بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد)ەوە دەرچو، ئەو کتێبە لە ئەنجامی ئەوەوە نوسرا کە تەماشام کرد، عەرەب زۆر کەم دەربارەی کورد ئەزانن، بەتایبەتی کە فواد رکابیم بینی، باسی ئەوەکرا، کە پێویستە کتێبێک بنوسرێت، کە مەسەلەی کورد لە عەرەب بگەیەنێت و مەسەلەکە بەشێوەیەکی واقعی و ڕاست و ڕەوان و دیموکراسیانە و پێشکەوتوخوازانە باس بکات.

ئەو ماوەیەی کە من لە قاهیرە بوم، وەفدی کوردی لەبەغدا مابۆوە، حکومەت هەر دەستی پێ ئەکردن، وەفدی حکومەت پرۆژەیەکی دابونێ کە ناوەرۆکەکەی زۆر بەتاڵبو، هیچ باسی لە مەسەلەی رەوای کورد نەئەکرد، زیاتر

باسی لە لامەرکەزی ئیداری ئەکرد، باسی لامەرکەزی سیاسی تێدانەبو. لەبەرئەوە وردە وردە برادەران لەوێ تەنگاو بوبون و ناچاربون کە وردە وردە خۆیان بدزنەوە، چونکە ئەترسان نەوەک حکومەت شەڕ بکاتەوە و بیان گرێت، بۆیە هەندێکیان مابونەوە و هەندێکیشیان گەڕابونەوە بۆ کوردستان.

کە لەقاهیرە بوم عەبدولناسر هاتەوە و ناردی بە دوامدا، شەوکەت عەقراویشم لەگەڵدابو، وابزانم (٢٩ یان ٣٠ ی مایس بو) لەوێ بۆچونی خۆمانم بۆ عەبدولناسر باسکرد، باسی وەزعی گفتوگۆشم بۆ کرد، چیکراوە و چۆن بوە؟ هەروەها ترسی خۆمانم نیشاندا کە حکومەت بەتەمای شەڕکردنەوەیە کە من لێبومەوە عەبدولناسر گوتی: "من هەمو قسەکانی تۆم پێ باشە، من ئەزانم ئەوان هەڵوێستیان خراپە و باش نیە لەگەڵتاندا"، بەبیری هێنامەوە و گوتی: "کاتی خۆی تۆ هاتیت بۆ لای من و گوتت، ئەوانە بیانوی ئەوە ئەگرن ئەڵێن ئێمە ناوێرین مافی کورد بدەین، چونکە عەبدولناسر ئیتهاممان ئەکات و دژمان ئەوەستێت" منیش پێم نەگوتی کە بچۆ بۆیان باس بکە، ئایا پێت گوتن"؟ منیش گوتم: بەڵێ.

پێشنیازەکانی ناسر ئەوەبون، با ئەوان لەسەر سیغەی حوکمی زاتی لەگەڵ ئێوە بگەنە ئەنجامێک، هەردولاتان ئیمزای بکەن، بەڵام رای مەگەیەنن، ئەو کاتە وەرن بۆ قاهیرە، منیش لای خۆمەوە ئیمزای ئەکەم و ئیعلانی ئەکەم و تەئیدی خۆشم دەرئەبڕم بۆ ئەو رێککەوتنە، بۆئەوەی ئەو بیانوەیان ببڕم.

منیش گوتم: من ئەوەم بۆ گێڕانەوە، بەڵام هیچ سودی نەبو، ناسریش گوتی: "ئەوان راست ناکەن، نە لەمەسەلەی وەحدەی عەرەبی راست ئەکەن، نە لەمەسەلەی چارەسەری سیاسی مەسەلەی کورد راست ئەکەن، بەداخەوە ئەوانە لە روانگەیەکی تەسکی حیزبایەتییەوە ئەڕواننە مەسەلەکان، ئەیانەوێت سوریا و عێراق و میسر بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، گوتیشی من ترسم هەیە لەشەڕبونەوە، بەڵام داوام لە ئێوە ئەوەیە، ئێوە شەڕنەکەنەوە، با ئەوان دەست پێشکەربن".

*** وەک باسی دەکەیت، ناسر، پشتگیری چارەسەری مەسەلەی کورد بوە؟**

- ئەوە راستە، بۆ راستی ئەوەش، ئەو گوتی: من هەندێک ئامۆژگاریم هەیە بۆ تۆ، "من پشتگیریی ئەوە ئەکەم، حوکمی زاتیتان بدەنێ، ئەوە مافی خۆتانە، بە بۆچونی من، مەسەلەی کورد لە حوکمی زاتی گەورەترە، گەلی کورد راستییەکی مێژوییە"، هەزار رەحمەتی لێبێت شەوکەت عەقراوی ئەوەی زۆر ئەگێڕایەوە کە ناسر گوتی: "چۆن روباری نیل حەقیقەتێکی جوگرافیە و واقعێکە، ناتوانرێت

ئینکاری لێبکرێت، ئاوەهاش گەلی کوردی حەقیقەتێکی تەئریخییە کەس ناتوانێت ئینکاری لێبکات".

گوتی: "من پێموایە، چارەسەری مەسەلەی کورد بە مافی چارەنوس ئەکرێت". نمونەی یۆگوسلافیای هێنایەوە و گوتی: یۆگوسلافیا نمونەیەکە کە کۆماری یەکگرتو ئەتوانن پێکەوە بژین، ئێستا ئەوکاتە هاتوە:

یەکەم: باش ئەبێت تۆ بچیت بۆ بێروت، کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی بگریت، ئێمەش یارمەتیت ئەدەین، چەند ڕاستیەک بۆ گەلی عەرەب دەربخەن و نیشانی بدەن، کە ئێوە ئەتانەوێت بە ئاشتی مەسەلەکەتان چارەسەر بکەن، ناتانەوێت شەڕ دەست پێبکەنەوە و شەڕتان ڕاگرتوە و دەست پێشکەری شەڕ ناکەن.

دوەم: ئێوە پێویستە هەمیشە رایبگەیەنن، دژی قەومی عەرەبی نین، پشتیوانی قەومی عەرەبین.

سێیەم: ئێوە کۆسپ نین لەڕێگای یەکێتی عەرەبی، بەڵکو لایەنگریی یەکێتی عەرەبین.

چوارەم: بەراوردێک بکە لە نێوان ئێوە و ئیسرائیلدا، چونکە ئەوان ئەیانەوێت هەندێ ئەوهام بخەنە مێشکی عەرەبەوە، تۆ هەوڵبدە باسی ئەوە بکەی، ئێوە جیاوازیتان هەیە لەگەڵ ئەواندا، ئێوە میللەتێکی موسڵمانن، ئەوان ئەوەنین، ئێوە گەلێکی رەسەنن، ئەوان هاتون و وافدن، ئێوە هەزاران ساڵە لەسەر خاکی خۆتانن، بەڵام ئەوان داگیرکەرن و بە زۆر مستەعمەرات دروست ئەکەن، پاشان ئێوە دۆست و پشتیوانی عەرەبن، ئەوان دوژمنی عەرەبن". ئەو، ئەو ئامۆژگاریانەی کردم، منیش زۆر مەمنونی بوم و گوتم: ئامۆژگاریەکانت زۆر چاکن و زۆر سوپاسمکرد و هاتمە دەرێ.

*** لەو کاتەی کە یەکێتی نێوان سوریا و میسر و عێراق ڕاگەیەنرا و لەوکاتدا کە ئێوە لە میسر بون، سوریا هێزێکی سەربازی بە سەرۆکایەتی (فهد الشاعر) نارد بۆ هێرشکردنە سەر کوردستان، بۆ هاوکاری سوپای عێراق. ئایا ئەم دۆستایەتیەی میسر و دوژمنایەتیەی سوریا بەرامبەر بە گەلی کورد،چۆن ڕێک ئەکەوت؟**

- میسر ئەوەندە دۆستی کورد نەبو کە لە بەرخاتری کورد واز لە عەرەب بهێنێت، میسر لەگەڵ ئەوەبو کە کورد مافی خۆی لە چوارچێوەی وڵاتێکی عەرەبی و لە چوارچێوەی یەکێتی عەرەبیدا بەدەست بهێنێت.

میسر، دژی شەڕ بو لەگەڵ کورد، دژی ئەوەبو کە بەعس شەڕی کوردی

کردوە، هەروەها دژی ئەوەبو کە سوریا سوپای ناردوە بۆ کوردستان، من چەند شایەتێکم هەیە لە قاهیرە، من و شەوکەت عەقراوی پێکەوە عەبدولناسرمان بینی، کێشەکەمان بۆ باسکرد، خۆی ناسر گوتی: "مەچۆرەوە بۆ بەغدا، چونکە ئێمە زانیاریمان هەیە کە وەفدەکەتان ئەگرن و ئەگەر تۆش بگرن، ئەوا ئەتکوژن".

ئەگەر ئامۆژگاری ناسر نەبوایە، رەنگ بو ئێمە بگەڕاینەوە بۆ بەغدا، بێگومان لەوێ توشی گیروگرفت ئەبوین.

هەروەها ناسر لە سەفەری یەکممدا، کە فواد عارفمان لەگەڵ بو، گوتی: "من پشتیوانی ئەوە ئەکەم، کە کورد حوکمی زاتی وەربگرێت" و لەبەرچاوی رۆژنامەنوسەکاندا پشتگیری داخوازیەکانی وەفدی کوردی کرد.

*** تۆ بۆ نەگەڕایتەوە بۆ بەغدا؟ بۆ لە قاهیرەوە سەفەری دەرەوەتکرد؟**

- لەبەرئەوەی رۆژی دوەم ئەمین هوەیدی کە سەفیری میسر بو لە بەغدا، هات بۆ لام و پێ گوتم، رەئیس عەبدولناسر ئەڵێت "نەچێتەوە بەغدا، چونکە زانیاریمان هەیە، ئەگەر بچێتەوە بەغدا ئەوە بەند ئەکرێت و ئەکوژرێت".

من لە ١ی حوزەیران گەیشتمە بێروت، لەسەر پێشنیازەکەی عەبدولناسر لە ئوتێل برستل، هیشام ئەبو زەهر و چەند رۆژنامەنوسێکی ناسری کۆنگرەیەکی رۆژنامەنوسیان بۆ ئامادەکردم، بە ئامادەبونی٨٠ رۆژنامەنوس، قسەم بۆکردن، بەیانێکم بڵاوکردەوە وەک ئەوەی، عەبدولناسر پێی گوتبوم، تێدا باسی مافی گەلی کورد و چەوساوەیی گەلی کورد و خەباتیم رونکردبۆوە، بۆچی گەلی کورد خەبات ئەکات، بۆچی داننان بە مافی گەلی کوردا، ئەبێتە هۆی بەتینکردنی دۆستایەتی و برایەتی نێوان کورد و عەرەب و ئەبێتە هۆی بەهێزکردنی یەکێتی نیشتمانی.

هەر لە میسر عەبدولناسر پێی گوتم، من بە برادەرانی خۆمان بڵێم کە بە مەلا مستەفا بڵێن: نەوەکا بە وەعدی شای ئێران هەڵبخەڵەتێت! چونکە "ئەوەی شا ئەیدا بە کورد، ژەهرە لەناو نوقوڵدایە، ئاگاتان لە خۆتان بێت نەکەونە داوی ئێرانەوە، ئەنجامەکەی کارێکی خراپ ئەبێت بۆتان"؟.

من لە بەیروت بوم، هەواڵیان دامێ کە نەگەڕێمەوە بۆ بەغدا، لەوێشەوە بەهەمان شێوە هەواڵم بۆهات، جا بڵێ چی؟ (آغرب الغرائب) چیە؟

رۆژێک من لە بەیروت ئەگەڕام، دوکتۆر نورەدین بابان لەوێ دکتۆر بو،

دۆستێکی قەدیمم بو، پیاوێکی بەرێز و تیکۆشەربو، هات گوتی: "جەنەڕاڵ تەیموری بەختیار لێت ئەگەڕێت"، جەنەڕاڵ تەیموری سالآنێکی زۆر سەرۆکی ساڤاک بو. ئەویش هەڵهاتبو، بوبو بە موعارەز و هاتبوە لوبنان، لەوێ چو بۆ بەغدا بۆ زیارەتی نەجەف و کەربەلا، لەوێوە هاتبۆوە بۆ لوبنان، تومەز لە بەغدا ساڵح یوسفی دیوە، سالح یوسفیش کاغەزێکی پێداناردوە بۆ من. زەمانە چەند سەیرە و عەنتیکەیە! مەسئولی ساواکی ئێران، جەنەڕاڵ تەیمور بەختیار بوبو بە تەتەری پارتی و نامەی ساڵح یوسفی بێنێ بۆ جەلال تاڵەبانی! وەڵڵا ئیتر چومە لای و نامەکەم لێوەرگرتو و ئەویشم ناسی، چەند جارێک یەکترمان بینیوە[٧].

ساڵح یوسفی لە نامەکەیدا نوسیویەتی "ئێمە لەمەترسیداین و تۆش بە هیچ جۆرێک مەیەرەوە"، من بەناچاری لە بەیروتەوە ئیعلانمکرد، ئەچم بۆ ئەوروپا، لە سەرەتادا چوم بۆ ڤیەننا، لەوێ بوم کە حکومەتی عێراق ئیعلانی شەری دژی کورد و شەڕی ئیبادەی ئیعلان کرد، بەوجۆرە شەڕ هەڵگیرسایەوە و ئیتر گفتوگۆی ئێمە و بەعسییەکان شکستی هێنا.

## دەستپێکردنەوەی شەڕ و پشتگیری جیهانیی بۆ کورد

*** بەدەست پێکردنەوەی شەڕ لەکوردستاندا، مەسەلەی کوردی چوە ئاستێکی جیهانییەوە، وڵاتانی سۆسیالیست بەئاشکرا پشتگیری مەسەلەی کوردیانکرد، کۆمۆنیستەکان هاتنە کوردستان، لە ئەنجامدا کۆماری مەنگۆلیا لەسەر داوای یەکێتی سۆڤێت مەسەلەی کوردی هێنایە نێو ئەجێندەی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە، ئایا توانرا سود لەو هەلە جیهانییە وەربگیرێت؟**

– بەڵێ، وەڵڵا کاک سلاحەدین ئەوەی راست بێت ئەوە، سەرەتای بە نێودەوڵەتبونی مەسەلەی کوردبو، ئێمە پێش دەستپێکردنەوەی شەر و پاش روخانی عەبدولکەریم قاسم، بۆ یەکەمجار من و ساڵح یوسفی چوینە بەغدا و زۆر رۆژنامەنوسی عێراقی، عەرەبی و بێگانە هاتن بۆلامان، هەموی ئەیانویست

بزانن هەڵوێستی شۆڕشی کوردستان چیە و ئێمە هەڵوێستمان چیە بەرامبەر بە حکومەتی تازە، هەروەها ئەیانویست بزانن، ئایا ئەو گفتوگۆیەی ئێمە بەکوێ ئەگات؟ لەبەرئەوە ڕۆژانە دەیان ڕۆژنامەنوسمان ئەبینی، بەڕاستی کۆمەڵێکی زۆریش لەو ڕۆژنامەنوسانە ڕێگەدران لەلایەن حکومەتەوە بچن بۆ لای مەلا مستەفا . زوربەی ئەوانیش چاوپێکەوتنیان لەگەڵیدا سازئەکرد و دەنگوباسەکانیان ئەگەیاندە دەرەوە، مەسەلەی کورد بە ئاشکرا و بەفراوانی لەدنیادا دەنگی دایەوە .

هۆی دوەمی ئەو تەقینەوەیەی دەنگوباسی شۆڕشی کوردستان لەدەرەوەدا، ئەو کوشتارە بو، بەرامبەر بە کۆمۆنیستەکان کرا، ئەوەش بوەهۆی ئەوەی هەمو ولاتانی ئیشتراکی، هەمو ئەحزابی شیوعی، زۆر بەتوندی ئیدانەی حکومەتی عێراقی بکەن، لەبەرئەوە هەمو دەزگاکانی راگەیاندنی ولاتانی ئیشتراکی، ڕۆژانە باسی عێراق و کوشتنی شیوعی و خەڵکانی دیموکرات و شەڕی دژ بە کورد و خەباتی کوردیان ئەکرد و سەرباسی رۆژانەی رۆژنامەکان بو لە زوربەی وڵاتاندا(٨).

*** ئایا شەڕی دژی گەلی کورد بە تایبەتی و شیوعی بە گشتی، وەک پێویست لە دنیادا دەنگی دابۆوە؟**

– بێگومان، چۆن لە کاتی هەڵەبجە زۆر بە خەستی باس لە مەسەلەی کورد و خەباتی عادیلانە و دژایەتی رژێم ئەکرا، ئەو کاتەش لەوە خەستتر و فراونتر باسی مەسەلەی کورد ئەکرا، هەمو ئەحزابە شیوعییەکان، رۆژنامەکانیان لە ئەوروپا بە توندی و بە خەستی و بەفراوانی باسی مەسەلەی عێراق و کوردیان ئەکرد، خۆشت ئەزانی ولاتانی ئیشتراکی و ئەحزابی شیوعی و ئەو رێکخراوانەی سەر بەوان بون، وەک لاوان، ئافرەتان، کرێکاران و قوتابیان هەمویان بەیەک دەنگ سیاسەتی دژایەتی بەغدایان پەیرەو ئەکرد.

ئەوە دەنگێکی گەورەی دابۆوە، رۆژنامە گەورەکانی دنیا بەڕاستی ئیهتمامیان بەمەسەلەی کورد دەدا، بۆ نمونە مەسەلەن نیویۆرک تایمز پێشتر دانا ئادەم شمیدتی ناردبو بۆ کوردستان، لەپاش روخانی عەبدولکەریم قاسم جارێکی تر ناردیەوە، رۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی، رۆژنامەنوسی ناودار ئێرک رۆلۆی بۆ کوردستان ناردبو کە عەبدولکەریم قاسم روخا، ئێرک رۆلۆ لای ئێمە بو، لە ئێرانەوە بە قاچاغ هاتبو، دوایی بەنهێنی لەگەڵ خۆماندا بردمان بۆ بەغدا.

ڕۆژنامەی لۆفیگارۆی فەرەنسیش نوێنەری لەوێ بو، واتا کەم دەزگای ڕاگەیاندنی ناودار هەبو، کە نوێنەرایەتیان لەوێ نەبوبێت.

## ڕۆڵی یەکێتی سۆڤێت، ئەوروپای ڕۆژئاوا و عەرەب

*** یەکێتی سۆڤێت بە تایبەتی و وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بە گشتی، چ ڕۆڵێکیان بینی بۆ پشتگیری گەلی کورد؟**

– ئێمە لەو کاتەدا گفتوگۆکەمان قبوڵکردبو، ئەمەریکا و سۆڤێتیش ئەم گفتوگۆیەیان پێباشبو، من ئەوکاتە کە گفتوگۆم ئەکرد لەبەغدا، ڕۆژانە لەگەڵ کابرایەکی سۆڤێتی پەیوەندیم هەبو، ئەو کابرا سۆڤێتییە وەکو موستەشاری من وابو، تا پێش ماوەیەکیش هەر مابو ناوی زایدسیف بو، دوایی لە لوبنان بینیمەوە، کە سکرتێری سەفارەتی سۆڤێتی بو.

سۆڤێت بە باشی پشتیوانی مەسەلەی کوردی ئەکرد، پێیان باشبو کە ئێمە لە ڕێگای گفتوگۆوە شتێک بەدەست بهێنین، ئەترسان لەوەی، کە عێراق و تورکیا و ئێران هەمو یەک بگرن و لەناومان بەرن. حکومەتی بەعسی ئەو سەردەمەش زۆر دڕندانە بە گژ خەڵکدا ئەچو[٩].

ئەوکاتە سۆڤێت ئەیویست ئێمە و شۆڕشەکەمان نەفەوتێین، ئەمەریکاش وەک چۆن بۆم باسکردیت، کە لە سەفارەتی ئەمریکییەوە هاتن و پێیان گوتین ئەبێ بەئاشتی چارەسەری کێشەکەمان بکەین، لەهەمان کاتدا سەفیری فەرەنسی و نوێنەرانی ئەڵمانیا و وڵاتانی ئیشتراکی ترم ئەبینی، هەروەها سەفیری چینم بینی، نەختێ قرەقرێشمانبو، چونکە هەڵوێستی لەسەر مەسەلەی کورد باش نەبو و زۆر بەتوندی پشتگیری حکومەتی عێراقی ئەکرد.

لە ئاهەنگێکی سەفارەتی چینی دا، سەفیر هاتەوە لام، ئەوە دوای ئەوەی لە سەفارەت ئەو نەختە قرەقرەمانبو، پێم گوت: هێشتا دژی مافی چارەنوسی گەلانی؟ گوتی نا، تۆ لە من تێنەگەیشتی! گوتم، "با، تۆ ئەو هەڵوێستەی نیشانی دەدەی هەڵوێستی دژایەتی بە مافی چارەنوسی گەلان و هەڵوێستی پشتوانیە لە

حکومەتێکی دیکتاتۆری کە شیوعی ئەکوژێت"، گوتی: "ئەوانە شیوعی نین، ئەوانە ڕێڤیزیۆنستن"! منیش گوتم: "کاکە گیان ئەوانە لەسەر شیوعییەت ئەکوژرێن! حکومەتی عێراق مارکسی لینینی نییە، تابڵێ ئەوانە ڕێڤیزیۆنستن و لایان داوە، ئەوانە بەناوی شیوعی و شیوعییەتەوە ئەکوژرێن". دوای ئەو گفتوگۆیە، خۆی لە ئاهەنگەکە ونکرد. سەفیری فەرەنسی زۆر دۆستانەبو، ڕاسپاردەم بۆ جەنەڕاڵ دیگۆل نارد و گوتی: بەسەرچاو ئەیگەیێنم، دوایی وەڵامی دامەوە، گوتی "ئەو عەتفی هەیە لەسەرتان، پێی خۆشە مەسەلەکەتان سەر بکەوێت". ئەوکاتە ڕۆژانە ڕۆژنامەنوس ئەهاتنە لامان و باسی مەسەلەی کوردیان ئەکرد، هەتا ڕۆژنامەنوسی تورک هاتن وێنەی منیان بڵاوکردبۆوە و باسی کورد و شۆڕشی کوردیشیان بە فراوانی بڵاوئەکردەوە.

*** دۆستایەتی ئێوە لەگەڵ میسر و باسکردنی مەسەلەی کورد لەناو ڕاگەیاندنی عەرەبی لەلایەک و شەڕی ڕژێم بەرامبەر بە کورد لەلایەکی تر، هیچ کاریگەرییەکی نەکردەسەر پەیوەندی میسری - عێراقی؟**

- ئەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم: کە حکومەتی عێراق بەرەسمی ئیحتجاجی کرد لای میسر، لەسەرئەوەی کە ڕۆژنامەی ئەهرام نوسیبوی (شۆڕشی کورد) حکومەت کردی بە هەڵا، محەمەد حەسەنێین هەیکەل وتارێکی ئیفتیتاحی نوسی، وەک وەڵامدانەوەیەک وابو، ئەوەش هەڵایەکی نایەوە.

بێگومان مەسەلەی کورد لە ئەوروپاش دەنگی دابۆوە، لەبەرئەوە من کە هاتم بۆ ئەوروپا زەمینە خۆشبو، بەراستی برادەرانی خۆشمان لەوێ چالاک بون، ئەو وەختە (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا) دەوریان هەبو، بۆ نمونە کە هاتمە ڤیەننا، دکتۆر وریا ئەمین ڕەواندزی و کۆمەڵێک لە برادەرانی تر هاتبون بەپیرمەوە، ڕۆژنامەنوسیان هێنابو، لە فرۆکەخانە تەلەفزیۆن، ڕادیۆ و چەندەها ئاژانسی هەواڵ لەوێ بون و لە ڕاگەیاندنەکاندا بە باشی باسی کێشەی کوردیان کرد و هەر لە نەمسا، چەندین حیزبی جیاجیای ئەوێم بینی.

*** ئەوروپای ڕۆژئاوا هەڵوێستی چی بو بەرامبەر بە مەسەلەی کورد؟**

- کەشەڕ هەڵگیرسایەوە چومەوە پاریس، لەوێش زۆر ڕۆژنامەنوس هاتبونە فرۆکەخانە، جۆرەها وتار دەربارەی کورد نوسراو و سەرنوسەری ڕۆژنامە گەورەکان دەعوەتیان کردم کە نوێنەرەکانیان هاتبون بۆ کوردستان، بۆ نمونە، لەبیرمە،

لەوانەی کە دەعوەتیان بۆ کردبوم، سەرنوسەری رۆژنامەی (لوفیگارۆ) کە بە رۆژنامەیەکی محافیزکار دائەنرێت و رۆژنامەیەکی گەورە و کاریگەرە لە فەرەنسا، سەرنوسەرەکەی بانگهێشتنێکی کۆکتێلی بەبۆنەی منەوە ئامادەکرد، دەیان رۆژنامەنوس و شەخسیاتی فەرەنسی هاتبون. هەروەها سەرنوسەری رۆژنامەی (هومانیتێ)ی پارتی کۆمۆنیستیش (ئیکیافاجۆن) دعوەتێکی بۆ کردم، جۆرێک شامپێنی هێنا گوتی: ئەوە بۆ میوانی زۆر خۆشەویستە، هومانیتێ وەک رۆژنامەی خۆمان وابو، هەمو شتەکانی بۆ بڵاوئەکردینەوە.

سەرنوسەری رۆژنامەی (لۆمۆند) پێشوازیکردم، ئەویش دەعوەتی کردم و بەوبۆنەیەوە، زۆربەی موحەرریری بەشەکانی دەعوەت کردبو، واتا بە گشتی ئیهتمامێکی زۆرمان پێدرا، ئەو کاتە تەنها ئینگلیز رێیان نەدام بچمە ئینگلتەرا و ڤیزەیان نەدامێ، گوتیان تۆ گیروگرفت ئەخەیتە پەیوەندی نێوان ئێمە و عێراقەوە.

بەڵام شتێکی خۆشت بۆ بگێرمەوە، نامەیەکم بۆ (هارۆڵد ویڵسن) نوسی، ئەو کاتە ئەو سەرۆکی پارتی کرێکارانی ئۆپۆزیسیۆن بو، باسی مەسەلەی کوردم تێدا نوسیبو، ئەویش وەڵامێکی زۆر جوانی دامەوە، ئەڵێت: ئێمە لەپەرلەمان باسی مەسەلەکەتان ئەکەین، هەرواش بو، فیعلەن لە پەرلەماندا باسی ئەوەیان کرد کە بۆچی ئینگلتەرا چەک ئەدات بەعێراق، بۆچی ڤیزەیان نەداوە بەمن.

پاش ساڵێکی تر، پارتی کرێکاران هاتنە سەر حوکم[10]، من لە بەرلین بوم، چوم داوای ڤیزەم کرد بۆ ئینگلتەرا، قونسڵەکە پێی گوتم: "من بەو شەرتە فیزەت ئەدەمێ تۆ پەیمان بدەی کە شتێکی وانەکەی پەیوەندی ئێمە و عێراق گیروگرفتی تێ بکەوێت"، منیش گوتم: "من هیچ مەرج قبوڵناکەم، یان ڤیزەم ئەدەیتێ و هەمو سەربەستییەکم هەیە، یان نامەوێت"، ئەویش فیزەی نەدامێ. منیش نامەم بۆ ویڵسن وەک سەرۆک وەزیران نوسی، گوتم: کاتی خۆی لەحکومەتی موحافیزدا فیزەیان نەدامێ، تۆ کاتی خۆی رەخنەت گرت و بەنامە وەڵامت دامەوە. پاش دوسێ رۆژی تر نامەکەی پێ گەیشتبو، قونسل پەیوەندی پێوە کردم، گوتی: ئەمر هاتوە کە فیزەت بدەینێ، بە پێکەنینەوە، لەبەرئەوەی کە شکاتت کردوە!".

لە ئینگلتەرا چالاکی باشمان نواند، ئەندامانی پەرلەمان کۆبونەوەیەکی گەورەیان بۆ رێکخستم. لەوێ لەناو باڵەخانەی پەرلەماندا توشمان بو بەتوشی ویڵسنەوە، منیان پێشکەشکرد، ئەوکاتە گرنگی زۆر هەبو بەمەسەلەی کورد. لەسەر تاسەری دونیادا باسی مەسەلەی کورد ئەکرا، منیش لە ئەوروپا بە هێمنی

و معقولانە باسم لە مەسەلەکە ئەکرد، بەراستی عەبدولناسریش هاوکاری کردین بۆ باسکردنی لەناو دنیای عەرەبدا. هەتا بەرەی موحافزینی عەرەبیش، وەک مەلیک حسێن، پشتگیری کردین، بێگومان ئەوکاتە مەلیک فەیسەڵ هێشتا ئەمیر بو (ئەمیر فەیسەڵ کە دوایی بو بە مەلیکی سعودیە)، ئەمیر فەیسەڵ لە کاکی تۆرابو لە ئەوروپا بو، بەهۆی سەفیرەکەیانەوە لە رۆما پەیوەندیشم بەوەوە کرد، هات بۆ لام بۆ ڤییەنا و لەوێ یەکتریمان بینی.

گرنگی مەسەلەی کورد لەو کاتانەدا، هەمو شوێنێکی گرتبۆوە، بۆ نمونە بۆت بگێرمەوە، کە داوای ڤیزەمکرد بۆ ئەمەریکا، یەکسەر دایانمێ. کۆبونەوەی قوتابیانی کورد هەبو، ئێوارەیەکی کوردی خۆشیان سازکردبو، لەوێدا دو کەس هاتنە ژوەرەوە، قسەیان لەگەڵ سەعدی دزەیی کردبو، گوتبویان، کە ئەیانەوێت کەمال فواد ببینن، دوکەسەکە لە سەفارەتی ئەمریکییەوە هاتبون، گوتیان: "فلانە کەس داوای ڤیزەی کردوە، ئەوە ڤیزەکەی هاتۆتەوە، با سبەینێ بێت یاخود پاسپۆرتەکەیمان بۆ بنێرێت، یان بچێتە فلان جێ و وەری بگرێت". ئەوان لەگەڵم دانیشتن، ئێمەش بەو یادەوە هێنامانە سەر مێزەکەی خۆمان و قسەمان لەگەڵداکردن، گوتیان: "ڤیزەکەت هاتۆتەوە، ئەگەر بچیت، ئەوا لە وەزارەتی دەرەوە ئەتبینن، کۆشکی سپی و سەرۆک ناتوانێت بتبینێ، بەڵام برای سەرۆک، رۆبێرت کەنەدی کە وەزیری داد بو، ئەو ئەتبینێ".

*** ئایا ئەو پەیوەندیانەتان بە ئاگاداری سۆڤێت بو؟ ئایا سەردانی وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەڵاتت کرد؟**

- بەڵێ، ئێمە ئەو کاتە هەمو شتێکمان بەپرسی سۆڤێت ئەکرد، من هاتمە برلینی خۆرهەڵات، لەوێ پێشوازییەکی گەرمیان لێکردم، ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەوانم بینی، (پارتی سۆسیالیستی یەکریزی ئەڵمانیا SED) لە خانویەکی تایبەتی دەرەوەی بەرلینی رۆژهەڵات دایانبەزاندبوین. ئەو کاتە سەد هەزار مارکیان یارمەتی دایێ، گوتیشیان خۆتان سەربەستن، چۆنی سەرف ئەکەن، بەڵام بە مەرجێ لەناو ئەڵمانیای دیموکرات بێت و لێرە شتی پێبکرن.

چیکۆسلۆڤاکیا و ئەڵمانیای دیموکرات گوتیان: "چەند چەکتان پێویستە ئێمە ئامادەین بتاندەینێ، تەنها خۆتان تەئمینی بردنی بکەن". پاشان چومە مۆسکۆ، پێش ئەوەی بچمە مۆسکۆ، رادیۆ و تەلەفزیۆنی مۆسکۆ لەپاریسەوە موقابەلەیان لەگەڵدا کردم کە چومە مۆسکۆش لەوێ هەندێ لێپرسراوم بینی، بەڵام لەوێ

تێگەیشتم، مەسەلەکەی مەنگۆلیا لە نەتەوەیەکگرتوەکان سەرناگرێت، گوتیان: هیچ وڵاتێک نیە پشتگیری بکات، واتا هیچ وڵاتێک ئامادەنەبو پشتگیری داواکەی مەنگۆلیا بکات، لە ئەنجومەنی نەتەوەیەکگرتوەکان بۆ ئیدانەکردنی عێراق.

*** ڕاستە کە تۆ لە حوزەیرانی ١٩٦٣ دا، شمعون پێرست لە پاریس بینیوە؟ هەروەها وەفدێکی پارتی لە مامۆستا براهیم ئەحمەد و عومەر دەبابە و شەمسەدین موفتی سەردانی ئیسرائیلیان کردوە؟**

– هەردو زانیاریەکە ڕاست نین و ئەساسیان نییە، مەسەلەکە بەم شێوەیە بوە:

من ئەوکاتە لە پاریس بوم و سەرۆکی وەفدی کوردی بوم، لەهەر وڵاتێک لە وڵاتەکان یەکێکی ڕوسیم ئەدی بۆ ئەوەی ئیرشاد و نەسیحەتم بکات دەربارەی پەیوەندیەکانم لە دەرەوە، لە پاریسیش سۆڤیەتییەکان یەکێکیان بۆ ئەو مەبەستە بۆ دانابوم.

میر کامیران بەدرخان، ڕۆژێک هات و پێی گوتم: "وەکیلی وەزیری بەرگری ئینگلیز و مەلیک حسێن ئەیانەوێت بتبینن"، منیش گوتم زۆر باشە و پرسم بە سۆڤیەتییەکان کرد، ئەوانیش لاریان نەبو، کە بیانبینم. پاش ماوەیەک کامیران بدرخان هات گوتی: "من سەهو بوم، وەزیری بەرگری ئینگلیز نییە، کە ئەیەوێت بتبینێ، بەڵکو وەزیری بەرگری ئیسرائیلیە"!.

منیش گوتم: "ئەزبەنی پێویستە پرسیار لە وڵات بکەم"، بەڵام من لە کابرای ڕوسم پرسی، ئەویش گوتی: مەیبینە! منیش ئەو وەڵامەم بە کامیران بەدرخان گەیاند، کە "برادەرانی وڵات ڕازی نین بە بینینی"!

*** ئەی دەربارەی سەفەری مامۆستا ئیبراهیم بۆ ئیسرائیل؟**

– ئەوەش ئەسڵی نییە، نە مامۆستا براهیم و نە عومەر دەبابە چاویان بە ئیسرائیل نەکەوتوە، شەمسەدین موفتی لەگەڵ مەلا مستەفا و دکتۆر مەحمود چون بۆ ئیسرائیل، کاتی ئەو سەفەرەی ئەوانیش، ئێمە و مەلا مستەفا لە ناکۆکیدا بوین.

*** ئەی سەفەرەکەی ئەمەریکات چی لێهات؟**

– سەفەری ئەمەریکام نەکرد، بەهۆی ئەوەی کە هیچ وڵاتێک پشتگیریی داخوازی مەنگۆلیای نەکرد لە نەتەوەیەکگرتوەکان، هۆیەکی تریش ئەوە بو، لە کوردستانەوە داوایانکرد بگەڕێمەوە و وەزع خراپە و ئەوجێیەی کە من لێپرسراوی

بوم، گیرابو، هێرشی لەسەربو، گوتیان خۆت بێیتەوە باشە.

ئێستا ئەڵێم بەداخەوە نەچوم و ئەو سەفەرەی ئەمەریکام نەکرد، ئەگەر ئەو سەفەرەم بکردبایە، زۆر کەڵکی ئەبو بۆ مەسەلەی کورد و پێشخستنی مەسەلەکە بۆ سەر مەسرەحی ئەمەریکی و نەتەوەیەکگرتوەکان.

*** لەو کاتەدا دەوری کوردی دەرەوە چی بو بۆ ناساندنی مەسەلەی کورد؟**

- هۆیەکی گرنگ کە مەسەلەی کورد لە ئەوروپا دەنگی دابۆوە، چالاکی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بو، ئەوسەردەمە خوێندکارانی کورد چالاکیی باشیان هەبو لە ئەوروپا، هەم کۆبونەوەیان ئەکرد، هەم خۆپیشاندانیان ئەکرد و هەم پەیوەندییان باشبو لەگەڵ میدیادا.

لەو ساڵانەدا مەسەلەی کورد زۆرباش چوبوە پێشەوە، دانا ئادەم شمیت باسی ئەو قۆناغە و دەوری ئێمە بە باشی ئەکات و زۆر ئەهمیەتی پێدەدا، ئەڵێ: "ئەوە یەکەم جارە کورد مەسەلەی خۆی دێنێتە سەر مەسرەحی نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی فراوان کە رۆژنامە، تەلەفزیۆن و میدیا باسی بکات و بەشیوەیەکی دیبلۆماسی و زیرەکانەش تەرحیان بکات، لە لایەک رەئی عامی ئەوروپی و ئەمەریکی قبوڵی بکات، لە لایەکی تریش وایان تەرح بکات کە رەئی عامی عەرەبی قبوڵی بکات، لای ئیشتراکی وایان باسکردوە، لای رۆژئاوا و دنیای دیموکراتیش بە جۆرێکی تر، کە هەمو قبوڵی بکەن".

*** شەڕی دژ بە کورد چەند مانگێکی خایاند، ئەوە بو بەعسییەکان لابران و عەبدولسەلام عارف دەستەڵاتی گرتەدەست، ئەوە فرسەتێکی تر بو بۆ ئەوەی گفتوگۆ لە نێوان شۆڕش و حکومەتی عێراق دەستپێبکاتەوە؟**

- بەڵێ راستە حوکمی بەعس، لە رۆژانی ٨ و ٩ و ١٠ ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا حەملەی بۆسەر کوردستان دەست پێکرد و تا تشرین بەردەوام بو، لەو ماوەیەدا، بەعس هاشوهوشێکی زۆری نایەوە، بە دڕندایەتیەکی زۆرەوە هاتەوە کوردستان، هەر یەکەمجار لە مێژوی عێراقی نوێدا، بەعس سیاسەتی کاول کردن و راگواستنی دێهاتی کوردی جێبەجێکرد. بۆ یەکەم جار لەدەوروبەری کەرکوک و ئەو ناوچانەی نەوتی تێدایە، دەیان دێهاتی کوردیان کاول کرد و تەختیانکرد، بەناوی ئەوەی مەترسی لە دامەزراوەکانی نەوتی دورئەخەنەوە.

ساڵی ١٩٦٣ بە سەرەتای سیاسەتی تێکدان و کاولکردنی دێهاتی کوردستان و

ڕاگواستنی خەڵکی کورد دائەنرێت، ئەوەش لەسەر دەستی حیزبی بەعس کراوە، من پێموایە ئەوە بەروبومی بیروباوەڕی میشێل عەفلەقە کە لەمادەیەکی نیزامی حیزبی بەعسدا هاتوە ئەڵێ: "ئەوەی ئەوان پێی ئەڵێن ئەقەلیاتی قەومی، ئەگەر نەگونجان و قبوڵیان نەکرد ببن بەعەرەب و لەناو ئومەی عەرەبیدا بتوێنەوە، ئەوە حەقە بتوێنرێنەوە یان رابگوێزرێن و دەرکرێن لەو وڵاتە، بەئیعتیباری ئەوەی، ئەو وڵاتی خاکی عەرەبە". ئەو بۆچونە شۆڤێنیە لە بناغەدا لەسەر بۆچونی هەڵە و شۆڤێنانە دارێژراوە، بۆنمونە خاکی کوردستانی عێراق خاکی عەرەب نییە، کوردی عێراقیش عەرەب نین، ئەوان بەشێکن لە نەتەوەی کورد، هەروەکو چۆن عەرەبی عێراق بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب، خاکی کوردستانی عێراقیش، بەشێکە لەخاکی کوردستانی گەورە و موڵکی نەتەوەی کوردە، هەروەکو خاکی عەرەبستانی عێراقیش بەشێکە لە خاکی نەتەوەی عەرەب.

ئەما ئەو سیاسەتە شۆڤێنیە، بۆ یەکەمجار لە ١٩٦٣دا جێبەجێکرا و هەندێک عەشایەری عەرەب هاندران بێن بۆ تاڵان و ڕاووڕوت لە کوردستان. ئەو ساڵە بەعس نەیتوانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێت، واتا بەعس هەرچەندە هاشەوهوشی زۆریکرد، بەڵام ناوچە ئەساسییەکان هەر بەدەست کوردەوە مانەوە و ناوچەی ڕزگار کراو هەر مایەوە.

*** ئەگەر هەڵسەنگاندنێک بۆ هێزی پێشمەرگەی ئەو کاتە بکەیت، ئەو هێزە چ ڕۆڵێکی بینی؟**

- پێشمەرگە بە گشتی ڕۆڵی زۆر جوامێرانە و نەبەزانەیان بینی، هەرچەندە هەندێک لە لێپرسراوی پێشمەرگە بەتایبەتی ئەوانەی مەلا مستەفا داینابون، زۆر بێتوانایی و ترسنۆکییان نیشاندا، باسی یەک نمونەت بۆ ئەکەم، ئەویش عەزیز عەقراوی بو، عەزیز عەقراوی کە موقەدەم ڕوکن بو، لافی ئەوەی لێدەدا کە پیاوێکی زۆر ئازایە و کراوە بە لێپرسراوی بەرەی هەولێر، لەو شەڕانەدا، لەسەری ڕەشەوە عەزیز عەقراوی شکا، کە شوێنێکی سەخت بو، پێشمەرگەشی زۆر لێبو تا چیای سەفین، کە شاخێکی زۆر سەختە و بە ئاسانی ناگیرێت، ئەبوایە بە دەیان ڕۆژ شەڕی لێبکرێت هەتا هاتنە ناوچەی سپیلک، واتا پشتی خانزادی سۆران و گەلی عەلی بەگ. عەزیز عەقراوی بە خراپی هەڵهات، هێزەکەی پەرتوبڵاوبۆوە و حاجی ئۆمەران و گەلی عەلی بەگیش بێ شەڕ تەسلیمی حکومەتی عێراق کرد.

گەلی عەلی بەگ جێگایەکە، ئینسان ئەتوانێ چەندین مانگ شەڕی لێ بکات،

بەڵام ئەو پیاوێکی ئاوا بێ توانابو، ئەو کاتە بەو شەڕانە زۆر لەناوخەڵکا شکا و پێیان ئەگوت (جەنەڕاڵی هەزیمەت) واتا جەنەڕاڵی هەڵاتن و تەسلیم بون.

لەو ناوچانەی تر کە لێپرسراوانی حیزبی لێبو، شەڕی زۆر قارەمانانەکرا، حکومەت نەیتوانی هیچ شوێنێک بگرێت. لە پایزدا چەمی ڕێزان گیرا، چەمی ڕێزان راستە خۆی دۆڵە، بەڵام پشتەکەی لەسەر سەربانی چەمی ڕێزان هەتا ئاغجەلەر دەشتێکی دیارە، دەبابە دێتە سەر تەپڵی سەری. ئەوەبو بە شەڕێکی دوسێ هەفتەیی و کوشتن و کوشتارێکی زۆر، ئنجا توانیان بیگرن، بەڵام نەیانتوانی زۆری لێبمێننەوە، ناچاربون لێبکشێنەوە. بەڵام نەیانتوانی ناوچەی قەرەداغ بگرن، بەمۆ، شاربازێڕ، ماوەت و ئەو ناوچانەیان پێنەگیرا، چونکە مەکتەبی سیاسی لێبو، هەندێ شوێنیان گرتەوە وەک ناوچەی بارزان، چونکە بارزان شەڕی لێنەکرا و حکومەت نەیتوانی سەرکەوتنی سەربازی بەدەست بهێنێت.

# ئینقیلابی تازە و گفتوگۆی تازە

*** دوای دەرکردنی بەعس و هاتنی شۆڤێنیە نەتەوەیەکانی عەرەب، هەڵوێستی پارتی چی بو لەو ئاڵوگۆڕە سیاسیەی عێراقدا؟**

– ئەوە بو کودەتا دژی بەعس لە ١٨ی تشرینی دوهەمی ١٩٦٣ دا رویدا کە بەعس روخا، حکومەت یەکسەر پەیوەندی بە ئێمەوەکرد، بە بۆچونی خۆم، ئەو پەیوەندییە لەژێر تەئسیری عەبدولناسردا بو، چونکە عەبدولسەلام عارف خۆی بە ناسری دادەنا، بەڵام ناسرییەکی ساختەچی بو، دەسەڵاتیان گرتە دەست عەبدولناسر پێیگوتن من دژی شەڕ کردنەوەم، هەروەها ئەشیانزانی کە عەبدولناسر دژی شەڕکردنەوەی پێشوشبوە.

*** واتا گفتوگۆ جارێکی تر لەگەڵ حکومەت دەستی پێکردەوە؟**

– بەڵێ وایە، کاتێ بەعسییەکان دژی ئێمە شەڕیان ئەکرد، رۆژنامەکانی میسر، تەنانەت عەبدولناسر خۆشی لێدوانی دژی شەڕ دەدا، ئەفسەرەکانی دەسەڵاتدار لە

حکومەتی عێراقدا ئەیانزانی عەبدولناسر شەڕی لەگەڵ کورد پێ ناخۆشە، بەڵام خۆشیان بە ناسری ئەزانی!.

حکومەت نوێنەری نارد بۆ لای ئێمە، ئەو کاتە من لە ناوچەی شەدەڵە و سورداش بوم، گوتیان ئەمانەوێ گفتوگۆ بکەینەوە، منیش بۆ گاڵتە پێمگوتن: ئینجا ئەمە زۆر باشە، خۆ وەفدی ئێمە لە بەغدایە، ئەوکاتە کە من ڕۆشتبوم، پاش ماوەیەک، هەمو وەفدی کوردییان گرتبو، بەعسییەکان لەجیاتی ئەوەی گفتوگۆیان لەگەڵ بکەن، چوبون گرتبویانن، لەوانە سالح یوسفی، بابەکری مەحمودی حاجی ئاغا، مەسعود محەمەد، کاکە حوسینی خانەقا، ڕەشید عارف، هەمویان گیرابون، لەبەرئەوە منیش گوتم: "ئێمە وەفدمان لای ئێوەیە، بڕۆن گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەن، لە بەندیخانەی خۆتان بیانهێننە دەرەوە، قسەیان لەگەڵدا بکەن".

یەکێک لەداواکان کە ئێمە کاتی خۆی پێشکەشی ناسرمان کردبو، بریتی بو لەوەی کە ڕێگامان بدەن مەکتەبێکمان هەبێ لەقاهیرە، ناسر موافەقەتی کرد، هەرچەندە عێراقییەکان زۆریان پێ ناخۆشبو، گوتیان با ئەو مەکتەبە لەوحەو ناوی پێوە نەبێت، منیش گوتم: وەڵڵاهی من خۆم دەستەڵاتی دانانم نیە، بەڵام هەتاخەبەری مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی ئەدەم، با کاک شەوکەت لە قاهیرە بمێنێتەوە، ئەوەبو شەوکەت بەوجۆرە لەوێ دانرا لەسەر ئەو ئەساسەی کە زمانزان و موسەقەف و بەقابلیەت و زۆر لەبلەبان بو، جگە لەوە کە ئینگلیزی باشی ئەزانی و زۆر ئیجتیماعیش بو.

* **باشە مەلا مستەفا ڕەزامەند بو بە دانانی ئەو وەک نوێنەر؟**

– مەلا مستەفا زۆری پێ ناخۆش بو، گوتی، "ئەوە تۆ جەلال بەعزەجار کاری شێتانە ئەکەی! ئاخر تۆ لای خۆت ئەڵێی دۆستی عەبدولناسریت"، مەلا مستەفا بە عەبدولناسری ئەگوت (مامی جەلال) هەندێ کەلیمەی سرپیمان هەبو، بۆ نمونە بە سۆڤێتمان ئەگوت (ماڵی ماممان)، بەڵام عەبدولناسر تەنها مامی من بو (مامی جەلال). مەلا مستەفا گوتی: "ئەوە چییە شەوکەتت لەوێ داناوە"، گوتم: وەڵڵا کەسی لێ نەبو، گوتی: "ئەزانی شەوکەت چی ئەکا؟ خۆ شەوکەت نوێنەری کورد نیە"! گوتم: ئەی نوێنەری کێیە؟ گوتی: "ئەو جاسوسی ئینگلیزە، بەسەر عەبدولناسرەوە؟"، سەد ڕەحمەتی لێبێ ناو و ناتۆرەی لە خەڵک ئەنا، ئەوەبو دوایی هەر خۆشی شەوکەتی لەو جێگایەی هێشتەوە.

لەو کاتانەدا، عەبدولناسر ناردبوی بەدوای شەوکەتدا و گوتبوی: کاکە ئەمانەی هاتونەتە سەر حوکم دۆستی ئێمەن، برۆ بە برادەرانی خۆتان بڵێ: "من ئامادەم بکەومەبەینەوە، وەساتەت بکەم، کەفالەتیش ئەکەم، ئەو ئیتفاقەی کە ئەکرێ من زەمانی دەکەم و حوکمی زاتیتان بۆ وەردەگرم، بەو شکڵە مەعقولەی کە جەلال بۆی شەرح کردوم و بەشکلێکی مەعقولی دەزانم".

بە بۆچونی من شەوکەت عەقراویی هەڵەی تەکتیکی کرد، ئەویش ئەوەبو، لەجیاتی ئەوەی بە عەبدولناسر بڵێ، هەوڵ بدات لە رێگای بەغدا بینێرێتەوە بۆ کوردستان، ئەو هات بە تاراندا گەڕایەوە، لە تاران چەند رۆژێک دواکەوت و ئێرانییەکان بەقەستی هێشتیانەوە، ئەوکاتە بەفر رێگای سەردەشتی گرتبو، مامۆستا برایم و ئەوانیش لەودیو بون، بەفرێکی زۆر زۆر باری بو، شەوکەت لە سەردەشت مایەوە، هەرچەند بروسکەی لێدەدا ئەو وەختە پەیوەندیەکی لاسلکیمان هەبو لەگەڵ ئەودیو، زۆر گرنگە شەوکەت بگەڕێتەوە و کاری زۆر گرنگمان پێی هەیە، مەلا مستەفا سەبری نەگرت و ئەیویست زو بگەڕێتەوە، شەوکەت خەبەرێکی ناردبو، بەموختەسەری ئەڵێت:

"سەبر بگرن قسە و راسپاردەی عەبدولناسرم پێیە" ئەو وەختە لە رانیە گفتوگۆ هەبو هەواڵەکەمان گەیاندە مەلا مستەفا، من خۆم بۆم برد و گوتم: "شەوکەت لای مامی منەوە گەڕاوەتەوە و خەبەری پێیە و ئەڵێ راسپاردەی عەبدولناسرم پێیە و ئەڵێ هیچ کارێک مەکەن، هەواڵی زۆر گرنگم پێیە، چاوەرێ بکەن تا ئەگەمەلاتان". شەوکەت جفرەی پێ نەبو، لە ترسی ئێرانییەکان بە راشکاوی نەیوێرا بیڵێت، ئێرانییەکان پێیان ناخۆش بو، کە پارتی پەیوەندی لەگەڵ عەبدولناسردا هەبێت، لەبەرئەوە مەلا مستەفا گوێی نەدایە ئەو داخوازیە گرنگەی عەبدولناسر. ئەوەبو کە شەوکەت هاتەوە، بەیانەکە ئیمزاکرابو. دوای ئەوە ئێمەمانان بە چەپۆک دامان بەسەری خۆماندا، کە چەند گرنگە عەبدولناسر وەساتەت بکات، حوکمی زاتیمان بۆ زامن بکات و کەفالەتیش بکات کە، جێبەجێ بکرێت، بەڵام پاش چی!.

*** گفتوگۆی بارزانی و حکومەت، کەی و چۆن دەستی پێکرد؟**

– راستییەکەی ئەمەوێت پێت بڵێم کە بەم شێوەیە بو:

من و نوری شاوەیس بە نوێنەرایەتی مەکتەبی سیاسی چوین بۆ لای مەلا مستەفا، بۆئەوەی لەگەڵیدا باسی ئەوە بکەین، کەوا حکومەت عەرزی پێیە و

ئێمە چی بکەین؟ ئەوکاتە ئەو لەدۆڵەرەقەبو کە ئێمە چوین بۆ ئەوێ، شاهیدێکی تەئریخیشم هەیە ئەویش مامۆستا سەلیم فەخریە، ئەویش لەوێبو، هەروەها مەرحوم دکتۆر سدیق ئەتروشیش، ئەویش لەوێبو، ئێمە ئەو چوارە زۆر کات پێکەوە ئەبوین لە ژورێکدا ئەژیاین.

رۆژێک عەریفێکیان لە رەواندوزەوە ناردبو، هاتن گوتیان: هاتوە خەبەری حکومەتی پێیە، مەلا مستەفا هەمومانی بانگ کرد و گوتی چیبکەین؟ سەلیم فەخری هەڵیدایە و گوتی: "وەڵڵا عەریف هی ئەوە نیە کە تۆ بیبینی، بنێرە یەکێک لە مورافیقەکانت بچێت بیبینێت و بزانێ چی پێیە"، گوتی ئێوە رەئیتان چیە؟ ئێمەش هەمان بۆچونمان باس کرد، گوتی: "نە کاکە ئەمن کابرایەکی فەقیرم، ئەمن شوانم، ئەمن گاوانم، ئەمن خۆم بەزەعیم نازانم، ئەمن هەمو کەس ئەبینم"، ئەوەبو خۆی دیتی، کەدیتی دیاربو کە راسپاردەی پێیە و گوایە حکومەت ئەیەوێت موتەسەریفی سلێمانی بنێرێت بۆ گفتوگۆ.

لەپێش هاتنی عەریفەکە، وەفدێک لەبەغداوە هاتبونە ناوچەی دێگەڵە، یەکێکیان تێدابو پێیان دەگوت ئەسکەندەری ئەجزاچی کە ئەرمەنی بو، ئەسکەندەری ئەجزاچی یەعنی ئەسکەندەری سەیدەلی، شەریکی بابا عەلی بو لە هێنانی کەرەسەی دکتۆری و دەرماندا، هاتبو بە زمانی بابا علی و ئەمریکاوە قسەی بۆ مەلا مستەفا ئەکرد کە حکومەت وا باشە و گرنگە کە مەلا مستەفا ئەم شۆرشە رابگرێت و لەگەڵ حکومەتدا پێکبێت. مەلا مستەفا بەخەیاڵی خۆی راسپاردەی بابا عەلی و ئەمەریکای پێ گرنگ تر بو لە هی عەبدولناسر، لەبەرئەوە رانەوەستا لەسەر هاتنی شەوکەت و قسە و راسپاردەکانی عەبدولناسر.

# شێخ ئەحمەدی بارزانی و
# ڕێککەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراق

*** لەو ماوەیەدا شێخ ئەحمەدی برا گەورەی بارزانی بەیانێکی دەرکرد، ئایا ئەو بەیانە هیچ کاریگەرییەکی هەبو لەسەر گفتوگۆی نێوان پارتی و حکومەت؟ هەڵوێستی بارزانی چی بو لەسەر بەیاننامەکە؟**

- حکومەتی عێراق، یەک شەیتانێتی زۆر گەورەی کرد، چونە سەر شێخ ئەحمەد و گوتیان: تۆ لەگەڵ ئێمەی، ئەویش گوتی بەڵێ، داوایان لێکرد و بەیانێکیان بە شێخ ئەحمەد دەرکرد، ئەو بەیانە ئێستاش لەناو خەڵکدا مەشهورە، ناوەڕۆکەکەی ئەوەبو کە ئەڵێت: "وەرنەوە ناو عایلەی خۆتان"، بەیانەکەی بەدەنگی خۆی تەسجیل کرد و لە رادیۆ بڵاویانکردەوە، ئەڵێت: "واز لەو موشاغەبە و تەمەڕود و ئەو هەڵایە بێنن، وەرنەوە ماڵی خۆتان لەناو عایلەی خۆتان دانیشن".

ئەو بەیاننامەیە زۆر ناشیرین و روخێنەربو، ئەوەبو هەمو رۆژێ لە رادیۆی کوردییەکەی بەغداوە لێیان ئەدایەوە، هەر بەوە ئیکتیفایان نەکرد، شێخ ئەحمەدیان هێنا، تەبعەن ئێمە ئەمانزانی هاتنی شێخ ئەحمەد چی ئەگەیەنێت[11]، بەتایبەتی من یەکێک بوم لەوانەی شارەزای وەزعی کۆمەڵایەتی و سیاسی بارزانی بوم، ئەمزانی کە شێخ ئەحمەد هات، مەلا مستەفا قسەی نامێنێ، مەلا مستەفا ناتوانێ لە حزوری شێخ ئەحمەدا دابنیشێ، شێخ ئەحمەد دائەنیشت، مەلا مستەفا رائەوەستا، تاپێی نەوتایە مستەفا دانیشە، دانەئەنیشت! عادەتی عەشائیری ئەوان بەو جۆرەبو، مەلا مستەفا بە ئاشکرا ئەیگوت: "من لە عومری خۆمدا، ئیتاعەی موتڵەقی دو کەسم کردوە، شێخ ئەحمەدی بارزانی و عەبدولکەریم قاسم، ئەگینا هی کەسی کەم نەکردوە".

چومە لای مەلا مستەفا گوتم: ئەزبەنی من هەمو وەزعەکە ئەزانم و ئاگاداری پەیوەندی شێخ ئەحمەد و جەنابت هەم، لەبەرئەوە، ئەو کێشەیە لێگەڕێ بۆ من

و بێ عاریەکە با بۆ من بێت، من قرەقرەکان ئەکەم تۆ هیچ مەکە، ئەویش گوتی: "باشە، بەڵام ناشکرێ من بەقسەی کاکم نەکەم"! گوتم: "باشە بەڵام تۆ لێم گەڕێ من کارەکە ئەنجام ئەدەم، بەڵام تۆ عاجز مەبە لەوەی من قرە ئەکەم"، گوتی: "باشە من عاجز نابم".

هەر ئەوەندەمان زانی هەلیکۆپتەر دابەزی و شێخ ئەحمەد و موتەسەریفی هەولێر و سلێمانی و یەک، دو کەسی کەشی نوێنەری حوکمەت تێدابو.

لە رانیە دانیشتین، ئەو وەختە رانیە ئازادبو، لەدەست خۆماندابو، گوتیان هاتوین بۆ گفتوگۆکردن و دەستیان بە کۆمەڵێک قسەی هەلەق و مەلەقکرد، لە کۆبونەوەکەدا کۆمەڵێک کەس بەشدار بون لەوانە نوری شاوەیس، عەباسی ئاکۆ، حاجی شێخ حوسینی بۆسکێن، کاکە زیاد ئاغای کۆیە، مەلا مەعسوم بابی دکتۆر فوئاد. لە کاتی قسەکردنەکەدا، من هەڵم دایە گوتم: "ئێمە شۆڕشمان کردوە، مافی خەڵکی کوردمان ئەوێت، خەباتمان کردوە، بۆ حوکمی زاتی".

مەلا مستەفا گوتی: "جەلال ئەتۆ وسبە، ئەتۆ هەر تێکی ئەدەی"، حاجی عەبدولرەزاق ئەیگوت: "تۆ وسبە، تۆ هەر قورسی ئەکەی، ئەتو گەنجی، ئەتو خوێنت گەرمە، قسەی تۆ حیساب نیە، ئەمن هاتوم بۆ لای (الرجل الصاعد)"یەعنی بۆ لای ئەو پیاوە هاتوم: "یەعنی تۆ وسبە"، گوتم: "کاکە ئاخر حیزب هەیە" گوتی: "نـا، نـا، نـا حیزبایەتی و شتی وانیە" ئەو سەردەمە ئەوان ئیعلانیان کرد کە هیچ حەیاتی حیزبی نیە: (العمل المشترک، العمل القومي الواحد) دروست ئەکەن ئەحزاب حەل ئەکرێ، ئەبێ ئێمەش خۆمان حەلکەین.

*** دوای ئەو دانیشتنە، ئەنجامی کۆبونەوەکان گەیشتنە کوێ؟**

- پاش چەندین کۆبونەوە، ئەوانە نەیانئەهێشت من قسەبکەم، هەر قسەشم ئەکرد، حاجی عەبدولرەزاق ناوبەناو ئەیگوت: ئەتۆ وسبە، ئەوان بەیانێکی زۆر بێهێز و خراپیان بە مەلا مستەفا ئیمزاکرد، دیارە ئێمە موافیق نەبوین، ئەوان قورئانێکیان بەدیاری لە عەبدولسەلام عارفەوە بۆ مەلا مستەفا هێنابو. لە دانیشتنەکەدا حاجی عەبدولرەزاق، مەلا مستەفا و من ئامادەبوین، قورئانەکەش دانرابو، حاجی عەبدولرەزاق هەر نەیدەهێشت قسەبکەم، ئەوەندە چەنەباز و زۆر بلێ بو، قورئانەکەم هەڵگرت و گوتم: "حاجی لە بۆ خاتری ئەم قورئانە لێمگەڕێ دو دەقیقە قسە بکەم"، بو بەپێکەنین و نوکتە، ئیتر من دەستم بە قسەکرد.

بەڕاستی مەلا مستەفا ئیمزای ئەو بەیاننامەی بە تەئسیری بابا عەلی و

ئەسكەندەر كرد، گوايە ئەمەريكاش پێی باشە و ڕەزامەندی شێخ ئەحمەدیشی لەسەر بو.

لەبەر ئەوەی خۆشی زۆر ماندو بوبو، بەرەئی من نیەتی ئەوەشی هەبو كە حیزب تەسفیە بكات و سەركردایەتی پارتی لەناوبەرێت، پێیوابو كە ئیتر گفتوگۆكردن بەسە و لەوەزیاتر ناكرێت و دەوڵەتە گەورەكانمان لەگەڵ نین، كەسمان نییە و مەلا مستەفا زۆر باوەڕی بە لوعبەی دەولی هەبو، وەكو ئینسانێک باوەڕی بە خەباتی جەماوەری و پشت بەخۆبەستن و هاندانی كۆمەڵانی خەڵک و ڕێبەریكردنیان نەبو.

*** هەڵوێستی پارتە عێراقییەكانی تر،چی بـون لەسەر ئـەم ڕێكەوتنە، بـۆ نمونە حیزبی شیوعی؟**

– كەهاتە سەر مەسەلەی بڕیاردان، من و نوری شاوەیس موافەقەتمان نەكرد، ئینجا بۆ مێژو شتێكی ترت بۆ ئەگێڕمەوە: ئەو سەردەمە لقی كوردستانی حیزبی شیوعی یاخود قیادییەكانی حیزبی شیوعی كە لە كوردستان بون، وەک عەزیز محەمەد، كەریم ئەحمەد، عومەری مەلا عەلی مامە شێخە و چەند كەسێكی تر لە قەڵادزێ بون و ڕۆژانە یەكتریمان ئەدیت، ئێمە هەمو ڕۆژێک لە قەڵادزێوە ئەهاتین بۆ كۆبونەوە لە ڕانیە، هەمو شەوێک یەكترمان ئەدیت، كاک سەلیم فەخری و دكتۆر سدیق ئەتروشیش لەوێبون، لەگەڵ عەزیز محەمەد تەنسیقیان ئەكرد و ئەوان هەمویان ڕەئیان وەک ئێمە بو، تەنانەت دژی ئیتفاقییەكە بون كە بە ئیتفاقیەی (مشیر- بارزانی) ناوبانگی دەركرد و ئیمزاكرا. حیزبی شیوعی بەیانێكیان دەركرد و موعارەزەیان نیشاندا و گوتیان: هیچ نەدراوە بەكورد[١٢].

بەیانەكە هێشتا بەتەواوی بڵاونەكرابۆوە، بروسكەیەكی پیرۆزبایی خرۆشۆف هات بۆ عەبدولسەلام عارف، ئەڵێ: پێک هاتنتان لەگەڵ حەرەكەی كوردی و دۆزینەوەی چارەسەریی ئاشتیانە و سیاسی ئەو كارە بە (عمل من أعمال الرجل الدولة البارز) ناو دەبات.

*** ئەی دوای بروسكەكەی خرۆشۆف حیزبی شیوعی هەڵوێستی خۆی گۆڕی؟**

– بێگومان، خێرا بەپەلەپەل كەوتنە خۆیان، بەیانەكەیان بڵاونەكردەوە و ڕەئیان گۆڕی، هەر لەدوای بەیانەكەوە حیزبی شیوعی كەوتە پشتگیری ڕێككەوتنامەكە، ئینجا كەوتنە بیانوهێنانەوە بۆ ئەوكارە و باس لە مەترسی ناكۆكی جیهانی ئەكرا.

ئەوکاتە شوباتی١٩٦٤ بو، ئەو دو فاکتەرە هەبو کە پێویست بو باسبکرێت، یەکێکیان ئەمەریکا، ئەوەی تر سۆڤێت.
ئەو سەردەمە، خەتی خرۆشۆف لە سۆڤێت بەهێزبو، ئەو خەتە باوەڕی بە خەباتی چەکدارنەبو، پێی وابو خەباتی چەکدار خراپە و لەهەمو ئەو جێیانەی کە خەباتی چەکدار هەیە، پریشکی ئەهاوێژێت بۆ جێگای تری جیهان، رەنگە ئەو شۆڕشانە تەشەنە بکات، لەبەرئەوە هەرچی زوترە، پێویستە ئەو شۆڕشانە دامرکێتەوە و بکوژێتەوە.

# ناکۆکی سۆڤێت و چین و مەسەلەی کورد

*** هەڵوێستی نادۆستانەی سۆڤێت لەو کاتەدا بەرامبەر مەسەلەی کورد، لە کوێوە سەرچاوەی گرتبو؟**

- ئەو رۆژگارە ئێمە لە مەکتەبی سیاسی باوەڕمان بە خەباتی چەکدار هەبو، لەبەرئەوە ئێمە لە روی فیکریەوە لەگەڵ خەتی سۆڤێتی موتەعاریز بوین، بە خەتی سۆڤێتیان ئەگوت: خەتی (التعایش السلمي و الانتقال السلمي)، ئێمەش خەتی شۆڕشگێربوین و باوەڕمان وابو، کە بە خەباتی چەکدار و جەماهیری چارەسەری کێشەی نەتەوەیی ئەکرێت.
ئەوکاتە ناکۆکی لە نێوان چین و سۆڤێتدا هەبو، سۆڤێتییەکان بەبێ ئەوەی ئێمە ئاگامان لێبێت ئێمەیان خستبوە سەر خانەی چینییەکان، هەتا رۆژنامەی (پراڤدا) وتارێکی لەسەر ناکۆکی ئێمە و بارزانی نوسی و ئەڵێت: "مەکتەبی سیاسی جەماعەتێکی چەپرەوی سەرکێشن! (یساریون مغامرون) هەر باوەڕیان بە خەباتی چەکدارییە، لە رۆحی زەمانە ناگەن (لایفهمون روح العصر وتلتقی خطوطهم مع خطوط الاوساط المتطرفة في الدوائر الاستعمارية)". وایان ئەزانی، ئێمە لە خەتی چینیین و چینییەکان تەئسیریان تێکردوین، حیزبی شیوعیش لەبن کاریگەری سۆڤێتی بو، هەرچەندە ئەوان رەئیان وەکو ئێمەبو، بەڵام بەهۆی کاریگەریی سۆڤێت و خەتی بەئاشتی پێکەوە ژیان و دوای ئەوەی، کە خەتی سۆڤێتیشیان

بە تەواوی تەبەنیکرد، خۆی لە قبوڵکردنی ئیتیحادی ئیشتراکیدا دەبینیەوە، هەروەهاش ئامادەبون کە حیزبی شیوعی حەلکەن، ئیتیحادی ئیشتراکیان بە مەڵبەندێک دائەنا بۆ هەمو هێزە پێشکەوتواخوازەکان و لەژێر کاریگەری خەتی خرۆشۆفدا بون و تیۆری گەشەکردنی نا سەرمایەداری (التطور اللاراسمالي) یان قبوڵکرد.

بۆچونەکانی حیزبی شیوعی مەوزوعییەن لە خەتی مەلا مستەفاوە نزیک بون، لەگەڵ مەلا مستەفا یەکیان ئەگرتەوە، بەڵام ئێمە فکرییەن و مەوزوعییەن لەگەڵ مەلا مستەفا جیابوین.

دانا ئادەم شمیت، لە کتێبەکەیدا بە درێژی باسی ئەو ناکۆکیە ئەکات، چونکە ئەو وەختە خۆی لە ڕانیە بو، لەگەڵ وەفدێکی ڕۆژنامەوانی هاتبون، مەلا مستەفا چوبو بۆ راوە بەراز، من ئیستیقبالم کردن و شەو و ڕۆژێک لەگەڵیاندا بوم، رەئیەکانی منیان زۆر چاک نوسیەوە و لەوێدا ئەڵێ: "خیلافی ئاشکرا هەیە لەنێوان کوردەکاندا".

## پەراوێزەکان:

١- دانا ئادەم شمیت لە (کتێبی رحلة الی رجال شجعان)، لە لاپەرە ٣٦٤ وای نوسیوە: کاتێ لە ناوەراستی شوباتدا سەردانی بارزانیم کرد لە بارەگاکەی خۆی لە باکوری رۆژهەڵاتی کەرکوك بو، لە تورەیدا نەکولا...وتی من نوێنەرەکەمم ناردوە بۆ بەغدا نەك بۆ سەفەر بۆ وڵاتانی عەرەبی.

٢- ئەحمەد بین بیلا لە ١٩١٦/١٢/١٥ لە رۆژئاوای جەزائیر لە شاری موغنیە لە دایك بوە و لە ١٩٦٣/١٠/١٥وە سەرۆك کۆمار بوە تا ١٩٦٥/٦/١٩کە وەزیری بەرگری هواریومیدیەن کودەتای بەسەرداکرد، یەکێك بوە لە دامەزرێنەرانی بەرەی میللی رزگاریخوازی جەزائیر لە ١٩٥٤ دا، بە سەرۆکی رۆحی شۆرشی جەزائیر دەژمێرا. بین بیلا نزیکی ١٥ ساڵ لە زینداندابو، سەرەرای کەمپەینی زۆری هەمەجۆر بۆ رزگارکردنی، بەڵام هەر لە زیندان مایەوە تا رۆژی ١٩٨٠/١٠/٣٠ کە شازلی بن جەدید بریاری رزگارکردنی بۆ دەرکرد.

بین بیلا، وەك ئیسلامیەکی کراوەی عەرەبی بیری دەکردەوە و لە ناوەراستی هەشتاکاندا، رێکخراوێکیان لەگەڵ منیر شەفیقی فەلەستینی و فازیلی مەلا مەحمودی کورد و بنی سەدری ئێرانی و چەند رۆشنبیرێکی تر دروست کرد. بە دۆستێکی دێرینی گەلی کورد دەژمێرێت، لە ٢٠١٤/٤/١١ لە تەمەنی ٩٦ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٣- (لە ١٩٦٣/٣/٧ وەفدێکی شەعبی حکومەت هاتن بۆ لای بارزانی، پێك هاتبون لە حسێن جەمیل وەزیری پێشو لە کابینەی نوری سەعید و قاسم فەیسەڵ، حەبیب خەیزەران باڵوێزی پێشوی عێراق لە مۆسکۆ، عەبدولعەزیز دوری سەرۆکی زانکۆی بەغدا، شیخ محەمەد رەزا شەبیبی وەزیر و ئەندامی پەرلەمانی پێشو، زەید ئەحمەد عوسمان پارێزەر و ئەندامی پەرلەمانی پێشو، فائق سامەرائی پارێزەرێکی ناسراو و باڵوێزی پێشوی عێراق)، (رحلة الی رجال شجعان) ل. ٣٦٨.

٤- (وەفدەکە لە ١٩٦٣/٣/٣٠ دا چون بۆ بەغدا، جگە لە مام جەلال، هەریەکە لە مەسعود محەمەد، مستەفا عەزیز، ساڵح یوسفی، محەمەد سەعید خەفاف، رەشید عارف، عەگید سدیق، حەبیب محەمەد کریم، شاخەوان نامیق، عەبدوسەمەد حاجی محەمەد، رەئوف ئەحمەد، عەبدولحسێن فەیلی، حسێن خانەقا و هاشم عەقراوی بون). (رحلة الی رجال شجعان).ل. ٣٧٦).

٥- (لە ١٩٦٣/٤/١ باڵوێزخانەی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نامەیەکی مەلا مستەفای ناردوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، کە تێدا هاتوە: ئەم پەیامە(نامە) لەلایەن جەلال تاڵەبانییەوە.. تەسلیم

بە باڵوێزخانە کراوە، لەم پەیامەدا مەلا مستەفا پێشنیاری پەیوەندی دۆستانەیکردوە لەگەڵ ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و داوای یارمەتی بۆ شۆڕشی کورد کردوە و هەروەها داوای کردوە لەگەڵ نوێنەری ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دیداربکات.. لە وەڵامدا کاربەدەستێکی باڵوێزخانە بە جەلال تاڵەبانی وتوە، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کێشەی کورد بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی عێراق دەزانێت و یارمەتی کوردەکان نادات و هیچ کاربەدەستێکی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش ناتوانێت لەگەڵ مەلا مستەفا دیدار بکات) (مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا – ئامادەکردنی وریا رەحمانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر – چاپی یەکەم ٢٠١٢- ل. ٤٥).

٦- (لە ١٩٦٣/٤/٥ وەزارەتی دەرەوە پەیامێك دەنێرێت بۆ سەفارەتەکەیان لە بەغدا کە تێدا هاتوە، ئەمریکا رۆژ بەرۆژ نیگەرانن لە ئەگەری مەترسیەکان بۆئەوەی بۆ سەرنەکەوتنی وتووێژەکانی نێوان کوردەکان و حکومەتی عێراق، ئێمە هەمان هەڵوێستی بێلایەنی جارانمان هەیە، ئێوە لەگەڵ جەلال تاڵەبانی قسە بکەن بۆئەوەی پەیامی ئەمریکا بگەیەنێت بە مەلا مستەفا کە ئێمە هەڵوێستەکانی کاربەدەستی باڵوێزخانەکەمان لە عێراق بە تەواوەتی پشت راست دەکەینەوە). (مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا – ئامادەکردنی وریا رەحمانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر – چاپی یەکەم ٢٠١٢- ل.٤٣).

٧- تەیموری بەختیار لە ١٩٥٧ تا ١٩٦١یەکەم سەرۆکی ساواك بو، لە ١٢ ئابی ١٩٧٠ لە بەغدا لەلایەن ساواکەوە تیرۆ کرا.

٨- کۆماری مەنگۆلیای میللی لە ٣ تەموزی ١٩٦٣ دا، لە خولی ١٨ی کۆبونەوەی گشتی نەتەویەکگرتوەکان، داخوازیەکیان پێشکەشکرد دەربارەی "کورد کوژی لە عێراق، بەڵام هیچ پشتگیریەکی نێونەتەوەیی بەدەست نەهێنا و ودوایی خۆیان داخوازیەکەیان کێشایەوە.

٩- لە ١٩٦٣/٧/٩ یەکێتی سۆڤێت ئاگاداری باڵوێزەکانی تورکیا و ئێران و سوریای کرد کە دەست نەخەنە ناو کاروباری عێراقەوە و هاوکاری سوپای عێراق نەکەن دژ بە کوردەکان. لە هەمان رۆژدا یەکێتی سۆڤێت ئاگاداری حکومەتی عێراقی کرد، کە هاوکاریەکانی بۆ عێراق دەوەستێنێت ئەگەر هێرش دژی کوردەکان نەوەستێت و ئامادەیە هاوکاری بارزانی بکا.

- لە ١٩٦٣/٧/٩ وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤێت (ئەندریە گرۆمیکۆ) وڵاتانی ئێران و تورکیا و سوریای لە رێگای باڵوێزەکانیانەوە ئاگادار کردەوە، کە هاوکاری سەربازی عێراق نەکەن دژ بە کوردەکان و ئەگەر ئەو هاوکاریە بەردەوام بێت، ئەوا مۆسکۆ بێ هەڵوێست نابێت، هەروەها. - لە ١٩٦٣/٧/١١ نوێنەری یەکێتی سۆڤێت لە ئەنجومەنی ئاسایش پرۆژەی بریارێکی پێشکەش کرد کە حکومەتی عێراق تاوانبار بکرێت بە دژایەتی گەلی کورد و شەری دژی گەلی کورد، پێشنیازەکەی لە لایەن نوێنەری ئینگلتەراوە رەت کرایەوە.

١٠- لە ١٩٦٣/١٠/١٥ پارتی کرێکارانی ئینگلتەرا هەڵبژاردنی پەرلەمانیان بردەوە و ویلسن بو بە سەرۆك وەزیران.

١١- شێخ ئەحمەد، کە بەناوی خودانی بارزانیشەوە ناوی دەرکردوە و لە ١٨٩٦ لە بارزان لە

دایکبوە، کوری دوهەمی شێخ محەمەد و براگەورەی مەلا مستەفا بوە، سەرۆکی عەشیرەتی بارزان بوە و رۆڵی هەبوە لە بەرگری نینگلیز و سەرکردایەتی شۆرشی بارزانی کردوە لە ١٩٣١ تا ١٩٣٧، لە ١٩٦٩/١/١١ کۆچی دوایی کرد

١٢- (دانا ئادەم شمیت، نوسەری ئەمریکی و دۆستی کورد و بارزانی بو، لە بروسکەیەکدا بۆ رۆژنامەکەی (نیورك تایمز) نوسیویەتی" چۆن بارزانی رێی بەخۆیدا، دوای ٢٩ مانگ لە شەری بەردەوامی دژوار دژ بە حکومەت، رێکەوتنێکی لەم جۆرە بکات) – (الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤- دیفید أدمسن.ل. ٣٦).

# ڕێککەوتنی بارزانی و عەبدولسەلام عارف

*** گەموگوڕییەکانی ڕێککەوتنامەی نێوان بارزانی و حکومەت چی بون؟**

– ڕێککەوتنەکەی مەلا مستەفا، لەگەڵ حکومەتی مشیر عەبدولسەلام عارف لە ١٠ شوباتی ١٩٦٤، هیچ مافێکی سەرەکی کوردی تێدا نەسلمێندرابو، هەتا لە بەیاننامەکەدا پاشەکشێی تێدابو، لەکاتی خۆیدا (مەجلیسی قیادەی سەورە) کە عەبدولسەلام خۆی سەرۆکی بو، خۆشی ڕێکەوتنامەکەی دەرکردبو، بۆ نمونە، ناوی کورد بە (الشعب الکردي) هاتبو، بەڵام لە بەیاننامە تازەکەدا ناوی گەلی کورد بە (آخواننا الاکراد) هاتبو. لە پاشاندا بارزانی بەڵێنی بە حکومەت دابو، باسی (حوکمی زاتی) نەکرێت و پارتیش هەڵبوەشێننەوە، لە ڕوانگەی حکومەتەوە کار بۆ پرۆژەی (العمل القومي المشترک) بکرێت و هەمو حیزبەکان لەناو ئەو پرۆژەیەدا بتوێنەوە، واتا پارتیش هەڵوەشێتەوە و نەمێنێ.

لەبەیانێکیشدا کە مەلا مستەفا بە زمانی عەرەبی و کوردیی بڵاویکردەوە، هاتبو کە ئەو، باوەڕی تەواویی بە عەبدولسەلام هەیە کە کابرایەکی موسوڵمانە و موئمینە (والمؤمنون مؤتمنون) و بڕوای میللەتی کوردیی پێ دەسپێردرێ، لەبەرئەوە داوا لە خەڵک ئەکا بچنەوە سەر کاروباری ئاسایی خۆیان.

*** ئەم بەیاننامەیە مەلا مستەفا بەجیا دەریکرد، یان لەگەڵ مەکتەبی سیاسی پارتیدا بو؟**

– بێگومان، ئەوەیە کە باسی ئەکەم، لەو بەیانەدا کە مەلا مستەفا لە ١٠ شوباتی ١٩٦٤ دەری کردبو، وەک ئەوە وابو، حکومەت بۆی نوسیبێت، جۆرە ئیهانەیەکی تێدابو بۆ پێشمەرگە، داوایان لێ ئەکات کە "بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و خەریکی کاروکاسپی ئازاد و بەرێزی خۆیان بن" وەک ئەم کارەیان (کاری پێشمەرگایەتیی) کارێکی ئازادانە و کەریم و سەربەرزانە و جوامێرانە نەبێت، هەرچەندە ئێمە کە لێوەی نزیک بوین ئەمانویست تێی بگەیەنین، ئەمە کارێکی باش نیە، بەڵام بەڕاستی بارزانی لەسەر ڕەئی خۆی سوربو.

*** هەڵوێستی ئێوە، واتا چەپەکانی ناو پارتی چی بو؟**

– ئەو سەردەمە رەئی خۆم بەئاشکرا ئەگوت، تەنانەت لای رۆژنامە نوسەکانی بێگانەش رەئیەکانی خۆمم گوتوە، جارێکیان لە رانیە بوم، چواردە رۆژنامەنوسی بێگانە هاتبون یەکێک لەوانە دانا ئادەم شمیدت بو، لەکتێبەکەیدا (رحلة الى رجال شجعان فی کردستان) باسی ئەو گفتوگۆیە، لەگەڵ من ئەکا، جگە لە نوێنەرانی ئاژانسەکانی (تاس) و (چینخوا) و (رۆیتەر) و (شەرقی ئەوسەت) و وەکالاتی جیاوازی تر، لەوێ بە سەربەستی رەئی خۆمم گوت: "من هیچ باوەڕم بەحکومەتی عەبدولسەلام عارف نییە و ئەوە حکومەتێکی دیکتاتۆرە و هەرگیز مافی کورد نادات. پێویستە ئێمە سوربین لەسەر خەباتی چەکداریی هەتا مافەکانمان ئەسەلمێندرێت، ئەبوایە ئێمە لە خودموختاری و مافە دیموکراتیەکانمان نەیەینە خوارێ"، هەروەها باسم لەوە کردبو کە "من دژی توانەوەی هەمو حیزبەکانم لەیەک حیزبدا، ئێمە حیزبی خۆمان، واتا پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەپارێزین، نایتوێنینەوە، هەڵی ناوەشێنینەوە و هێزی پێشمەرگەش حەل ناکەین، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە رێککەوتنامەی بارزانی و حکومەتدا هاتوە، ئێمە گەشەی پێ ئەدەین، تەدریب زیاتر ئەکەین و ژمارەیان زیادئەکەین"، تەفسیلاتەکەی لەو کتێبەی دانا ئەدەم شمیت دا هەیە.

دیارە من ئەو سەردەمە تێبینیم کرد کە نوێنەرانی ئاژانسەکانی هەواڵی سۆڤێت و وڵاتانی سەر بە سۆڤێت، ئەو قسانەی منیان پێ خۆش نەبو، چونکە ئەوان لەسەر خەتی خرۆشۆف بون، خەتی بە ئاشتی چارەسەرکردنی هەمو گیروگرفتەکان، خەتی کوژانەوەی هەمو شۆڕشەکانی دونیا، خەتی دامرکاندنەوەی راپەرینەکان، نەوەکا یەک تەقە، یەک پریشک بپەڕێتە پەرژینی گەلانەوە و ئاگر بگرێت و دنیا بسوتێت! لەبەرئەوە ئەوان هەم لە روی سیاسی و مەبدەئیەوە پشتیوانی مەلا مستەفایان ئەکرد و هەم لە روی کار و کردەوەشەوە.

*** کەواتە دەرکردنی ئەو بەیانە بە سەرەتای ئاشکرابونی ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی دائەنرێت؟**

– راستە، تا ئەهات ناکۆکیەکانی نێوان مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی پارتی، جەنەراڵ بارزانی، پەرەی ئەسەند، بەتایبەتی کە کار گەیشتە سەر جێبەجێکردنی رێککەوتنامەکەی، بارزانی لەگەڵ حکومەتدا رێکەوتبون، بە تایبەتی خاڵی زۆر گرنگ بەلای ئێمەوە مەسەلەی تەسلیمکردنەوەی

ناوچە رزگارکراوەکان بو. بەپێی ئەو رێککەوتنامەیە، ئەبوایە حکومەت بگەڕێتەوە بۆ هەمو ئەو شوێنانەی، پێشتر لەژێر دەسەلاتی شۆڕشدابون، وەکو شارەکانی (قەلادزە، رانیە، چوارتا، پێنجوین، قەرەداغ، سەنگاو و گەلێک ناوچەی تریش).

حکومەت وردە وردە داوای لە بارزانی ئەکرد، رێککەوتنامەکە جێبەجێ بکات، بارزانیش ئەمری ئەدا بە پێشمەرگە کە بریارەکە جێبەجێ بکەن، مەکتەبی سیاسیش ئەمری ئەکرد، ناوچە رزگار کراوەکان نەدەینەوە بە حکومەت و هەر لەژێر دەسەلاتی خۆماندابێت، ئەوە خالێکی سەرەکی پێکدادان بو لەگەڵ بارزانیدا.

بارزانی ئەوەی بەهەلوەشانەوە و هەلگەڕانەوە لە بڕیارەکانی خۆی ئەزانی، بەوەی ئەزانی کە دو سەرکردایەتی هەیە، یەکێک ئەمر ئەدات بەتەسلیم کردنەوەی ناوچە ڕزگارکراوەکان، یەکێک ئەڵێت ناوچە ڕزگارکراوەکان نادەمەوە و ئەیانپارێزم، یەکێک ئەڵێ با عەسکەر و پۆلیس بچنەوە لای حکومەت، یەکێک ئەڵێ نابێ بچنەوە و ئەبێ لای خۆمان بمێننەوە، لەم کاتەدا بارزانی هەلی قۆستەوە، هەندیک ئەفسەر و پۆلیسی هێنا و کردنی بە لێپرسراو.

*** بارزانی هیچ ئیجراناتێکی حیزبی بەرامبەر بە لایەنگیرانی مەکتەبی سیاسی کرد کە دژ بەو ریکەوتنامەیە بون؟**

– پێشتر حیزب ڕێکخراوی خۆی هەبو، خەباتی کردبو، پێشمەرگەی دروست کردبو، ئەوانە لە حیزبەوە هاتبون و بە چالاکانە و بە گیانی حیزبایەتییەوە کاریان ئەکرد، هەر کەسێ بەپێی توانای خۆی و بەپێی خزمەتی خۆی ئیشی پێ سپێردرابو، بەلام ئەوانەی کە مەلا مستەفا هێنابونی تەماحیان ئەوەبو هەمو کاروباری هێزی پێشمەرگە بکەوێتە دەست ئەوان، مەلا مستەفا ئەو هەستەی ئەوانی قۆستەوە و هەستا کودەتایەکی دروست کرد، بەسیفەتی ئەوەی کە سەرۆکی حیزبە، ئەمریدا بە لابردنی کۆمەڵێک لە لێپرسراوەکان و دانانی ئەوانەی، کە خۆی هێنابونی لەجێیان.

بۆ نمونە، عەلی عەسکەری لابرد و عەبدولوەهاب ئەتروشی لەجێ دانا، کەمال موفتی لابرد نوری مەلا مارفی لەجێ دانا، عومەر دەبابەی لابرد، عەزیز عەقراوی لەجێ دانا و بەو جۆرە گۆڕانکارییەکی گەورەی کرد.

*** ئەم گۆڕانکاریانە سالی چەند بو، چیتری کرد؟**

– ئەمانە لە مایسی١٩٦٤ بو، تەنانەت من کە لە خۆیەوە زۆر نزیک و دۆستی

بوم، منیشی لابرد لە فەرماندەی هێزی رزگاری و رەشید سندی دانا لەجێی من، یەکەمجار عەقید نامیق عەبدوڵڵا حەویزیی دانا، بەڵام کە عەقید نامیق نەیکرد و گوتی من جێگری ئەو بومە و بۆ من جوان نییە، ئینجا رەشید سندی دانا، لە هەندێ شوێن هەندێ ئەفسەری لابرد و معاون پۆلیسەکانی لە جێ دانان.

بارزانی خەڵکی خۆی ئەنارد، بۆ ئەو جێگایانەی کە گۆڕانی تێدا بو، بۆئەوەی ئەگەر یەکێک بەرگری کرد بە زۆر بیسەپێنن و کەس نەتوانێت فەرمانەکانی رەت بکاتەوە. بەڕاستی ئەوە سەرەتای کودەتایەک بو لەناو هێزی پێشمەرگەدا، بەبێ ئەوەی سەرۆکی حیزب، پرس بە مەکتەبی سیاسی، یان بە کۆمیتەی مەرکەزی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەی بڕیارەکانی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی سەرکردایەتیەوە بو، مەلا مستەفا کەوتە تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی هێزی پێشمەرگە و دانانی ئەو زابتانەی، کە راستەوخۆ دژی حیزب بون و بەخۆیەوە بەسترابون بۆ ئەوەی کار لەدەست حیزب دەربێنێ.

خاڵێکی تر ئەوە بو، مەلا مستەفا لەهەمو جێگایەک بڵاوی ئەکردەوە کە حیزب خراپە، نابێ حیزب بمێنێت، ئێمە لەگەڵ حکومەت پێکهاتوین و کۆتایی هاتوە. بەرامبەر بەو توندوتیژیەیی مەلا مستەفا، بە رەئی من و بۆ مێژو و بۆ راستی ئەڵێم کە لەلایەن مەکتەبی سیاسیشەوە، توند و تیژییەک هەبو.

# قوڵبونەوە و توندبونی ناکۆکی و ململانێکانی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی

*** بۆچی مەکتەبی سیاسی نەیتوانی بە هێمنی چارەسەری کێشەکان بکات، توندی بەرامبەر بە توندی بەکارهێنا؟ ئایە هەموتان لە مەکتەبی سیاسی یەک تێڕوانینتان هەبو بەرامبەر بە کێشەکان، کێ بون ئەوانەی لە مەکتەبی سیاسیدا توندبون؟**

– توند و تیژییەک هەبو لەلایەن برادەرانی مەکتەبی سیاسییەوە، بە تایبەتی لەلایەن مامۆستا ئیبراهیم، دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی، نوری شاوەیس، عەلی

عەبدوڵڵا، چەند برادەرێکی تری مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزیی، وەک نوری ئەحمەد تەها، مەلا ماتۆڕ، ئەمانە زۆر توند بون بەرامبەر بە مەلا مستەفا، تەنانەت نوری شاوەیس لە زۆر شوێن و مەجلیسدا، جنێو و قسەی ناشیرینیشی پێدەگوت، قسەکانی ئەویش ئەگەیشتەوە مەلا مستەفا.

عەلی عەبدوڵڵا و نوری شاوەیس، پێیان وابو کە زەمانی ئەوە هاتوە سنورێک بۆ مەلا مستەفا دابنرێت و فێری دیسپلین بکرێت!.

جارێکیان موناقەشەیەک لە نێوان من و عەلی عەبدوڵڵادا رویدا لەسەر ئەوەی من ئەمگوت:"مەلا مستەفا نیزامی داخلی لەسەر تەتبیق ناکرێت، چونکە مەلا مستەفا خۆی نە باوەڕیی بە نیزامی داخلیی هەیە، نە باوەڕی بە حیزبایەتی هەیە، مەلا مستەفا شەخسییەتێکی مێژویی کوردە، زروفێکی تایبەتی هاتۆتە کایەوە و بۆتە سەرۆک، لەبەرئەوە ئەو ئەندامێکی ئاسایی حیزبی نییە، یان ئەندامێکی سەرکردایەتی ئاسایی نییە کە بە رێگای هەڵبژاردن هەڵبژێردرابێت".

عەلی عەبدوڵڵا بە منی گوت: "تۆ خاتری ئەو دەگریت، ئەتەوێت خۆتی لا خۆشەویست بکەیت، ئەگینا ئەبێ ئێمە پەیرەوەی ناوخۆی بەسەردا فەرز و تەتبیق بکەین و سنورێکی بۆ دابنێین".

# مەکتەبی سیاسی و بارزانی

*** کەواتە تۆ ئەو کاتە بۆچونت لەگەڵ مەکتەبی سیاسی جیاوازبو، دەربارەی مامەڵەکردن لەگەڵ بارزانیدا؟**

- بەڵێ وایە، بەڕاستی من رەئێکی تایبەتیم هەبو، رەئیەکانم تا ئێستا بەدرێژی نەگۆڕاوە، بەڵام ئێستا حەز ئەکەم بیڵێم و تۆماری بکەم:

من رەئیم وابو: هەرچەندە هەمو هەڵوێستەکانی مەلا مستەفا ناڕاستن، بەپێچەوانەی ژیانی حیزبایەتین و بەپێچەوانەی شۆڕشن، بەڵام ئەبێت بە قسەی بکرێ و قسەکانی جێبەجێ بکرێت، بە پێچەوانەوە، ئەبێتە هۆی لاوازبون و نەمانی شۆڕش و نەمانی حیزب، بەڵام شێوەی بەگژاچونەوەی مەکتەبی سیاسیم پێ

چەپڕەوانە و ئینعیزالی بو، پێموابو کە ئەبێ:

یەکەم: مەکتەبی سیاسی ئەو راستییە بزانێ، کە مەلا مستەفا، پێویستییەکی مێژوییە بۆ شۆڕشی کورد، لەکاتێکدا، ئێمە کارمان بە هەندێ عەشایری کەم دەسەڵات و هەندێ سەرۆک عەشیرەت و کوێخا هەبو لەشۆڕشدا، لەبەرئەوە پێویستمان بە پیاوێکی گەورەی وەکو مەلا مستەفا زۆر زۆر زیاترە، نیشاندانی ئەوەی، ئێمە ئەتوانین مەلا مستەفا فت کەین، یان مەلا مستەفا دەرکەین لە شۆڕش، یان وا نیشان دەین، کە ئیشمان پێی نەماوە، ئەوە کارێکی هەڵەیە و ناواقیعیە و ناڕاستە.

دوهەم: من پێموابو، کە مەکتەبی سیاسی ئەو بەگژا هاتنەوەی مەلا مستەفا، تەنها بە هێزی پێشڕەو دەکا نەک بە جەماوەر، واتا ئەو گروپە هێشتا ئەوەندە پشودرێژیی شۆڕشگێڕانەیان نییە، ئەوەندە سەبریان نییە کە لێی بگەڕێن خەڵکەکە تێبگات کە مەلا مستەفا ئەیەوێ ئاش بەتاڵ بکات و ئەیەوێت حیزب هەڵوەشێنێتەوە و ئەیەوێت ناوچە رزگار کراوەکان بداتەوە دەست حکومەت، هەر کاتێک جەماوەرەکە بە تەواوی تێگەیشت، ئەو کاتە خۆیان دەچنەوە بەگژ ئەو سیاسەتە ناڕاستەدا و دەچنە سەر مەلا مستەفا و دەڵێن واز لەو سەرۆکایەتییە بهێنە. ئەوان ئەو بەگژاچونەوەیان بە هێزی ئەندامان و کادێرانی پارتی ئەکرد، ئەو کاتە لە ٩٠٪ ئەوانە لە دەوری مەکتەبی سیاسی بون وایان ئەزانی بەو هێزە حیزبیە ئەتوانن بەربەرەکانی ئەو سیاسەتەی مەلا مستەفا بکەن و بیبەنەوە!

خاڵی سێهەم: بە رەئی من، هەڵە بو کە لە جیاتی ئەوەی چارەی سیاسی لەگەڵ مەلا مستەفا بدۆزرێتەوە، قینەبەرایەتی لەگەڵدا دەکرا.

خاڵی چوارەم: هەڵەی کوشندە کە بوە هۆی هەڵگیرسانی ناکۆکییەکان، نوری شاوەیس بو، بەڕاستی بە سەرکەشی، بەتاکرەوی خودی خۆی و سەربەخۆ، ئەو ئیشەی کرد، ئەم شتە چەند جار باسکراوە، بەڵام ئێستا من ئەمەوێت چاکتری بگێڕمەوە، ئەویش ئەوە بو: پاش ئەوەی کە هەندێک لە پیاوماقوڵانی کورد کەوتنە نێوان پارتی و مەلا مستەفاوە، مامۆستا ئیبراهیم لە مارتی ١٩٦٤ لە ماوەتەوە هات بۆ لای مەلا مستەفا، لە سەنگەسەر، من و چەند برادەرێکی تری لەگەڵدا بوین، چوینە لای مەلا مستەفا و هەندێ راز و گلەییمان لێکرد، توانیمان مەلا مستەفا قانیع بکەین بە چارەسەرێکی مامناوەندی کە من پێشکەشم کرد.

# چارەسەری ناکۆکیەکانی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی

*** پێشنیازی ئێوە چی بو بۆ مەلا مستەفا، بۆ خاوکردنەوەی ململانێ ناوخۆییەکان و چارەسەرکردنی ئەو گرژییەی هەبو؟**

– پێشنیازەکەی من بریتی بو لەوەی، کۆمیتەیەکی بێلایەن دابنرێ بۆ سەرپەرشتی کردنی هەڵبژاردن بۆ کۆنگرەیەکی راستەقینەی حیزبی، لەو کۆنگرەیەدا باس لە ناکۆکیەکانی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی، هەڵوێست لە حکومەت، هەڵوێست لەو رێککەوتنانەی لەگەڵ حکومەت کراوە، بکرێت، ئەوکاتە یا بارزانی رەئی کۆنگرە قبوڵ ئەکات، یان قبوڵی ناکات و ناکۆکییەکان شێوەیەکی قانونی خۆی وەردەگرێت.

بۆ حەقیقەت مامۆستا ئیبراهیم و عەلی عەبدوڵڵا بەم پێشنیازە رازی بون، مەلا مستەفا داوایکرد کە پێشنیازیی چەند کەسێک بکەم بۆ کۆمیتەیەک، منیش کە ناوەکانم دایە، موافیق بو، ناوەکانی ئەم کۆمیتەیە بەراستی زۆرتریان ئەو کەسانە بون کە ئەو رۆژە باوەڕیان بەحیزبایەتی هەبو، لەگەڵ خەتی حیزبدا بون، نەک لەگەڵ خەتی بارزانی، ئەو کەسانەی کە دامان نابون بریتی بون لە: (جەمال شاڵی، حەبیب محەمەد کەریم، یەدوڵڵا فەیلی، عەباس حوسێن، جەلال عەبدولرەحمان، عومەر بامەڕنی و برادەرێکی تریش بو ئێستا ناوەکەیم لەبیر نیە) ئەمانە دانران بۆئەوەی سەرپەرشتی هەڵبژاردنی کۆنگرە بکەن. بەیانێکمان نوسی بەیانەکە زۆربەی من نوسیم، مامۆستا ئیبراهیم چاکی کرد و بردمە لای مەلا مستەفا، پاش ئەو گۆڕینانەی کە ئەو ویستی لێمان کرد و دوایی بە شێوەیەکی جوان بەیانەکەمان نوسییەوە.

مەلا مستەفا بەیانەکەی ئیمزاکرد، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش لە جیاتی مەکتەبی سیاسی ئیمزای کرد، بەیانەکەمان بە حەبیب کەریم و یەدوڵڵا و ئەو

برادەرانەدا نارد بــۆ لای نوری شاوەیس، کە لە بارەگای مــەکتەبی سیاسی بو لە خەرزێنە، لە پەنا ماوەتدا، کە لەوێ ئەو بەیانە چاپ بکرێت و بڵاوبکرێتەوە.

نوری شاوەیس، بەتوندی و بە سەرسەختی دژی مەلا مستەفا بو، نازانم چ هێزێکی لەپشت خۆیەوە شک ئەبرد، یان کێ هانی ئەدا؟ یان چ نیازێکی هەبو؟ لەوێ لەو برادەرانە تورە ئەبێت، جنێویان پێ ئەدا، بەیانەکەیان لێ وەردەگرێ و ئەیدڕێنێ و پارچە پارچەی ئەکات، ئەڵێ بڕۆن ئێوە هەر حەپسن، هەمویان تەوقیف ئەکات.

*** هەڵوێستی بارزانی چی بو بەرامبەر بەو کارەی نوری شاوەیس؟**

– مەلا مستەفا، لە سەرەتادا کۆنگرەی پێ خۆش نەبو، لەبەرئەوە، ئەو هەلەی قۆستەوە کە پارتی ڕێکەوتن و کۆنگرەی ناوێت و مەکتەبی سیاسی نایەوێت کۆنگرە ببەستێت، لەبەرئەوە کەوتە هەوڵی ئەوەی خۆی کۆنگرە ببەستێت.

هەرخۆی کەوتە نامە نوسین بۆ هەمولایەک و ئەیگوت: هەوڵدەن لە کۆنگرە جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد دەرنەچن، یەکێک لەو نامانەی کەوتە دەست ئێمە، بۆ عەقید کافی نوسیبو بۆ باڵەکایەتی، وێنەمان لەبەرگرتەوە و دوایی نامەکەمان ڕەوانکرد، کورتییەکەی ئەوەبو، ئەگەر بهاتبایە و ئەو ڕێککەوتنامەیەی کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و من و علی عەبدوڵڵا لەگەڵ مەلا مستەفا، لە ڕانیە، لەسەری ڕێکەوتبوین و سەری بگرتبایە، ڕوداوەکانی دوایی ڕەنگە بە ئاقارێکی تردا بڕۆشتبایە.

*** ئەم ڕوداوانە کەی بون؟**

– ئەمە هەموی لە مایسی ١٩٦٤دا بو، ئەگەر ئەو ڕێکەوتنەی نێوان مەلامستەفا و مەکتەبی سیاسی سەری بگرتبایە، بەڕاستی کۆنگرەیەک ئەبەسترا، کێشەی نێوان پارتی و مەلا مستەفا چارەسەردەکرا، دڵنیاش بوم بەشی زۆری، یان سەدی نەوەد و پێنجی ٩٥٪ پشتیوانی لە ڕەئیەکانی مەکتەبی سیاسی و لە هەڵوێستە سیاسییەکانی مەکتەبی سیاسی ئەکرد، ئەو ڕەئیانەی کە چۆن مەسەلەی کورد چارەسەر بکرێت.

من خۆم نارەزایی خۆمم بەرامبەر بە کارەکەی کاک نوری شاویس لای مامۆستا ئیبراهیم دەربری و لایەنگری ئەوە بوم، ئەو کۆنگرەیە پێویستە ئەنجام بدرێت، گوتم بەڕاستی ئەوە کارێکی زۆر خراپە، من لایەنگری ئەو هەڵوێستە توندتیژانەی

مەکتەبی سیاسی نەبوم، لایەنگری ئەو هەڵوێستەی نوری شاوەیس نەبوم، لایەنگری پچڕاندن نەبوم، لەگەڵ مەلا مستەفا پەیوەندیم هێشتا هەر باش بو.

من دیسان دوای مەکتەبی سیاسی کەوتم و لەگەڵ خەتی مەکتەبی سیاسی رۆشتم، لەبەرچی؟

یەکەم: لەبەرئەوەی بە پێی مەبدەئی کاری رێکخستن، کەمایەتی ملکەچی زۆربەبێ، چوار بەیەک بوین لە مەکتەبی سیاسی.

دووەم: عەلی عەبدوڵڵا جارێک توانجێکی تێگرتم، زۆر تەئسیری تێکردم، ئەوە بەڕاستی رەخنە لەخۆم ئەگرم کە نەدەبوایە تەئسیرم تێبکات، بەڵام ئەوە یەکێک بو لە هۆیەکانی کە منی بەلای م.س.دا داشکاند، ئەویش ئەوە بو گوتی: "ئەوە مام جەلال تۆ ئەوە چیە شێت و شور، ئێستا وا بوی بە حەکیم، لەسەرەخۆ، بە هێمنی و بە شێنەیی ئەتەوێت موشکیلەکان لەگەڵ مەلا مستەفا چارەسەر بکەیت". من و حیلمی علی شەریف بۆچونمان نزیک بو لەیەک، بۆیە عەلی عەبدوڵڵا گوتی: "ئەوە قەیناکە حیلمی هەر لەسەرەخۆ بوە، بەڵام تۆ بۆ"؟ وای هێنایەوە کە مەلا مستەفا ئەو وەختە بڵاویئەکردەوە، ئەیەوێت من بکاتە سکرتێری حیزب، وای هێنایەوە من لەبەرئەوەمە کە هەڵوێستم وا نەرمە.

*** ئایا بەڵێنی لەوجۆرە بەتۆ درابو، یاخود خۆت بۆ ئەو جێگایە ئامادەکردبو، ببیتە سکرتێری مەکتەبی سیاسی پارتی؟**

- نەخێر، ئەوەی کە من ببم بە سکرتێری پارتی هیچ وانەبوە، هیچ نیەتیشم نەبوە، بۆیە بۆئەوەی ئەو قسەیە بە درۆ بخەمەوە و ئیسپاتی بکەم، نیەتی وام نیە، بەباشم زانی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بوەستم، هەرچەندە باوەڕم بە بڕیارەکەیان نەبو!.

سێیەمیان: ئەم هۆیەشیان هەمدیسان شەخسی بو، کاری تێکردم، ئەوەبو مەلا مستەفا ئینقلابە عەسکەریەکەی کرد، منی دانابو، بمکاتە جێگری سەرۆکی هێزی شۆڕشگێڕ، خۆی سەرۆک بو، منی لە لێپرسراویەتی هێزی ڕزگاری لابرد، من ئەووەختە وەکو ئینقلابەکەی عەبدولسەلام عارفم ئەهاتە بەرچاو، کودەتای بەسەر بەعسییەکاندا کرد و ئەحمەد حەسەن بەکری کرد بە جێگری سەرۆک کۆمار، بۆئەوەی لای بات، حەردان تکریتی کرد بە جێگری قائیدی قوات، بۆئەوەی لەوێ لایبات. ئەو کارەم بەو شێوەیە ئەهاتەبەرچاو، بۆیە منیش نەمکرد، بەڵام ئەترسام لەوەی ئیتیهام بکرێم کە ئەمەوێ خۆم پێشخەم و برادەرەکانم لەکاتی تەنگانەدا بەجێ

بهێڵم، لەسەر لاشەی برادەرەکانم خۆم نزیک بخەمەوە و سەرکەوم و پێشبکەوم.

چوارەم: کۆبونەوەیەکی تایبەتیم لەگەڵ مەلا مستەفا کرد کە بەلای منەوە ئەوە کاری کردەسەر بۆچونەکانم، تا ئەو کۆبونەوەیە دودڵ بوم ئایا لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بوەستم، یان بێلایەن بوەستم؟ ئەو کۆبونەوەیە بۆچونەکانی یەکالاکردەوە، بەڕاستی ئەویش جەلسەیەکی تایبەتی بو، مەلا مستەفا هەزار ڕەحمەتی لێ بێت، هەتا ئەو سەردەمەش ماوەی زۆری بە من ئەدا، واتا مەجالی زۆر ئەدامێ باسی زۆر شتی لەگەڵدا بکەم و لەگەڵ من ئەکرایەوە، لوتفی هەبو لەگەڵمدا.

هەرچەندە لە ١٩٦٤وە لوتفی کەمێک کەمبوبوەوە، هۆیەکی گەورەی کەمبونی لوتفی مەلا مستەفا لەگەڵ من ئەوەبو، من لەپاش ١٩٦٣وە ناوم دەرکرد، ئەویش بەهۆی ئەوەی، بوم بە سەرۆکی وەفدی گفتوگۆ، هەمو رادیۆ و ڕۆژنامەکان باسیان ئەکردم، ناویان ئەهێنام، فڵان کەس وای گوت و چوە لای عەبدولناسر، چوە لای فڵان لێپرسراوی ئەوروپی و بەو شێوەیە. جارێک ڕۆژنامەی ئیزڤێستیا وتارێکی نوسیبو، ئەڵێ جەنەڕاڵ جەلال تاڵەبانی، جەنەڕاڵ ! گوتم ئەی قوڕم بەسەر ... دو جەنەڕاڵ لە شۆڕشی ئێمەدا شوێنیان نابێتەوە! ئەوەش هۆیەک بو بۆئەو ساردییە.

هۆیەکی تر ئەوەبو کە لە بۆچونی جیاوازمانەوە ناکۆکی کەوتە نێوانمان، ئەو دانیشتنە یەکلاکەرەوە بو بەلای منەوە، ئەوەبو کە لە سەنگەسەرەوە چومە ماڵی مەلا مستەفا و گوتم: "وەڵڵا من ئەمشەو هاتوم هەندێ قسەی جدی و تایبەتیم هەیە لەگەڵ جەنابت و هیوادارم هەروەکو هەمو جارێک، ڕێم بدەی بەسەربەستی قسەبکەم و وەڵلامی سەربەستانەش وەربگرمەوە"، گوتی: باشە بەسەرچاو. زۆر قسەی کرد، گوتی: "تۆ لای من خۆشەویستیت و لە کوڕەکانم نزیکتریت، ئەوەی ئەتو پێم ئەڵێیت کەس نەیوێراوە بیڵێت"، زۆر سوپاسم کرد و گوتم: "من شانازی بەوەوە ئەکەم"، پێشمگوت کە تا ئەوکاتەش مەلا مستەفا لای من هەر سەرۆکی حیزب و شۆڕش نەبو، بەڵکو پەیوەندیەکی روحیشم لەگەڵیدا هەبو، ئەتوانم بڵێم وەک باوکێکی ڕوحی تەماشام ئەکرد، واتا (الاب القائد) بو. بەڵام ئەو پەیوەندیە کەمێک درزی تێکەوتبو، ئەویش لەسەر هەڵوێست بو بەرامبەر بە ڕێککەوتنامەکە، هەرچەندە ئەوە چاک ئەکرا و قابیلی چاکبونەوەبو، ئەوەبو من پرسیارم کرد، کە "ئەو ڕێککەوتنامەیە بەرەو کوێمان ئەبات، نەخشەت چیە؟ ئەوە تەکتیکە؟ ئەوە بۆ کات کوشتنە لەگەڵ حکومەت، یان بڕوایە بە مەسەلەکە؟ ئێمە چی ئەکەین و ئەمە چیە"؟.

# بارزانی و شۆرش

*** واتا بارزانی بڕوای بە شۆرش لەق بوبو؟**

– بێگومان، مەلا مستەفا گوتی: "من رەئی خۆمت بە رونی پێ دەڵێم، من پێموایە وەکو خۆت ئەزانی، لە یەکەم ڕۆژەوە ئێمە شۆڕشمان نەویستوە، حکومەت بەسەریدا سەپاندین، ئێستا هەلێک هاتۆتە کایەوە رێمان ئەدەن خەڵکەکە بچێتەوە سەر کاروباری خۆی، ئێمەش دائەنیشین، ئەوە دوکانمان بۆ چۆڵ ئەکەن و ئەماندەنێ، ئەچینە دوکان دائەنیشین، ژیان و گوزەرانمان تەئمین ئەبێت، بزانین دوای ئەوەش خوا چی ئەکات"! منیش گوتم: "ئەی مەسەلەی حوکمی زاتی و دەوری حیزب" گوتی: "وەڵڵاهی جەلال خۆت رەئی من ئەزانی، من حوکمی زاتی بە خەیاڵ ئەزانم و نایەتەدی! حیزبیش وەڵڵاهی من بەزۆر کرام بە سەرۆک، عەبدولکەریم قاسم و ئێوە بە زۆر منتان کرد بە حیزبی، دەنا من نە حیزبی بوم، نە باوەڕیشم بە حیزب هەیە، لەبەرئەوە سیاسەتی من ئەوەیە، من ئەو رێککەوتنەم پێ راستە".

ئەوە کورتەی قسەکانی بو، ئەو گفتوگۆیە منی گەیاندە ئەو قەناعەتەی کە مەلا مستەفا ئەیەوێت ئاشبەتاڵ بکات، من ئێستاش بۆ مێژو رەئیم وایە، مەلا مستەفا دو ئاشبەتاڵی کرد ئاشبەتاڵێک لە ١٩٧٥ دا، ئاشبەتاڵێک لە ١٩٦٤، ئاشبەتەڵی ١٩٦٤ دو شت لێی تێکدا.

***بەرگری مەکتەبی سیاسی و حیزب.**

– هەڵەی حکومەتی عێراق و لەخۆبایی بونی، ئەگینا ئەوەش ئاشبەتاڵ بو.

# بڕیاریی کۆتایی هێنان بە کارکردن لەگەڵ بارزانی

*** واتا ئەو گفتوگۆیە لەگەڵ بارزانی، بە سەرەتای کۆتایی پەیوەندی خۆت لەگەڵ بارزانی دائەنرێت؟**

– ئەو شەوە، دوای ئەو گفتوگۆیە، هاتمە دەرەوە بڕیاریی کۆتاییم دا، هەتا ئەو شەوە شتێکم لەبیرە، مەسعودی کوڕی، گەنج بو، هات بۆلای بابی، پێی گوت: "مەسعود بۆ دایکی خۆت نابەی بۆلای دکتۆر"؟ لەوێ زانیم کە دایکی کاک مەسعود نەخۆشە، بەو بۆنەیەوە من ڕێزێکی تایبەتیم هەبو بۆ دایکی مەسعود و هەمان ڕێزم هەیە بۆی، بەڕاستی ژنێکی زۆر سەلار و قورس و سەنگینە.

ڕەخنە لەمن ئەگیرا لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی ڕۆحیم هەبو لەگەڵ ماڵی مەلا مستەفا، ژنە گەورەی مەلا مستەفا (مەحبوبە خان) دایکی مەرحوم عوبێد و لوقمان تا لە ژیاندا مابو، لە ساڵەکانی ١٩٨٤ تا ١٩٨٨ یارمەتی زۆرم بۆ ناردوە، بێگومان بە ڕەزامەندی کاک نەوشیروان و مەکتەبی سیاسی، خێزانەکانی ماڵی مەلا مستەفا، ماڵی عوبێد، ماڵی شێخ سادق و دو کچی شێخ ئەحمەد، یارمەتی هەمومان داون، ئەوە بە درێژکەرەوەی پەیوەندی دۆستانەی کۆنم ئەزانی.

ئەو شەوە بە ناخۆشترین شەو ئەژمێردرێت لە ژیانمدا، زۆرم پێناخۆشبو، بەڵام بە ئەرکی خۆمم ئەزانی کە هەڵوێستی خۆم یەکلا بکەمەوە، ئەوەبو کە بڕیارمدا لەگەڵ حیزب بمێنمەوە، هەرچەندە پێموابو کە حیزب ئەیتوانی لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێت، بەڵام ئەبێ بڕیاری زوربەش قبوڵبکرێت.

*** کەسی تر هەبو لە مەکتەبی سیاسی، یان لە لیژنەی مەرکەزی, وەک تۆ بیربکاتەوە؟**

– بەڵێ، ئەوەی ڕاست بێت جگە لە من، نزیک ترین هەڤاڵ لەو فکرەیە لەناو پارتیدا حیلمی عەلی شەریف و ئەحمەد عەبدوڵڵا بون، ئەوانیش ڕەئیان وەکو من وابو، پێیان وابو کە کاتی ئەوەنیە ئێمە بە گژ مەلا مستەفادا بێینەوە، تەنانەت حیلمی بە سیفەتی ئەوەی ڕابەری سیاسی هەمو هێزی پێشمەرگەی کوردستان

بو، پێی وابو کە ئەسڵەن ئێمە هەر بە کردەوەش پێمان ناکرێت ئەو شەڕە بکەین و خەڵک ئەو شەڕەمان بۆ ناکات.

نوری شاوەیس، عیبارەتە مەشهورەکەی خۆی گوتەوە و گوتی: "ڕەشاشێک لەسەر پردەکەی ماوەت دائەنێم، یا لاشەم هەڵدەگرن، یا نایەڵم بپەڕنەوە، دەیان و سەدانیان لێ ئەخەمە خوارێ".

لە ڕاستیدا ئێمە باوەڕمان بەوەنەبو کە پێکدادانی چەکداری یان سیاسی، لەگەڵ مەلا مستەفا کارێکی ڕاست و دروستە، بەڵکو ئەوە کارێکی ناوەخت، کاڵ و کرچە و نەگەیشتوە و زۆری ماوە. گرنگە بەهەمو شێوەیەک نەهێڵین روبدات، چونکە هەم پارتی زەرورەتێکی مێژویی بو، هەم مەلا مستەفاش واقێعکە و پێویستیەکی مێژویی بو.

هەم مەلا مستەفا و هەم پارتی پێویست بون بۆ شۆڕش و بۆ کوردایەتی، لەبەرئەوە ئەبوایە پێکەوە بگونجێن و ئەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا هەبون، ناکۆکی ناو ڕیزەکانی گەل بون، ئەبوایە بە ڕێگەی گفتوگۆ، دانوستاندن، پێکەوە کارکردن، رەخنە لەخۆ گرتن، بۆ سەلماندن و سازش چارەسەر بکرێت، هەر لایە هەندێک بێتەخوارێ و لاکەی تریش بە هەمان شێوە، هەمو لە روانگەی پاراستنی پرنسیپە گشتیەکان و مەبدەئیەکانەوە، ئەو سازشانەشم پێ ڕاست بو کە لە ڕێگای گفتوگۆوە چارە بکرێت، نەک بە ڕێگایەک کە دوژمنایەتی و ناکۆکی ناو ریزەکانی گەل زیادبکات.

*** کەسی تر، یان لایەنی تر، هەبون کە ئاگری ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی خۆش بکەن؟**

– بەڕاستی من ئەمەوێ بڵێم: دەستیش هەبو لە تێکدانی پەیوەندی نێوان پارتی و مەکتەبی سیاسیدا، شیوعییەکان دەورێکی خراپیان بینی لە ئاژاوەنانەوە و دروستکردنی ناکۆکی، بەڕەئی من ئێرانیەکان دەورێکی خراپیان ئەبینی، پێموایە ئێرانیەکان ئامانجیان ئەوەبو کە حیزب لە ساحەی خەبات دەربهێنن، هەرچەندە بەشکڵێکی فرۆفێڵاوی و زیرەکانەکردیان، هەروەها خالێکی تر هەبو، پێویست بو ئەو سەردەمە حیسابی بۆبکەین، ئەویش ئەوەبو کە هەمو عەشایەری کوردستان، هەمو ئاغا و دەرەبەگی کوردستان لەبەر دو هۆ لە حیزب رەنجابون:

یەکەم: حیزب دەسەڵاتی ئەوانی نەهێشتبو، ریکخراوەکانی حیزبی، کادێرانی حیزبی، ئەندامانی حیزبی، وردە وردە گەشەیان کردبو، ئەوان ئەبونە دەسەڵات و هێزی چەکداری پێشمەرگەیان بەدەستەوەبو.

دوەم: دانانی ئەنجومەنی گوندەکان، لە قازانجی ئاغاکاندانەبو، ئەنجومەنی گوندەکان دەسەڵاتی ئەدا بە جوتیاران، لەبەرئەوە هەمو ئاغاکانی کوردستان لەم پەڕ تا ئەو پەڕی کوردستان، تەنانەت ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئێمەومانان زۆر دۆست بون، دایانشکاند بەلای مەلا مستەفادا و لەشەڕی مەکتەبی سیاسیشدا هاتنە سەرمان.

# پێشنیازی بارزانی بۆ گۆڕینی ناوی پارتی بۆ (پارتی میللی کورد)

*** باشە ئەگەر بارزانی بڕوای بە حیزب نەبو، ئەی بۆچی حیزبی سەرلەنوێ دروستکردەوە؟**

- هەندێ لەخوێندەوارەکانی دەوروبەریی مەلا مستەفا هەڵمەتە کاسە بون، ئەیانویست زو ببن بەشت، لەو کاتانەدا هیچ نەبون، ئەوانە لە دەوری مەلا مستەفا کۆبوبونەوە و هانیاندا، بەتایبەتی ئەفسەرەکان، گوتیان حیزب تەرک مەکە، حیزب بەجێ مەهێڵە، چۆن ئەو هەمو سەروەریی و ناو و ناوبانگەی حیزب ئەدەی بە مەکتەبی سیاسی، خەڵک زۆر لەگەڵ حیزبە، حیزب بگەڕێنەوە بۆ خۆت و بەناوی حیزبەوە ئیش بکە.

مەلا مستەفا، هاتەسەر ئەو فیکرەیەی، دەست بکاتەوە بەکاری حیزبی، یەکەمجار ئەیویست ناوێکی تر لەوحیزبە بنێت بە ئیعتیباری ئەوەی، حیزب ناوی بەدبوە، ناوێکی تری پێویستە و یەکێک لەو کەسانەی کە لێوەی نزیک بو کاک مستەفا قەرەداغی بو، ناوی (حیزبی شەعبی کوردی)ی بۆ پێشنیازکردبو، لە سەرەتادا ناوی لێنا (حیزبی شەعبی کوردی)، دوایی نازانم چۆن هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ناوە کۆنەکەی خۆی بەکاربهێنێت، پێموایە ئەوە لەژێر کاریگەریی هاشم عەقراوی و عەزیز عەقراویدا بو، ئەوانە تاقمێک بون لەو هەڵمەتە کاسانەی، لە دەوری بون و هانیاندا، کە وەک سەرۆکی حیزب کۆنگرەیەک ببەستێت بەناوی حیزبەوە.

# دابەشبونی پارتی بە دو حیزب

*** واتا گرتنی ئەو کۆبونەوەیە یان ئەو کۆنگرەیە، دوبەرەکیەکەی چەسپاند لەنێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانیدا؟**

- وایە، ئەوە بو کۆبونەوەیەکی هەرەمەکی لە ١ی تەموزی ١٩٦٤دا لە ماوەت رێکخست و ژمارەیەکی زۆری لە خەڵک بانگکرد، بەبێ ئەوەی کە ئەندامی حیزب بوبن، نزیکی چوارسەد کەسی کۆکردەوە کە زیاتر لە نیوەیان ئەندامیش نەبون لە پارتیدا، بەناوی ئەوەی کە کۆنگرەی گەلە و جیاوازی نییە، هەمو کوردێک ئەتوانێت لەو کۆنگرەیەدا بەشداربێت، حیزب، حیزبی هەمو کوردە. لەو کۆنگرەیەدا بڕیاریدا، کۆمیتەی ناوەندی کە لە حەڤدە ئەندام پێکهاتبو، پانزەیان دەرکرێن و دوربخرێنەوە، تەنها دو ئەندامیان مایەوە، خۆی و هاشم عەقراوی[1].

کۆنگرە بڕیاریدا، پشتیوانی لە سیاسەتی بارزانی بکرێت و مەکتەبی سیاسی هەڵبوەشێتەوە، بڕیاریشیدا هێز کۆبکاتەوە بۆئەوەی بچێتە سەر مەکتەبی سیاسی. ئەوەندەی توانی خەڵکی کۆکردەوە، بە تایبەتی عەشایرەکان لە قوڵی ئاسۆسەوە هەڵگەڕا بۆ مەکتەبی سیاسی، لە قوڵی چوارتاشەوە بە سەرۆکایەتی عەبدولوەهاب ئەتروشی و بە پشتیوانی ئاغا و بەگەکانی شلێر و سیوەیل، وەک فەتاح ئاغا و باوکی فەتاح ئاغا، هێزێکی تر بە سەرۆکایەتی ڕەشید سندی، بەناو شاری سلێمانیدا ڕۆیشتن، حکومەتی عێراق ڕێیدان بەوێدا تێپەڕبون و فیشەکیشی دانێ، ئەوەبو کە هەندێ نوسراومان دەستکەوت، کە سەرفی فیشەک و هەندێ شتی تریان بۆکرابو بۆئەوەی بێنە سەر مەکتەبی سیاسی.

*** بەو پێیەبێت حکومەتی عێراق ناڕاستەوخۆ هانی ناکۆکیەکەی ئەدا بۆ قوڵبونەوەی کێشەکانی پارتی؟**

- بێگومان یەکێ لە هۆیەکانی زیادبونی ناکۆکی لە نێوان مەلا مستەفا و حیزب، حکومەتی عێراق بو، حکومەتی عێراق وای ئەزانی، مەکتەبی سیاسی

کۆسپە لەرێی پێکهاتن لەگەڵ مەلا مستەفادا، ئەگەر مەکتەبی سیاسی نەبێت، ئەوا مەلا مستەفا دائەنیشێتەوە و حەقی بەسەر مەسەلەی کوردەوە نامێنێت و تەنها داخوازی شەخسی خۆی ئەبێت کە بۆی جێبەجێ ئەکەن.

حکومەتی عێراق، هانی مەلا مستەفایدا و ئەویش کەڵکی لێوەرگرتبو، ئەو لەو کۆبونەوەیەدا کە لە لە خەلەکان گیرا و تاهیر یەحیا وەک سەرۆک وەزیران و قائیدی فیرقەی دو، رائد ئیبراهیم فەیسەڵ ئەنساری لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تر هاتن بۆلای، قەناعەتی چەسپیبو کە لەگەڵ حکومەت رێکبکەوێت.

مەلا مستەفا، خەڵکی بۆ کۆبونەوەکە کۆکردەوە، مامۆستا ئیبراهیم و من و چەند برادەرێکی تریشی برد و گوتی: "فەرمون قسە بکەن"، بە تاهیر یەحیای گوت: "من هیچم ناوێ، ئەوانە داوای مافی کورد ئەکەن، ئەوە مامۆستا ئیبراهیم و ئەوانەن".

مامۆستا ئیبراهیمیش زۆر بەرەقی و زۆر بە سوربونەوە لەسەر ئۆتۆنۆمی و لەسەر مافی حیزب و دژی ئەو ئەفکارانەی کە ئەوان هانیبویان کە یەک حیزب دروست بکەن لە هەمو عێراقدا و مافی کورد نەدەن، بە ئاشکرا قسەی لەگەڵ کردن. تاهیر یەحیا لە کۆتاییدا گوتی: "ئێستا بۆمان رون بۆوە (هسه افتهمنا) کەوا مەکتەبی سیاسی دژی رێککەوتنە و مەلا مستەفا لەگەڵ رێککەوتنە!! ئێوە لە دژی حەلکردنی پارتەکان و دژی پێکهاتن و دژی وازهێنان لە داخوازی ئۆتۆنۆمین".

لەوێ مەلا مستەفا مناوەرەیەکی زۆر زیرەکانەی کرد، حکومەت و پارتی کرد بە گژیەکدا و حکومەتی تێگەیاند، ئەو پیاوێکی باشە، هیچی ناوێت و شەڕخواز و ئاژاوە جەماعەتی حیزبن، بە تایبەتیش مامۆستا ئیبراهیمە، کە سکرتێری پارتی بو.

# سەرەتای شەڕی ناوخۆ یان شەڕی براکوژیی

*** کەی ناکۆکییە سیاسییەکان لەناو خۆتاندا تەقییەوە بەرەو شەڕی ناوخۆ ڕۆشت؟**

- لەو کاتەوەی کە مەلا مستەفا لە ١٣ تەموزی ١٩٦٤ هاتە سەر بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ماوەت، ئەو هاتنەی ئەو بە تاوانێکی مێژویی ئەزانم، یەکەمجارە لە مێژوی کورد، گیروگرفتی سیاسی بەشەڕ چارەسەر بکرێت و پەنا ببرێتە بەر چەک، یەکەمجارە لە مێژوی میللەتی کوردا، چەک ناکۆکی نێوان یەک حیزب چارەسەر بکات، لەجیاتی ئەوەی گیروگرفتەکان بە گفتوگۆ چارەسەر بکەن، پەنا ئەبەنە بەر هێز، یەکەمجارە لە مێژوی کوردا، سەرۆکی حیزب خۆی بچێ هەرچی ئاغا، دەرەبەگ، سەرباز و ئەفسەری فیراری تا مەبدەئی هەیە کۆیانکاتەوە لەدژی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی و ئەندامانی حیزبەکەی.

ئەوە سەرەتای ئەو ناکۆکیە ناخۆشە و ئەو کارە جەرگبڕ و کوشندەیە بو، بەسەر کورداهات، کەپێی ئەڵێن (شەڕی برا کوژیی). هێرشیانکردە سەر مەکتەبی سیاسی، دیارە مەکتەبی سیاسی نەیتوانی خۆی رابگرێت و لە ئەنجامی ئەو هێرشە چەندین کەسی لێ کوژرا و هێزەکانی مەکتەبی سیاسی کشانەوە بۆ دیوی ئێران.

بەو شێوەیە، ئەبینین پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و پارتی تێکچو، ئەو شەوەی کە مەلا مستەفا هێرشی کردەسەر مەکتەبی سیاسی، بەیانێک لە رادیۆی پارتی خوێنرایەوە، ئەو ڕادیۆیە کاتی خۆی سۆڤێت بەدیاری دابوی بە مەکتەبی سیاسی، لە ڕێگای سەید عەزیزەوە لە بەغدا وەریگرتبو، لەو ڕادیۆیەوە مامۆستا ئیبراهیم بەیانێکی خوێندەوە، مەترسی، سامناکی و پڕ زەرەر و زیانی ئەو هەڵوێستەی مەلا مستەفای تێدا رونکردەوە، داوایکرد کە بەرگری بکرێ و خەڵک خۆی تەسلیم نەکات.

## پەراوێزەکان:

١- (کۆنگرەکە لە ١٩٦٤/٧/١ گیراو، یەك هەفتەی خایاند. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزی هەمو دەرکران، تەنها سێ دانەیان نەبێت کە بریتی بون لە سالّح یوسفی و هاشم عەقراوی، حەبیب محەمەد کریم، کە تازە لە بەغداوە هاتبو. بە سکرتێر هەڵبژێرا، مەکتەبی سیاسی تازە بریتی بون لە: نەعمان عیسی، سالّح یوسفی، عەگید سدیق، یەدوڵلا عبدولکەریم، شێخ محەمەد هەرسین، بابە تاهیر شێخ جەلال، عومەر شەریف، عەزیز عەقراوی، مستەفا قەرەداغی، ئیسماعیل مەلا عەزیز، د.فواد جەلال. رەمەزان عەقراوی). (الحرب الکردیة و أنشقاق ١٩٦٤- دیفید أدمسن-ل. ٥٧).



**کۆمەڵێک سەرکردەی شۆڕش و چەند پێشمەرگەیەک، زستانی ۱۹۶۳**





شوباتی ۱۹٦۳، دێی شەروێت، مەبەنگورایەتی، لای چەپەوە کەریمی قەرەنی، لوقمان بارزانی، مام جەلال



لای راستەوە، شەمسەدین موفتی، شێخ بابەتاهیر حەفید، مام جەلال،؟، د.کەمال فواد



کانی ماران لەگەڵ بارزانی و هەژار موکریانی - مارتی ١٩٦٣



لەگەڵ د.کەمال فواد و پۆلێ پێشمەرگە. مارتی ١٩٦٣



گفتوگۆی ۱۹٦۳/۲/۲۰، بەغدا لای راست ساڵح یوسفی، مام جەلال....



کۆبونەوەی کۆیە ۱۸ای مارتی ۱۹٦۳،
شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی حەفید،
یەکێکە لە بەڕێوەبەرانی کۆبونەوەکە



جەولەیەکی پێشمەرگانە، ١٩٦٣ ماوەت



لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە ١٩٦٣



سەرەتای ١٩٦٣ لەگەڵ عومەر دەبابە



لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە سەرەتای ١٩٦٣

# ڕۆشتن بەرەو ئێران

*** باشە مام جەلال، ئێوە هیچ چارەسەری ترتان نەبو، جگە لە ڕۆشتنتان نەبێت بەرەو ئێران؟**

– ئەو کاتە، یان ئەبو بکوژرێین یان ئەبو بچینە ئەوبەری سنور.

*** ئێرانییەکان چۆن ڕێگایانندان، لە سنور بپەڕنەوە؟**

– کەس لەسەر سنور نەبو، هاتوچۆی لێنەبو، ئەوبەر، بەرامبەر ئێمە هیچ هێزی لێنەبو، دوایی ئێران هات و ئابلۆقەی داین، ئێمەش کەچوین نزیکی چوارسەد، پێنج سەد کەس ئەبوین.

*** ئایا بۆچی هەتا بارزانی هێرشی نەکردە سەرتان، ئێوە وەکو مەکتەبی سیاسی بیرتان لەوە نەکردبۆوە، جیا ببینەوە و کۆمەڵێکی تازە دروستبکەن، یاخود لەگەڵ حکومەتی عێراق ڕێکبکەون، یاخود بچنە ئێران، یان خۆتان لە شوێنێکی تر دور لە بارزانیەوە نیشتەجێ بکەن؟ ئایا بیری وا کرابۆوە؟ قسەی وا کرابو؟ ئەگەر نەکرابو بۆ نەکرابو؟**

– نازانم ئەو پرسیارەم لا سەیرە، چونکە ئێمە خۆمان بەحیزب ئەزانی، بارەگامان هەبو هێزی پێشمەرگەمان هەبو کۆمەڵی چی دروست بکەین!.

*** کەی بە یەکجاری لە بارزانی جیابونەوە؟**

– ئێمە بارزانیمان بە جیابۆوە ئەزانی! ئەمانزانی بەرزانی جیابۆتەوە، خۆمان حیزب بوین و هەمو حیزب لەگەڵ ئێمەبو، هەمو لیژنەی ناوچەکان، لقەکان، لەسەدی نەوەدی ٩٠٪ کادیرانمان لەگەڵ بو، ئێمە حیزب بوین، بەبێ موبالەغە ٥٪ی ئەندام و کادیری حیزبی لەگەڵ مەلا مستەفا نەبون. حیزب بە موتڵەقی لەلایەک و مەلا مستەفا لەلایەک بو، لەحەقدە ئەندامی لیژنە مەرکەزی، ئێمە پانزە لەلایەک بوین، بارزانی و هاشم عەقراوی لەلاکەی تر بون.

*** ئەگەر زۆربەی حیزب لەگەڵ ئێوە بو، ئەی بۆچی ئێوە شکان و، دواتر بارزانی بو بە خاوەنی پارتی؟**

- ئەو شکانە عەسکەرییە بەهۆی بەکارهێنانی هێزەوەبو، ئەی نەمگوت ئەو یەکەمجار ئینقیلابێکی عەسکەری کرد و هێزەکانی خستە دەست خۆی.

دوەم، هەمو عەشایەری کوردی کۆکردەوە، ئەوی لای مەکتەبی سیاسی مابۆوە هەزار پێشمەرگەیەک بو، هەزار پێشمەرگە، نەی ئەتوانی بەرامبەر بە پێنج هەزار کەس راوەستێت، ئەوە شکانی عەسکەری بو، نەک شکانی سیاسی.

تا ئەو ڕۆژەی هاتیشە سەرمان، چاوەڕێی ئەوەمان نەئەکرد، هێز بەکاربهێنێت، ئەمانگوت ئەوە تەنها هەڕەشە و گوڕەشەیە، نەمان ئەزانی کە مەلا مستەفا بەچەک، بەهێز، بەشەڕ، بەعەشائیر، ناکۆکییەکان لەگەڵ ئێمە یەکالأئەکاتەوە. وامان ئەزانی ئەگەر ناکۆکییەکان زیادبکات، رەنگە ئەو ببێتە حیزبێک و ئێمەش ئەبینە حیزبێک، هەر کەسە لە لایەک و لە ناوچەیەک بۆخۆی دادەنیشێت و کاری خۆی دەکات.

هەتا ئێمە کە بیستمان ئەو بەتەمایە کە حیزبی شەعب دروست بکات، هیچ موخالیف نەبوین و پێمان خۆشبو، واتا ئەگەر ئەو بەناوی حیزبی گەلەوە حیزبێکی دروست بکردایە، پیرۆزبایشمان لێ ئەکرد، بەڵام کە بەناوی پارتیەوە دەستی بە کارکرد، هەمومان دژی بوین و گوتمان ئەوە پارتی نییە!.

پێش ئەوەی ئەو کۆنگرەیە ببەسترێ، مەکتەبی سیاسی لە نێوان ٤ -٩ نیسانی ١٩٦٤ دا کۆنفرانسێکی لە ماوەت بەست، هەمو ئەندامانی لیژنەکان لەسەر تاسەری کوردستاندا بەشداربون تێدا، لەوێ بە زۆرینەی دەنگ بڕیاردرا، هەمو دەسەڵاتەکان لە مەلا مستەفا بسەنرێتەوە، هەتا ئەو کەسانەی کە دوایی گەڕانەوە بۆ لای مەلا مستەفاش، ئەوانیش دەنگیان بۆ ئەو بڕیارەدا، کەسانی وەک عەلی سنجاریی، حەبیب محەمەد کەریم، یەدوڵڵا.

من لەو کۆنفرانسەی ماوەتدا بەشداریم نەکرد، هەم پێم باش نەبو، هەم کاروباریی پێشمەرگایەتیم هەبو، چونکە ئەمزانی بڕیاری توندی تێدا ئەدرێت، من لەگەڵ ئەو جۆرە نەبوم، وەکو پێشتر باسمکرد.

کۆنفرانسەکە بڕیاریدا، وەفدێک بنێرێت بۆ لای مەلا مستەفا، ئەویش رەفزی کرد گوتی: "من خۆم حیزبم، هەمویان دەرکراون"، بەڕەئی من ئەوە چاک تەقدیر نەکردن بو وەک پێی ئەوترێت (Over Estimate and Under Estimate) (بە گەورە گرتن و بە بچوک گرتن) ئەو وەختە مەکتەبی سیاسـی (Over Estimate)

ی هێزی خۆی زۆر گەورە و بەهێز تقدیر ئەکرد، واتا زیاد لەپێویست تەقدیری هێزی خۆی ئەکرد، وەک پێویست تەقدیری هێز و جوڵانەوەی مەلا مستەفای نەدەکرد! وای ئەزانی مەلا مستەفا زاتی ئەوەناکات شەڕ بکات و شەڕی براکوژی بنێتەوە و پەلاماری حیزب بدات و لە مەکتەبی سیاسی بدات و هێز بەکاربهێنێت لە چارەسەری ناکۆکییەکاندا. ئەوان پێیان وابو کە بارزانی ناتوانێت ئەو ئیشە بکات، کەچی کردی و گوێشی نەدایە هیچ شتێ.

مەکتەبی سیاسی قەناعەتی وابو، پێشمەرگە بە فەرمانی مەلا مستەفا نایەتە سەر مەکتەبی سیاسی، بەڵام کە مەلا مستەفا خۆی و چەند سەد بارزانیەک هات و دو سێ هەزار عەشایری هێنا، پێشمەرگەشی راپێچیکرد لەگەڵ خۆیدا.

راستیەکەی کۆمەڵێک خەڵک بەنابەدڵی هاتبون، هەندێکیان نامەیان بۆ ئەنوسین و ئەیانگوت، ئێمە بەزۆر هاتوین، پێمان ناخۆشە شەڕی ئێوە بکەین، ئەوەبو لە هەندێ شوێن هەر تەقەشیان نەکرد، بەڵام جەبهەکە ئەوەندە فراوان بو، کە بۆی نەدەگیرا.

کەپەلاماری مەکتەبی سیاسیاندا، هیچ رێگایەکمان نەبو، یان ئەبو شەڕ بکەین و شەڕێکی ئیبادە و یەکتر کوشتن، یان ئەبو بکشێینەوە بۆ ئەودیوی ئێران بۆ دیوی ئالان. پێی دەڵێن ئالانی عێراق و ئالانی ئێران، روبارێکی بچکوڵە لە نێوانیاندا هەیە، زیاتر لە زستاندا ئەبێتە روبار و هاوینان ئاوێکی کەمی پێدادێت. ئەوەبو ئێمە لەم بەری روبارەکەوە چوینە ئەوبەریەوە، واتا جیاوازییەکە ئەوەبو لە گوندی ئەمبەرەوە چوینە گوندەکەی ئەوبەر.

لەدیوی ئێران گردێک و شاخێکمان گرت و چوینە پشتی بێتوش و شاخەکەمان گرت، ئەگەر مەلا مستەفا بیویستایە بێتە سەرمان ئەبوایە هەمو هێزەکەی جارێکی تر بچێتەوە سلێمانی و لەوێوە بێتەوە قەڵادزێ.

کە ئێمە گەیشتینە ناو خاکی ئێران، هەر ئەوەندەمان زانی ئێرانییەکان کەوتنە خۆیان، لە سەرەتادا هەواڵیان نارد کە ئێمە بۆ هاتوین؟ بۆ رۆژی دواتر هەستاین، تەماشامان کرد یەک لیوای عەسکەری ئێرانی لە دەورمان چادری هەڵداوە.

ئەفسەرێکی ناسراوی کورد بەناوی (سمکۆ عەلی یار) کە ئێستا لە سویدە و خزمی بنەماڵەی سەلاحەدینی موهتەدیە، خەبەری داینێ، ئەو وەختە مولازمی یەکەم بو، گوتی: دەورەتان ئەگیرێت، بەیانی کە هەڵساین دەوریان گرتبوین، وەفدێکی ئێرانی هات بۆ لامان و پێی راگەیاندین کە ئێمە چی ئەکەین و چۆن

سنوری ئێرانمان بڕیوە؟ ئەوە وڵاتێکی ترە و کارێکی نایاساییمان کردوە، ئێمەش پێمان گوتن کە بە ناچاری هاتوینەتە ئێرە.

*** ئەوە چ مانگێک بو، و چۆن دەریان نەکردن؟**

– پێم وایە ناوەراستی تەموز بو، من و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەریی گفتوگۆمان لەگەڵ کردن، یەکەمجار من قسەم کرد، دواتریش عومەر دەبابە، گوتمان ئێمە ناچاربوین و ئەو شەش سەد، حەوت سەد کەسە یان دەکوژراین یان ئەبوایە کورد، کورد بکوژێت، بۆیە بەچاکمان زانی هاتینە ئێرە، هیچ نیازی خراپمان نیە لەگەڵ ئێراندا.

ئەوانیش مۆڵەتیان دایێ و گوتیان لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا پێویستە ئێرە بەجێبهێڵن، گوتمان ئەو ماوەیە زۆر کەمە، ئێمە ماندوین، پێویستیمان بە حەسانەوە هەیە، بە هەزار حاڵ قانیعمان کردن، یەک حەفتە رێمان بدەن کە لەوێ بین. ئەوانیش هەمو رێگاکانیان لێ گرتبوین بۆئەوەی ئێمە هیچ مەجالی پەیوەندیمان نەبێت بە هیچ لایەکەوە و نەتوانین دەرچین و جوڵە بکەین[1].

هەر لەو کاتانەدا وەفدێک هات بۆ ناوبژی بە سەرۆکایەتی ساڵح یوسفی.

*** بۆچی ساڵح یوسفی لای بارزانی مابۆوە؟**

– ساڵح یوسفی لەوێ مابۆوە، بەڵام هیچ چالاکییەکی نەبو، پەیوەندی لەگەڵ ئێمەش هەبو، هەروەها نەچوبوە کۆنگرەکەی مەلا مستەفاوە، لە ئەندامانی سەرکردایەتی کەس بەشدارنەبو، هەتا حەبیب کەریم نەچوبو، دوایی حەبیب کەریم بو بە لێپرسراو، ئێستا بۆت ئەگێڕمەوە چۆن کرا بە سکرتێری پارتی.

حەبیب کەریم، بە ئستیفزازیی زەبیحی بو بە پارتی، عەبدولرەحمانی زەبیحی پیاوێکی توندوتیژیی دەست قایمی زۆر گیربو، لێپرسراوی دارایی بو، حەبیب مانگی ١٥ دیناری هەبو وەک کادێری پارتی، چوبو بۆ بەغدا، زەبیحی پارەکەی لێبڕی و گوتی: "کاکە پانزە دینارەکەم لێمەبڕن، هەر هیچ نەبێ تا ئەچمەوە سەر وەزیفەکەم"، حەبیب داخوازییەکی پێشکەشکرد بۆئەوەی ببێتەوە بە موزیع لە بەغدا، ئەوە بو زەبیحی قبوڵی نەکرد پارمەتییەکەی بڕیبو.

لەو کاتەدا، مەلا مستەفا لە دوای ناردبۆوە، ببێت بە سکرتێری حیزب، ئەویش لە داخی زەبیحی گوتی: "مادام تۆ یارمەتییەکەم نادەیتێ، ئەوا منیش کاری وا وەردەگرم کە پێویستم بەتۆ نەبێت"، ئەگینا حەبیب خۆی زۆر دژی مەلا مستەفا

بو، حەبیب دو تەعبیری شائعی هەبو لەناو بزوتنەوەی کوردایەتیدا، من خۆم قەت ئەو تەعبیرانەم بەکارنەهێناوە، یەکێکیان کاغەزەکەی کە بڵاومانکردبۆوە بۆ شەمسەدین موفتی نوسیبو، باسی مەلا مستەفا ئەکات کە گوایە عەشائیریە و دژی حیزبە و وائەکات، کۆتایەکەی بەوە دێنێتەوە (بارک الله بهذا الزعیم الهمشري) ئەوە ئێستاش کاک کەمال فواد ئەیلێتەوە.

هەروەها لای عومەر دزەیی و هەندێ برادەری تر گوتبوی کە لە ئێستگەی ماوەت پێکەوە ئیشیان ئەکرد، من قەت جنێوی وام نەداوە ئەو گوتبوی (بارزانی... معلبة)، عولبەیەکی جوان و رێکوپێکە، بەڵام (تفتحها تطلعلك ...) ئەو بەو شێوەیە قسەی ئەکرد.

خەڵک ناکۆکی ئەو رۆژەی ناونابو ناکۆکی نێوان حیزب و بارزانی، دوایی ئەوان ناویان لەئێمە نا جەلالی، دەنا یەکەمجار هەمو خەڵک ئەیگوت ناکۆکی نێوان حیزبیەکان و مەلاییەکان.

*** ئەنجامی سەردانی ساڵح یوسفی بۆ لای ئێوە چی بو، ئێوە هیچ پەیامێکتان هەبو بۆ رێکەوتن لەگەڵ بارزانی؟**

– کە وەفدەکەی مەلا مستەفا هاتە لامان بۆ ئێران، لەوێ دو پێشنیازمان پێشکەشکردن، یەکێکیان ئەوە بو، با مەلا مستەفا رێگەی ئێمە بدات بچینە بارزان بۆ لای شێخ ئەحمەد و لای ئەو دادەنیشین. ئەگەر مەلا مستەفا شەڕی دژی حکومەت کردەوە، ئەوە دێینەوە پێکدێینەوە، ئەگەر مەلا مستەفا پێکهات لەگەڵ حکومەت، ئەوا ئێمە بۆخۆمان سەربەست ئەبین لەو کارەی کە ئەیکەین، ئەوەبو کە مەلا مستەفا ئەو مەرجەی قبوڵ نەکرد.

مەرجی دوەم ئەوەبو کە لە جێگایەک دادەنیشین بۆ خۆمان و ناوچەیەک پێکدێنین، بۆ نمونە لە ناوچەی بەمۆ، یان قەرەداغ، یاخود هەر کوێیەکی تر بێت، هەر لایە کاری خۆی بکات و هەردولاش ناوی حیزبەکە بگۆرێت.

*** ئایا بارزانی مەرجەکانی ئێوەی قبوڵ کرد؟**

– بارزانی هەمو پێشنیازەکانی رەتکردەوە، باسکردن لە گەڵیدا هیچ سودی نەبو، مەلا مستەفا لەسەر بۆچونی خۆی سوربو، ئەو تەسلیمبونێکی ئەویست کە بچینەوە دانیشین و لە هەرکوێ دامان ئەنێن و چیمان پێ ئەکەن رازی بین.

کە ماوەکە تەواوبو، ئێرانیەکان رێیاندایین بگەرێینەوە کوردستان، ئەوەبو

هاتینەوە ناو خاکی کوردستان، چوینە سورکێو و لەوێ ماینەوە، دوای هەفتەیەک دیسان مەلا مستەفا هێزی لەسەر کۆکردینەوە، دیسان شەڕ قەومایەوە، پاش ماوەیەک تەماشامان کرد کە هەمو ڕۆژی یەکتر کوشتن سودی نییە، بۆیە ناچاربوین، پەیوەندی بە ئێرانیەکانەوە بکەین، پێمانگوتن ڕێگامان دەدەن بێینە ناو ئێرانەوە، گوتیان بەڵێ باشە! گوتمان لەکوێ داماندەنێن، گوتیان لەسەر سنور داتاندەنێین.

ئێمە چوینە ناو ئێران، بەیانی کە هەستاین دەورەیان گرتبوین، گوتیان یەللا ئەتانبەین بۆ ناوچەیەکی دورتر، بۆ شنۆ، من ئەوەم پێ خۆشبو، بردنمان بۆئەو ناوچەیە، ئەمانتوانی لەوێوە بچینە لای شێخ ئەحمەدی بارزان، ئەگەر نزیک ئەو بوینایە، مەلا مستەفا نەی ئەتوانی بێتەسەرمان، پێمان باشبو، لە بارزان پەنا بەرین بۆ شێخ ئەحمەد لەجێی ئەوەی پەنا بەرین بۆ ئێران.

ئەوان لەجیاتی ئەوەی بمانبەنە شنۆ، ئێمەیان بردە سەقز، و لەوێ وەک دەستبەسەر وابوین[٢].

# پەیوەندی بارزانی لەگەڵ ئێران

*** ئەی بارزانی لەوکاتانەدا، هەوڵی نەدا خۆی پەیوەندیی لەگەڵ ئێراندا دروستبکات؟**

– لەو ماویەدا (حەسەن پاکرەوان) مودیری ساواکی ئێرانی، چوبو بۆ لای مەلا مستەفا، مەلا مستەفا پێی گوتبو، "من دۆستی ئێرانم، ئێرانم خۆش ئەوێ، جەماعەتەکەی تر حیزبین، ئەوانە چەپ و مارکسین، من ئامادەم ئێستا لەگەڵتاندا پێکبێم، ئەگەر یارمەتیم بدەن دژی حکومەتیش دەوەستم، بەڵام ئەوانەم لەکۆڵ کەنەوە".

ئەوانیش پێکهاتبون، دوایی یەکێک قسەیەکی بۆ کردین، ئەو لەسەر ئەو قسەیە، ملیان شکاند و لەهەمو ئیشێک دوریان خستەوە، کوردێک هەبو ناوی (عیسا پەژمان)، عەقید بو لە ساواک، خەڵکی سنە بو، ئێمەی خۆش ئەویست، بۆ زانیاری خۆت، ئەو کاتە دو کورد هەبون، لەلایەن ساواکەوە نێرابون، یەکێکیان

ناوی عەقید عەلی (سەرهەنگ مودەریسی) بو، کورەکەی ماوەیەک یەکێک بو لە سەرکردەکانی کۆمەڵە (مەبەست لە کۆمەڵەی ئێرانە)، پیاوێکی سنەیی بو. ساواک ئەوانەیان دانابو بۆ مەسەلەی کورد، هەردوکیان عەتفیان لەسەر ئێمە هەبو، ئەیانگوت، کە ئێمە گەنجین، حیزبین، مونەزەمین و مەلا مستەفا عەشایەرییە و بزوتنەوەی عەشایەری هیچ کات سەرناگرێ.

عیسا پەژمان هات بە دزییەوە پێی گوتین: "کاکە من شتێکتان پێ ئەڵێم، بەڵام ئەو قسەیە ئاشکرا بکرێ من ئیعدام ئەکرێم"، ئێمەش وەعدمان دایە کە هەمو بەرگریەکی لێ بکەین و قسەکانیشی نەدرکێنین. قسەکە ئەوە بو گوتی: "شا بڕیاری داوە لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێت، من خۆم لە کۆبونەوەکەدا بەشداربوم، شا وا بیردەکاتەوە کە مەلا مستەفا نەفەرە و سەرۆکی عەشیرەتە، رێککەوتن لەگەڵیدا ئاسانترە لەوانەی تر، ئەمانە حیزبین، تۆ ئیمرۆ لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد رێک ئەکەوێت، سبەینێ حیزب ئەیەوێ سیاسەت بگۆڕێ بڕیارێک دەرئەکات و ئەڵێ ئیبراهیم ئەحمەدم لابرد لە سکرتێر و نوری ئەحمەدی تەهام لە جێگەی دانا، ئەوانە حیزبین نە فێڵێکیان بە کۆمەڵ لێ ئەکرێت، نە ئیستیغلال ئەکرێن، تەعامول لەگەڵ یەک نەفەر شێخی عەشیرەتیش بێ باشترە، بەتایبەتی ئەوانە کوردایەتی ئەکەن و ئەفکاری چەپیان هەیە، مەلا مستەفا یەک شێوە ئەمێنێتەوە، لەبەرئەوە، شا بڕیارپێداوە لەگەڵ ئەو تەعامول بکات"[٢].

مەلا مستەفا گوتبوی، نابێ ئەوانە لە کوردستانی ئێران بمێننەوە، ئێرانییەکان هەستان شەوێک بەزۆر ئێمەیان برد بۆ هەمەدان، ٤٠٠-٥٠٠ کەس بوین، هەمومانیان لە هەمەدان لە ئۆردوگایەک دانا و گوتیان ئێوە لێرە پەنابەرن و چەکەکانیان لێ سەندین، ئیتر کەوتینە ناو داوی ئێرانەوە.

*** چۆن ئێوە ئەو بڕیارەتان قبوڵکرد، بۆ نەگەڕانەوە بۆ کوردستان، بۆ هەوڵتان نەدا وەفدێک بنێرن بۆ لای بارزانی؟**

– ئێمە هەندێکمان ئەمانویست لەوێ رزگاربین، من و حیلمی عەلی شەریف و چەند برادەرێک ئەمانویست بێینەوە بۆ لای خۆمان و ئیشی حیزب بکەین، عەلی عەبدوڵڵا و عەلی عەسکەری و عومەر دەبابەش لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بمێننەوە و کەمال موفتی و رائید حەمەدەمین فەرەج و چەند برادەرێکی تر سەرپەرشتی بکەن، مامۆستا ئیبراهیمیش لە تاران بمێنێتەوە.

یەک حادیسەی گرنگم لەبیرچو بۆت بگێڕمەوە، لە باسی ناکۆکی حیزبدا، ئەویش لە پاش ئەوەی، کە نوری شاوەیس ئەو بەزمەی کرد و جارێکی کە ئێمە چوینەوە ماوەت. کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسیمانکرد و بڕیارماندا وەفدێکی تر بنێرینەوە بۆ لای بارزانی بۆئەوەی پێکبێینەوە.

# یەکەم گفتوگۆی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی

*** ئێوە لەنێو خۆتاندا کێتان دەستنیشان کرد بە نوێنەرایەتی بچن بۆ لای بارزانی؟**

- ئەوە لە مانگی حزیرانی ١٩٦٤ بو، من ئەندامانی وەفدەکەم پێشنیازکرد، یەکەم گوتم: با دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی بچێ، بە ئیعتباری ئەوەی سەید عەزیز رەفیقی بارزانییە و خۆی لە بنەماڵەی شێخی نەهریە و مەلا مستەفا زۆر حسابیان بۆ ئەکات، ئەسڵەن بارزان لە ناحیەی دینەوە تابیعی ئەوان بو (لە روی ئاینییەوە رێبازی نەقشی بوە).

دوهەمیشیان ئەو رەفیقی بو، سەید عەزیز کە قسەی لەگەڵ مەلا مستەفا ئەکرد پێی دەگوت مەلا مستەفا، بەڵام ئێمە پێمان ئەگوت ئەزبەنی، جەنابت و ئەو وەکو رەفیق قسەی لەگەڵ ئەکرد.

سێیەم: عەلی عەبدوڵڵا، بچێ چونکە عەلی عەبدوڵڵاش هەمیشە باسی ئەوەی ئەکرد، پێویستە سنورێک بۆ مەلا مستەفا دابنرێت، ئێمە مساوەمە ئەکەین لەگەڵ مەلا مستەفادا و مەبدەئی نین، منیش گوتم: با ئەو بچێ مەبدەئەکانی تەتبیق بکات، کەمال محێدینیشمان لەگەڵیان نارد.

کە وەفدەکە چون بۆلای مەلا مستەفا، نەک پێکنەهاتن و رێکنەکەوتن، بەڵکو مەلا مستەفا توڕەبو، عەلی عەبدوڵڵا و کەمال محێدینی خستە زیندانەوە، سەید عەزیز لەبەرئەوەی ماڵی نەهریی بو تەوقیفی نەکرد و سواری جێبێکی کرد و ناردیەوە بۆ حاجی ئۆمەران و تەسلیمی ئێرانی کرد کە کوڕی سەید عەبدوڵڵا فەندی لەلای ورمێ دادەنیشێ و گوتی: ئەوە کوڕەکەت بالای خۆت بێت، بەو شێوەیە سەید عەزیز لە عێراق دەرکرا.

مەلا مستەفا، ماوەی هیچ جۆرە چارەسەرێکی نەئەدا، عەلی عەبدوڵلاشی بە تەوقیفی لەوێ هێشتەوە، هەتا ئێمە رۆیشتینەوە بە بەندی مایەوە، دوایی لە بەندیخانە بە کەفالەت بەریاندا و چوەوە ناوچەی هەولێر و کۆیە و لەوێ دانیشت.

ئەوە ئاخر هەوڵدان بو بۆئەوەی یەک بگرینەوە و تێک نەچین، بەڵام کاتێ من و حیلمی ئەمانویست بێینەوە کوردستانی عێراق، ئێرانییەکان نەیانهێشت، ئەوەبو من مانمگرت لە خواردن، خەبەریشم دانێ گوتم: "تا مردن مان ئەگرم، یان ئەمگرن، یا ئەگەر بەندنیم، ئەوا رێگام بدەن و ئازادم بکەن کە برۆم".

رۆژی یەکەم گوێیان نەدامێ، دوەم، سێیەم، بەڵام چوارەم وەزعم خراپ بو، هاتن بۆلام و گوتیان: ئەوە کارێکی باش نیە، گوتم "یا ئەمرم، یا رێگام پێ ئەدەن لە ئێران برۆم"، برادەرانی خۆشمان مەوقیفەکەی منیان پێخۆش نەبو. منیش ئێرانیەکانم ئاگادرکردەوە، "چیتان لە دەست دێت بیکەن، ئەتوانن دوشت بکەن، یا تەسلیمی عێراقم بکەنەوە، ئەو کاتە ئەچمە بەندیخانە لە نوگرە سەلمان کە لێرەم پێ باشترە، یاخود ئەچمە دەرەوە بۆ ئەوروپا".

رۆژی حەوتەم، وەزعم زۆر خراپ بو، هاتن گوتیان "لەبەرئەوەی شا رەزامەندی دەربریوە و لەسەر وەعدی شەرەفی شا وەعدت ئەدەینێ ئیزرابەکەت بشکێنە، ئەتنێرین بۆ دەرەوە، بەڵام خۆت پاسپۆرت پەیدابکە"، منیش قبوڵمکرد و ئیزرابەکەم شکاند.

پەساپۆرتەکەشم بەو جۆرە پەیدا کرد: جەلال بەگی جاف، قونسوڵی عێراقی بو لە کابول، سەردار جاف لە ئێران ئیشی ئەکرد خزمیشی بو، ئێمە مەسرەفی سەفەرەکەیماندا و ناردمان بۆلای جەلال بەگی جاف و ئەویش دو پاسپۆرتی بۆ ناردین.

بە یارمەتی ئەو، من بوم بە خاوەنی پاسپۆرت، لەو ماوەیەدا، ئێرانیەکان هاتن و گوتیان بۆئەوەی بە دڵشکاوی نەرۆیت سەفەرێکیان بۆ رێکخستم و بردمیان بۆ باکوری ئێران و گەڕانیانم لەسەر دەریا و زۆر شوێنی خۆشیان بردم و دوای ئەمانە، سەفەرم کرد بۆ دەرەوە.

رێگای من و سەید عەزیزیاندا، بێینە دەرێ، رێگای کاک حیلمیان نەدا، بەمجۆرە لە ئێران رزگارمان بو.

*** هیچ هەوڵێکتاندا، پەیوەندی لەگەڵ ئێران دروست بکەن، ئەی بارزانی هیچ پەیوەندیەکی سیاسی لەگەڵ ئێران هەبو؟**

- بۆ حەقیقەت و بۆ مێژو، ئەو پەیوەندیەت بۆ باس ئەکەم چۆن بوە کە ئێمە

دژی عەبدولکەریم قاسم هەڵسابن، ئەو جەماعەتەی، بە ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان- مەکتەبی سیاسی) ناسرابو، هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ ئێران نەبو، بە پێچەوانەوە ئیتیجاهاتی مامۆستا ئیبراهیم و نوری شاوەیس و حیلمی عەلی شەریف و ئەو برادەرانە زۆر دژی ئێران بون. لە نوسینیشدا زۆر بە توندی باسی ئیستیعمار و ئێرانیان ئەکرد. مەلا مستەفا پێش هەڵگیرساندنی شۆڕش لەگەڵ هەندێ لە عەشائیری پشدەر و کاکە هەباسی مامەندئاغا پەیوەندیان کردبو بە ئێرانەوە، بەهۆی جەنەراڵ وەهرامەوە، ئەو لە مەهاباد بو، مەلا مستەفا پیاوێکی ناردبو بۆلای، ناوی عەبدولڕەحمان ڕوتە بو. عەبدولڕەحمانە ڕوتە کادێرێکی حیزبی بو، کوڕی خاڵی عەلی عەبدوڵڵایە، ئەو خۆی بۆ عەلی عەبدوڵڵای گێڕابۆوە، گوتبوی وەڵڵا شتێکی وابو، هەمو برادەران ئەیان زانی گوتبویان داپۆشن، با ئەو خەبەرە دەرنەکەوێ.

ئەوە پێش هەڵگیرسانی شۆڕش بو بە ماوەیەک، کە شۆڕش هەڵگیرسابو مەلا مستەفا جارێکی کە پەیوەندی بە ئێرانەوە کردبۆوەو، بەڵام نازانم بەهۆی کێوەبو، یەکێک ئەیگوت بەهۆی ئاغایەکی هەرکییەوەبوە، بە تایبەتی ئەو کاتە مەلا مستەفا لە ناوچەی حاجی ئۆمەران بو، نزیکی سنور بو، لەوێ هاتوچۆیەکی دروستکردبو لەگەڵیان، بەڵام نازانین ئەنجامەکەی چی بو؟.

لەپڕ دو روداو ڕویدا، یەکێکیان، سەیدای یوسفی لە بەغداوە نامەیەکی نوسی ئەڵێت: "من لە ماڵی بورهان بەگی جاف مولحەقی عەسکەریی ئێرانم دیوە، ناوی عیسا پەژمانە و کوردە، خەڵکی سنەیە، باسی ئەوەی کردوە، ئێمە ئامادەین رادیۆشتان بدەینێ و یارمەتیشتان بدەین، ئەگەر پەیوەندیمان پێوەبکەن".

حیلمی عەلی شەریف، لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی بو کە باسکرابو، مامۆستا ئیبراهیم، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوڵڵا و نوری ئەحمەدی تەها، دژی ئەو پەیوەندییە قسەیان کردبو، گوتبویان کە ئێمە بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی لەگەڵ ئێران ناکەین، من رەئیم وابو، با پەیوەندی بکەین و گوتم چی تێدایە، با کۆبونەوەی لیژنەی مەرکەزی بکرێت، لەوێ بڕیاری لەسەر بدرێت، بەڵام مەرجەکەی برادەران ئەوە بو کە پێویستە سۆڤێت رازی بێت، چونکە ئەوکاتە پەیوەندیمان لەگەڵ سۆڤێت زۆر باشبو، یارمەتیشمان لێ وەرئەگرتن.

من گوتم با پرسێک بە سۆڤێت بکەین و بزانین سۆڤێتییەکان ئەڵێن چی؟ لەسەر ئەو بۆچونەی ئەوان ئەتوانین مامەڵە بکەین، بێگومان من رەئی مەلا مستەفاشم ئەزانی کە ئەویش لەگەڵ ئەو جۆرە پەیوەندیانەیە، وەڵاممان بۆ ساڵح

یوسفی ناردەوە کە (م.س) جارێ ئەو پەیوەندیەی قبوڵ نیە و ڕاگرتنی باشترە تا کۆبونەوەی فراوانی بۆ ئەکەین.

*** ئایا بارزانی پێش ئەو کاتە، پەیوەندی بە ئێرانیەکانەوە کردبو؟**

- بەڵێ، مەلا مستەفا لە ١٩٦٢دا پەیوەندی بە ئێرانیەکانەوە کردبو، هەوڵی دابو، نوێنەری خۆی کە عەلی عەسکەری بو، بنێرێت بۆلایان، بەڵام ئێرانیەکان گوتبویان واباشە ئەگەر حیزبیشی لەگەڵدابێت، پێشنیازیان کردبو، عومەر دەبابە وەک نوێنەری مەکتەبی سیاسی بچێت.

مامۆستا ئیبراهیم، وەڵامی دایەوە، ئەوان ڕازی نین نوێنەر بنێرن، ئەگەر مەلا مستەفا خۆی ئەینێرێت، ئەوە لەسەر مەسئولیەتی خۆیەتی.

ئەوسەردەمە، مەلا مستەفا پێی وابو، مامۆستا ئیبراهیم بەبێ ڕوسەکان ئاو ناخواتەوە، لەبەرئەوە بە خەتی خۆی نامەیەکی بۆ نوسیبو، ئەڵێ: "برای خۆشەویست ئیبراهیم، تۆ لەسەر مەسئولیەتی من عومەر بنێرە، ئەگەر ماڵی مام گلەییان کرد، بڵێ مستەفا گوتی"، واتا ئەو بەرپرس ئەبێت بەرامبەر سۆڤێت.

پێموایە، مەلا مستەفا پرسێکی سۆڤێتی کردبو، ئەوان ڕازی بوبون، چونکە کە من لە ساڵی ١٩٦٣ دا چوم بۆ مۆسکۆ، پرسم پێکردن گوتیان: جگە لە ئیسرائیل ئەتوانن پەیوەندی بە هەمو دەوڵەتێکی دنیاوە بکەن، بەو مەرجەی ئاگادارمان بکەن.

## ڕۆڵی ئێران لەناو بزوتنەوەی کورددا

*** ئەو سەردانە بۆ ئێران کەی بو، هیچ ئەنجامێک و بەرهەمێکی سیاسی هەبو؟**

- کۆتایی ١٩٦٢ بو، هیچیان بۆ نەکردن و هەندێ گێڕابونیان و گوتبویان هەمو شتێک بەندە بەوەی ئیبراهیم ئەحمەد بێت بۆ ئێران، چونکە ئەو سکرتێری حیزبە، شا ئەو یاخود مەلا مستەفا ئەبینێت.

کۆبونەوەمان کرد، مەلا مستەفا بە تەئکید نەی ئەتوانی بچێت. کە پرسی

پێکرا، گوتی با ئیبراهیم بچێت، چونی ئەو لە بەرژەوەندی کوردە کە خرایە دەنگدانەوە و زۆربەی لیژنەی مەرکەزی رازیبون، تەنها سێ کەس دژ بون، ئەوانیش مامۆستا ئیبراهیم، نوری شاوەیس و حیلمی عەلی شەریف، ئەو سێ ئەندامە دەنگیاندا کە نەچێ.

*** باشە ئێرانیەکان هیچ هاوکاریەکی شۆرشیان کرد؟**

– ئێمە بە زۆربەی دەنگ بریارماندا کە مامۆستا ئیبراهیم سەفەربکات، ئەویش لەو سەفەرەدا شای نەدی، تەنها هەندێ کاربەدەستی تری بینیبو، ئەوانیش بەڵێنیان دابویە کە هاوکاری بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی شا ئاگاداری ئەوەبو کە لە بەغدا کودەتا لە دژی عەبدولکەریم قاسم ئەکرێت، بۆیە هیچ بەڵێنێکیان جێبەجێ نەکرد، تەنها ١٠٠ تفەنگی برنەویان بە دیاری دابویە، تفەنگەکانمان بەو شێوەیە دابەش کرد ٥٠ مان نارد بۆ مەلا مستەفا ٢٥ی بۆ شێخ ئەحمەد ٢٥ی بۆ حیزب.

ئەوە هەمو ئەو پەیوەندییەبو کە ئێمە لەگەڵ ئێراندا هەمانبو، تا ئینقلابی شوبات قەوما و عەبدولکەریم لاچو و کودەتای بەعس کرا.

ئێرانییەکان هەڵوێستیان گۆڕی، چونکە ئەوان پشتیوانی کودەتاکەیان کرد، بەتایبەتی پێیان خۆشبو، باڵی بەعس سەرکەوێت بەسەر باڵی عەبدولناسردا، چونکە ئێران زۆر لە دژی عەبدولناسر بو.

ئەمەریکا، وڵاتانی رۆژئاوا و هەندێ وڵاتی عەرەبی بە تایبەتی کوێت، پشتگیری ئەو کودەتایەیان کرد و پێیان باشبو کە کەریم قاسم لاچێ و مەسەلەی نەوت ببرێتەوە و کوێت وەک وڵاتی سەربەخۆ دانی پێدابنرێت.

ئێران، هەمو بەڵێنەکانی خۆی بۆ ئێمە راگرت، زۆر ناڕەزاییشیان نیشاندا لەسەر چونی من بۆ لای عەبدولناسر، یەکێک لە هۆکانی ئەوەی، مەلا مستەفا پێی ناخۆش بو کە من چوم بۆلای عەبدولناسر و بن بێللا ئەوەبو، دەیگوت ئێران پێی ناخۆشە، لەسەر ئەو پەیوەندییە توشی قڕە ئەبین لەگەڵ ئێراندا.

مەلا مستەفا بە ئاشکرا لێدوانی ئەدا لە دژی سەفەرەکەی من، مەبەستیشی ئەوە بو کە ئێران بیبیستێتەوە کە ئەو رازی نییە لەسەر ئەو چونەی من.

*** وەک باسکرد، بەرژەوەندی ئێران زیاتر لەوەدابو، پەیوەندی لەگەڵ بارزانیدا بکات نەک لەگەڵ ئێوە، بۆچی پەیوەندی لەگەڵ ئێوە کرد، ئەو پەیوەندییە بەرەو کوێ رۆیشت؟**

– مەلا مستەفا پەیوەندیەکی راستەوخۆی لەگەڵ ئێران دروستکردبو، ئێران

ئەوی تەبەنی و قبوڵکرد و ئێمەی وەکو پەنابەر وەردەگرت. ئەوان رەئیان لەسەر من خراپ بو، منیان بە گەنجێکی توندڕەوی چەپڕەو ئەزانی، هەرچەندە من ئەو کاتە بە راستی وەکو سۆفی وابوم، مەشروباتم نەدەخواردەوە، نە دەچومە سینەما، خەریکی کتێب و مەکتەبە و ئەو جۆرە کارانە بوم، منیان بە مەترسی ئەزانی، واتا دەستەمۆ نەدەکرام، لەبەرئەوە ناوی من لە دۆسیەی ئێرانییەکاندا باش نەبو، واتا لای ئەوان ناوم لە لیستی توندڕەو و چەپڕەوەکاندا هاتبو.

دیارە لە دوای ئێمە، پەیوەندییەکە لەگەڵ مەلا مستەفا مایەوە، ئەو پەرەی پێدا و پتەوی کرد. کە ئێمە چوینە ئێران و ئەو هەڵسوکەوتە خراپەمان لێ بینین ئەو شیعرەی سالممان لەبەرکردبو:

لەگەڵ دڵ شەرتە سالم گەر نەجاتم بێ لە تارانا

بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ڕەی، بە ئێراندا گوزەر ناکەم

ئەو شیعرەمان لەبەرکردبو، کە هاتمە دەرەوە بەو ئینتیباعە کە پەیوەندی لەگەڵ عێراق زۆر باشترە لەو پەیوەندیە لەگەڵ ئێران و ئەو مامەڵە نابەجێیەی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا ئەیکەن.

زۆر لە برادەران بە گەرمی بەرەو ئەو خەتە ئەچون، ئەوترا هەرچۆنێک بێت حکومەتی خۆمان باشترە لەوان، هیچ نەبێت سەر بە عەبدولناسرە، هیچ نەبێت نیشتمانیە، هیچ نەبێت دژی ئیستیعمارە، هیچ نەبێت لە بەرەی میللەتانە و هیچ نەبێ لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت دۆستە، بەڵام ئێران وا کۆنەپەرستە، لە سەنتۆدایە، ئیستیعمارە و قازی محەمەدی کوشتوە.

*** باشە کە وەزعەکەتان وابو، بۆ نەگەڕانەوە بۆلای حکومەتی بەغدا، هیچ هەوڵێک لەو جۆرە هەبو، تا پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی عێراق دروست بکەن؟**

– ئەو ئیتیجاهە لەناو ئێمەدا پەیدابو، کە باشترە لەگەڵ عێراقدا قسە بکەین، لەبەرئەوە، کە من هێشتا لە تاران بوم، مولحەقی عەسکەری عێراقی هات، لە ماڵی سەردار جاف داوای دیتنی منی کرد، برادەران رەزامەندبون لەو بینینە. کابرایەکی سامەڕائی بو، لەوێ پێمگوت: کە ئێوە ئێمەتان والێکرد، کاری خراپتان کرد، تاهیر یەحیا پەشیمان بۆوە و هەڵەیەکی گەورەی کرد، من خۆم بەش بە حاڵی خۆم زیندانی نوگرە سەلمانی عێراق بە باشتر ئەزانم لەوەی لە ئێران بمێنمەوە.

قونسوڵ زۆر موعجیب بو بەو قسانە، هەستا ماچی کردم و گوتی: "ئەوە ئەو

پەری نیشتمان پەروەرییە، من ئەم مەسەلانە ئەگەینمە بەغدا".

هەڵوێستی ئێران، کاردانەوەیەکی سەلبی لەسەر ئێمە پەیداکردبو، هەروەها کاریگەریی هەبو لە بڕیاری پێکهاتن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، دوایی بە درێژی بۆت باس ئەکەم.

هەمو برادەرانی ئێمە، کە لە ئێران گەڕانەوە، دڵپەست و داخ لەدڵ بون، ئەو وەختە حکومەتی عەبدولسەلام راستە دیکتاتۆربو، بەڵام بە نیشتمانپەروەری حسێب ئەکرا و دۆستی عەبدولناسر بو، وا ناسرا بو، لە بەرەی وڵاتانی رزگاریخوازە.

*** دوای ئەوەی لە ئێران پەساپۆرتت وەرگرت، بەرەو کوێ چویت؟**

- راستەوخۆ بەرەو بەرلین هاتم، ئەوەبو ئەو ساڵە بو کە گوتم لە شەقامی Hollsteinischestr لە بەرلینی رۆژئاوا ژورێکم گرت و تا ساڵی داهاتو ١٩٦٥دا لەوێ مامەوە.

# دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ حکومەت

*** لەو ساڵەدا، واتا ١٩٦٥ پەیوەندی نێوان حکومەت و بارزانی تێکچو، ئایا هەڵوێستی ئێوە چی بو، هەوڵی رێکەوتنتان نەدا لەگەڵ بارزانی؟**

- لە بەهارەکەیدا، حکومەت لەگەڵ مەلا مستەفا تێکچو، جەنگی راگەیاند و لەگەڵ مەلا مستەفا کەوتەوە شەڕەوە، ئێمە یەکسەر وەفدێکمان نارد بۆلای مەلا مستەفا، گوتمان: "ئێمە ئامادەین بێینەوە لەژێر سەرکردایەتی تۆ خەبات بکەین"، ئەویش گوتی: باشە بەخێر بێنەوە، بیرمانکردەوە، ئێمە چی بکین؟ دو مەرجمان دانا، گوتی: "وەرنەوە دوای شەش مانگ یا پێکدێینەوە و حیزب ئەکەینەوە یەک و ئیشتان دەدەمێ یا خود حیزبی خۆتان دروستبکەن"[٤].

هەمو برادەران چونەوە و هەواڵیشیان بۆ من نارد، من لە دەرەوە بوم، چوبومە ئینگلتەرا، بەوشێوەیە ئێمە لە ئێران نەماینەوە و گەڕاینەوە عێراق و چوینەوە لای مەلا مستەفا.

*** با ئێستا باسی ئەوە بکەین کە ئێوە هاتنەوە بۆ کوردستان، چیتانکرد و چۆن خۆتان لەگەڵ بارودۆخە نوێیەکە گونجاند، هیچ هەوڵێکتان لەگەڵ بارزانیدا بۆ ئاشتبونەوە؟**

- جارێ پێکهاتنەوە باس ئەکەم، چونەوە باس ئەکەم، پێش ئەوە کە شەڕ لە نێوان حکومەت و بارزانی دەستپێبکاتەوە، حکومەت شەڕی لەسەرئەوە دەستپێکرد، چونکە حکومەت تەسلیم بونی تەواوی لە بارزانی ئەویست و بارزانیش نەیکرد.

ئەوەبو کە حکومەت پەلاماریدا، دیسان ئەمجارەش وەکو زۆربەی جارەکانی تر حکومەت شەڕی هەڵگیرسانەوە.

کە شەڕ هەڵگیرسایەوە، برادەران پەیوەندییان کرد بە بارزانی و گوتیان ئێستا هۆیەکی سەرەکی لە جیاوازیەکانی نێوانمان لاچو، ئێمە ئامادەین بەهێزی چەکدارمانەوە بێینەوە و بەشداری بکەینەوە.

وەفدێک لە ٦ تەموزی ١٩٦٥دا چو بۆلای مەلا مستەفا، پێکهاتبو لە عەلی عەسکەریی، عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف و چەند برادەرێکی تر، لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە پێکهاتبون:

یەکەم: برادەران بچنەوە ئەوێ، پێویستە هەمو ئەمین و مەحفوزبن، مەلا مستەفا کەس نەکوژێت و کەس نەگرێت و کەس ئازارنەدا.

دوەم: هەتا سێ مانگ، لەوێ ئەمێنینەوە، یان هەوڵدەین ببینەوە بە یەک حیزب، یان ئێمە بۆخۆمان سەربەستی ئیش کردنمان هەبێت، وەکو حیزبی شیوعی عێراقی کە لەوێ هەیبو. مەلا مستەفا لەسەر ئەو رەئیەبو، ئێمە بێینەوە و یەک بگرینەوەو و کێشەکان چارەسەر بکەین.

سێیەم: ئەوەبو کە ئەو پێشمەرگانەی کە ئەچنەوە، دابەش بکرێن بەسەر ناوچەکاندا، بە سەرکردایەتی برادەرانی خۆمان بەپێی لێوەشاوەیی لەناو هێزەکاندا ئیشیان بدرێتێ، ئیزگەکەش لای ئێمەبو، ئەوەشیان بدەینێ بۆ شۆڕش بەکاریبهێنن.

ئێمە مەرجەکانی خۆمان جێبەجێکرد، ئیزگەکەمان بۆناردن، برادەران چونەوە و چەکی زیادمان هەبو، بردمانەوە لەگەڵ خۆمان و تەسلیمی ئەوانمانکرد، برادەران دابەشبون بەسەر ناوچەکاندا و هەر ئیشێکی پێیان ئەسپێردرا زۆر بە رێکوپێکی ئەنجامیان ئەدا.

لەشەڕەکاندا زۆر دەوری دیار و ئازایانەیان نواند، چونکە زۆر بە ورەوە چوبونەوە، من نەختێک درەنگ پێ راگەیشتم، بەڵام منیش هەر لەگەڵ برادەران لە ئەوروپا بوم.

لە لەندەن گەڕامەوە، هەرچەندە نێوانمان لەگەڵ مەلا مستەفا باش نەبو، بەڵام کە چومە لەندەن هیچ قسەی خراپم لەسەر نەکردن، گوتم ئەو کێشانەی نێوان ئێمە، جیاوازیی یەک خێزانە و یەک بنەماڵەیە، قابیلی چارەسەرکردنە و بە زوترین کات چارەسەر ئەکرێت، گوتیشم: حکومەتی عێراق حکومەتێکی شەڕفرۆشە.

کە شەڕ بۆوە، دیسان من جارێکی کە لەوێوە دیعایەم بۆ مەسەلەی کورد کرد، هیچ قسەیەکی خراپم دژ بە مەلا مستەفا نەکرد، لە پارتی کرێکاران و حیزبەکانی تری ئینگلیزی خەڵکم بینی، هەروەها کاربەدەستانم لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی و رۆژنامەنوسانم زۆر بینی، لەهەمو ئەو بینینانەدا زۆر دۆستانە باسی پەیوەندی خۆمان و مەلا مستەفام دەکرد.

# ئاشتبونەوەی کاتی لە نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسیدا

*** دوای هاتنەوەتان بۆ کوردستان، بارزانی چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئێوەکرد؟**

– کە لە ئێران گەڕامەوە، لەگەڵ برادەران چوینەوە لای مەلا مستەفا، ئەوکاتە هێشتا مەلا مستەفا زۆر قینی لەمن نەبو، چوینەوە لای گوتی: "هەر دو سێ مانگ دانیشن، پاشان ئێمە بەیەکەوە دائەنیشینەوە قسەئەکەینەوە".

مەلا مستەفا جێگایەکی بۆ دانایین لە نزیک خۆی، لە ناوچەی باڵەکایەتی کە لەوێ بین، دوای ماوەکە تەواوبو چوینەوە لای و گوتمان: "ئەوە ماوەیەکە ئێمە بێ ئیش و بێ کار ماوینەتەوە"، وا رێکەوتبوین کە یا جیا ببینەوە یاخود چارەسەرێک بۆ گیروگرفتەکان بدۆزینەوە، ئەویش گوتی: "باشە ئێوە بڕۆن بۆ دۆڵەرەقە و بارەگای خۆتان لەوێ دانێن، منیش ماوەیەکی تر دێم بۆئەوێ، لەوێ بەیەکەوە دادەنیشین و قسە ئەکەین و کێشەکان چارەسەر ئەکەین".

ئێمە چوینە دۆڵەرەقە، پاش ماوەیەک مەلا مستەفا هات و ماوەیەک لەگەڵیا دانیشتین، وردە وردە بۆمان دەرکەوت، مانەوەمان بەیەکەوە هیچ سودی نیە، بە تایبەتی لەو ماوەیەدا، حەمید عوسمان هاتبو، ئەوکاتە ئەو لای حکومەت ئیشی

ئەکرد و موچەی هەبو، کاربەدەستی حکومەت بو، دەوری ئەوەی پێ سپێردرابو، کە نەیەڵێت ئێمە و مەلا مستەفا پێکبێینەوە.

چوبو کۆمەڵێک قسەی بۆ مەلا مستەفا کردبو، ئینجا حەمید عوسمان پیاوێکی زۆر زۆرزان بو، وەکو رێوی وابو، خۆی فەقیر و بەستەزمان نیشان ئەدا، بەڵام زۆر بنبڕ، فێڵباز، پیلانگێڕ و موتەئامیرێکی عەجیب بو، بەڕاستی لەوێ قسەی وای لە مەلا مستەفا گەیاندبو، ئەگەر لەگەڵ ئێمە پێکبێتەوەو حیزبمان بکەینەوە بەیەک، ئەوا مانای ئەوەیە، ئێمە دەست ئەگرین بەسەر هەمو شتێکدا، خەڵکی زۆر لەگەڵ ئێمە ئەبێت، دوەمیشیان، چونکە حیزبی شیوعی دەسەڵاتی کەمە و ئێمە زۆر خەڵکمان لەگەڵە، ئێمە ئەبینە سەنتەری هێز و نفوزێکی زۆر گەورە دروست ئەکەین.

*** هەڵوێستی بارزانی چی بو، ئایا ئەو تەنها بە قسەی ئەو خەڵکانەی ئەکرد کە ئەیانویست تۆوی ناکۆکی بچێنن، ئێوە بریاری کۆتایتان چی بو؟**

– مەلا مستەفا لە هەمو ئەو شتانەی، کە خۆی پەیمانی بە ئێمە دابو، پەشیمان بۆوە، ئێمەش پێمان گوت: "جەنابت هەندێ بەڵێنی ترت دابو کە جێبەجێی بکەیت، یەکێک لەوانە عەلی حەمدی و مەحمودی حاجی توفیق لەگەڵ هەندێ کادێری تر گیرابون، بەڵێنت پێ داین، بەریان ئەدەی، کەچی تا ئێستا هیچ روینەداوە".

گوتی: "من خۆم ئەچم بۆ ناوچەی ماوەت کە هاتمەوە، دادەنیشینەوە و کێشەکان چارەئەکەین و ئەوانەش بەردەدەم". کە بەوێدا چوبو، نەک بەری نەدابون، بەڵکو تەشدیدی تری کردبون و ئێمە خەڵکمان لەناو لایەنگیرانی مەلا مستەفادا هەبو، ئێمە خەڵکمان لەناو رێکخستنەکانی مەلا مستەفادا هەبو، هەروەها لەشکرەکانیشی خەڵکی ئێمەی تێدابو، تەنانەت لە مەکتەبی تەنفیزیش، لەبەرئەوە هەواڵەکانمان بەدەست دەگەیشت.

بەڕاستی مستەفا قەرەداخی دۆستی من بو، زۆر ئاگاداربو، هەواڵی بۆ ئەناردم و دەربارەی زۆر شت ئاگاداری ئەکردمەوە، شەش حەوت مانگی پێچو، هیچ دیار نەبو، واتا بەڵێنەکانی مەلا مستەفا هیچی دیارنەبو، ئێمەش هەرلەوێ مابوینەوە، کاتی خۆشی ئێمە وامان بریاردابو ئەگەر پاش شەش مانگ مەلا مستەفا کار نەدا بە برادەرانی سەرکردایەتی و لەگەڵمان پێک نەهات، ئەوا برادەرانی سەرکردایەتی رابکەن و بچنە شارەکان لەوێ رێکخستن و خەباتی نهێنی بکەن و لەبەردەستی مەلا مستەفا نەمێنن.

ئەوماوەیە بێ کار مابوینەوە، خۆمان وەک دەستبەسەر ئەهاتە بەرچاو، دوای شەش، حەوت مانگ، هەواڵێکی زۆر ناخۆشمان پێ گەیشت، گوایە عەلی حەمدییان لە زیندانی ماوەت دەرهێناوە و بردویانەو کوشتویانە. یەکەمجار، بە کوشتنەکەی باوەڕمان نەکرد، دوایی لێمان کۆڵییەوە، عەلی ئیبراهیم دەرویش، بەڕێوەبەری بەندیخانەکە بو، زیرەکانە ئیشەکەی ئەنجامدابو.

داوایان لە عەلی ئیبراهیم دەرویش کردبو، عەلی حەمدی تەسلیم بکات و بیکوژێت، ئەویش گوتبوی تا نامەی دەستی بارزانیم بۆنەیەت ناتوانم کاری وابکەم، پێویستە بەخەتی خۆشی بینوسێت، بارزانیش وای زانیبو ئەوە نیشانەی ئەوپەڕی دڵسۆزییە بۆئەو، بۆیە ئەویش بە خەتی خۆی نامەی بۆ نوسیبو، لە نامەکەدا نوسیبوی "عەلی حەمدییان تەسلیم کات، چونکە ئەوە خائینە و پێویستە بکوژرێت".

کوشتنی عەلی حەمدی، نیشانەیەکی زۆر خراپبو، چونکە ئێمە پێکهاتبوینەوە، عەلی حەمدی پیاوە فەقیرەکە بو لەناو کۆمیتەی ناوەندیدا، پیاوێکی زۆر تێکۆشەربو، لە کادێرە پێشکەوتوەکانی کوردایەتی بو، پیاوێکی پاک، وەکو سۆفی و دەرویش وابو لە تێکۆشاندا، لە دامەزرێنەرانی پارتی و حیزبی رزگاری بو، لە هەڵگیرساندنی شۆڕش لە بادینان دەستێکی باڵای هەبو، بۆیە کوشتنی یەکێکی وا بە ئیشارەتێکی زۆر خراپ لێکدرایەوە.

*** ئایا کوشتنی تەنها کادێرێک نەبێتە هۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ، یان هۆکار و پاڵنەری تریش هەبو؟**

– تەنها ئەوەنەبو، ماوەیەکی تری پێچو کارەساتێکی تری لەوە خراپتر رویدا، ئەویش برادەرێکی لێپرسراومان هەبو لای مەلا مستەفا، ئەو نەی ئەزانی کە لەگەڵ ئێمەیە، ئەویش نەوشیروانی فوئاد مەستی بو، ئەو نامەیەکی بە خەتی مەلا مستەفا بۆ ناردین، کە بۆ ئامر هێزەکان تەعمیم کرابو، تێیدا ئەڵێ: "هەرکەسێک جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلالە، بیانکوژن، واتا هەرکەسێک لەسەری بسەلمێت جەماعەتی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلالە بیانکوژن".

ئەو نامەیە، ئاژاوەیەکی گەورەی خستە ناو هێزی پێشمەرگەوە، چونکە ئێمە سەدان کەسمان هەبو لەناو هێزی پێشمەرگەدا و سڵمان ئەکردەوە کە بیان کوژن.

# ڕاگەیاندنی شەڕ دژ بە مەکتەبی سیاسی

*** باشە چۆن بارزانی بە ئاشکرا داوای کوشتنی ئێوەی کرد؟**

– ئەو نامەیە ماوە، کاتی خۆی لە گۆڤاری رزگاری و ڕۆژنامەی خەباتی کۆندا بڵاوکرایەوە، ئێمە بیرمان لە ڕۆشتن ئەکردەوە، مستەفا قەرەداغی هەواڵێکی بۆ ناردین و گوتی: "مام جەلال پیویستە ئاگای لە خۆی بێت"، ئێمە ناچاربوین ئیحتیات وەربگرین. ڕۆژێک هێشتا حیلمی عەلی شەریف و من ژنمان نەهێنابو، برادەرەکانی تر کە پێکەوە بوین نوری ئەحمەدی تەها، عەلی عەبدوڵڵا، عەلی عەسکەری، واتا هەردو عەلی و هەردو نوری ژنیان هەبو، داوای پشویان کرد، کە سەردانی ماڵەوەیان بکەن.

ئینجا ئەو ڕوداوەت بۆ دەگێڕمەوە، ڕەنگە بۆ نەشرکردن گونجاو نەبێت، چونکە هەندێ لە شاهیدەکان هێشتا ماون، چونکە ئەوە یەکەمجار بو، جنێوێکی زۆر ناشیرین بە نوری شاوەیس بە ئامادەبونی خۆی بدرێت، بەڵام حەیفە ئەو دو تەڕە جنێوە بفەوتێ. عەبدولڕەحمان ڕوتەمان ناردبو بۆلای مەلا مستەفا، بۆئەوەی ڕەزامەندی دەرببڕێت بۆئەوەی ئەو برادەرانەی، ژنیان هەیە، سەردانێکی خێزانەکانیان بکەن، عەبدولڕەحمانە ڕوتە، وەکو پێمگوتی خزمایەتیەکی نزیکی هەیە لەگەڵ عەلی عەبدوڵڵا و کوڕی خاڵی یەکترن. ئەو ئێوارەیە پیاسەمان ئەکرد، عەلی عەبدوڵڵا لای خوارێ پیاسەی ئەکرد کە ڕوتە هاتەوە، یەکەم کەس، توشی بو، عەلی عەسکەری بو، ئەویش لێی پرسیبو ئایا مەلا مستەفا چی گوت؟ ئەویش گوتبوی: وەڵڵا ئیجازەی نەدانێ! گوتبوی چی تری گوت. گوتی: وەڵڵا بابە جوێنیشیدا، بەڵام با بیبرێنینەوە، عەلی عەسکەری عادەتێکی خۆشی هەبو و دایە قاقای پێکەنین.

ئەوان کەمێ لە ئێمەوە دوربون، بەڵام بینیمان، ڕوتە هاتەوە، ئەمانزانی هەواڵی خۆشی پێیە، عەلی عەبدوڵڵا پیاسەی ئەکرد و تەزبیحەکەی لە پشتەوەی گرتبو، ئەهات و ئەچو، نوری شاوەیسیش لەبەرمەتاو هەڵتروشکابو، زۆر چاک

دیمەنەکەم لە بەرچاوە، نوری ئەحمەد تەها و من و حیلمیش پێکەوە قسەمان ئەکرد. لە دورەوە عەلی عەبدوڵڵا پێیگوت: "ها ڕوتە ماندی نەبی شێری یا ڕێوی"؟ گوتی: "وەڵڵا عەلی ڕێویمە"! ئەویش گوتی کو؟ گوتی: "ئیجازەی نەدانێ، کەمێک جوێنی دانێ لە جیاتی ئیجازە"! گوتی چی گوت؟ گوتی: "عەلی ناگوترێ! جوێنە"! عەلی عەسکەری لەگەڵیابو، تومەس بۆ ئەوی گێڕابۆوە، گوتی: "ئەبێ بیڵێیت، نەیڵێی من ئەیگێڕمەوە"، ئاخر گوتی: "جنێوەکە زۆر ناشیرینە"، هەمو گوتیان ڕوتە هەرئەبێ بیڵێت، گوتی: "مەلا مستەفا ئەڵێ من ئیجازەیان نادەمێ، منیش پێم گوت ئەزبەنی بۆ ئیجازەیان نادەیتێ؟ ئیتر مەلا مستەفا کۆڵێک جنێویدا ....." دوایی عەلی عەبدوڵڵا لەبەرخۆیەوە زۆر بە هێمنی گوتی: "پەککو بەخوا پیاوێکی جنێو فرۆشە..."، لەوێش ئەترسا بیڵێ نەوەکو دەنگی دەرچێ!.

نوری شاوەیسیش هەر لەوێ دانیشتبو، کۆمەڵێک قسەیکرد، کە بۆ گێڕانەوە ناشێت...!

کوشتنی عەلی حەمدی و مەسەلەی ئیجازە نەدانی برادەران و نامەی هەڕەشەی کوشتنی پێشمەرگەکانی ئێمە، هەمو ئەمانە کۆبوبونەوە و کێشەکانی قوڵتر و زەحمەترکرد.

زستان بو، کانونی دوهەم بو، هەر ئەوەندەمان زانی ڕۆژێک هەشت نۆ بارزانی پەیدابون و سڵاویانکرد و نامەیەکیان لە کاک ئیدریسەوە پێ بو بۆ من و حیلمی عەلی شەریف.

*** ئەمە کەی بو، چی لە نامەکەدا نوسیبو؟**

– ئەوە کانونی دووەمی ١٩٦٦ بو، لە نامەکەدا نوسیبوی "لەسەر فەرمانی بارزانی ئێوە هەردوکتان ئەبێ بێن بۆ لای ئێمە و لە ناوچەی ئێمە بن"، واتا ئێمە جیا ببینەوە لە برادەران و بارەگا بەرینە ئەوێ.

لێپرسراوی ئەو کۆمەڵە، یەکێک لەو بارزانیانە بو کە لە ڕوسیا خوێندبوی، حیزبی بو، لەناو بارزانیەکاندا چەند نەفەرێک هەبون کە میولی حیزبییان هەبو، بۆنمونە حەمەدئەمین میرخان لەوانەبو.

لێم پرسی ئایا ئێمە بچین؟ ئەو گوتی: "وەڵڵا کەیفی خۆتانە، بەڵام حەز ئەکەن یەک دوورۆژ ئیجازەتان ئەدەینێ بۆئەوەی خۆتان ئامادەبکەن"، ئێمەش گوتمان زۆر باشە.

ئێوارە عەلی عەسکەری جیاکردبۆوە و پێی گوتبو: "کاک عەلی سوێندم بۆ بخۆ قسەیەکت پێ ئەڵێم، بەو مەرجەی ناوم نەهێنی و باسم نەکەی"، ئەویش سوێندی بۆ خواردبو، گوتبوی ناوت ناهێنم: "ئێمە پێمان گوتراوە حیلمی و مام جەلال بەرین و لە رێگا بیانکوژین و بڵێین راپانکردوە، ئێمەش هاوارمان لێکردن، بەڵام نەگەڕانەوە، بۆیە ناچاربوین تەقەیان لێبکەین".

گوتبوی "ئەگەر دەرکەوێت، من هەواڵی وام بۆ هێناوە، ئەوا خۆت ئەزانی چیم لێ ئەکرێت، خۆم و کەس و کارم ئیبادە ئەکرێین"(٥).

ئێمە هەمومان لەیەکجێ نەبوین، ئێمە لە دۆڵێک بوین، هەریەکەمان ماوەیەک لەیەکەوە دوربوین. من بەتەنیابوم، کتێبم ئەنوسی، بە ڕاستی نەختێک لێیان دور کەوتبومەوە، ئەو کتێبەم ئەنوسی (کردستان والحرکة القومیة الکردیة) لەبەرئەوە بە تەنیا چوبومە ناو نوسین و بەڵگەنامەکانەوە، جۆرەها شتم کۆکردبۆوە و مەکتەبەیەکی ژێکەلانەم دانابو. شەوێک لە دویان ناردم و گوتیان کۆبونەوەمان هەیە، هەردو نورییەکە، هەردو عەلییەکە، عومەر دەبابە، حلمی شەریف و من هەر حەوتمان ئامادەبوین.

*** ئەی مامۆستا ئیبراهیم و ئەندامانی تر لەکوێ بون و چ بریارێکتان دەرکرد لەبارەی ڕۆشتنەکەتان؟**

– مامۆستا ئیبراهیم لە تاران بو، سەید عەزیزیش لە ئێران بو، ئەویش نەهاتبۆوە، هەندێ برادەری تریش خۆیان شاردبۆوە، عەلی عەسکەری باسی مەسەلەکەی بۆ کردین، باس لەوەکرا، ئێمە چی بکەین؟ لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر بڕیارماندا کە نەچین، هەر حەوتمان بە کۆمەڵ بریارماندا، ئێمە نەچین بۆلای بارزانی.

ئێمە کاتی خۆی بریارێکمان هەبو، ئەگەر پاش شەش، حەوت مانگ مەلا مستەفا ئیشی نەداینێ، ئەوا بچینەوە شارەکان و خۆمان لەوێ بشارینەوە و دەست بە کاربکەین. بۆ بەیانی چوینە لای عەباسی مامەند ئاغا و گوتمان: "کاکە باس و حاڵ و مەسەلەیەکی وایە و لە دومان هاتونە و بەتەمای شتی وان"، ئەویش لەو رەئیە بو کە نەچین، بەڵام پێشنیارێکی کرد و گوتی: "من بروسکەیەک بۆ مەلا مستەفا لێ ئەدەم، ئەوکاتە لە ناوچەی پێنجوین بو، پێی ئەڵێم لە جیاتی ئەوەی تەنها مام جەلال و حیلمی بێنە خزمەتت، ئەوا هەمومان بەیەکەوە دێینە خزمەتی جەنابت و لەوێ ئەبین لە پاشان چۆن

بەباش زانرا وائەکەین"، بڕیاریشماندا، بە سیتەکدا بڕۆین و شێخ لەتیفیش لەگەڵ خۆمان بەرین.

بڕیار وابو، هەمومان لەرێی خدرانەوە بڕۆین و کاکەزیاد ئاغای کۆیەش تێبگەیەنین بۆئەوەی هیچ کارەساتێک رونەدات. هەباساغا بۆ بەیانی بروسکەیەکی لێدا و وەڵامی هاتەوە و ئەڵێ: "نەخێر پێویست ناکات بێن بۆلای من، با ئەوان ئەمرەکە جێبەجێ بکەن و بچن بۆ لای ئیدریس کە خۆم هاتمەوە ئەیانبینم".

# گەڕانەوەی مەکتەبی سیاسی بۆ لای حکومەت و سەرەتای گفتوگۆکردن

*** هەڵوێستی ئێوە چی بو، دەربارەی وەڵامەکەی بارزانی و چ بڕیارێکتاندا؟**

- بێگومان ڕۆژ بە ڕۆژ، تا ئەهات دودڵی زیاتر دەبو، ئێمە دانیشتین کۆبونەوەمان کرد، بڕیارماندا ئەو بڕیارەی کە هەمانبو جێبەجێی بکەین، ڕۆژی سێیەم نوری شاوەیس و عەلی عەبدوڵلا پەشیمان بونەوە و گوتیان: "وەڵا ئێمە لە شارەکان ناتوانین بژین و مەلا مستەفا ئەمانکوژێت، بۆیە ئێمە بۆخۆمان لێرە ئەمێنینەوە و سیاسەت ناکەین و دائەنیشین"، ئێمە پێنجەکەی تر بڕیارماندا کە بڕۆین.

وامان بڕیاردا، ئێمە چوارمان ڕاکەین و نوری ئەحمەدی تەهاش بۆخۆی بە کۆمەڵێک پێشمەرگەوە سبەینێ بچێتە ڕانیە، ئەوکاتە برادەرمان هەبو لە ڕانیە، نوری ئەحمەد تەها گوتی: "من لە شارا ناتوانم بژیم، ئەچمە لای مامۆستا ئیبراهیم لە تاران".

ئێمە شەوێ ڕامانکرد، هەندێ هێزمان پێبو هەریەکە دە، پازدە کەسێک دەبو، دەستەکان بەهەموی شەست کەسێک ئەبوین. ئێوارەیەک ڕۆیشتین پەڕینەوە بۆ بناری کۆسرەت، نیوەڕۆ چوینە لای کاکە زیاد ئاغا، حیکایەتەکەمان بۆ گێڕایەوە، گوتمان بەشکو تۆش هەوڵێ بدەی، ئەگەر مەلا مستەفا واز لەو سیاسەتە بهێنێت،

ئەگەر وا نەبێت ئەوا ئێمە هەڵاتوین و ئەڕۆین.

ڕۆژی دوەم، چوینە چەمی ڕێزان، لە چەمی ڕێزان ناردمان، برادەرانی سلێمانی هاتن، عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریف بە دو بەش ڕۆیشتین بۆ کەرکوک، بە مەرجێ لەوێوە حیلمی بچێت بۆ بەغدا بۆ مەسەلەی ڕێکخستن، عەلی عەسکەری کاروباری ڕێکخستنی کەرکوک بکات، من و عومەر دەبابەش بۆ سلێمانی.

کە گەیشتینە ئەوێ، مەلا مستەفا زانی، زۆری تەحقیقی کردبو، بزانێ چۆن هەواڵەکە دەرچوە، چونکە ئێمە بەیانێکمان دەرکرد گوتمان حاڵ و مەسەلەکە بەو شێوەیەبوە، هۆکەی ئەوەیە ئێمە پێمان خۆش نیە کە کورد، کورد بکوژێ، هەواڵی عەلی حەمدیشمان لە ڕۆژنامە بڵاوکردەوە، نەمانگوت کوژراوە، نوسیبومان (قلق مشروع على الحياة المناضل علي حمدي)، گوتمان ماوەیەکە عەلی حەمدی لە زیندانی ماوەت گوێزراوەتەوە، چارەنوسی دیارنییە و ئەمانەوێت چارەنوسی بزانین، تومەز لەو ماوەیەدا مەحمودی حاجی تۆفیق و عوسمان عوزێریشیان کوشتبو.

پیلانیان دانابو کە زوربەمان بکوژن، ڕاستیەکەی بیست، سی کەسێکیان لێ کوشتین، بەحساب دوای ئەوە خۆمان تەواو ئەبین. خەڵک کوشتن لای مەلا مستەفا وەکو ئاو خواردنەوە وابو، بۆ نمونە، حەمەد ئاغای مێرگەسوری شێروانی خاڵی خۆی کوشت، بەبێ هیچ هۆیەک و بەخۆڕایی کوشتی، بەیەکجار خۆی و کوڕەکانی، هەموبانی کوشت، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت، یان دادگایەک بڕیارێکی دابێ، ئەمە لە کاتێکدا کە شۆڕشەکە ئاشبەتاڵی ئەکرد.

ئێمە دەستمانکردەوە بە چالاکی و بە کارکردن و ڕۆژنامەی خەباتمان دەرکردەوە.

مەلا مستەفاش کەوتە گفتوگۆیەکی تر لەگەڵ حکومەتی عێراق، ئەوکاتە عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆک وەزیرانی عێراق بو، ئێمە زۆر لەوە ئەترساین، کە جارێکی تر وەکو (٦٤) پێکبێنەوە، ئەو جارەش هەر بۆ ئیبادەی ئێمە ئەبێ، بیرمان کردەوە چ بکەین و چی نەکەین.

من پێشنیازێکم بۆ برادەران کرد و موافەقەتیان کرد کە ئێمە حیلمی عەلی شەریف بنێرین بۆلای جەمال عەبدولناسر و بزانین جەمال عەبدولناسر ئەڵێ چی، ئەمەش نەهێنییەکەیە هەتاکو ئێستا نەگوتراوە، سەلاحەدین، ئێستا بۆت ئەگێڕمەوە، حلمیمان نارد، بەهۆی سەفارەتی میسرەوە لە بەغدا سەفەرمان بۆی تەرتیب کرد و چو بۆلای عەبدولناسر، پێش ئەوەی ئەو بچێت بۆلای

عەبدولناسر، حکومەتی عێراق هەواڵێکی بۆ کاک عەلی عەسکەری، ناردبو بەهۆی کابرایەک، کە عەریف بو لە سوپای عێراقیدا، سەر بە عەلی عەسکەری بو چوبۆوە تەسلیم بوبۆوە لە ئیستیخبارات کاری ئەکرد.

هەواڵەکە ئەڵێ: "وا لەگەڵ مەلا مستەفا گفتوگۆمان هەیە، عەبدولرەحمان بەزاز ئەیەوێت سەرکەوتوبێت و نایەوێ وەکو گفتوگۆکەی پێشوی لێبێت، لەهەمان کاتیشدا بەزاز ئەیەوێت لەگەڵ حیزبیش پەیوەندی بکات".

عەلی عەسکەری، وەڵامی دابۆوە و گوتبوی، ئەوە من بە تەنها ناتوانم بڕیاری لەسەر بدەم، پێویستە پرس بە (م.س) بکەم کە پرسی بە ئێمەکرد، گوتمان پێی بڵێ: "ئێمە بڕوامان بە حکومەتی عێراق نییە، ئەگەر هەر ڕێککەوتنێک لەگەڵ حکومەتی عێراق ببێت، پێویستە زەمانەتی عەبدولناسری لەگەڵ بێت، ئەگەر ئەوانەش خۆیان بە ناسری ئەزانن، ئەبێ پێیان خۆشبێت کە عەبدولناسر پشتگیری و ڕەزامەندی ئەوی لەسەر بێت".

ئێمە لەگەڵیان گفتوگۆش ئەکەین و پێکیش دێین، بەڵام ئەگەر عەبدولناسر پشتگیری نەکات و ڕازی نەبێت، دڵنیابە بە ئەنجام ناگات، ئەوان گوتبویان باشە ئێمە وا ئەکەین، با یەکێکتان بچێ بۆلای عەبدولناسر.

ئێمەش کە حیلمیمان پێشنیازکرد بچێت بۆلای عەبدولناسر، پێمان گوتبو کە لەگەڵ عەبدولناسر بە درێژی باسی بارودۆخی عێراق و کوردستانی بۆ بکات، داخوازی ئێمە چی بێت و بزانین عەبدولناسریش خۆی چی ئەڵێت؟.

تومەز مەسەلەکە ترسناک بو، عەبدولناسر خۆی کاک حیلمی نەدیبو، (فەتحی دیبی) کە وەزیری کاروباری عەرەبی بو لە سەرۆکایەتی جمهوری، ئەو بینیبوی، بە درێژی باسی کوردستان و عێراقی بۆ کردبو، بۆی باسکردبو، کە ئێستا بزوتنەوەی کوردی گەیشتۆتە پایەیەکی ترسناک، ئەویش ترسی دەستێوەردانی هەیە لە ڕێگای شا و ئیسرائیلەوە، ئەنجامەکەی ئەبێتە هۆی گەیاندنی زیانێکی گەورە بە گەلی کورد، لەبەرئەوە ئێمە پێمان باشە، لەگەڵ ئەو حکومەتەی ئێستای عێراق پێکبێن، هەرچەندە ئەم حکومەتە، ڕەنگە هەمو شتێکتان نەداتێ، بەڵام پێویستە سەبربگرن، پاش ماوەیەکی تر حکومەتێکی تر دێ و ئەو حکومەتە حکومەتی ئێمە ئەبێت.

سەرۆک عەبدولناسر پەیمانتان ئەداتێ، حوکمی زاتیتان بداتێ، هەروەها گوتبوی کە عەبدولڕەحمان عارف پیاوێکی باشە و وەکو عەبدولسەلام عارف نییە، ئەوکاتە عەبدولسەلام عارف نەمابو، عەبدولرەحمان عارف نەک هەر لە ڕیزی

زوباتی ئەحرارە، بەڵکو نێوانیشی لەگەڵ میسر باشە، پیاوێکی نیشتمانپەروەرە و پێمان باشە لەگەڵ ئەودا پەیوەندی بکەن و پێکبێن، وەک لەوەی لەگەڵ حکومەتێکی کۆنەپەرستی وەک ئێران دەست تێکەڵ بکەن.

هەروەها گوتبوی، ئێمە جەماعەتی مەلا مستەفاشمان لە بۆچونی خۆمان ئاگادارکردۆتەوە کە پێکبێن، بەڵام ئەو بەشەی دوەمان بەوان نەگوتوە، مەبەست کە گوایە موئامەرەیەک لە عێراق روئەدات و سەر بە میسر ئەبێت، مەسەلەکەش وابو، پیلانی عەبدولڕەحمان عارف سەریگرت و دەسەڵات کەوتە دەست ئەوان.

ئەوەبو لە ٣٠ حوزەیرانی ١٩٦٦دا پیلانەکە سەریگرت، ئێمەش قسەکانی ئەوانمان پێ باشبو[٦].

*** کاک مسعود بارزانی لە کتێبی "بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد" نوسیویەتی، کە لە ١٩٦٥/١٠/٣ دا نوێنەری مەلیک حسێن و ئینگلیز سەردانی بارزانیان کردوە بۆ مەسەلەی هەوڵدان بۆ ئینقلاب لە عێراقدا؟**

– ئاگام لەوە نیە و قەتیش نەم بیستوە.

*** ئایا ئێوە پەیوەندیتان بە عەبدولرەحمان عارفەوە کرد، ئایا بارزانی پەیوەندی لەگەڵ ئەوان هەبو؟**

– بەڵێ، من و چەند برادەرێک چوینە بەغدا، لەوێ عەبدولرەحمان عارفمان بینی، یەکەمجار بە دزییەوە بینیمان، گوتی: عەبدولڕەحمان بەزاز ئەیەوێ لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێت، عەبدولڕەحمان عارف پیاوێکی خۆش و نیشتمان پەروەربو، بەڵام فکری کۆنەپەرست و راسترەوانەبو، گوتی: "عەبدولڕەحمان بەزاز پێی خۆشە لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێت، من پێم خۆشە لەگەڵ هەردولا پێکبێم، لەگەڵ حیزبیش پێکبێم و لەگەڵ مەلا مستەفاش"، ئەوکاتە هەمو کەس بە ئێمەی ئەگوت حیزب.

ئەو کاتە ٩٠٪ی حیزب لەگەڵ ئێمە بو، مەلا مستەفا لایەنە عەشایەریەکەی زۆر ئاشکرابو، عەبدولرەحمان عارف گوتی: "من پێم خۆشە لەگەڵ هەردولا پێکبێم"، هەروەها گوتی: "ئەڵێن بەزاز پیاوی ئینگلیزە، بەڵام بەخوا من نازانم"! جا سەیرە بۆ سەرۆکی دەوڵەت بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی خۆی بڵێت، پیاوی ئینگلیزە!.

گوتم: "باشە ئێمە ئەوەمان قبوڵە، پێشمان ناخۆش نییە، بەڵام لەوە سڵ

ئەکەینەوە نەوەکا ئێوە دوایی کە مەلا مستەفا ئیمزای بۆکردن غەدرمان لێ بکەن (تغدرون بنا)"!

ئێستاش لە یادمە، کە گوتی: "والله و بشرفی آخون عرضي ما آخونکم"، ئیتر کە ئەوەی گوت، ئێمەش گوتمان باشە، گوتمان "ئێمەش تۆ بە پیاوێکی نیشتمانپەروەر ئەزانین و ئەخوازین گیروگرفتەکان بە ئاشتی چارەسەربکرێت".

ئێمەش پێمان باش بو، بە ئاشتی لەگەڵ بەغدا بگەینە ئەنجامێک، بە ڕاستی ئێمە دو زانیاریمان هەبو، یەکێک لەو زانیاریانە ئەوەبو، کە پەیوەندی مەلا مستەفا و ئێران زۆر بەهێزبوە، دوەم زانیاری ئەوەبو، کە مەلا مستەفا لەگەڵ ئیسرائیل پەیوەندی پەیداکردوە. سەرچاوەی زانیاریەکەمان نوێنەری مەلا مستەفا بو لە تاران، کە لەگەڵ ئێمە پەیوەندی هەبو، بۆ حەقیقەت و مێژو، کاک شەمسەدین موفتی تا کۆتایی ساڵی هەزار و نۆسەد و شەست و شەش لەگەڵ ئێمەبو، بە فەرمانی ئێمە لەگەڵ مەلا مستەفا مابۆوە، گوتی: "ئەگەر ئەڵێن بەجێی دێڵم"، گوتمان ئێستا بمێنەرەوە، بۆیە ئەو هەمو شتێکی بە ئێمە ئەگوت بەتایبەتی پەیوەندیەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ ئێران.

هەروەها ئەو نوێنەرەکەی بو، بۆ پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل، باسی ئەکرد کە چۆن ئیسرائیلیەکان هاتون و ئەو بردبونی بۆ کوردستان[۷].

ئەوەی بەلای ئێمەوە ئەوکاتە زۆر ترسناک بو، مەسەلەی پەیوەندی بو لەگەڵ ئیسرائیل، وامان ئەزانی هەرچی ئیمپریالیزم و ئیسرائیل دەستی تێدابێ گڵاوە! باوەڕمان وابو، کە مەلا مستەفا بزوتنەوەی کوردایەتی بە ئێران و ئیسرائیل و ڕۆژئاواوە دەبەستێتەوە[۸].

پێمان باش بو، بزوتنەوەی کوردی ڕێگە چارەی ئاشتیانە بدۆزێتەوە، هەتا ئەگەر حوکمی زاتی لەم قۆناغەدا جێبەجێ نەبێت، ئێمە دژایەتی ڕێککەوتن ناکەین، واتا ئەگەر ڕێککەوتنێک لە نێوان حکومەت و مەلا مستەفا دابیێت، ئێمە وەکو جارەکەی تر دژی ناوەستین، بەو مەرجەی ئەو دژی ئێمە نەبێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانە و بەڵێنەکانی عەبدولناسر، چاوەڕێمان ئەکرد، گۆڕانی سیاسی ڕوبدات و ناسرییەکان دەسەڵات بگرنەدەست، چونکە ئەوان خەڵکیان لەناو سوپادا زۆربو.

لە بەغدا من خەڵکانی بزوتنەوەی ئیشتیراکی عەرەبیم ئەبینی، لە سەرکردەکانیان فوئاد ڕکابی، عەبدولئیلا نەسراوی، د.خەیرەدین حەسیب و ئەدیب ئەلجادر، ئەوانیش دڵنیایان کردین و گوتیان شتێکی زۆر باشە، ئێوە لێرەبن، لەگەڵ یەک

بین، بۆئەوەی هەر گۆڕانێک ببێت، ئەوا هەمو پێکەوەبین.

من ئەوکاتە لەگەڵ فوئاد رکابی و عەبدولئیلا دۆست بوم، فوئاد بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بردمیە ماڵی خۆیان، دوای ئەوەی ئیجازەی لە کاک حیلمی وەرگرت و گوتی: "بە سەلامەتی بۆت دێنمەوە، نافەوتێ و هیچی لێ نایەت".

فوئاد رکابی، تازە لە وەزارەت ئیستیقالەی کردبو، پێی گوتم: "ئێمە خەریکی کودەتاین، لەو کودەتایەدا بەشدارئەبین، ئێمە دو باڵین باڵە عەرەبیەکە کە ئێمەین، باڵە کوردیەکەی ئێوەن، عەبدولناسریش پشتیوانیمان لێدەکات".

بەڕاستی دڵمان خۆشبو، گوتمان هەم لایەنە پێشکەوتوخوازو و وەتەنیەکەی عەرەبیمان دڵنیاکردوە، ئەشمانزانی ئەگەر دەسکەوتێک وەرگرین بەشی هەرە زۆری میللەتی کورد لەگەڵ ئێمە ئەبێت.

# بەیانی ٢٩ حوزەیران

*** هەڵوێستی ئێوەچی بو لە بەیانی ٢٩ حوزەیران؟**

- ئێمە، رێککەوتنەکەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ کە لەنێوان مەلا مستەفا و عەبدولڕەحمان عارف - عەبدولڕەحمان بەزازدا مۆرکرا، پشتگیریمان کرد، واتا نەک هەر دژی نەوەستاین، بەڵکو لە رۆژنامەدا نوسرابو (عارف يستقبل طالباني و الشريف) ئەوەبو، عەبدولڕەحمان عارف پێشەوازی لە من و حیلمی عەلی شەریف کرد و وێنەمان لە رۆژنامەکاندا بڵاوکرایەوە.

لەو کاتانەدا، لە کوردستاندا شتێک رویدابو، ئەویش بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری کوشتنی دۆستانی ئێمە لەناو هێزی پێشمەرگەدا، کەوتبونە راونانی هەندێک لە کادێرەکان و لێپرسراوانی عەسکەری ئێمە، لە ئەنجامدا زۆر لە لێپرسراوانی ناوچەی چەمی رێزان یاخیبون و گوتیان ناچین بۆلای بارزانی.

لە ئەنجامدا سەدان پێشمەرگە کۆبونەوە و ئیعلانی سەرپێچیان کرد لە مەلا مستەفا، بەراستی کە سەرپێچیەکەیانکرد، ئێمە ئاگامان لێ نەبو، بەڵام کە ئاشکرایانکرد، خۆ نەدەکرا بە تەنها بەجێیان بهێڵین، چونکە هەمویان برادەرانی

خۆمان بون، لەبەرئەوە من و حیلمی عەلی شەریف و عەلی عەسکەری چوینە ناویان و دەستمانکرد بە رێکخستنیان و سەرپەرشتیکردنیان.

کە مەلا مستەفا ئەمری لێدانی ئەوانەی دەرکرد، ئێمە بانگەوازێکمان دەرکرد و گوتمان: "پێشمەرگە تەمەڕود بکەن، شەڕی براکوژی مەکەن، لە برای خۆتان مەدەن"، هەرچی بەقسەی ئێمەی کرد جیابۆوە، بۆ نمونە لە ناوچەی قەرەداخ هەمو هێزەکانی ئەوێ بە سەرپەرشتی کەمال موفتی لەگەڵ ئێمە هاتن، لە ناوچەی مەرگە، حەمەدەمین فەرەج، بابەکری مەحمود ئاغای پشدەری، عەلی ئاغای کوڕی عەباس ئاغای گەورە لەگەڵ ئێمە هاتن.

ئەمانە هەموی لەگەڵ ئێمە هاتن و هێزێکی گەورەمان لێ کۆبۆوە، ئیمەش بوینە هێزێکی گەورە و لە ناوچەی چەمی رێزان و قەرەداخ و بنکەی خۆمان دانا.

*** چەند پێشمەرگەیەک لە ئێوە کۆبوبونەوە؟**

- دو هەزار کەس ئەبوین.

*** ئەی لای بارزانی چەند دەبون؟**

- سێ هەزار کەسێکی مابونەوە، لە سۆران وەکو یەک بوین، دوهەزار بە دو هەزار، بارزانیەکان، بادینانیەکان و هەندێ عەشایری تریشی لەگەڵ مەلا مستەفا بون، ئێمەش عەباسی مامەند ئاغامان لەگەڵ بو کە سەرۆکی عەشیرەتی ئاکۆ بو، لە پشدەر و باڵەکایەتی خەڵکمان لەگەڵ بو، بەڵام هەندێکیان نەیان ئەوێرا بەرامبەر بە مەلا مستەفا هەڵسن، ئێمە بەمجۆرە بوین بە دوهێز و دو حیزبی ئاشکرا.

ئێمە لەو کاتەدا بەیانێکمان دەرکرد، کەوا ئێمە ئەو کارەمان پێ باشە کە کراوە، دژی ناوەستین، دوایی خەڵکمان راسپارد بۆلای مەلا مستەفا، "با شەڕ نەکەین، با نەیەنە سەرمان، ئێمە شەڕ ناکەین، ئێمە لایەنی ئاشتیمان گرتوە"، بەڵام لایەنە ئاشتیخوازییەکە سودی نەبو، ئەو جارێکی تر هێزی لە سەرمان کۆکردەوە.

مەلا مستەفا ئاگربەستی لەگەڵ حکومەت قۆستەوە بۆئەوەی پەلاماری ئێمە بدات، هەندێ ناوچەی لێ وەرگرتینەوە وەکو دەشتی کۆیە، بەڵام شوێنەکانی ترمان هەر بەدەستەوە مایەوە.

*** بۆچی عەبدولرەحمان بەزاز زۆرتر بەلای بارزانیدا دای ئەشکاند، هیچ گرفت و کێشەیەکی لەگەڵ ئێوە هەبو؟**

- بەپێی رێککەوتنامەی ۲۹ ی حوزەیران، عەبدولرەحمان عارف وەک سەرۆک کۆمار بەڵێنی بە ئێمەدابو، بەڵام کە دیتمان خەریکە مافمان پێشێل ئەکرێت، چوینەسەری و گوتمان تۆ وەعدت بەئێمەدا، کە "والله و بشرفی آخون عرضي ما آخونکم" کوا ئەو پەیمانە چی بەسەرهات؟ گوتی: من وامگوتوە، لەسەر قسەی خۆم بەردەوامم، گوتی: سەد رێککەوتنامە تێکدەدەمەوە، لەبەرچاوی ئێمە بە تەلەفۆن بە توندی قسەی لەگەڵ عەبدلرەحمان بەزاز کرد، ئەو زۆر دژی ئێمەبو، چونکە من و حیلمی عەلی شەریف، ئەو سەردەمە لە بەغدا بوین، سەردانی عەبدولرەحمان عارفمان ئەکرد و پەیوەندیمان لەگەڵیدا باشبو.

عەبدولرەحمان بەزاز هەمو ئەو قسانەی ئەبیستەوە، بۆیە ئەو پەیوەندیەی ئێمەی پێ ناخۆشبو، دو شتت بۆ بگێڕمەوە لەوەی کە پێمگوتی: جارێکیان قەناعەتمان بە عەبدولرەحمان عارف کرد کە لێبوردنی گشتی دەرکات بۆ زیندانیە سیاسیەکان، بەشی زۆریان شیوعی بون، گوتمان ئەمکارە ئەبێتە هۆی ئەوەی، ناوبانگت لە مەعەسکەری ئیشتیراکی بە زۆر باشی بڵاوبێتەوە و چەندەها بروسکەی پشتیوانیت بۆ بێت.

هەروەها لاپەرەیەکی نوێ لە شۆڕشی ١٤ی تموز ئەکەیتەوە، ناو و ناوبانگی عێراق، زۆر باش ئەبێت، ئەم پێشنیازەی ئێمەی چوە مێشکیەوە و گوتی وڵڵا ڕاستە. دو، سێ ڕۆژ دوای ئەوە عەبدولرەحمان بەزاز وەک سەرۆکی وەزیران چوبو، گوتبوی: "چۆن شیوعی بەردەین! دنیامان لێ تێکئەدەن، هەمو وڵاتانی ڕۆژئاوا دژمان ئەوەستن و ئەمەریکا و ئینگلیز دێن بە گژماندا" و پەشیمانی کردبۆوە.

جارێکی تر چوین بۆ مەسەلەی جەواهیری، بڕوامان پێهێنا جەواهیری شاعیری گەورەی عەرەبە و خزمەتی زۆرە، چۆن ئەبێت لە زەمانی عەبدولرەحمان عارفدا شاعیرێکی وەکو جەواهیری لە دەربەدەری و غوربەت بژی، ئەویش گوتی: باشە چی بکەم؟ گوتمان لێبوردنی بۆ دەرکە، گوتی: "بیتاقەشی بۆ دەنێرم و لێبوردنیشی بۆ دەردەکەم، با بێتەوە موعەزەز و موکەڕەمیش لێرە دای ئەنێم".

کە مەرسومەکە ئەچێتە لای عەبدولرەحمان بەزاز، گوتبوی: "چۆن، ئەوە جنێوی داوە بە باوکت و بە عەبدولسەلام عارفی برات"، جەواهیری ئەڵێ (یا ابن الخنا..). پاش ماوەیەک کە چوینەوە بۆلای، گوتی: "ئەوە جنێوی داوە بە باوکم چۆن ئەبێت لێبوردنی بۆ دەرکەم"!.

ئێمەش بێگومان موشاغەبەمان لەسەر عەبدولرەحمان بەزاز ئەکرد، دوای ماوەیەک هاتبوە سەر ئەو بڕوایەی، ئێمە بە تەئسیری عەبدولناسر وا ئەکەین، ئێمەی بە دۆستی عەبدولناسر و ناسریەکان ئەزانی، لە ئەنجامدا عەبدولرەحمان بەزاز لاچو.

کە عەبدولرەحمان بەزاز لاچو، وەزارەتێک دروستکرا بە سەرۆکایەتی ناجی تاڵب، بەڵام شەخسی دوەم و گرنگ لە وەزارەتەکەدا رەجەب عەبدولمەجیدبو، زۆر دۆستی ئێمەبو.

رەجەب عەبدولمەجید، ئەو ئەفسەرەبو، لە سەرەتای دامەزراندنی زوباتی ئەحرار و لەکاتی چالاکی نهێنیدا سکرتێریان بوە، پیاوێکی زۆر هێمن و نیشتمانپەروەر و رۆشنبیربو، تا کۆچی دوایی، هەر دۆستایەتیمان باش مابۆوە[٩].

# بەشداری وەزیرانی کوردی
# سەر بە دو حیزبی جیاواز لە یەک حکومەتدا

*** راستە کە بڕیارێک هەبو، ئێوە نوێنەرێک و بارزانی نوێنەرێک دەستنیشان بکەن بۆ کابینەی حکومەت؟**

– حکومەت بڕیاری دابو، کورد وەزیری هەبێت، یەک لە ئێمە (پارتی م.س) یەک لە (پارتی مەلا مستەفا)، ئێمە کاک فەوزی جەمیل سائیبمان پێشنیازکرد، ئەوانیش لیوا ئەحمەد کەمالی کەرکوکیان دانا، لیوا ئەحمەد یەکێک بو لەوان، بەڵام پێیان گوتبو ئەگەر نوێنەری ئێمەی تێدابێت، ئەوان نایکەن و وەزارەتەکە رەت ئەکەنەوە.

رۆژێک کاک فەوزی تەلەفونی کرد گوتی: ئەوە ناردویانە بە شوێنمدا بۆ قەسر، وابزانم مەسەلەکە سوێند خواردنی وەزیرەکانە، ئێمەش گوتمان باشە (شایف الخیر).

لەبەردەمی کۆشکی کۆماری بە کاک فەوزی ئەڵێن، "ناوی تۆی تێدا نیە"!! تومەز لەو ماوەیەدا ئەحمەد کەمال ئەچێت و پێیان ئەڵێت: "ئەگەر نوێنەری

جەماعەتی حیزبی تێدابێت، ئەوە من نایکەم و مەلا مستەفا شەڕ ئەکاتەوە"، خۆی ئەکاتە کۆتری ئاشتی و عەبدولڕەحمان و ئەوان قانع ئەبن و ئەڵێن دەباشە قەیناکە ئەوانە پیاوی نیشتمانپەروەرن، ئێمە قسەیان لەگەڵ ئەکەین و قەناعەتیان پێ ئەهێنین.

ئەوەبو لە وەزارەتی ناجی تاڵیبدا نوێنەری ئێمەی تێدانەبو، نوێنەری مەلا مستەفای تێدابو، هەرچەندە ئێمە پێمان خۆشبو لە وەزارەتی ناجی تاڵبدا یەکێکمان هەبێت.

کاک فەوزی ئەندامی حیزب نەبو، بەڵام دۆستمان بو، ئەو مەسەلەیە هەڵایەکی گەورەی لەسەر دروست بو، بەڵام من خۆم ئێستا لێی پەشیمان نیم، ناجی تاڵب یەکێک بو لە زوباتی ئەحرار و شیعە و زۆر دۆستی عەبدولناسر بو، پیاوێکی هێمن، ناسک و بە ڕەوشت بو، ئەوەنەبو بیکوژن و ملی بپەڕێنن.

هەروەها لە وەزارەتی ناجی تاڵبدا، چەند پیاوێکی نیشتمانپەروەر هەبون، وەکو ئەدیب جادر، کە وەزارەتی سناعەی پێسپێرابو، کەسایەتی یەکی نیشتمانپەروەر و ناسری و خۆشەویست بو.

## جەماعەتی مەلایی و جەلالی یان جەماعەتی ٦٦

*** ئەو کاتە سەرەتای ناونانی ئێوەبو بە جاشی ٦٦؟**

– لەو کاتانەدا جەماعەتی مەلا مستەفا یەک حەملەی دیعایەی گەورەیان دژ بە ئێمە دەستپێکرد، گوتیان ئەوانە جاشی ٦٦ن و نۆکەری بێگانەن، ئێمەش بێگومان حەملەیەکی توندمان لەسەر ئەوان دەستپێکرد، گوتمان ئەوان جاشی سەنتۆن و ئەیانەوێ بزوتنەوەی کوردایەتی ببەستنەوە بە ئیمپریالیستەوە، هەرچی قسە هەیە پێمان گوتن.

*** باشە بۆ جاشی ٦٦، خۆ مەلا مستەفاش ئەو کاتە لەگەڵ حکومەتدابو؟**

– بەڵێ بۆ ئەوان جائیزبو، بەڵام بۆ ئێمە جائیز نەبو! بۆ ئەوان جائیزبو کە

پەیوەندییان هەبێت، مانگانە موچە و یارمەتی وەربگرن، وەزیر و رۆژنامەیان هەبێت، بەڵام نابێ ئێمە پەیوەندی بکەین! ئەوان بە یارمەتی حکومەت شەڕی ئێمەیان ئەکرد، لەشکرەکەیان بەناو شاری سلێمانیدا تێپەڕاند، بە چەک و فیشەک و هاوکاری حکومەت شەڕی ئێمەیان دەکرد.

ئێمەش بە هەمان شێوە قسەمان ئەکرد، ئەمانگوت باشە ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ حکومەتدا خراپە بۆ ئێوە ئەیکەن؟ ئەگەر وەزارەت خراپە بۆ وەزیرتان هەیە؟ ئەمانگوت مەلا مستەفا ئەیەوێت ئیحتیکاری ساحەی کوردایەتی بکات، لەبەرئەوە ئەیەوێت شەڕی ئێمە بکات بۆئەوەی شەڕی براکوژی هەڵگیرسێنێتەوە.

مەلا مستەفا پێویستی بە بیانویەک هەبو، بڵێت ئەوانە جاشن بۆئەوەی شەڕی براکوژی حەڵاڵ بکات.

پێکدادانی چەکداری دەستی پێکرد، زۆرجار ئەمانشکاندن، ئێمە لە ناوچەکانی خۆمان ماینەوە، حەملەیەکی زۆرمان لەسەربو، بەوەی کە ئێمە خۆمان بە ئێرانەوە بەستۆتەوە، بۆیە مامۆستا ئیبراهیمیشمان هێنایەوە لە ئێران و پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران بڕی.

هەردولا دژی یەکتر قسەمان ئەکرد، ئەوانمان بە پاشکۆی ئیمپریالیزم، سەنتۆ، ئێران و ئیسرائیل ئەدایە قەڵەم، ئەمانگوت رۆژێک دێت، بەڵگەنامە دەردەکەوێت لەسەریان، ئێمە دەلیلمان تەنها شەمسەدین موفتی بو.

*** ئێوە ئەوکاتە پەیوەندیتان لەگەڵ حیزبە عیراقییەکان چۆن بو؟**

- ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ حیزبە قەومییەکان و حیزبی شیوعی باشبو، بۆ راستی و بۆ مێژو، حیزبی شیوعی بون بە دو بەشەوە، جەماعەتی عەزیز حاج بەناوی (قیادەی مەرکەزی) لەگەڵ جەماعەتی لیژنەی مەرکەزی. جەماعەتی لیژنەی مەرکەزی قبوڵیان نەدەکرد کە بەشداربن لەگەڵ بارزانی لە شەڕدا دژ بە ئێمە.

ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ جەماعەتی لیژنەی مەرکەزی خراپ نەبو، ئەوان شەرعیەتیان بۆ کارەکانی مەلا مستەفا ئەدۆزیەوە، بەڵام ئامادەنەبون لەگەڵ ئێمەدا بەرەیەک دروستبکەن. ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ حەرەکەی ئیشتیراکی عەرەبی، حیزبی وەحدەی ئیشتیراکی ناسری، حیزبی بەعسی چەپ و حیزب ئەلعومال ئەلسەوری کە هێزێکی چەپ بون.

ئێمە بۆ ئەو شتانەش کەوا ئێستا بۆت دەگێڕمەوە، دوجار هەوڵماندا پێکەوە حوکوم بگرینە دەست، یەکێکیان ساڵی ١٩٦٦ و ئەوەی تر ١٩٦٧ بو، ئێمە

پەیوەندیمان لەگەڵ هێزە عەرەبییەکان، لەگەڵ میسریش گەشەی کردبو، لەگەڵ سەفارەتی میسری لە بەغدا زو زو یەکترمان ئەبینی. من چومە بەیروت و جەماعەتی عەبدولناسر هاتن بۆلام، ئەوانە هەمو بەڵێنی باشیان پێداین، کە هاوکاری و یارمەتیمان بدەن.

# کۆبونەوەی جەزایری ١٩٦٧ و مەسەلەی کورد

*** روداوی گرنگی چی تر لە ١٩٦٧دا رویدا، کەپەیوەست بێت بە بارودۆخی کوردستان و عێراقەوە؟**

– روداوە گرنگەکانی ١٩٦٧ ئەوەبو، کۆنگرەی ئیشتیراکی عەرەبی لە جەزایر گیرا، هەمو حیزبە شیوعیی و ئیشتراکی و بەعسییەکان، جگە لە بەعسی راستڕەو، هەمو حیزبەکانی بەرەی رزگاریخوازی و ئیتیحادی ئیشتیراکی عەرەبی بانگهێشت کرابون.

لە کوردیش، لە پارتی دیموکراتی کوردستان تەنها من بانگهێشت کرابوم، بەعسییە راستڕەوەکان بانگهێشت نەکرابون، مەبەستمان بەعسی عەفلەقیە، چونکە ئەوکاتە بەعس ئەم گۆڕانانەی بەسەرداهاتبو:

لە ١٩٦٣دا جەماعەتێکیان لێ جیابونەوە ناویان لە خۆیان نا حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی شۆڕشگێڕ، ئەمانە لە سوریا، لوبنان و عێراق جەماعەتێکی زۆربون، کۆنگرەی خۆیان بەست و میشل عەفلەقیان دەرکرد و گوتیان ئەوە پیاوێکی (نەرجسی) و کۆنەپەرستە. کۆمەڵێک بریاری باشیاندا، لەوانە مافی چارەنوسیان بۆ کورد تەبەنی کرد، گوتیان حوکمی زاتیش هەنگاوی یەکەمە لەپێش ئەو قۆناغە، ئیدانەی سیاسەتی پێشوی بەعسیان کرد بەرامبەر بە کورد.

دوا بەدوای ئەوە، بەعسی سوریاش ئینقیلابیان کرد، میشل عەفلەقیان دەرکرد و قیادەی قوترییان بە سەرۆکایەتی دکتۆر یوسف زعین و دکتۆر نورەدین ئەتاسی دامەزراند. ئەمجارە میشل عەفلەق، ویستی ئەو سەرکردایەتیە دەربکات و حەلیان بکات، بەڵام ئەوان ئەویان پەرکرد و دەریان کرد، سوپاش لەگەڵ ئەوان بو.

سەرۆک کۆمار ئەمین حافزیان لابرد و ئیتر خۆیان هەمو حوکمیان گرتەدەست. بەوجۆرە یەکەمجار بەعسە چەپرەوەکانی دەرکردبو، دوایی راسترەوەکەش، بوبە دو بەشەوە، بەشێکیان لەگەڵ میشل عەفلەق مابونەوە، بەڕاستی یەمینی یەمین بون، لە عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حسێن و چەند کەسێکی تریان لەگەڵدابو، لە عێراقیش زوربەی زۆر لەگەڵ چەپەکان بون.

ئێمە لەگەڵ بەعسی یەسار و لەگەڵ بزوتنەوەی قەومی عەرەبی کە هێشتا نەبوبون بە چەند پارچەیەکەوە، پەیوەندیمان باش بو، هەروەها لەگەڵ یەمەنی خوارو، کومەڵێک هێزی تری عەرەبی پەیوەندیمان باش بو. لەو قۆناغەدا ئەوەی پێی ئەگوترێ برایەتی کورد و عەرەب و هاوکاری و تێکۆشان، باش خۆی نواندبو.

دیارە من لەگەڵ وەفدەکە چومە جەزائیر، ئەوانەی کە لەگەڵمان دابون بریتی بون لە فوئاد رکابی، هاشم عەلی موحسین سەرۆکی ئیتیحادی نەقاباتی کرێکارانی عەرەب، دوایی بو بە سکرتێری گشتی حیزبی کرێکارانی عەرەبی ئیشتیراکی و پیاوێکی زۆر چاک و دۆستی من و نەوشیروان مستەفا بو، نەوشیروان لەو ماوەیەی لە شام بو لەگەڵ ئەواندا پەیوەندی پەیداکردبو. هەروەها د.خیرەدین حەسیب و د.مەحمود ئەلحمسی لە بەعسی چەپەوە هاتبون.

دوای ئەوەی کە وەزارەتی ناجی تاڵب روخا، وەزارەتێکی دیکە بە سەرۆکایەتی وەزیری ناوخۆ، عەبدولستار عەلی دروستکرا کە دۆستێکی من و فوئاد رکابی بو.

ئێمە وەکو وەفدێکی نیمچە ڕەسمی بەڕێکراین، چوینە لوبنان و قاهیرە و لەوێوە هەمومان بەیەکەوە رۆیشتین بۆ جەزائیر، لە شەخسیاتی ناوداری ئەو زەمانە کە هاتبون وەک کەمال جونبلات، فوئاد نسار، سکرتێری حیزبی شیوعی ئوردونی، کەمالەدین رەفعەتی میسری، ئەحمەد حەمروش، عەبدولخالق مەحجوبی سودان، موحسین ئیبراهیم، نایف حەواتمە، لە سوریاشەوە وەفدی حیزبی بەعسی تازەی یەساری هاتبون.

لەوێ، من سێ باسم پێشکەشکرد، ئێستاش باسی گرنگ و سەرەکین و ئەگەر بیخوێنینەوە پێموایە هێشتا بەکەڵک دێن، یەکێکیان بە ناونیشانی (الاشتركية و المسالة القومية و المشكلة الكردية في العراق)، ئەوە دوایی بو بە کوڕاسێک و بڵاوکرایەوە. باسی دوەم، بەناوی (الاهمية التاريخية للوحدة العربية على آسس تقدمية و الديمقراطية) من بۆ یەکەمجار بابەتێکی ئیقتیسادی و سیاسی و ئیستراتیجیم پێشکەشکرد، باس لەوەئەکات، ئەگەر یەکێتی عەرەب لەسەر بناغەی پێشکەوتنخوازیی و دیموکراتیی دابمەزرێت، چ کاریگەرییەک ئەکات لەسەر

تەرازوی هێزەکان لە ناوچەکە و لە جیهاندا بە بەرژەوەندی گەلان کۆتایی دێت.

بەشداربوانی کۆنگرە، زۆر بابەتەکەی منیان پێ باشبو، ئەوە یەکەم موداخەلەم بو، دوەم باسم، مەسەلەی کوردبو، ئەویش کاری خۆی کردەسەر بەشداربوان، لە جەزائیریەکان، بوتەفلیقە و ئەخزەر ئیبراهیمی، ئێستا دبلۆماتێکی ناوداری نەتەویەکگرتوەکانە و دۆستێکی نزیکی منە، ئامادەبون، تا ئێمە هاتوچۆی خێزانیشمان هەبو، ماوەیەک سەفیریان بو لە لەندەن، چەندینجار من و هێرۆی دەعوەت کردوە و ئێمەش ئەوان.

باسێکی ترم پێشکەشکرد بەناوی (دور البورجوازية الصغيرة في بناء الاشتراكية)، ئەمە زوربەی خەڵکەکە پێی ناخۆشبو، چونکە ئەوکاتە بۆچونی چەپ زاڵ بو بەسەر نوسینەکانمدا گوتم: "ئەو بۆچونانەی راستن، کە ئەگوترێ کە بەبێ سەرکردایەتی هێزی کرێکار، سۆسیالیزم بینا ناکرێ و بۆرژوازی بچوک ناتوانێ سۆسیالیزم بینابکات".

منیش گوتم: "(التطور اللاراسمالي) شتێکی باشە بۆئەو وڵاتانەی ئیشتیراکیەتی تێدانیە، هەروەها نمونەی وتەیەکی لینینم هێنایەوە کە نابێت بزوتنەوەی رزگاریخوازی و بزوتنەوەی دیموکراتی شورشگێر تێکەڵاو بکرێت لەگەڵ بۆچونەکانی شیوعیەتدا".

سۆڤێتەکان بۆچونەکانی منیان پێ ناخۆشبو، ئەوان دو شتیان پێ ناخۆشبو، یەکەمیان سەفیری سۆڤیەتی لەوێ گوتبوی: "بۆ بارزانیتان دەعوەت نەکردوە، بۆ تاڵەبانیتان دەعوەتکردوە". موحسیبن ئیبراهیم وەڵامی دابونەوە بەناوی هەیئەتی تحریرەوە. موحسین ئیبراهیم زۆر پیاوێکی نوکەتەچی و قسە خۆشبو، گوتبوی: "رەفیق، ئەگەر کۆنگرەی عەشایەری عەرەبیمان بەست و بارزانیمان دەعوەت نەکردایە، ئەوا هەق بو گلەییەکی زۆربکەیت، ئەگەر کۆنگرەی عەشایەری وڵاتانی عەربیمان ببەستایە و بارزانی لە سەرەوەی لیستەی دەعوەتکراوەکان نەبوایە، ئەوە پێویست بو گلەیی بکەی، بەڵام ئەمە کۆنگرەی ئیشتیراکی عەرەبیە"!.

*** کۆبونەوەی لەو جۆرە، فرسەتێک بو، کە باسی مەسەلەی کوردی تێدا بکرێت، هەروەها فرسەتێک بو بۆ ناسینی کەسایەتی ناوداری عەرەبی، ئایا توانرا وەک پێویست سود لەو کۆنگرەیە وەربگیرێت؟**

- بێگومان بەپێی توانا هەوڵماندا، لە کۆنگرەکەدا باسی مەسەلەیەکمان کرد کە جەزائیریەکان پێیان ناخۆش بو، ئەویش مەسەلەی بین بیلا بو، کۆمەڵێک

باسی ئەویان کرد کە بن بیلا پێویستە بەربدرێت، من یەکێک بوم لەو کەسانە و لەو بارەیەوە قسەم لەگەڵ بوتەفلیقەدا کرد، ئایا بچین لەگەڵ سەرۆک کۆمار قسەبکەین، گوتی پێویست ناکات قسە بکەن، چونکە رەنگە زۆر تورەبێت.

بن بیلا چاکەی بەسەر کوردەوە هەبو، شەخسیەتێکی نیشتمان پەروەر و سەرکردەیەکی گەورە بو لە مێژوی جەزائیردا، بە باشم زانی کە دەنگی خۆم بخەمە پاڵ دەنگی ئەو کەسانەی کە داوای بەردانی ئەکەن.

من ٥ی حوزەیران لە قاهیرە بوم، لەوێ وەزیریی بەرگریی و کۆمەڵێک شەخسیاتمان بینی، وەک ئەمین هوەیدی، سامی شەرەف، وابریاربو کە سەرۆک عەبدولناسریش ببینین، بەڵام ئەوەبو لەو رۆژەدا، ٥ی حوزەیران هێرشەکە رویدا.

لەگەڵ عەبدولخالق مەحجوب (سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی سودانی) لە کۆنگرەکەدا زوبوین بەناسیاو و بۆچونمان زۆر لەیەک نزیک بو، هەروەها لە لیژنەیەکی کۆنگرەدا ئەندام بوم لەگەڵ عەبدولعەزیز بوتەفلیقە، ئەخزەر ئیبراهیمی، عەبدولخالق مەحجوب و چەند کەسێکی تر، لەوێ فوئاد نەسارم ناسی، بەودا نامەیەک و چەند کڵاوێکم بۆ جەواهیری نارد، چونکە فوئاد نەسار لەوێوە ئەچو بۆ پراگ، بۆلای جەواهیری.

هەر لەوێ لەگەڵ شیوعییەکانی سوریا، لوبنانی و وڵاتانی تری عەرەبی یەکترمان ناسی، هەروەها کەمال جانبوڵاتم ناسی، رۆژێک چەند نوکتەیەک رویدا لەوانە، حەز ئەکەم بۆت بگێرمەوە، هەرچەندە رەنگە کاتەکە بکوژم، بەڵام هەر پێم خۆشە بیگێرمەوە: رۆژێک لەگەڵ خێرەدین حەسیب و موحسین ئیبراهیم راوەستابوین، پاش ئەوەی موحازەرەکەمدا لەسەر (الاشتراكية و المشكلة القومية و المشكلة الكردية في العراق) کەمال جانبوڵات بەوێدا هات و سڵاوی لێکردم و پیرۆزبایی لێکردم و گوتی: "جەلال تۆ ئەزانی ئێمەش ئەسڵمان کوردە"! گوتم: بەڵێ عائیلەی (جان پۆڵاد) مەشهورن لە مێژوی کورددا.

لەو کاتەدا کورێکی رەشتاڵەی بچکۆلە بەوێدا هات، سەرۆکی وەفدی یەمەنی شیمالی بو، ئەویش خۆی تەقدیم کرد و گوتی: "ئوستاز جەلال ئەمنیش کوردم، باپیرم قازی بوە و چۆتە یەمەن، ئێمە بە رەچەڵەک کوردین"، منیش گوتم: زۆر باشە و خۆشحاڵ بوم و رۆیشت. خێرەدین حەسیب قۆڵی گرتم گوتی: "كاكه هذا شلون ينجرع، هم كردي و هم يمني" نوکتەیەکی تری مەشهوری تر، ئەوەبو، لە تەیارەدا من و عەبدولخالق مەحجوب لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوین، یەکێک لای موحسین ئیبراهیمەوە، لەوبەرمانەوە دانیشتبو، بەڵام دیاربو گوێی هەڵخستبو بۆ

قسەکانی بەینی من و عەبدولخالق مەحجوب، باسی ئەوەی بۆ کردم کە کورد لە سودان هەیە، منیش گوتم ئاگاداری شتی وا نیم، گوتی: با کورد هەیە وەڵڵا بە جددیمە و گاڵتە ناکەم، لە سەرەتادا وام ئەزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکات و باس لەوە کرد، کە کورد لە هەمو شوێنێک هەیە، گوتی نەوەڵڵا، هەتا حادیسەیەکی گێڕایەوە کە قەت لە بیرم ناچێتەوە گوتی: "ئێمە گەنج بوین لە نادیەک بوین، وابزانم ناوی نادی قەڵەم بو، هی رۆشنبیرەکان بو، لەوێ کۆدەبوینەوە، گوتی شاعیرێکی سودانی بە رەگەز کورد لەوێبو لەگەڵ شاعیری تری عەرەبی سودانی شەڕە شیعریان ئەکرد و هەجویان ئەکرد، گوتی: کوردەکە هەمو ئەوانی بەزاندبو بە درێژایی وەقت، هەتا ئاخیرجار یەکێک لە شاعیرە عەرەبەکان هەجویەکی بۆ دانابو تەرجومەکەی بەوە ئەهاتەوە (این الکرد والتتر)" منیش گوتم: "ها های هاوڕێ عەبدولخالق تۆی نوێنەری پرۆلیتاریا، قسەی وائەکەیت"! گوتی: "جەلال ئەمن نوکتەت بۆ ئەگێڕمەوە"، گوتم: "نا لە مارکسییەتدا ئەڵێ هەمو فکرێک بناغەیەکی ماددی هەیە"، ئەویش گوتی: "کوڕە جەلال خوا بتگرێ من خۆت ئەزانی عەواتفم چۆنە بەرامبەر بە کورد"، گوتم: "وەڵڵا ئەزانم، بەڵام ئەوە ئاساریی شۆفێنێتی عەرەبییە"!

موحسین ئیبراهیم گوێی لێبو گوتی: "جلال آسمعنی آنتم مسیرکم آبادة، آبادة و بس علی آیدي العرب، غیر الابادة ما تشوفوا، بس تریدها قومیة احنا جاهزین".

زۆرجار کە باس لەسەر پشتگیریی کورد ئەهاتە پێشەوە، زۆر بە عمومیات قسەیان ئەکرد، ئەیانگوت پێویستە پشتگیریی خەباتی گەلی کورد بکرێت، بەمەرجێ برایەتی کورد و عەرەب بەهێزبکات و رێگا لە ئیمپریالیزم بگرێت کە تەدەخول لە کاروبارەکانیدا بکات. موحسین ئیبراهیم تەعەلیقی هەبو ئەیگوت: "ئەوە یەعنی هیچ نەدرێ بە کورد"! موحسین زۆر پیاوێکی خۆشبو، ئەیگوت: "من تێناگەم (یسد النافذه علی الاستعمار و الرجعیة) مانای چییە، کورد میللەتێکە و مافی چارەنوسی خۆی هەیە.

موحازەرەکەی من دەربارەی مەسەلەی کورد و ئیشتراکییەت بو، کاریگەریەکی باشی هەبو لەسەر بۆچونی عەرەبی لەسەر مەسەلەی کورد، ئەوە یەکەمجاربو لە وڵاتێکی عەرەبی و بەتایبەت جەزائیریش لەناو کۆمەڵێک هێزی ئیشتیراکیی عەرەب کە هەندێکیان لە حوکم بون، مەسەلەی کورد و مافی چارەنوسی و ئۆتۆنۆمی بەو شێوەیە باسبکرێت.

باسم لەوە ئەکرد، مافی چارەنوس و حوکمی زاتی باشترین چارەسەرە بۆ کێشەی

نێوان کورد و عەرەب، بەو شێوەیە نەبێت چارەسەری مەسەلەی میللی کورد ناکرێت.

کە هاتینەوە قاهیرە شەڕی حوزەیران رویدا، میسر تێدا شکا، ئێمە چوبوینەوە ئەسکەندەرییە، لەوێوە بە پاپۆڕ گەڕاینەوە بۆ بەیروت کە گەیشتینە بەیروت، ئەو شەوە عەبدولناسر ئیستیقالەی کرد، هەمو عالەم هاتە جۆش و خۆپیشاندان دژی ئیستیقالەکەی عەبدولناسر و داوایان کرد، ئەبێت بمێنێتەوە و نەڕوا.

*** ئەوکاتە شەڕی حوزەیرانی نێوان عەرەب و ئیسرائیل دەستی پێکردبو، ئایا هەڵوێستی ئێوە چی بو بەرامبەر بەو شەڕە، بێلایەن بون، یان پشتیوانی لایەکتان دەکرد دژ بە لایەکی تر؟**

– لەو کاتەدا، من لە بەیروت بوم، لەوێ وتارێکم نوسی لەسەر مەسەلەی کورد و هەڵوێستی نەتەوەی عەرەبی بەرامبەر بەو مەسەلەیە، لە گۆڤاری (الحرية)ی لوبنانیدا بڵاومکردەوە کە موحسین ئیبراهیم دەری ئەکرد. وتارێکی زۆر عاتیفی گەرمبو بەرامبەر بە عەرەب و عەبدولناسر، باسم لەوە ئەکرد، گەلی کورد لەگەڵ عەرەبدایە لەو شکستیەدا و پیلانەکانی ئیستیعمار و سەهیۆنی هەر ئەبێ بشکێت.

جەماعەتی مەلا مستەفا بەتایبەتی د.مەحمود عوسمان ئەو هەڵوێستەی منیان بە کلکایەتی بۆ عەرەب و عەبدولناسر نیشاندا، وتارەکەی منیان فۆتۆکۆپی کردبو، لە ئەوروپا بڵاویانکردەوە.

دوایی لە لوبنانەوە هاتینەوە بۆ سوریا، کە هاتینە سەر سنوری سوریا هەمو وەفدەکان پێکەوەبوین، بەعسی سوریشمان لەگەڵدابو. رێگایان بە هەمو ئەندامانی وەفدەکەدا بڕۆن، تەنها رێگایان بە من و فوئاد رکابی نەدا و گوتیان قەدەغەیە بچنە ناو سوریاوە.

پێمانگوتن، ئێمە لەگەڵ وەفدی سوری و عێراقین، تکامان لێکردن کە رێگامان بدەن، بەڵام بێ ئەنجام بو، ئەندامانی وەفدەکە گوتیان، "ئێمە ئەچینە دیمەشق و بە برادەران ئەڵێین، چونکە ئەم گیروگرفتە لێرە لەگەڵ کارمەندی بچکۆلە چارەسەر ناکرێت، بۆیە پێویستە ئێوە لەسەر سنور چاوەڕێ بکەن".

من و فوئاد رکابی لەسەر سنور چاوڕێمان کرد، بە شەپۆلیش سەربازی سوریمان ئەدیت کە فیراریان کردبو، یان لە جەنگدا شکابون و پەرت و بڵاوبوبونەوە، ئینسان دڵی پێیان ئەسوتا.

کۆمەڵێک ئەفسەری سوریش هەبون، ناسری بون و هاتبونەوە، لەسەر سنور راوەستابون، ئەیانگوت ئێمە ئەچینەوە وڵات و لە سوپای خۆماندا خەبات ئەکەین،

ئەوانیش قبوڵیان نەکرد بچنەوە.

ئەو دو دیمەنە، زۆر کاریگەربو لەبەرچاوم، پاش درەنگێک هەواڵ هات، بانگیان کردین گوتیان: فەرمون، ئوتومبێلێکیان لە دیمەشقەوە بۆ ناردبوین، ئێمەیان برد بۆ دیمەشق.

شەو چوینە بارەگای نقاباتی کرێکاران، ئەوکاتە کابرایەک سەرۆکی بو ناوی (خالد الجندی) بو، سمێڵ گەورەیەک بو، دانیشتبوین لەوێ ئەو مستەفا تەلاسەی وەزیری بەرگری سوریاش لەوێ بو، پاش ماندوبون و قسەی خۆش، باسی ناپاڵممان ئەکرد کە چۆن بەکارهاتوە لە دژی سەربازی سوریا. لەوەئەچو کە ناپاڵمیان نەبینیبێ، ئەفسەرێکی فرۆکەوانی عێراقیش، پەنابەربو لەوێ. ئەوە بۆیە بۆت ئەگێڕمەوە چونکە ئەوەیش نوکتەیە، بەعسی چەپ بو، باسی ناپاڵمی ئەکرد، چەند کاریگەر و چەند خراپ و ترسناکە و زۆر کەس ئەکوژێت.

وەکو شارەزایەکی باش لە ناپاڵم قسەی ئەکرد، مستەفا تەلاس سەری لەو قسانە سورمابو، گوتی: "رەفیق ئەتۆ چۆن ئەو زانیاریانە ئەزانی و لەکوێوە فێربویت"؟ گوتی: "کیف ما آعرف، مو آحنا استعملناها ضد اخواننا الاکراد"دەستیشی بۆمن درێژکرد، ئیتر بو بە پێکەنین. دوای ئەوە ئەو مەسەلەیە زۆر جار باس ئەکرا و ئەیانگوت، ئێمە نەبوین کە دژ بە برا کوردەکانمان بەکارمان هێنا!.

لەوێ ماینەوە، چونکە فرۆکە نەبو، پێی بگەڕێینەوە لەو ماوەیەدا زۆر خەڵکمان بینی، لە زۆر شوێن پێشوازی کراین، ویستم پەیوەندی لەگەڵ سوریەکاندا بکەم، ئەمزانی تاقمێکی یەساریی وەک دکتۆر یوسف زەعین هەن کە دوایی سەیرمکرد، ئەوانە لە مەسەلەی قەومیدا یەساری نین، بەڕاستی هەمو لە ناوەڕۆکدا بەعسین، لەبەرئەوە هیچ سودێکی نەبو، بۆیە بە شەمەندەفەر و بە ئۆتۆمبێل گەڕاینەوە بۆ بەغدا.

لە ئیستگە تەماشا ئەکەم تاریق عەزیز لەوێیە، ئەوکاتە تاریق عەزیز مامۆستا بو لە دیمەشق، لە جەماعەتی میشێل عەفلەق بو، جەماعەتی چەپرەوەکان لە ١٩٦٦دا گرتیان و لە حوزەیرانی ١٩٦٧ بەهۆی شەڕی ئیسرائیلەوە ئازادیان کردبو، ئەیویست بگەڕێتەوە، بەڵام یەک کەس لە وەفدی عێراقی قسەی لەگەڵ نەدەکرد، ئافەرۆزیان کردبو، من سڵاوم لێکرد و تێگەیشتم پارەشی پێنیە، بۆیە لەهەمو چاخانە و نان خواردنێکی سەر رێگادا، پارەی هەردوکمانم ئەدا.

لە کاتی گفتوگۆی ١٩٨٣ دا لە بەغدا ئەو مەسەلەیەی گێڕایەوە و گوتی:

"من ئەوەم لەبیرە کاتی خۆی کاکە جەلال لەشام تاکە کەس بو، قسەی لەگەڵ ئەکردم".

*** وەک باس ئەکرێت، ڕاستە لەو ماوەیەدا بارزانی سەردانی ئیسرائیلی کردبو؟ ئایا ئەو سەردانە چ کاردانەوەیەکی هەبو لای ئێوە و لای عێراق، هەڵوێستی فەرمی ئەوان لەو بارەیەوە چی بو؟**

- کە ئێمە هاتینەوە بەغدا، پاش ماوەیەک لە تارانەوە هەواڵێکی خراپمان پێ گەیشت، ئەویش ئەوەبو کە مەلا مستەفا چۆتە ئیسرائیل و شەمسەدین مفتی و دکتۆر مەحمودیشی لەگەڵ خۆی بردوە[١٠].

وایان گێرایەوە دوای شکستەکەی عەرەب، ئیسرائیلیەکان بردویانن بۆ سینا، شوێنی شەڕەکانیان نیشان داون، هەواڵێک هات کە مەلا مستەفا بروسکەیەکی پشتگیری بۆ ئیسرائیل ناردوە، بەڕاستی ئەو بروسکە پشتگیریە تا ساڵی ١٩٦٩ رون نەبو، لەو ساڵەدا کتێبێک دەرچو بەناوی (اسوار اسرائیل) کە موشێ دەیان، پێشەکیەکی بۆ نوسیبو. سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئیسرائیل لەوێدا ئەڵێ، لە شەڕی ١٩٦٧دا کە بەسەر عەرەبدا سەرکەوتین، بروسکەی پیرۆزباییمان لە بارزانییەوە پێگەیشت.

ئەو پەیوەندیە توندەی مەلا مستەفا بە ئیسرائیل و ئێرانەوە، هۆبون کەوای کرد مەلا مستەفامان بە تەواوی لەبەرچاو رەشبێت، بزوتنەوەکەیمان نەک وەک شۆڕش نەئەهاتە بەرچاو، بەڵکو پێمانوابو، کە ئەوە بزوتنەوەیەکی کۆنەپەرەستانەی گرێدراوی ئیسرائیلە.

لەوسەردەمەدا، هەرچی خۆی بە چەپ و مارکسی بزانیبایە، پشتگیری ئێمەی دەکرد، ئەو کاتە ناکۆکی کەوتبوە نێوان روس و چینەوە، تەیارێک لەناو ئێمەدا پەیدا بوبو، بۆچونی چینی بەڕاست ئەزانی و ماوتسی تۆنگی بە سەرکردەیەکی گەورەی شیوعی ئەدایە قەڵەم.

لەناو پارتیدا کۆمەڵێک گەنج هەبون، لە ئەوروپا خوێندبویان و لەو مەسەلانە باش تێگەیشتبون، وەک، روشدی شەریف و تاقمێک گەنجی تری باش و هۆشیار هەبون لە سلێمانی کە زۆرتر موتەئسیر بون بە (الیسار الجدید)، وەکو نەوشیروان مستەفا، بەکر حوسێن، فوئاد و فازیلی مەلا مەحمود، فەرەیدون عبدولقادر، شازاد سائیب، ئەمانە بەڕاستی بۆچونیان لە یەساری جەدیدەوە نزیک بو، بەڵام من قۆستمنەوە، زو پەیوەندیم لەگەڵیان بەست.

# دروستکردنی (تەیاری چەپ) لە ناو پارتیدا

*** کەی و چۆن چەپەکانی ناو پارتی لەیەک نزیک بونەوە؟**

- ئێمەی گەنجانی چەپی ناو پارتی، لە ئەنجامدا هەمو بوین بەو تەیارە چەپەی ناو پارتی و کەوتینە بن کاریگەری خەتی چینەوە. ماوتسی تۆنگمان خۆش ئەویست، کار گەیشتبوە ئەوەی، ئێمە لە بارەگاکانی خۆمان لە بەکرەجۆ و لە قەرەداغ وێنەی ماوتسی تۆنگمان هەڵواسیبو، مەدالیایەکی ماوتسی تۆنگ بە سنگمەوە بو، نەوشیروان و ئەو برادرانەی تر کە ناوم بردن، هەمو لەژێر هەمان کاریگەریدابون، بۆیە ئێمە ئەڵقەی رۆشنبیریمان دروستکردبو.

هەرچەندە ئێمە پارتی بوین، بەڵام بەڕاستی تەیارێک بوین لەناو پارتیدا، خۆم پشتگیریم ئەکردن، ئەگەر لە (م.س) یان لە سەرەوە شتێکیان لێ بکردنایە، چەکم ئەدانێ و ئەمپاراستن.

ئێمە هەوڵماندا، ئەم برادەرانە لە ئەنجامی هەڵبژاردندا لە سلێمانی دەسەڵات بگرنە دەست، برادەرانی تری وەک حەمەی حاجی تایەر و ئەوان دەسەڵاتیان کەم بێتەوە، برادەرانی تر، سەرەڕای ئەوەی کە زۆر کوڕی باش و دۆست بون، بەڵام تازەکان نفوزیان پەیداکرد، بۆ نمونە مامۆستا ئیبراهیم، عومەر دەبابە، زەبیحی، عەلی عەسکەری و حیلمی عەلی شەریف ئەوانە زۆر گەرم نەبون بۆ بۆچونە فکرییە تازەکان.

*** کەواتە ئێوە رێکخستنێک بون لەناو رێکخستنێکدا، یان حیزبێکی چەپ بون لەناو حیزبێکی نەتەوەییدا؟**

- نەخێر، رێکخستن نەبوین، تەنها تەیارێک بوین، بڵاوکراوەمان بڵاوئەکردەوە، نوسینمان ئەنوسی، بۆ نمونە هەندێ نوسینمان بە نەوشیروان مستەفا تەرجومەکرد، بە تایبەتی نوسینەکەی ماوتسی تونگ (بژی جەنگی گەل).

لە دوایدا مامۆستا ئیبراهیم بە یارمەتی نەوشیروان مستەفا، تەرجومەی

هەڵبژاردەکانی ماوتسی تونگیان کرد.

*** ئایا کتێبخانەی بیری نوێ لە بەغدا، شوێنی کۆکردنەوەی ئێوەبو، کێ بون ئەوانەی لەوێ کۆدەبونەوە؟**

- دوایی باسی مەکتەبەی بیری نوێشت بۆ ئەکەم، ئێمە دامان مەزراند، ئەویش دەربارەی هەمان مەسەلەبو، ئەوکاتە برادەرانی تریش کۆبوبونەوە، وەک شەهابی شێخ نوری و دارۆی برای، محەمەد سابیر، مەحمودی مەلا عیزەت، جەمال تاهیر، هەمویان لە چوارچێوەی ئەو بیرە چەپەدا خۆیان کۆکردبۆوە.

*** تۆ لەوەوپێش باسی ئەو شەڕانەت کرد، لە کوردستان لەنێوان ئێوە و بارزانیدا رویدا؟**

- ئاخر هێشتا ڕوی نەداوە، لە ١٩٦٨وە رویدا، ئێمە جیابوینەوە و مەلا مستەفا هاتە سەرمان و هەندێکی لێگرتین، بەڵام شەڕی گەورە لە شەست و هەشت بەولاوە ڕویدا.

ڕوداوێکی گرنگی تر ئەوە بو، لە سەرەتای ١٩٦٨دا ئێمە و بەعسی چەپ و بزوتنەوەی ئیشتیراکی بە سەرۆکایەتی فوئاد رکابی خەریکی کودەتابوین، ئەوان لە ناوسوپا دا خەڵکیان هەبو، ئێمەش بڕیارماندابو، هەندێک پێشمەرگە ئامادەبکەین.

عەبدولستار عەبدوللەتیف کە رئیس روکنی خانەنشین بو، دۆستمان بو، ڕۆژێکیان داوای دیتنی من و فوئاد رکابی کرد، بێگومان من لەگەڵ فوئاد رکابی زۆر دۆست بوم، وەک خێزانیش تێکەڵاویمان هەبو، کاتێ هێرۆ دەسگیرانم بو، لەگەڵ ئەوان بەیەکەوە ئەچوینە دەرێ و هاورێی ڕۆژانەبوین. بێگومان لەگەڵ میسریش پەیوەندیمان زۆر باشبو، سەفیری میسر بۆ هەندێ کاری گرنگ ئەهاتە لای من، یان من ئەچومە لای ئەوان، یان بۆ هەندێ مەسەلەی گرنگ پرسی پێدەکردم.

لەگەڵ حکومەتیش نێوانم ئەوەندە باشبو، عەبدولرەحمان عارف جارێکیان گیروگرفتی هەبو بۆ چاککردنی بەینی خۆی و عەبدولناسر، هات تەکلیفی لە من کرد کە نامەیەکی ئەو بەرم بۆلای عەبدولناسر، بەڵام دوایی بە شێوەیەکی دیکە چارەسەرکرا.

کە چوینە لای عەبدولستار عەبدوللەتیف، پێی گوتین: "وەزعی حوکمەت زۆر شلۆق بوە هەتا جەماعەتەکەی عەبدولرەحمان عارف خۆیان ئەیانەوێت بیگۆڕن"و تەکلیفیان لەو کردوە، ببێتە سەرۆک کۆمار، ئەویش گوتویەتی: "دو هاورێی هەیە و ئەیەوێت پرسیان پێ بکات، ئەوانیش فوئاد رکابی و جەلال تاڵەبانین".

## پەراوێزەکان:

١- ئیبراهیم جلال، خۆی یەکێك بو لەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵ (م.س.) چوبون بۆ ئێران، لە کتێبەکەیدا نوسیویەتی (فەرماندەیەکی فارسی سوپای ئێرانی.بە ژمارەیەك سەربازەوە کە نزیکەی ٢٥٠ کەس دەبون، هاتنە لامان و کۆبونەوەیان لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد پێشتر کردبو، لەوێش لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و عەلی عەسکەریی و عومەر مستەفا و خالید دلێر کرد، هێشتا لە کۆبونەوەکەدا بون، جەلال تاڵەبانی بە توڕەییەوە لە کۆبونەوەکە هاتە دەرێ و فەرمانی بە پێشمەرگەکاندا، کە هەمو بەرزاییەکان بگرن و دەوری سەربازە ئێرانیەکان بدەن.... دیسان مام جەلال بە رق و توڕەییەکی ناڕەوا و ناڕاستەوە، هێرشێکی کردەسەر ئەوانەی لەگەڵ مانەوەدا بون و وتی "من بە تەنیاش بم هەر دەگەڕێمەوە و سەر بۆ بڕیاری ئەم سەگبابانە شۆڕ ناکەم وچەك دانانێم" .(ئیبراهیم جلال، ،خواروی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن). ل.١٩١.

٢- (دوای ئەوەی جارێکی تر بە ناچاری و خۆ دورخستنەوە لەشەڕ لەگەڵ بارزانیدا، هاتنەوە ناو خاکی ئێران، ئەوانە چەکەکانیان تەسلیم نەکرد و لە ناوچەی سورچییەکان مانەوە، بەڵام کە ئێرانیەکان هاتن، پێان ڕاگەیاندن کە نابێت لەو ناوچەیەبن، وەعدیشیان دانێ، ئێرانیان جێ هێشت، ئەو کاتە چەکەکانیان بدەنەوە، لەوێوە بردیانن بۆ شاری سەقز و دو مانگ لەوێ مانەوەو لێپرسراوەکانیان لەژێر چاودێری حکومەتدا مانەوە، پێشمەرگەکانیان بردن بۆ هەمەدان و لە کارگەیەکی کۆنی شقارتە دروستکردن، نیشتەجێیان کردن، کاتی برینی سنوری ئێران، ژمارەیان ٦٠٠ چەکدارێك دەبون، بەڵام نزیکی نیوەیان گەڕانەوە بۆ ناو بزوتنەوەی چەکداری کوردی). (الحرب الكردية و أنشقاق ١٩٦٤- ديفيد أدمـــن). ل. ٥٨.

٣- (سەرەتای پەیوەندیی پارتی یان بارزانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢، کاتێ ئەو پەیوندیە بەهۆی سەفارەتی ئێرانەوە لە بەغدا دەستی پێکرد، بەهۆی ئەو پەیوەندیەوە، شەمسەدین موفتی، چو بۆ قەسرێ شیرین و چاوی بە ئەفسەرێکی ساواك کەوت..ئەم پەیوەندیە بە ڕەزامەندی مەکتەبی سیاسی بو، جگە لە نوری شاویس نەبێ کە دژی ئەو پەیوندە بو).(التيارات السياسيه..صلاح خرسان. ل.١٢٥).

هەروەها مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ عەلی کەریمی باسی پەیوەندی کورد و ئێران بەم شێوەیە دەکات: (ڕابیتەی پارتی و ئێران بەوە دروست بو، کە مەلا مستەفا وەفدێکی بە سەرۆکایەتی عەبدولڕەحمان ڕوتە کە کادیرێکی چالاکی پارتی بو، کوری خاڵی عەلی عەبدوڵڵایە، نارد بۆ مهاباد

بۆ لای وەهرام، بۆئەوەی پەیوەندی دروست بکات، ئەمە لە ئەواخیری ١٩٦١ بوە). (ژیان و بەسەرهاتی عەبدولرەحمان زەبیحی - نوسینی علی کریمی١٩٩٩.ل. ٣١٣).

٤- حکومەت لە ١٩٦٥/٥/٣ هێرشی بۆسەر کوردستان دەستپێکرد.

٥- ئەحمەدی بانیخێلانی، ئەندامی لیژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی کوردستانی عێراق و دۆستی پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانی، دەربارەی پلانی بارزانی بۆ کوشتنی سەرکردەکانی باڵی م.س. پارتی دەگێرێتەوە "بارزانی ناردی بە شێونماندا، من و ئەبو سەلام و عادل سەلیم ڕۆشتین، چونکە داوای کردبو هەمو بڕۆین، ئەو کاتە زستان بو، بارەگاکەی لە دیلمان بو. پاش نانخواردن چوین بۆ لای، بایزی عەباسی مامەند ئاغا و چەند کەسێکی تریش لەوێ بون، بارزانی گوتی: "من ناردومە بە شوێنتانا هەتا پێتان بڵێم دەبێ جەلال تالەبانی و ئیبراهیم ئەحمەدم بۆ بکوژن". ئێمەش گوتمان ئەوە بە ئێمە ناکرێ. گوتی: "یان دەبێ بیکەن یان دەبێ لە کوردستان نەمێنن، تەنها چل ڕۆژتان مۆڵەت دەدەم، ئەگینا دەبێ بارکەن و لەم ناوە نەمێنن" (ئەحمەد بانیخێلانی، یادەوەرییەکانم، ل. ٢٦٢ - سلێمانی ٢٠١٤- چاپخانەی کارۆ).

٦- (لە ١٩٦٣/٦/٢٩ ڕێکەوتنامەی نێوان پارتی و حکومەتی عێراق (عەبدولرحمان بەزاز) کە لە ١٥ خاڵ پێکهاتبو کە ٣ نیان نهێنی بو، بریتی بو لە دامەزراندنی پارێزگای دهۆك و ڕێگادان بە پارتی کە بە ئاشکرا کاربکات و ڕۆژنامەی تایبەتی خۆی دەربکات و لێبوردنێکی گشتی دەربچێت، هەروەها زۆربەی خاڵەکان هەمان خاڵ بون، لە گفتوگۆ کۆنەکاندا باسی لێوە کرابو، کە گرنگترینیان ئەوەبو کە بە ڕونی دانرا بە مافی میللی گەلی کوردا و لە ڕێکەوتنامەکەدا هاتبو (عێراق لە دو نەتەوەی سەرەکی پێکهاتوە، عەرەب و کورد)و بڕیاردرا کە مافە نەتەوەییەکانیش لەو دەستورە هەمیشەیەدا تۆماربکرێت، کە دەردەچێت. هەر ڕۆژی دوای ئەوە ڕۆژنامەی (الجمهورية) زمانحاڵی حکومەت، نامەیەکی مەلا مستەفای بڵاوکردەوە کە پشتگیری تێدا بوو بۆ ئاسایی کردنەوەی باری کوردستان و دانپێنانی مافی کورد لە چوارچێوەی عێراق دا) (پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن- نەوشیروان مستەفا) ل ٩٣.

٧- (پەیوەندی کوردی-ئیسرائیلی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ١٩٥٩. ئەم پەیوەندیە لە ڕێگای کامەران میر بدرخانەوە دروست بو، "ئەو کاتە وەك نوێنەری بارزانی بو لە ئەوروپا"، کاتێ کە ئەو لە کۆتایی تەموزی ١٩٥٩ دا لەگەڵ گۆڵدا مایەر، وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل، لە شاری زیوریخی سویسرا بینیوە، لە سەرەتادا، گۆلدا مائیر، تەنها باسی هاوکاری کوردی کردوە لە بواری ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریدا. ئەو پەیوەندیە دوای چەند ساڵێ زیاتر گەشەی کردوە، زیاتر بەهۆی سەفیری ئیسرائیلی لە ئیتاليا، مۆریس فیشەر، کە هەمیشە هەوڵی ئەدا، کە ئیسرائیل یارمەتی کوردەکان بدات، ئەوەش لە نامەیەکی فیشەر زیاتر دەردەکەوێت، کە لە ٦ تشرینی یەکەمی ١٩٦١ بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیلی نوسیوە، کە حکومەتەکەی ٢٠ هەزار دۆلاری بۆ چالاکی بدرخان تەرخان کردوە و هەزار دۆلار بۆ کڕینی ڕادیۆیەکی لاسلکی بۆ بەردەوامی پەیوەندی کورد لە کوردستان و مەرکەزی چالاکیەکانیان لە ئەوروپا)، (الموساد في العراق و دول الجوار- شلومو نكديمون).ل. ٦٢، ٦٧.

٨- (ڕۆشنبیرانی ناو پارتیش، ڕۆڵیان هەبوە، لە گەشە پێدانی پەیوەندی نێوان کورد و ئیسرائیل،

جێگری جارانی موساد، ماحیم ناڤوت کە بە (ناهیك) ناسراوە، دەیگێڕێتەوە، لە پایزی ١٩٦٣ دا، سەردانی پاریس دەکات و ئەو یەکەم ئیسرائیلیە کە لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد ٤٩ ساڵ وەك سکرتێری پارتی کۆدەبێتەوە، بەڵام بەهۆی سەختی ژیانیەوە، پیرتر دیاربوە، دوای کۆبونەوەیەکی درێژ و باسی بارودۆخی ناهەمواری کورد، ئیبراهیم ئەحمەد ٢٠ هەزار دۆلار یارمەتی ئیسرائیلی دێنێتەوە بۆ کوردستان و وەعدی هاوکاری تریان پێ ئەدرێت). (آمە فی شقاق - جوناثان راندل) ل. ٢٥٢.

٩- دەربارەی ئەوەی کە حکومەتی عێراق ناچاربو، پەیوەندی لەگەڵ دو هێزی کوردی بکات، سەفیری ئەمریکا لە بەغدا لە نامەیەکدا لە ١٩٦٧/٨/١١دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی دەنوسێ (من لە ١٨ ئاب بە ماوەی ٥٠ خولەك لەگەڵ ناجی تالیب، سەرۆك وەزیرانی عێراق گفتوگۆم کرد، پێی راگەیاندم کە حکومەتی عێراق بەرنامەی چارەسەری کێشەی کورد بە تەواوەتی جێبەجێ دەکات، بەڵام زۆرتر باسی گیروگرفتەکانی کرد و ئاماژەی بەوەکرد، کە چۆن دەوڵەتی عێراق لەم پەیوەندیەدا دەچێتە پێش. بەوتەی تالیب جدی ترین کێشە لەم پەیوەندیەدا، بوونی ٣ کوتلە لە نێو کوردەکاندایە. بارزانی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە حکومەتی عێراق تەنها لەگەڵ ئەو مامەڵە بکات، بەڵام حکومەت ناتوانێت ئەو کوردانە پشتگوێ بخات کە لایەنگیری حکومەتی عێراقن یا ئەندامی کۆنی پارتی دیموکراتن). (مێژووی پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا – ئامادەکردنی وریا رەحمانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر – چاپی یەکەم ٢٠١٢) ل ٨٠.

١٠- (بارزانی لە ١٩٦٨/٤/١٥ دا، لە رۆژی جەژنی قیامەتی ئیسرائیلیدا، سەردانی ئیسرائیلی کردو، چاوی بە سەرۆك کۆمار، ولمان شۆفان و گەورەی لێپرسراوانی حکومەت و ئۆپۆزیسیۆن کەوت، د. مەحمود و شەمسەدین موفتی و ٥ پاسەوانی تایبەت، لەو سەفەرەدا لەگەڵ بارزانی بون)، (الموساد في العراق و دول الجوار- شلومو نكديمون).ل. ٢٠١.

# کودەتای بەعسییەکان

*** لە عەبدولستار عەبدوللەتیفتان نەپرسی کێن ئەوانەی کە ئەیانەوێت کودەتا بکەن، هەڵوێستی فەرمی ئێوە چۆن بو لەبارەی ئەو کودەتایەوە؟**

- بێگومان، کۆمەڵێک پرسیارمان دەربارەی خەڵک و چۆنێتی ئینقیلابەکە کرد، لەو ناوانەی باسیکرد، عەبدوللەتیف دەراجی، ئیبراهیم داود، عەبدولرەزاق نایف، مەجموعەکەی سەعدون غێدان. ئەوانە لەگەڵیدا دانیشتون و گوتویانە: "تۆ پیاوێکی حیزبی نیت، پێمان باشە، ببیت بە سەرۆک کۆمار"، ئەویش پێی گوتبون، ئەو بەو مەرجە ئەیکات، فوئاد رەکابی تەکلیف بکرێت بە دروستکردنی وەزارەت، ئەویش وەزارەتێکی وەتەنی پێکبهێنێت و ئێمەشی تێدا بەشداربین. ئەوانیش گوتویانە، بەو مەرجەی کە یەک وەزیر بدرێت بەوان، ئەویش وەزیری ئەمنی قەومییە، گوایە ئەویش رازی بوە و ئەیەوێت رەئی ئێمە بزانێ.

ئێمەش گوتمان، ئەوە شتێکی تازەیە و زۆر گرنگە، ئەبێ ئێمە بگەڕێینەوە بۆ حیزبەکانی خۆمان، یان هیچ نەبێ پرس بە هەندێ برادەرانی نزیکی خۆمان بکەین هاتینە دەرەوە، فوئاد رکابی رەئی وابو، باش ئەبێت، هاوکارییان بکەین، گوتی: "من پێم باشە، پشتگیریی ئەو کارە بکەین کە عەبدولستار عەبدوللەتیف ببێتە سەرۆک کۆمار و من ببمە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و تۆش ببیتە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیری ناوخۆ، ئەو کاتە ئێمە وردە وردە وەزعی خۆمان لەناو سوپا بەهێز ئەکەین و هەم کۆمەڵێک ئیسلاحات ئەکەین، ئەبێتە هۆی ئەوەی، ئەو ئەفسەرانە نەبنە مەترسی لەسەرمان".

منیش ئەو رۆژە ئەو بۆچونانەم پێ باشبو، ئەگەر راستت ئەوێت خۆشم هەمان رەئیم هەبو، بۆ تەئریخ و بۆ حەقیقەت، ئێستا نەیکەمە لافوگەزاف لێدان، منیش بۆچونەکەی ئەوم پێ باشبو. بەڵام کە گەڕامەوە بۆلای برادەرانی خۆمان و فوئاد رەکابی گەڕایەوە بۆلای خۆیان، تەحلیلێکی تر هاتە کایەوە، ئەو وەختە وەزعی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست ئاوەهابو، عەرەب لە جەنگی شەش حەوت رۆژە

لەگەڵ ئیسرائیلدا شکابو، جەبهەی شەرقی دروست بوبو، بەشی زۆری سوپای عێراقی ٥٠ تا ٦٠ هەزار، چوبون بۆ ئەردەن، ئەبوایە عێراق ئامادەبکرێت بۆ شەڕی فەلەستین بە هاوکاری میسر.

*** ئەوکاتە وەزعی عێراق بە گشتی و حکومەتی عەبدولرەحمان عارف بە تایبەتی و بارودۆخی حیزبایەتی و ئازادی ڕادەربڕین چۆن بو؟**

- ئەوکاتە عەبدولرەحمان عارف زۆر بێ هێزبو، حیزبی شیوعی بو بە دوبەشەوە، جەماعەتی قیادەی مەرکەزی ئەیانویست شەڕی ئەهوار دەست پێبکەن، زۆر کەس ئەیویست حکومەت بگۆڕێت، لە هەمان کاتیشدا وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاواش ئەیانویست بیگۆڕن، سعودیە و ئێران خەریکی پیلانی هاوبەش بون، بە تەمابون کە عەبدولرەحمان عارف لابەرن، چونکە عەبدولرەحمان عارف بەلای ئەوانەوە پیاوێکی نیشتمان پەروەرەبو، لە قسەی عەبدولناسر دەرنەئەچو، لە هەمان کاتدا پێیان وابو، کە ئەو پیاوێکی بێ هێزە و لەژێر سێبەری ئەودا بزوتنەوەی نیشتمانی گەشەناکات.

ئەو بۆچونە ڕاست بو، جموجوڵی حیزبایەتی گەشەی کردبو، حیزبەکان ڕێگایان پێدرابو، کەم کەس زیندانی ئەکرا، واتا هەمو کەس ئەیتوانی حەز و خواستی خۆی دەربب‌ڕێت، ئەزانرا کێ چییە و کەسیش هیچی لێ نەدەکرا.

ئەم وەزعە بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا دەستی نەئەدا، ئەوان ئەیانویست حکومەتێک بهێنن کە جەبهەی شەرقی هەڵوەشێنێتەوە، بچێت بەگژ عەبدولناسر و سوریادا، چاکترین جەماعەت بۆ ئەوکارە، (بەعسی یەمین) بو، بەحوکمی ئەوەی دژی سوریا بون و ئەگەری ئەوە هەبو، کە بێنە سەر حوکم دژی سوریا ڕائەوستن و ناهێڵن سوریا و عێراق نزیکبن و هاوپەیمانێتیان پێکبێت، چونکە دو حیزبی بەعسی دژ بەیەکن، بەحوکمی ئەوەی دژی عەبدولناسرن، ئەکەونە شەڕ لەگەڵیاندا و جەبهەی شرقی تێک ئەدەن. هەروەها بەحوکمی ئەوەی دژی شیوعییەتن، ئەوە حیزبە شیوعییەکان لەناوئەبەن، بۆیە ئەوان ١٠٠٪ پشتگیری هاتنی بەعسی یەمینییان کرد.هاتنی بەعسییەکان لەگەڵ پیلانی وڵاتانی ڕۆژئاوادا ئەگونجا، بۆیە قسە هەبو، کە ئەوان ئەیانهێننە سەر حوکم، هەتا عەبدولستار لەتیف پێی گوتین، ئەگەر ئێوە هاوکاری نەکەن، ئەوا ئەم ئەفسەرانە بێ ئومێد ئەبن لە ئێمە و ئەچن لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکر و ئەوان پێکدێن.

لە بیرمە، فوئاد ڕەکابی گوتی: "خلی یجون" پاش ماوەیەک ئەیانڕوخێنینەوە، من گوتم: "وا بە ئاسانی ناڕوخێندرێن، ئەمجارە تاقیکردنەوەی ١٩٦٣ یان هەیە و وا بەئاسانی لا نابرێن".

*** ئه‌ی په‌یوه‌ندیتان له‌گه‌ڵ هێزه‌کانی تری عێراق چۆن بو؟**

- له‌وسه‌رده‌مه‌دا، ئێمه په‌یوه‌ندیمان له‌گه‌ڵ حیزبی شیوعی عێراقی خراپ نه‌بو، له‌گه‌ڵ دوکتۆر سه‌فا حافیز یه‌کترمان ئه‌بینی، هه‌ندێجار مامۆستا ئیبراهیم ئاماده‌ی ئه‌و کۆبونه‌وانه ئه‌بو، هه‌ندێجار من و حیلمی عه‌لی شه‌ریف ئه‌چوین، هه‌ندێجار عه‌زیز محه‌مه‌دمان ئه‌بینی. عه‌زیز محه‌مه‌د به‌نیو ئاشکرا هاتبوه‌وه و هاتوچۆی ئه‌کرد، هه‌ندێ جاریش عه‌زیز محه‌مه‌دمان له ماڵی هه‌مزه عه‌بدوڵڵا ئه‌بینی، ئه‌وان ئه‌وسه‌رده‌مه بۆچونیان وابو، که هه‌م له‌گه‌ڵ ئێمه په‌یوه‌ندیان هه‌بێت و هه‌م له‌گه‌ڵ مه‌لا مسته‌فا.

ته‌نانه‌ت له‌ناو ده‌گه‌ڕان که لێمان بنێن! ئه‌یانگوت قبوڵتانه، پێتان بڵێین (حیزبی دیموکراتی کوردستان- مه‌کته‌بی سیاسی).

جه‌ماعه‌تی قیاده‌ی مه‌رکه‌زی، پشتگیری مه‌لا مسته‌فایان ئه‌کرد و دژی ئێمه بون، من پێموابو، مه‌لا مسته‌فا ده‌ستی هه‌بو له هاندانی عه‌زیز حاجدا، ئه‌ویش به‌هۆی حه‌بیب که‌ریمه‌وه که خزمی یه‌کن، بۆئه‌وه‌ی جیابێته‌وه له حیزبی شیوعی، مه‌به‌ست له‌وه بێ هێزکردنی حیزبی شیوعی و کردنیان به ته‌یرێکی مه‌عقول بو، بۆئه‌وه‌ی هه‌میشه له‌بن ده‌ستی خۆیاندابن.

حیزبه عه‌ره‌بییه‌کان، هه‌مو له‌گه‌ڵ ئێمه دۆست بون، هه‌تا له‌گه‌ڵ ئه‌فسه‌ره ناسری و قه‌ومییه پێشکه‌وتوخوازه‌کانیش، له کوردستانیش و له شوێنه‌کانی تری عێراق، ئه‌وان زۆر یارمه‌تی ئێمه‌یان ئه‌دا له دانی ده‌نگوباس و ئامۆژگاری و زانیاری.

کۆمه‌ڵی فواد رکابیش مه‌سه‌له‌ی به‌شداربونیان له حوکم ره‌تکرده‌وه، به تایبه‌تی ئه‌بو شه‌وقی (جواد الدوش) زۆر موعارزبو، ئه‌وکاته ئه‌و ئه‌ندامی سه‌رکردایه‌تیان بو، دژی ئه‌وه‌بو که ئێمه هاوکاری له‌گه‌ڵ ئه‌واندابکه‌ین، چونکه ئه‌وانیان به خه‌ڵکانی گومانلێکراو و راستره‌و ئه‌زانی.

ئه‌وکاته، ئه‌بو شوقی و ده‌سته‌ودائیره‌که‌ی له‌ناو حه‌ره‌که‌ی ئیشتراکیدا بۆچونێکی چه‌په‌ره‌ویی کاڵوکرچی تازه هه‌ڵکه‌وتو و تازه خۆ به مارکسی زان و لینینی زانی ئاخر مۆدێل و زۆر موته‌ته‌ریفیان هه‌بو.

*** به‌عسییه‌کان چۆن ده‌سه‌ڵاتیان گرته ده‌ست، باس له رۆڵی ئه‌مه‌ریکا ئه‌کرێت له هاتنیان بۆ سه‌ر حوکم؟**

- ئه‌فسه‌ره به‌عسییه‌کان به‌هۆی ناسر عانیه‌وه که سه‌فیری عێراق بو له دیمه‌شق و به‌یروت و له کۆنه‌وه له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ریکییه‌کاندا په‌یوه‌ندی هه‌بو، توانیان کۆمه‌ڵێک ئه‌فسه‌ر رێکبخه‌ن، له‌وانه: حه‌ردان تکریتی، ئیبراهیم داود، عبدولره‌زاق نایف، سه‌عدون غێدان،

ئەحمەد حەسەن بەکر و کۆمەڵێک کەسانی تری سەر بە بەعس، ئەوانە بەیەکەوە هاوکار بون و ئینقیلابی ١٧ی تەموزی ١٩٦٨یان بە ئەنجام گەیاند (٢).

پێش ئەوەی ئینقیلابی ١٧تموز روبدات، من، ئەحمەد حەسەن بەکرم ئەناسی، زۆربەی جار لە ١٩٦٧-١٩٦٨ کە ئەچومە بەغدا، سەردانیم ئەکرد، ئەویش هەندێجار ئەهاتە ماڵی مامۆستا ئیبراهیم لە بەغدا و رەدی زیارەتی ئێمەی ئەدایەوە.

*** ئەحمەد حەسەن بکر، چۆن کابرایەک بو؟**

- ئێمە ئەحمەد حەسەن بەکرمان وەک پیاوێکی سادەی عەشائیری ئاشتیخواز ئەهاتەبەرچاو، بۆچونێکی باشی لەسەر مەسەلەی کورد هەبو، خۆی بە دۆستی ئێمە پیشان ئەدا و ئەیگوت ئەگەر جارێکی تر ئێمە دەستمان بروات، یا بێینەوە سەر حوکم، ئەوا ئۆتۆنۆمی ئەدەین بە کورد و هاوکاری ئێوەئەکەین.

ئەحمەد حەسەن بەکر، لەگەڵ ئێمە، بەو شێوەیە قسەی ئەکرد، لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ جەماعەتی بارزانیش بەهەمان شێوە قسەی ئەکرد و لەگەڵ شیعەکانیش پەیوەندی باش بو. ئەوکاتە جوڵانەوەیەکی شیعەش پەیدابوبو، ئەوانە بۆ خۆ خۆشەویستکردن ئەوەیان ئەکرد، من هەندێجار چومەتە دیوەخانەکەی و یەک، دوجار سەدامم لەوێ بینیوە.

# سەدام حسێن و کورد

*** یەکەمجار کەی سەدام حسێنت بینی و کەی بو؟**

- یەکەمجار سەدام حسێنم لە دیوەخانی ئەحمەد حەسەن بەکر بینی، لەناو گروپی ئەحمەد حەسەن بەکردا، کۆمەڵێک گەنجی باش هەبون وەک: عەبدولخالق سامەرائی و عەبدوڵڵا سەلوم سامەرائی، بەهۆی سەیدای تەیبەوە (تەیب بەرواری) ئەمان ناسین و لە پەیوەندیدا بوین لەگەڵیاندا.

ئێمە پەیوەندییەکەمان لەگەڵ ئەوان بەهۆی عەبدوڵڵا سەلوم سامەرائی و دکتۆر محەمەد مشاتەوە بو کە دوایی بو بەسەفیری عێراق لە لەندەن، زۆرجار

ئەهاتن بۆ ماڵی مامۆستا ئیبراهیم و کۆبونەوەمان ئەکرد.

ئێمە تاکە حیزب بوین، پەیوەندیمان لەگەڵ جەماعەتی ئەحمەد حەسەن بەکر هەبو، هەتا لە بیرمە، ئەحمەد حەسەن بەکر جارێک داوای لە من کرد، گوتی: "وابکە چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ عەزیز محمەد بۆ رێکبخەیت"، منیش بە عەزیز محەمەدم گوت و ئەویش گوتی: "بەخوا ناتوانم بیبینم، ئێمە ئەو هەمو کوشت و کوشتارەمان لە نێواندا بوە، چۆن ئەتوانم ئێستا بیبینم"؟.

جەماعەتی عەبدولخالق سامەرائی هەڵوێستیان بەرامبەر بە مەسەلەی کورد لە هەندێ جەماعەتی تر باشتربو، لە هەڵبژاردنی خوێندکاراندا ئێمە و بەعسییەکان هاوکاریمان کرد و قایمەمان دابەزاند، لەهەندێ شوێنیش لەگەڵ حەرەکەی ئیشتراکی عەرەبی و ناسرییەکان قائیمەی هاوبەشمان دابەزاند.

*** کاتێ کودەتای ١٧ی تەموز رویدا، تۆ لە کوێ بویت؟**

- کە کودەتای ١٧تەموزی ١٩٦٨ رویدا، من لەسلێمانی بوم، عەبدولکەریم حەمدانی هەبو، ئەفسەرێکی ئیستخبارات بو، دوایی بو بەئامری قاعیدەی حەرەسی کۆماری، هات بۆلام و هەواڵەکەی دامێ، هێشتا ناوەکان بڵاونەکرابونەوە، گوتی: ئەمە کاری ئەحمەد حەسەن بەکر و ئەوانە، ئەوەبو ئێوارە ناوەکان لە ڕادیۆوە بڵاوکرایەوە.

*** لە یەکەم کابینەدا، دو وەزیری سەر بە بارزانی هەبون، کەچی هیچی ئێوەی تێدا نەبو، هۆی ئەوە چی بو؟**

- راستە لە یەکەم وەزارەتدا، بە سەرۆکایەتی عەبدولرەزاق نایف دامەزرا، دو وەزیری سەر بە مەلا مستەفای تێدابو، موحسین دزەیی و ئیحسان شێرزاد، کەسی ئێمەی تێدانەبو. لەبەرئەوەی عەبدولڕەزاق نایف و ئەوان، پێشتر لەگەڵ مەلا مستەفادا پەیوەندیان کردبو. ئەحمەد حەسەن بەکر بو بە سەرۆک کۆمار، عەبدولڕەزاق نایف بو بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و ئیبراهیم داود بو بە وەزیری بەرگری.

خەڵک یەکسەر ئەو ئینقیلابەیان بە پیلانێکی ئیستعماری دایە قەڵەم، میسر یەکسەر هەڵوێستی وەرگرت کە ئەوە پیلانێکە ئینگلیز و ئەمەریکا دایناوە بۆ تێکدانی جەبهەی شەرقی و دوژمنایەتی سوریا و میسر، هەروەها سوریەکانیش هەمان بۆچونیان هەبو، کودەتاکە وڵاتانی عەرەبی کۆنەپەرست و ئێران لەپشتیەوەن.

عەبدولرەزاق نایف، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا گوتی: "ئێمە نوێنەری

کوردمان لەگەڵە و مەسەلەی کورد لەسەر بنەمای ڕێککەوتنامەی ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦ چارەسەر ئەکەین".

*** ئێوە پێشتر پەیوەندیتان لەگەڵ بەعسییەکان هەبو، بۆ ئێوە بەشدارنەبون لەو کابینەیەدا، لەجیاتی ئێوە، بارزانی نوێنەری هەبو؟**

– ئێمە بەعسییەکانمان لەو سەردەمەدا نەبینی و نەمان ئەزانی، چی و چۆن رویداوە، تەنها سەیدای تەییب، عبدولخالق سامرائی دیبو، ئەویش زۆر بێزاریی نیشاندابو، گوتبوی: "ئەوانە هەموییان گومان لێکراون، ئێمە نازانین چۆن هاتین و کێ هێنایینی؟ کۆبونەوەی قیادەی قوتریمان هەیە، لەوێدا باسی ئەکەم".

*** ئێوە هیچ هەڵوێستێکتان بەرامبەر بە بەعسییەکان وەرگرت کە لە حکومەتی تازەدا ئێوەیان پشت گوێ و پەراوێز خست؟**

– ڕۆژی ٢٠یان ٢١ تەموزی ١٩٦٨ بو، لە شەقامی جمهوری مامۆستا ئیبراهیم و من سواری ئوتۆمبیلەکەی عومەر دەبابە بوبوین، عومەر دەبابە خۆی لێی ئەخوڕی، ئۆتۆمبیلێکی حیمایەشمان لە دواوەبو، تەماشامکرد، ئوتۆمۆبێلێک لە پشتەوە هۆڕن لێدەدات؟ عومەر دەبابە نەیدەناسی، گوتی: "کورە ئەو سەگبابە کێیە ئەوەندە هۆڕنمان بۆ لێدەدا"!. ئاوڕم دایەوە تەماشامکرد، سەدام حسێنە! من سەدامم ئەناسی، بەڵام ئەوان سەدامیان نەدەناسی، ئیشارەتی کرد، گوتی ڕاوەستن، ئێمەش ڕاوەستاین و ئەو دابەزی و منیش دابەزیم چوم بەپیرییەوە، لەسەر شەقامەکە چاکوچۆنیمان کرد و گوتم "ابو عدي شنو القصة، شنو الحكاية؟" گوتی: "خلي كاكه جلال" گوتی: ئەوانە کێنە؟ گوتم: "مامۆستا ئیبراهیم و عومەر دەبابەن" گوتی: "حەز ئەکەم بیاناسم"، منیش چوم پێم گوتن، نزیکبونەوە لە یەکترو سڵاویان لەیەکترکرد و بە یەکترم ناساندن، گوتم ئەوە بۆکوێ ئەچیت؟ گوتی: "ئەچم بۆ لای دکتۆر و توشی قورحە بوم".

منیش گوتم بۆچی؟ گوتی: "وەڵڵاهی لەو چوار ڕۆژەوی کە لەگەڵ ئەو سەگبابە مەشبوهانە هاتوینەتە سەر حوکم، ئێستا وائەزانم هەمو عالەم جنێومان پێدەدات، ئەگەر ئەوەی لەمێشکماندایە و ئەوەی بەدەستمانەوەیە سەری نەگرت، ئەوا خەڵک پێمان ئەڵێ ئەو سەگبابانە هەمو جاسوس و نۆکەری ئیستعمارن، ئەڵێن ئەوانە لەگەڵ نۆکەرانی ئیستعمار هاتنە سەر حوکم، ئەوەندە نیگەرانم لەم وەزعە،

وابزانم لەو نیگەرانییەوە توشی قورحەی مەعیدەبوم"، وەعدمان بەیەکدا کە یەکتر ببینینەوە و بە درێژی باسی مەسەلەکان بکەین.

لەو بینینە کورتەدا تێگەیشتین کە مەسەلەکان چۆنن؟ من ئەوقسانەم بۆ حازم جەواد گێرایەوە کە هاورێم بو، سەرەڕای ئەوەش کۆنە بەعسییەکی گەورەبو، بەڵام ئەوکاتە وازی لە بەعس هێنابو، دانیشتبو، گوتی: "کاکە جەلال، سەدام شەخسیەتێکی گرنگە لەو حیزبەدا، بەقسەی من ئەکەن ئێوە پەیوەندی خۆتانی لەگەڵدا بەهێزبکەن".

رۆژێک دوای ئەوە، مامۆستا ئیبراهیم و من چوینە لای ئەحمەد حەسەن بەکر کە چوین بۆلای هەمیشە وای نیشاندەدا، مامۆستا ئیبراهیمی زۆر خۆش ئەوێت و زۆریشی رێز لێدەگرێت، کورسییەکی لەپشتی مێزەکەی دانابو، بەجێهێشت و هاتە تەنیشتەوە و لە لایەوە دانیشت و باسی ئاڵوگۆڕکرا، من هەڵمدایە و گوتم: "ئەوە نازانم ئێستا چی بڵێم سیادەت ئەلرەئیس ! یا بڵێم ئەبو هەیسەم"؟ چونکە ئێمە پێمان ئەگوت ئەبو هەیسەم گوتی: "مثل السابق، انت ما تجوز من عادتك"، بڵێ چۆنت پێ خۆشە"، گوتم: "ولا رفيق ابو هيثم هاي شنو. انت وين و عبدالرزاق نايف وين؟ هل شكولات منين جبتهم شلون جمعتهم؟ كل الناس يگولون هذولة مشبوهين و مرتبطين". روی لە مامۆستا ئیبراهیم کرد و گوتی: "هذا الشاب ابد ما يثق بينا"، لەگەڵ منی بو. ئینجا بۆ ئەوەی قسەکە خەفیف بکات، هەستا ماچی کردم و گوتی: "اصبر علي، اصبر... اصبر لا تكون مستعجل... اصبر علينا كل شي يسير بكيفك".

ئێمە تێگەیشتین، نێوانیان باش نیە، مەوعدمان لەگەڵ عەبدولرەزاق نایف هەبو، چوینە لای ئەویش، ئەو دۆستی کەمال موفتی بو، مقدەم بو لە سوپادا، کە هەمو جارێک منی ئەبینی زۆر ئیحترام و دۆستایەتی نیشان ئەدا، لای من زۆر رەق بەرامبەر بە مەلا مستەفا قسەی کرد، کە چوینە لای پیرۆزبایمان کرد و گوتم: "ئەوە چییە؟ تۆ چیت ئەگوت و چیت کرد"؟ گوتی: "ئەوە زروفی تایبەتییە، من ئەمەوێت چارەسەری گیروگرفتەکان بکەم، ئێوە پیاوی نیشتمانپەروەرن، بەڵام ئێوە شوێنی تایبەتی خۆتان هەیە لە دڵمدا". من لێم پرسی گوتم: "تۆ ترست لە بەعسییەکان نیە وا بەیەکەوە حوکمتان گرتۆتە دەست". ئێمە ئەمانویست بە باشی لە مەسەلەکان تێبگەین، گوتی: "زوربەی ئەندامانی مەجلسی قیادەی سەورە لەگەڵ ئێمەن، حەفدە وەزیرمان هەیە لە ئەنجومەنی وەزیران، واتا زوربەی ئێمەین و خۆشت ئەزانی کە بەعس لاوازە".

*** ئایا بەعسییەکان ئێوەیان لە کودەتاکەی خۆیان لە ٣٠ تموز ئاگادار کردەوە؟ داوایان لە ئێوە کرد، لە حکومەتەکەیاندا بەشداربن؟**

– بەڵێ، پێش ئینقیلابی ٣٠ تەمموز، عەبدولرەزاق نایفیان دەرکرد، ئەو رۆژەی کە دەریانکردن، هێشتا ئیعلانیان نەکردبو، تەلەفۆنی ماڵی مامۆستا ئیبراهیم لێدرا، من هەڵمگرت، ئەحمەد حەسەن بەکر لەسەر تەلەفۆن بو، چاک و چۆنیم لەگەڵ کرد و گوتی ئاخۆ مامۆستا ئیبراهیم لەوێیە؟ منیش تەلەفۆنەکەم دایە و گوتی: "مامۆستا ناوی دو وەزیرم بدەنێ، وەزارەتی تازە دروست ئەبێت، گوتی ئێستا گوێ لە رادیۆ بگرن".

من لە تەنیشتییەوە راوەستابوم، گوتی: "بەو لاوەی لای خۆت بڵێ، کێشەکانی ناوخۆمان یەکالاکردەوە و وەلاممان دانەوە، من وەزارەتی تازە تەشکیل ئەکەم و ناوی چەند کەسێکمان بدەنێ لە خۆتان بۆ وەزارەت". پێشنیازەکەشی وابو کە مامۆستا ئیبراهیم و من بین. مامۆستا ئیبراهیم گوتی: "وەلا ئێمە لە کۆنگرەی چوارەم، لە کەلار بڕیارمان داوە، خۆمان بەشداری حکومەتی ئیئتلافی نەبین، بۆیە ئەبێ ئێمە عەفو بکەیت، بەلام ناوی دو دۆستت ئەدەمێ (فەوزی جەمیل سائیب، تەها محێدین معروف) هەردوکیان پیاوی زۆر باشن".

تەها محیدینیان دانا و کاک فەوزی سائیبیان دانەنا، دوایی بۆمان دەرکەوت کە کاتێ ئەحمەد حەسەن بەکر زابت بوە، کاک فەوزی خۆش نەویستوە، هەروەها فەوزی سائیب لەکاتی عەبدولکەریم قاسمدا بوە بە موتەسەریفی ناسرییە، هەندێک تۆمەتی لەسەربو، قەومییەکان زۆر خۆشیان نەدەویست، لەبەرئەوە کاک فەوزیان دانەنا.

یەکەم ناویش هی فەوزی سائیب بو، هەرچەندە تەها محێدین لەعێراقیش نەبو، لە سەفارەتی عێراقی بو لە لەندەن. کە دانرا، ئەو وەختە تەها بە تەهای حاجی مەلا محیدین ناسراوبو، بەلام پێیان ئەگوت تەها مەعروف، ئەوەبو ئەمین ئاغای برای گوتبوی: "وەڵڵا مامۆستا ئیبراهیم، من سوپاسێکیشت ئەکەم تەهات کردەوە بە برام، من ئەمین محیدین بوم، ئەو تەها مەعروف بو، ئێستا تەهاشت کردەوە بە برای من"!.

# بەشداری مەکتەبی سیاسی لە کابینەی بەعس

*** تەها محێدین کادێری پارتی بو، وا ئێوە کاندیتان کردبو بۆ پۆستی وەزیر؟**

- نەخێر دۆست بو، مـــامۆستا ئیبراهیم، بـــە ئەحمەد حەسەن بەکـــری گوت: ئێمە حیزبیین ناتوانین لە وەزارەتدا بـــەشداربین، ئـــەو ئەیویست دو حیزبی ببێت بە وەزیر، بەڵام مـــــامۆستا ئیبراهیم گوتی ئێمە ناوی دو دۆستت ئەدەینێ.

لەبەرئەوەی وەزیرێک درابو بە ئێمە و وەزیرێکیشیان دابو بە مەلا مستەفا، ئەوان گوتیان چونکە تەها محێدینی تێدایە و ئەو سەر بەجەماعەتی جەلالیەکانە، ئێمە باشدارنابین، ئەوەبو ئەوان بەشدارییان نەکرد[٣].

*** ئێوە لەسەر چ بنەمایەک بەشداریتان کرد لە حوکمدا؟**

- ئێمە چەند کۆبونەوەیەکمان بەیەکەوە کرد و لەسەر چەند خاڵێکی گرنگ رێکەوتین کە گرنگترینیان:

یەکەم: هەردولا هاوکاری یەکتر بکەین

دوەم: ئەوان ئۆتۆنۆمی بدەن بە کورد

سێیەم: هاوکاریی ئێمە بکەن لە کوردستان بۆ ئەوەی ئێمە بەهێزبین و خۆشیان لە خوارو بەهێز بکەن، وابکەین لە دوارۆژدا ئێمە لە کوردستان دەسەڵات بگرینە دەست. گوتیان بۆ ئەمکارەش، چی پێویستە ئێمە ئامادەین بیکەین؟ بێگومان ئێمە کە قسەمان بۆ کردن و گوتمان:

یەکەم: هەنگاو، کە پێویستە بکرێت، پشتگیری سیاسییە، پێویستە کاری باش بکەن بۆ گەلی کورد.

دوەم: پێویستە رێگا بدەن، کە رێکخراوی دیموکراتی وەک قوتابیان، لاوان، ژنان، جوتیاران ئازادبن و رێگامان بدەن بە ئازادی رۆژنامە دەربکەین.

سێیەم: ئەبێ یارمەتی عەسکەری و دارایمان بدەن، ئێمە پێمان وابو، ئەگەر ئەو هاوکاریانەمان بکەن، ئەوا ئەتوانین ئەو کەسانەش بۆلای خۆمان رابکێشین،

کە لە مەلا مستەفا بێ هیوابون.

ئەوانیش گوتیان: "باشە، بەڵام جگە لە ئۆتۆنۆمی، کە ئێستا ناتوانین ئیعلانی بکەین، هەمو شتەکانی ترتان بۆ ئەکەین، بەڵام ئێمە ئۆتۆنۆمیشمان وەکو پرنسیپ قبوڵە".

*** کەواتە تۆخکردنەوەی دەسکەوتەکان، هی بەیانی ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦ بو؟**

- بێگومان، ئەوەبو لەوکاتانەدا ڕێگادرا بە کاری ئاشکرای ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، کردنی نەورۆز بە جەژنی ڕەسمی، کردنەوەی زانکۆی سلێمانی، کردنی دهۆک بە پارێزگا، دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد، ئیجازەی یەکێتی نوسەرانی کورد و ڕێگادان بە دەرکردنی گۆڤارەکانی ڕزگاری و بەیان و چەند کارێکی تریش.

ئێمە لەسەر ئۆتۆنۆمی ڕێککەوتبوین، هەتا میشل عەفلەقمان بینی و گوتی: "ئێمە لەسەر ئۆتۆنۆمی رازین، بەڵام سەبرمان لێبگرن"، هەتا ساڵح مەهدی عەماش کردی بە پێکەنین گوتی: "وەک جارەکەی ترمان لێمەکەن و پەلەمان لێمەکەن و بڵێی مەلا مستەفا قبوڵی نییە، وەعدی شەرەف بێت و قەولی پیاوبێت ئێمە ئۆتۆنۆمیتان ئەدەینێ، بەڵام ماوەیەکمان ئەوێت و کەمێ کاتمان بدەنێ تاکو شوێنپێی خۆمان قایم دەکەین".

*** دەنگێک هەبو پێی وابو بۆچونی جیاواز هەیە لە ناو بەعسیەکاندا دەربارەی چارەسەری مەسەلەی کورد، ئەمە تا چەند ڕاستە؟**

- بەڵێ، لەناو بەعسدا دو تەیارهەبو، تەیارێکیان بریتی بو لە عەبدولخالق سامرائی، عەبدوڵڵا سەلوم سامەرائی و ساڵح مەهدی عەماش و لە بەعسییە کۆنەکان شازل تاقە، مورتەزا حەدیسی و عەبدولکەریم شێخلی، ئەوی دوایی بو بە وەزیری دەرەوە و دوایی سەدام کوشتی، ئەمانە لایەنگری پێکهاتن بون لەگەڵ ئێمە، بەتایبەتی عەبدولخالق بۆچونێکی زۆر رونی هەبو، ئەیگوت: "لە عێراقدا دو نەتەوە هەیە، نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب" و زنجیرەیەک وتاری لەوبارەیەوە نوسی کە هەردو میللەت دابەشکراون و ئەوان بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب و ئێمەش بەشێکین لە نەتەوەی کورد.

نوسیبوی، "ئێمە لەسەر بناغەی ئەو ڕاستیە، پێویستە حوکمی زاتی بدەین بە کورد، لە ئەنجامی ئەوەدا هەردولا بەهێزئەبین و عێراق ئەکەینە مەڵبەندی ڕاپەڕینی کورد و عەرەب، بەو هەنگاوەش نەبێت کێشەکان چارەسەرناکرێت". هەروەها ئەو

هەڵوێستی بەرامبەر بە مەلا مستەفا باش نەبو، بە پیاوێکی کۆنەپەرستی ئەدایە قەڵەم کە پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل هەیە.

خەتێکی تر هەبو لەناو بەعسییەکاندا، ئەویش خەتی سەدام و سەعدون شاکیر و تەها جەزراوی و دەستە و دائیرەکەی سەدام بون، ئەوانە ئێمەیان بە مەترسی ئەزانی، ئەیانگوت: "حیزب لە بارزانی ترسناکترە، چونکە بارزانی یەک نەفەرە و بیکوژین تەواو ئەبێت، بەڵام ئەوانە حیزبن، پەرەدەسێنن و جەماوەریان هەیە، لەپاشان ئەوانە داخوازیان لە بارزانی کەمتر نییە، بەڵکو زیاترە".

من قسەیەکی گرنگ هەیە کە بۆ مێژو بۆت دەگێرمەوە، فوئاد عارف گێرایەوە و گوتی: سەدام ناردی بە دوامدا و گوتی: برۆ بۆ لای مەلا مستەفا، منیش پێمگوت، ئاخر ئێوە پەیوەندیتان لەگەڵ جەماعەتی حیزب هەیە! گوتی: "کاکە جەمەعات چیە! ئەوانە زۆر ترسناکترن لە مەلا مستەفا، هیچ نەبێ مەلا مستەفا باسی ئۆتۆنۆمی ناکات، ئەوانە بە ئۆتۆنۆمی رازی نابن و باسی فیدراڵیشمان بۆ ئەکەن".

ئەو بۆچونەی ئێمە کاریگەریی هەبو، خاڵێکی تر کە ئەوان سڵیان لە ئێمە ئەکردەوە مەسەلەی پەیوەندی ئێمە بو، لەگەڵ عەبدولناسر، ئێمە پەیوەندیمان نەبرِیبو لەگەڵ عەبدولناسردا، بۆ نمونە لە یادی جەژنەکاندا بروسکەمان لێ ئەدا، رۆژنامەی نور لە لاپەرەی یەکدا هەواڵی شەرِی ئەو کاتەی بڵاوئەکردەوە، لەکاتێکدا رۆژنامەکانی تری عێراق باسیان نەدەکرد. جارێکیان عەبدولناسر لە نامەیەکدا رەخنەی لە ئەحمەد حەسەن بەکر گرتبو و ئەڵێ: "نەک ئێوە ئیش ناکەن و شەرناکەن، هەتا هەواڵی شەرەکانیش بڵاوناکەنەوە، رۆژنامەی نور بڵاوی ئەکاتەوە کە رۆژنامەی جەماعەتێکی کوردی وەتەنین"، ئەوکاتە رۆژنامەی نور، تاکە رۆژنامە بو کە هەواڵی شەرەکانی بڵاوئەکردەوە.

*** رۆڵی رۆژنامەی نور چی بو، چ کاریگەرییەکی بەسەر رەوتی رووداوەکانەوە هەبو؟**

- بەراستی رۆژنامەی نور ناوبانگێکی زۆری هەبو، چاکترین رۆژنامەی ئەو کاتەبو کە ٣٠-٤٠ هەزار ژمارەی لێ ئەفرۆشرا، کە بۆ ئەوکاتە بەرزترین ژمارەبو. لای خەڵک رۆژنامەکانی حکومەت هیچ تامێکیان نەبو، هەروەها مونزیر موسلی لە کتێبەکەیدا (العرب و الاكراد) باسی رۆژنامەی نور زۆر بە باشی ئەکات و ئەڵێ: "ئێمە لاجیئەکانی سوریا لە عێراق بەیانیان پێش ئەوەی رۆژنامەکانی تری عێراقی بخوێنینەوە، لەپێش هەموویاندا، نورمان ئەخوێندەوە چونکە چاکترین رۆژنامەی ئەوسەردەمەبو".

*** نوسەرە سەرەکیەکانی کێ بون؟**

– مامۆستا ئیبراهیم زۆری تێدا ئەنوسی، حیلمی عەلی شەریف، زەبیحی و کۆمەڵێک نوسەری گەنج پەیدابوبون، کە تێیاندا ئەنوسی و ئیشیان تێدائەکرد، مەجید کریم کە شەهیدکرا، برای مامۆستا جەعفەر بو، ئەو یەکێک بو لەوانە، هەروەها سەیدای تەیب کاری تێدائەکرد، هەندێ رۆژنامەنوسیشمان هێنابو تەرجومەمان پێدەکردن. مەسەلەن بۆ یادی ۱۰۰ ساڵەی لەدایک بونی لینین کتێبێکمان، لەسەر ژیانی تەرجومە کرد و بە ئەڵقە بڵاومانکردەوە، بە کورتی زۆر نوسەری عێراقی پێشکەوتوخواز لە ئێمە کۆبوبونەوە و کاریان لەگەڵ ئەکردین، بۆ نمونە عەزیز سباهی کە باشترین وەرگێڕ بو[٤].

# گەرمەی شەڕی ناوخۆ

*** بەهێزبونی ئێوە کاری نەکردە سەر پەیوەندیتان لەگەڵ بارزانی، ئایا پەیوەندیتان هەروا بە هێمنی مایەوە؟**

– ئێمە کە کەمێک بەهێزبوین، جەماعەتی بارزانی تەحەڕوشیان پێکردین و هێزیان کۆکردەوە بۆئەوەی لەناومان بەرن، باسیان ئەکرد کە دێنەسەرمان لە بەکرەجۆ. ئەوەبو تاهیری علی والی بەگ لە تاسڵوجە هات و لەوێ شکاندمانن و بە دوایاندا رۆیشتین.

حکومەت چەکی داینێ، هێزی پێشمەرگە لە سەرەتادا نزیکی ۷۰۰ — ۸۰۰ کەس بون، دوایی توانیمان بیکەین بە ۲۰۰۰ – ۳۰۰۰ کەسێک، زوربەی ناوچەی شارەزور لە ژێر دەسەڵاتی ئێمەدابو، هەروەها هێزی ئێمە لە هەمو ناوچەکانی چەمی رێزان، سورداش، دەشتی شوان، شێخ بزێنی و دەشتی لای کۆیە بڵاوبونەوە و گەشەیان کرد.

*** ئایا ئێوە نەخشەتان هەبو بۆ شەڕ دژی بارزانی؟ یاخود زۆربەی کات ئەوان هێرشیان ئەکردە سەرتان، کێ یەکمجار دەستپێشخەری شەڕی کرد؟**

– شەڕەکە لە نێوان ئێمە و جەماعەتی مەلا مستەفادا دەستی پێکرد، ئێمە

نەخشەکەمان وابو، کە بێ هێزیان بکەین، یەکەم دەستپێشکەریی شەڕ لەوانەوەبو، بەڵام ئێمە لە دوسێ لاوە شکاندمانن و لە چەندلایەکی ترەوە دەستمان پێکردەوە. جاری وا هەبو، ئەوان دەسپێکەریی شەڕ بون و جار هەبو ئێمە بوین، بەڵام باڵادەستییەکە لای ئێمە بو، چونکە ئێمە دەسکەوتمان بەدەست ئەهێنا بۆ کورد.

مەلا مستەفا، پێش ئێمە لەگەڵ چەند حکومەتێکدا پەیوەندی کردبو، بۆ نمونە لەگەڵ عەبدولسەلام عارف، تاهیر یەحیا، عەبدولرەحمان عارف، ئەوانە هیچیان شتێکیان بۆ کورد نەکردبو، ئێمە هەموی ٥-٦ مانگ بو لەگەڵ بەعس ڕێککەوتبوین، توانیمان کۆمەڵێک دەسکەوتی بەرچاو بە دەست بهێنین.

لەهەمو جێگایەک هێزی چەکدارمان هەبو، زۆرشار و شارۆچکەی کوردستان خەریک بو بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئێمەوە، لە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا بارەگا و پێشمەرگەمان هەبو، جۆرەها چالاکی هەمە جۆرەی تێدا ئەنجام ئەدرا، هەتا شارەکانی بادینان وەک ئامێدی و دهۆک لەدەست ئێمەدابون.

لە کۆتایی ١٩٦٩دا پەیوەندیەکم بە مەلا مستەفاوە کرد، ئەویش بەهۆی کۆمەڵێک خەڵکەوە کە زۆرجار ئەهاتن و ئەیان گوت: بۆ کورد پێکنایەتەوە، منیش گوتم: باشە بە یەکێک لەو کەسانەم گوت کە هاتبون: "برۆ تۆ وەکیلی ئێمە بە، ئێمە ئامادەین پێکبێینەوە، بەڵام مەلا مستەفا پێکنایەتەوە، دەفەرمون ئێمە ئێستا وەزعمان زۆر باشە بەڵام ئامادەین پێکبێینەوە"، ئەوان دڵنیانەبون لە قسەکانی ئێمە، ئەوکاتە ڕۆژانە دەیان چەکدار، ریزەکانی مەلا مستەفایان بەجێ ئەهێشت و ئەهاتنە لای ئێمە، لەو کاتانەدا ژمارەی پێشمەرگەمان گەیشتە ٣ تا ٤ هەزار پێشمەرگە.

*** ئەو کەسە کێ بو پێشنیازی ئاشتبونەوەی بۆ کردن لەگەڵ بارزانی؟**

ئەو کەسەی کە راستەوخۆ پەیوەندییەکەی پێوەکردم، هەمزە عەبدوڵڵا بو، بەڵام هەمزەش، فوئاد عارفی راسپاردبو، باسەکە لە ماڵی بورهان بەگی جاف کرا کە فوئاد عارفم دیت، پێمگوت: "کاک فوئاد برۆ هەوڵ بدە، ئێمە ئامادەین لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێنەوە"، ئەوکاتە مەلا مستەفا وەزعی شلۆق بو، رەزامەندی دەربریبو.

ئێمە رەئیمان وابو، مادەم حکومەت ئامادەیە، شتێک بدات، با پێکەوە بین، ئێستا ئاشتییەک هەیە، ئەگەر ئێمە لەناوخۆماندا یەکبین، رەنگە حکومەت ئۆتۆنۆمیشمان بداتێ.

بێگومان حکومەت هەواڵی ئەم هەوڵەشی بیستبۆوە، پێیان ناخۆشبو، هەروەها کشانەوەی خوێندکارانی ئێمە لە کۆنگرەی خوێندکارانی عێراقدا لەسەر مەسەلەی کەرکوک و پەیوەندیمان لەگەڵ میسر و جەمال عەبدولناسر، ئەمانە هەموی خاڵ بون، وایکرد سەدام حوسێن بەسەر خەتەکەی دۆستی ئێمەدا، لەناو بەعسدا، زاڵ بێت.

# بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠

*** کەواتە ئەوە خۆئامادەکردن بو بۆ بەیاننامەی ١١ی ئازار، بۆچی بەعس بەیاننامەکەی لەگەڵ بارزانی مۆرکرد و لەگەڵ ئێوە نەیانکرد؟**

– حکومەت باسی بەیانەکەی لەگەڵ ئێمە کرد، لەناو خۆیاندا باسیان ئەکرد، لەگەڵ کێ مۆری بکەن؟ ئەوەبو لەگەڵ بارزانی مۆریان کرد. ئەگەر لەگەڵ ئێمە مۆریان بکردایە، ئەتوانرا بڵێین کە مەلا مستەفا تەواوئەبو، بەڵام کە لەگەڵ ئەوان کردیان ئەوە بو ئێمە سیاسییەن تەواوبوین.

بەعسییەکان، دوای بەیانی ئازار، هەڵوێستیان بە تەواوی لە ئێمە گۆڕا و کەوتنە دوژمنایەتیمان، لە سلێمانیەوە دەستیان پێکرد و نەوشیروان مستەفایان حوکمدا بە ئیعدام و ئیتر نەوشیروانمان شاردەوە لێیان، کوڕێکیان ئیعدام کرد بەناوی (جەمال ئەحمەد– کۆچەر) بە بیانوی ئەوەی کە بە پیلانی نەوشیروان بۆمبای فڕێداوەتە قوتابخانەی سانەوی کچانەوە لە سلێمانی کە لە راستیدا دروستکراوبو، تەنها مەبەست تەشقەڵەکردن بو بە ئێمە.

مامۆستا ئیبراهیم ئەو وەختە زۆر نەخۆش بو، توشی نەخۆشییەک بوبو، هەر زەعیف ئەبو، هیچ چارەیەکی نەبو، هەرچی دکتۆری بەغدا هەبو بردمانە سەری عیلاجیان نەکرد، ناچاربوین ناردبومان بۆ لەندەن، لەبیرمە کە چۆن ناردمان بۆ لەندەن، ئەو لەماڵەوە کەوتبو، رۆژێک سەدام هات بۆ سەردانی بۆ ماڵەوە و من لەو کاتەدا لەوێ بوم، گوتی ئەوە بۆ مامۆستا ئیبراهیم نانێرن بۆ لەندەن؟ منیش گوتم ئێمە فکرمان لەوە نەکردۆتەوە، گوتی باشە سبەینێ پاسپۆرت و

پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ ئەکەین و پاشان گوتی تۆ خۆشت وەرە بۆلام.

بۆ بەیانی کە چوم پاسپۆرتی بۆ ئامادەکردبو، هەندێکیشی پارەی بۆدانابو، بەراستی نەمزانی چەندبو، خستبویە زەرفێک و لێ نوسیبو "لەگەڵ سلاوی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی بالآی شۆرش"، دوای ئەوە مامۆستا ئیبراهیممان نارد بۆ لەندەن.

*** ئەوکاتە بەیاننامەی١١ ی ئازار بە سەرکەوتنێکی سیاسی گەورە ئەژمێردرا بۆ گەلی کورد، ئێوە وەک هێزێکی کوردی هەڵوێستان چی بو؟ سەرەرای ئەوەی کە ئەو بەیاننامەیە ئەمانی سیاسی ئێوەی لەگەڵ خۆی هێنابو؟**

- ئێمە بریارماندا، پشتگیری بەیانی ئازار بکەین، سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە وەک حیزب زیانمان لێکرد، بەلآم بۆ کورد سودی هەبو، بۆیە دژی نەوەستاین، ئەوەبو لە چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی نوردا پشتگیریمان دەربری.

## پەراوێزەکان:

١- تەیب بەرواری. ئێستا لە هۆڵندا نیشتەجێیە و یەکەم کارمەندی دبلۆماسی کورد بو لەوەزارەتی دەرەوەی عێراقی، کە لە ساڵی ١٩٨٨ وازی لە کارەکەی هێنا و چوە ریزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، دوای رزگار کردنی عێراق گەڕایەوە سەر کارکەی و دواهەمین پۆست، باڵوێزی عێراق بو لە جۆرجیا، ئێستا خانەنشینە.

٢- چەند سەرچاوەیەکی جیاواز باسی هاوکاری دەزگای هەولگری ئەمریکی دەکات کە رۆڵی گرنگی هەبوە لە کودەتای بەعسیەکاندا، چەندەها سەرچاوە قسەکانی عەلی ساڵح سەعدی "ئەمینی ئەو کاتەی سڕی سەرکردایەتی ناوەندی حیزبی بەعس" پشت راست دەکەنەوە، کە لە ١١/ ١١/١٩٦٣ دەربارەی رۆڵی ئەمریکیەکان لە هێنانی بەعسیەکاندا بۆسەر دەسەڵات لە بەغدا و گوتوتیەتی "ئێمە لە پێشەوەی ئەو شەمەندەفەرەبوین کە ئەمریکیەکان لێیان دەخوڕی" هەر لەو بارەیەوە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ٨ شوباتی ١٩٦٣ بروسکەیەك دەنێرێت بۆ سەفارەتەکانی لە لەندن و ناوچەی ناوەراست کە تێیدا هاتوە، کە ئەم حکومەتی ئەو وڵاتانە دڵنیا بکەنەوە، حکومەتی تازەی عێراق، حکومەتێکی بەعسیە و ناوەرۆکێکی نەتەوەیی هەیە و دۆستی کۆمۆنیستەکان و جەمال عەبدولناسر نیە، داوایان لێبکەن، لێدوان نەدەن، کە کاری خراپ بکاتە سەرباروودۆخی عێراق -(سیاسه الولایات المتحدة الامریکیة تجاه العراق في عهد الزعیم عبدالکریم قاسم -١٩٥٨ ١٩٦٣ — د.سنان سادق حسین الزبدی -٢٠١٣) ل.٢٧٢، ٢٩٧.

٣- پارتی بەسەرۆکایەتی بارزانی، موحسین دزییان پێشنیاز کردبو بۆ وەزیر، بەڵام کاتێ وەزیری باڵی مەکتەبی سیاسی دانرا، ئەو ناوی خۆی کشانەوە (التیارات السیاسیه-سلاح خرسان) ل. ١٧١.

٤- رۆژنامەی نور، رۆژنامەیەکی رۆژانەبو، کە لە ١٩٦٨/٩/٢٦وە رێگەی دەرچونی پێدرا، مەکتەبی سیاسی پارتی، یان کۆمەڵەی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تالەبانی، پشتگیریان دەکرد. خاوەنی ئیمتیاز و سەرنوسەرەکانی بریتی بون لە: عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف، کەمال محێدین، نور یەکێك بو لە رۆژنامە هەر گرنگەکانی ئەو سەردەمە، کە رۆژانە ٣٠ تا ٤٠ هەزار ژمارەی لێدەفرۆشرا، کۆمەڵی رۆژنامەنوس و نوسەر و رۆشنبیری عەرەبی ئەو سەردەمە تێیاندا دەنوسی، لەوانە کازم سەماویی، فایق بەتی، عەزیز سباهی، محەمەد حامد، سادق ئەزدی.. رۆژنامەکە تا ١١ ئازاری ١٩٧٠ بەردەوام بو. (الموسوعة الصحفیة الکردیة في العراق. د. فائق بطی ) .ل. ٣٢٨.



دێیەکی کوردستانی ئێران لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی ئێرانی - تەموزی ١٩٦٤



تەموزی ١٩٦٤ - هەمەدان



لەگەڵ چەند سەرکردایەتیەکی پارتی لە تاران ١٩٦٤



تاران- ئەیلولی ١٩٦٤ لای ڕاست؛ حیلمی عەلی شەریف،
عیسمەت شەریف وانلی، مام جەلال، د.کەمال فواد



١٩٦٧ کەلار لە راستەوە: عەزیزگورگە، ؟، نەقیب حەمە ساڵح، قادر بەردەسپی، زەبیحی، هەمزە ئاغای پشدەری، ئەحمەد حەمەمین ئاغای دزەیی، مام جەلال، ؟.. شێخ لەتیف بەرزنجی، عەباس حوسێن



یادی نەورۆزی ١٩٦٩ - سەلمان پاک نزیک بەغدا

# هەڵوێستی بارزانی لە دوای ١١ی ئازار

*** دوای ١١ ئازار هەڵوێستی بارزانی بەرامبەر بە ئێوە چی بو؟**

– پاش ماوەیەک، مەلا مستەفا ناردی بەشوێن مندا، فاخرمێرگە سوریی نارد، فاخرمێرگە سوریی پەیوەندی پێوە کردم و گوتی: "مام جەلال ئەمەوێ بێم بۆ زیارەتت و راسپاردەی جەنابی بارزانیم پێیە"، منیش گوتم بەخێربێیت، گوتم: کەی دێیت؟ گوتی: سبەینێ، گوتم: کەواتە سبەی نیوەڕۆش لە ماڵی مامۆستا ئیبراهیم بەیەکەوە نان ئەخۆین، ئەویش گوتی زۆر باشە.

کە فاخر هات ١٠-١٢ کەسی لەگەڵدابو، زۆر ڕێزمان لێگرتن و دوای نان خوادن، گوتی: "وەڵڵا دو قسەم هەیە پێم خۆشە بەتەنیا بیکەین"، چوین جیابوینەوە و گوتی: "مەلا مستەفا ناردومی بۆ لای تۆ، گوتویەتی: بە جەلال بڵێ بێت بۆ لام، هەندێک قسە هەیە پێی ئەڵێم، وەعدی ئەدەمێ وەعدی پیاو، ئەگەر نەگەیشتینە ئەنجام بەسەلامەتی، بگەڕێتەوە"، گوتم: "فاخر من تۆ بە پیاو ئەزانم و بەقسەشت ئەکەم، لەسەر مسئولیەتی تۆ ئەوەش ئەکەم، بەڵام بەشەرەفت ئایا مەلا مستەفا بەراستی نامگرێت"؟ گوتی: "بەشەرەفم بەڕاستێتی و ناشتگرێت".

*** ئەمە کەی بو کە فاخیر مێرگە سوریی هات بۆ لای ئێوە؟**

ئەمە لە ٧ ئابی ١٩٧٠دا بو، حکایەتێکی خۆش هەیە هەمویت بۆ ئەگێڕمەوە، بە فاخیرم گوت، بە قسەی تۆ ئەکەم و دێم، با پرسێک بە برادەران بکەم و رای ئەوانیش وەرگرم، ئەوەبو برادەرانیش ڕەزامەندیان نیشاندا.

فاخر گوتی، من خۆم دێم لەگەڵتدا، فاخر هات و منیش بە ٥-٦ چەکداری خۆمانەوە لەگەڵ فاخیر ڕۆیشتم بۆ لای مەلا مستەفا، کە چوین بۆ لای مەلامستەفا لە ڕەواندز تێپەڕین تەماشامان کرد خەڵک ڕاوەستاون، سەعدون غیدان و مورتەزا حەدیسی لای مەلا مستەفا ئەهاتنەوە، مەسعود و ئیدریس و دکتۆر مەحمود هەتا ئەوێ بەرێیان کردن.

فاخیر خێرا چو بە مەسعودی گوت: مام جەلالم لە گەڵدایە و ئەوان هاتن خوا حەقە مەسعود و ئیدریس بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم و دکتۆر مەحمود زۆر بەساردی و بەعاستەم دەستێکی دامێ و منیش بە ساردی دەستێکم دایە. سەعدون غیدان و ئەوان زۆر پەشۆکان، کە منیان بینی و گوتیان: "ئەوە چ دەکەیت لێرە"؟ منیش گوتم: "ئەی ئێوە چی دەکەن لێرە"؟ گوتیان: "ئێمە هاتوین بۆ سەردانی بارزانی"، زۆریان پێناخۆشبو بە دەم وچاویاندا دیاربو، وەک بۆ ئەوان حەڵاڵ بێت و بۆ من حەرام!

# ئاشتبونەوەی بارزانی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی

*** واتا چونی تۆ سەرەتای ئاشتبونەوەی ئێوە بو لەگەڵ بارزانیدا؟**

- وابو، کە ئێوارە گەیشتینە بارەگای بارزانی ئەوەندەمان زانی بارزانی هات و چاک و چۆنیەکی گەرمی لەگەڵ کردم، سامی عەبدولرەحمان و کوڕەکانی بارزانی هەمویان دانیشتبون و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم. مەلا مستەفا روی تێکردم و گوتی: "جەلالە شێت، تۆ ئەبوایە دەمێک بوایە لێرە بویتایە، فەرمو ئەها چیت بەسەر من هێنا و چیت بەسەر خۆت هێنا"؟.

دوایی بەجەماعەتی گوت: "من و جەلال، کۆنە رەفیقین، بۆخۆمان ئەچینە ئەم ژورە، قسەی تایبەتیمان هەیە".

مەلا مستەفا گوتی: "جەلال راستە، کە کاتێ وەزیری داخلیە و ئەوان تۆیان دیوە زۆر پەشۆکاون و رەنگیان زۆر تێکچوە"؟ ئەو کاتە سەعدون غیدان وەزیری ناوخۆ بو، منیش گوتم: "کام وەزیری داخلیە؟ وەزیری داخلیەی جەنابت یان وەزیری داخلیەی عێراق"؟ گوتی: "نا نا سەعدون غیدان، بۆ هی من کێیە"؟ دکتۆر مەحمودیش زۆری پێناخۆش بو، دیار بو مەسعود و ئیدریس بۆیان گێڕابوبویەوە.

زۆرجار ئەیگوت لەعنەت لە جەلالە شێت و رەفیقەکانی، کە ئەوان توشی خەڵکی وایان کردم! ئەوکاتە دکتۆر مەحمودیان خۆش نەدەویست، گوتم باشە ئەوە دوایی قسەی لێدەکەین ئاخۆ ئەوە خەتای کێ بو.

چوینە ژورەکە و دەستی بە قسەکردن کرد، مەلا مستەفا عادەتێکی هەبو، شتێکی چەند جارێک ئەگوتەوە، ئەبوایە دەنگ نەکەی هەتا لێ ئەبێتەوە. کۆمەڵێک قسەی کرد، کە ئێمە چیمان کردوە و چیمان گوتوە و لەو جۆرە قسانە. ئەو هەمو قسەکانی خۆی کرد، کەڵیبۆوە، منیش گوتم: "زۆر بە گرنگی نازانم ئەو قسانە بڵێمەوە، بەڵام هەموی خەتای یەک ئینسان بو کە ناوی مەلا مستەفای بارزانیە"! من کۆمەڵێک بیرەوەریم هێنایەوە یادی لەوانە مەسەلەی سەنگەسەر، گوتم: "تۆ واتکرد، خەتای تۆ بو دەنا ئەوە نەدەقەوما، ئاخرجار فوئاد عارفم نارد بۆلات" هەمو ئەو قسانەم کرد، گوتی: "بەڵێ ئەو قسانەی تۆش راستە"، لەبەرئەوە گوتی: "باشە ئێستا ئەڵێیت چی"؟ گوتم: "من هاتومە بۆلای جەنابت تۆ ئەڵێیت چی"؟ گوتی: "باشە جەلال تۆ رەئی خۆت بڵێ، منیش گوتم ئێمە ئێستا حیزبێکی بچکۆلەین و جەنابیشت حیزبێکی گەورەت هەیە، ئێمەش دێینەوە لە کوردستان لە ژێر قیادەی تۆ حیزبایەتی خۆمان ئەکەین، وەک حیزبی خۆمان". من لێم پرسی "بۆچونی ئێوە چیە؟ ئایا ئەم رێککەوتنەی ئازار سەرئەکەوێ و مەسەلەی ئێمە بەرەو کوێ ئەروات"؟ ئەویش گوتی: "چەند خاڵێک هەیە گرنگە کە بیزانیت:

یەکەم: بەعسیەکان بەراستیان نییە، ئەوە فرت و فێڵە لێمان ئەکەن، من زۆر بە ترسناکی ئەبینم، خۆم قەت وەکو ئەمڕۆ لە خەتەردا نەدیوە، خەڵک وا ئەزانێ، ئێمە سەرکەوتوین، بەڵام من وای نابینم.

دووەم: بە ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر دەبابە بڵێ، ئەوانە خۆیان بەسیاسی ئەزانن بەڵام هیچ لە دنیا نازانن، وەڵڵا وەبیلا وەتیلا، ئەو رۆژەی مستەفا لە بەغدا هەڵدەواسرێ و لە سێدارە ئەدرێت دەستی راستی ئیبراهیم ئەحمەد هەڵواسراوە، دەستی چەپی جەلالە شێت هەڵواسراوە، ئەولاتریش عومەر دەبابەیە، ئێوە خراپ لەوە گەیشتون، ئێمە چارەنوسمان پێکەوە بەستراوە و ئەوحکومەتە دژی هەمو کوردە".

من ئەو خاڵە زۆر کاری تێکردم، تەحلیلەکەیم پێ راست بو، لەگەڵ دڵی خۆم ئەگونجا و تەحلیلەکەی چو بەدڵما، راستی ئەو تەحلیلەی وای لێکردم، گوتم: تۆ ئەڵێی چی بکەین؟ گوتی: "من ئەڵێم ببینەوە یەک حیزب"، گوتم: "من قبوڵمە، بەڵام نازانم برادەران ئەڵێن چی"، گوتی: "من وەعدێکت ئەدەمێ، جەلال تۆ ئەو هەواڵە بەرەوە بۆ برادەران و ئەوان قانع بکە، کە بێنەوە. من چۆن وەختی خۆی لەزەمانی هەمزە یارمەتی ئێوەمدا دژی هەمزە و ئەوان، ئەمجارەش بە هەمان

شێوە یارمەتیتان ئەدەم دژی ئەمانەی خۆم و پاش ماوەیەکی تر حیزب ئەدەمەوە دەست ئێوە"، منیش گوتم: بابە ئێمە نامانەوێ حیزبت لێ بستێنینەوە، هەریەکە بەپێی لێهاتویی خۆی".

پاشان گوتم: "باشە، من ئێستا موافەقەت ئەکەم، بەڵام ئەمە تەنها رەئی خۆمە، رازیم لەسەر یەکخستن، بەڵام ئەچمەوە بە برادەران ئەڵێم"، گوتی: "من تۆم زۆر لا گرنگە و کاتی خۆشی لە بیرتە جا بەبیری هێنامەوە کە نامەیەکی بۆ نوسیم"، من ئەوەم لەبیرچوبۆوە، بۆت بگێرمەوە کە کوردەتاکەی کرد، ئەوە رەنگە کاغەزەکە ئێستا لای کاک کەمال فواد مابێت، من ئەوکاتە لە زێوێ بوم، نامەیەکی بۆ نوسیم، ئەڵێ: "وەرە بۆلام، لەگەڵ جەماعەتی مەکتەبی سیاسی مەڕۆ و ئەمن ئەوەمە و تۆم وا خۆش ئەوێ، وا موحتەرەمی لەلام، وەرە بۆلام، وەرە بۆلام، وەرە بۆلام، سێ جاری واینوسیبو، لەپاشان ئایاتەکەی نوسیبو کە نوح بە کوڕەکەی خۆی ئەڵێ (یابنی ارکب معنا ولا تکن مع القوم الکافرین)".

ئەوسەردەمە، ئەو نامەیە دەنگی دابۆوە و مەشهور بو، نامەکە بڵاوکرایەوە و گوتی: "لە بیرتە وەختی خۆشی کاغەزم بۆناردیت و بەقسەت نەکردم، ئێستاش وەرنەوە"، منیش گوتم: "باشە ئاخر ئەزبەنی منیش تەجروبەیەکی تاڵم لەگەڵتا هەیە کە هاتینەوە لە ئێران وەعدی شەش مانگت داینێ، کەچی دوایی خەڵکت نارد بمانکوژن و عەلی حەمدیش بەوجۆرە رۆیشت و هەندێ شتت دژی ئێمە کرد"، مەلا مستەفا حاشای لێکرد کە شتی وانەبوە و بۆکوشتن نەبوە و چۆن من دەستم بچێتە تۆ؟ خۆ نەموێرا بڵێم فلان کەس خۆی بۆی گێڕاینەوە.

منیش گوتم: "با بچینەوە لای برادەران و قسە بکەین، ئەو کاتە ئاگادارت ئەکەمەوە"، کوڕەکانی لەوێ بون قسەی خۆشی ئەکرد و گوتی: "جەلال ئەڵێن ژنت هێناوە"، ئەو کاتە هێرۆ دەستگیرانم بو، گوتم بەڵێ وەڵڵا ئەزبەنی هێناومە، گوتی: پیرۆزبێت "چۆنیت لەماڵەوە ئازای، ترسنۆکی"؟ منیش گوتم: "وەڵڵا ئەزبەنی (الناس علي دين ملوكهم) دەستم بۆ مەلا مستەفا درێژکرد، جەنابی بارزانی چۆنە ئێمەش هەمومان لەسەر رێگای ئەوین"، ئیتر هەمو دایانە قاقای پێکەنین و مەلا مستەفاش پێکەنی و رۆیشت و عوبەیدی کوڕی کە لەوێ دانیشتبو گوتی: "جەلال هێشتا شەوێکی پێ نەچوەوە دەستت کردەوە بە بەزم"، گوتم: "کاکە گیان جەنابی بارزانی لە کۆنەوە ئەناسم، وەک خۆی فەرموی رەفیقی قەدیمین، ئێستا ئەو لوتفەی کردوە لەگەڵ من، لە کوێ بچڕاوە، لەوێ گرێی ئەدەمەوە، خۆ لەسەرەتاوە دەستی پێ ناکەمەوە"، ئیتر بو بە پێکەنین.

مەلا مستەفا، گوتی: "چەند رۆژمان لەلا ئەبی"؟ منیش گوتم: "چەند ئەفەرموی لاتان ئەبم و چەندیش زوتر بچمەوە بۆلای برادەران ئەوەندە باشە و کەیفی خۆشتە چەند ئەڵێت". گوتی: "باشە بەکەیفی خۆت بکە، چەند جارێکی تریش یەکتر ئەبینینەوە".

ئەو شەوە لەوێ مامەوە و سبەینێ نیوەڕۆ لەسەر خوانی خۆی نانی دامێ و عوبید و مەسعود و لوقمان و ئیدریس ئامادەبون، فاخیر مێرگەسوریی دەوری ئیجابی هەبو لە ئامادەکردنی سەفەری مندا، ئەویش گوتی: "ئێمە نەخشەیەکمان هەیە، ئەو لیژنەی مەرکەزیە بگۆڕین و حەبیب و دکتۆر مەحمود بگۆڕین، زۆر لێیان تورەیە، ئێستا ئەم سەردەمە سەردەمی پیاوی نیشتمانپەروەرە لەگەڵ عەرەب"، ئاخر مەلا مستەفا ئەوەی هەبو بۆ هەرسەردەمە خەڵکێکی ئەویست، بۆ نمونە ئەگەر پەیوەندی لەگەڵ روس بەهێز بکردایە، ئەوا دارا توفیقی ئەنارد، ئەگەر لەگەڵ ئینگلیز بوایە، ئەوا شفیق لاینی ئەنارد، ئیستا مەسەلەن لەگەڵ عەرەب پێک هاتوین، ئەوا پیاوی وەکو ئێمەیان ئەوێت کە پەیوەندی عەرەبیمان هەیە و لەگەڵ عەرەب باشین و لەناو عەرەبدا ناسراوین.

بەراستی لەو بوارانەدا زۆر زیرەک بو، ئیتر من دو، سێ رۆژ مامەوە و زۆر رێزیان لێگرتم و خەڵکی زۆرم بینی پاشان رۆیشتمەوە و چومەوە بەغدا.

*** کاک مەسعود بارزانی لە بەرگی سێهەمی کتێبەکەیدا باسی لەوە کردوە، ئێوە دوای بەیانی ١١ی ئازار ویستوتانە لەگەڵ بارزانی ئاشت ببنەوە و (رەشید) ناوێکتان ناردوە بۆ لای بارزانی؟ ئەو رەشید ناوە کێیە؟**

- ئەمە دورە لە راستیەوە، وەک بۆم باسکردیت موبادەرەکە لە خودی بارزانی خۆیەوەبو، ئێمە کەسمان نەناردوە و لە سەرەتادا ئاشتبونەوەمان نەئەویست و هیچ بڕیاریشمان نەبو کە لەگەڵ مەلا مستەفا ئاشت ببینەوە، بەڵکو بڕیارمان وابو، کە خەباتی سیاسی بکەین و دابەشببین بەسەر دەرەوە و ناوەوەدا، بارزانی خۆی موبادەری کرد وەک بۆم باسکردیت.

*** ئەی ئەو رەشید ناوە کێ بوە کە ئێوە ناردوتانە؟**

- ناوی وام لەم بارەیەوە نەبیستوە.

# هەڵوەشاندنەوەی
# پارتی دیموکراتی کوردستان (مەکتەبی سیاسی)

*** دوای گەڕانەوەت لەلای بارزانی، هەڵوێستی برادەرانی ئێوە چی بو؟**

- دوای گەڕانەوەم، کۆبونەوەمان بە برادەرانکرد و دوایش کۆنفراسێکمان بەست و لە کۆنفراسەکەدا بڕیارماندا، خۆمان حل بکەین، پێش ئەوە ناوی خۆمان گۆڕی بۆ (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان).

لە ١٥ تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا مامۆستا ئیبراهیم و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری چون بۆ لای مەلا مستەفا و پێش ئەوەی پێکهاتن ئاشکرا بکرێت، خاڵی پێکهاتن لەسەر بناغەی نسبەتی بەشداری سێ یەک لەهەمو دەزگاکانی حیزبدا و لە رێکخراوە پیشەییەکان و جەماوەرییەکان بێت، جگە لە لیژنەی مەرکەزی، گوتیان لیژنەی مەرکەزی کۆئەبێتەوە و کۆنگرەیەک ئەبەستین و مەلا مستەفاش وەعدی داوە، لە ماوەی ساڵێکدا کۆنگرە ئەبەستین و لەوێش وەعدیاندا کە بە پێی کەفائەت کارەکان وەربگیرێت.

ئەوەبو ئێمە کۆنفرانسی خۆمان بەست و لە کۆنفراسەکەدا بڕیاری حەلکردنماندا و تەسدیقی رێککەوتننامەکەمان کرد[1].

مەلا مستەفا، زۆر دەوری باشی نواند بۆ ئاسانکردنی رێککەوتنامەکە و سامی عەبدولرەحمان و دکتۆر مەحمودیش کۆسپیان دروست ئەکرد.

بەیانە هاوبەشەکە، دەوری هەبو لە ئاسانکردنی پرۆسەی پێکهاتندا، کوڕەکانی مەلا مستەفا هەڵوێستیان ئیجابی بو.

بەیانەکە بە رەزامەندی هەردولا نوسرا، ئێمە بەیانەکەمان ناونا (ئینزیمام). حکومەتی عێراق ئەو رێککەوتنەی زۆر پێناخۆش بو، هەتا لەبیرمە رۆژێک من و عەلی عەسکەری چوین بۆ لای سەعدون غێدان، سەعدون غێدان زۆر زیرەک نەبو، زۆر لەشت نەدەگەیشت پلارێکی زۆر گەورەم لێدا کە هاتینە دەرێ عەلی عەسکەری گوتی ماڵت کاول بێ چیت پێوت؟ بەڵام ئەو تێنەگەیشت،

چوینە ژورەوە، سەعدون غیدان گوتی: "کاک جەلال من پرسیارێکم هەیە، بەڵام بەینی خۆمان بێت، چونکە ئێستا بەینمان باشە لەگەڵ مەلا مستەفا، چۆن جەماعەتێکی ئینسانی و وەتەنی پێشکەوتوخوازی وەکو ئێوە ئەتوانن لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێن و پێکەوە بژین"؟ منیش گوتم: قسەیەکت بۆ بکەم؟: گوتی بەڵێ، گوتم: "کوردێکی سوری هەیە، ناوەکەیم لەبیرچوبو، ئەو وەختە لە بەغدا بو، لەدانیشتنێکدا مامۆستا ئیبراهیمی دیبو گوتبوی چۆن ئێوە شەڕی مەلا مستەفا ئەکەن و ئەو گەورەی کوردە، ئەو کابرایە دوای ئازار هاتبو بۆلای مامۆستا ئیبراهیم، ئەیزانی ئێمە خەریکی رێککەوتنین لەگەڵ مەلامستەفا، گوتی: ئێوە چۆن ئەتوانن لەگەڵ ئەو پیاوە پێکبێن. چونکە مەلا مستەفا عەشائیرە و کۆنەپەرستە کە ئەو رۆیشت لە مامۆستا ئیبراهیممان پرسی، ئەوە ئەڵێ چی؟ ئەویش گوتی: "وەڵڵاهی پیاو نازانێت لەگەڵ ئەو سەگبابە چی بکات؟ پێکدێین ئەڵێ بۆ پێکدێن! پێکنایەین، ئەڵێ بۆ پێکنایەن"؟ ئەمنیش هەمان مەسەلەم بۆ ئەو گێرایەوە و گوتم: " نازانین لەگەڵ ئەو سەگبابانە چی بکەین، شەڕ ئەکەین، ئەلێن بۆ شەڕ ئەکەن، رێک ئەکەوین، ئەپرسن بۆ رێککەوتون" بێگومان خۆی ئەگرتەوە، بەڵام ئەو تێنەگەیشت و دایە قاقای پێکەنین و گوتی" "والله صدق کاکە جەلال"!.

*** راستە کە ئێوە چونەوە لای بارزانی، مامۆستا ئیبراهیم لەبەردەمی بارزانی و عەلی عەسکەری و عومەر دەبابەدا گوتبوی: ئێمە هەڵەبوین و کوردایەتی و نیشتمانپەروەری لەلای تۆوەبوە؟**

– من شتی وام نەبیستوە.

*** دوای هەڵکردنی حیزبەکەتان، چارەنوسی ئێوە چیی لێهات، کارتان لەگەڵ بارزانی کرد، یان بۆچونی جیاواز هەبو لە نێوتاندا؟**

– کە پێکهاتینەوە و بەیانەکە دەرچو، مەرجی مەلا مستەفا ئەوەبو، ئێمە چەند کەسێکمان لای ئەوان بین. زەبیحی و حیلمی قبوڵیان نەکرد، مامۆستا ئیبراهیم و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و من، قبوڵمان کرد کە بچین بۆئەوێ، نەوشیروان مستەفاشمان برد بۆئەوێ، چونکە نەوشیروان مەحکوم بو بە ئیعدام لەسەر حادیسەکە و لای خۆمان دامانا هەتا تەرتیبی ئەوەی بۆ ئەکەین، بینێرین بۆ دەرەوە، ئەو پێنجەمان چوینەوە خزمەت بارزانی، دانیشتینەوە.

*** لەوێ چیتان نەکرد، نەتان توانی بە سەربەستی بجولێنەوە؟**

- ماوەیەک لەوێ ماینەوە، بەراستی مەلا مستەفا هیچ لە مەرجەکانی ئێمەی جێبەجێ نەکرد، زۆرتر لە ژێر چاودێریدا بوین، هاتنی خەڵکیان بۆ لای ئێمە قەدەغە کردبو، جگە لە خۆیان و ئەوانەی کە خۆیان ئەیانویست کەسی تر نەی ئەتوانی بێت بۆلامان.

پتر لە ساڵێک تێپەری هیچ بەڵێنێکیان جێبەجێ نەکرد، بریار بو کۆنگرە ببەسترێ و ئیشمان پێ بدرێتەوە، ئەوەش نەکرا.

کە هەوڵی لەناوبردنی مەلا مستەفا لە ۲۹ ئەیلولی ۱۹۷۱ دا درا، لەو کاتانەدا حکومەت چەند کەسێکی نارد، کە خۆیان تەقاندەوە بۆئەوەی مەلا مستەفا بکوژن، دوایی دەرکەوت کە سەدام لە پشت ئەو کارەوەبو، بەڵام لە سەرەتادا حاشایان لێکرد.

بارودۆخی کوردستان و ناو پارتی کاریگەریی زۆری نەبو لەسەر مەلا مستەفا بۆ ئەوەی هانی بدات، کۆنگرەیەک ببەستێت و بەپێی لێهاتویی ئیش لەناو ئەندامانی پارتیدا دابەشبکات و دەورێک بدرێت بە ئێمە، بۆیە ئێمە لەوێ وەک دەست بەسەر مابوینەوە.

*** مەسعود بارزانی لە کتێبی "بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد"، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم ل. ٦٠ دەنوسێ: کاتێ باڵی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ بارزانی تێکەڵاو بونەوە، عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری گوتویانە، کە ملیۆنێک و ٤٠٠ هەزار، کە دەیکردە نزیکەی ٤ ملیۆن و ۲۰۰ هەزار دۆلار دیار نەماوە و لای تۆ و مامۆستا ئیبراهیم بوە؟**

- دەربارەی پارە، یەکەم: یەک فلس لای من نەبوە، پارەی حیزب لای عەبدولرەحمان زەبیحی و عومەر دەبابە بوە، لای مامۆستا ئیبراهیمیش نەبوە، دوەم: پارتی بە درێژایی تەمەنی خۆی ملیۆنێک و چوار سەد هەزاری نەبوە، چونکە حکومەتی عێراق مانگی پەنجا و هەشت هەزار دیناری یارمەتی حیزب ئەدا، بۆیە شتی وا بە هیچ شێوەیەک نەبوە. دەربارەی دارایی، پێویستە ئەو راستیە بڵێم، کاتێ پارتی دیموکراتی کوردستان حەل بو هەندێ پارەی هەبو، هەندێک لەو پارەیە کە (پانزە هەزار) دینار بو لای من بو، بە ئاگاداری ماموستا ئیبراهیم و عومەر دەبابە و زەبیحی دانرابو، من ئەو پارەیەم زۆرتری لە کۆمەڵی چالاکیدا سەرفکردوە.

# سەرەتای ڕێکخستنی
# کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان (کۆمەڵە)

*** کە ئەتانزانی ئێوە ناتوانن ڕۆڵتان هەبێت لە کاری سیاسی ناو پارتیدا و زۆربەی دەرگاکانتان لێ داخراوبو، بۆ بیرتان نەکردەوە جموجۆلێکی سیاسی تازەی هاوچەرخ دروست بکەن؟**

- بەڵێ دەستمان پێکرد، ئەوکاتە بە دزییەوە دەستمانکرد بە دروستکردنی کۆمەڵە، دوایی لە مەسەلەی دروستکردنی کۆمەڵەدا بەتایبەتی بۆت باس ئەکەم، من کۆمەڵە بوم، ئەو سەردەمە نەوشیروان مستەفاش کۆمەڵە بو، بەڵام کۆمەڵەیەکی فەعال نەبو، وەک شەریک شعور وابو.

مامۆستا ئیبراهیم و عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری نەیان ئەزانی من کۆمەڵەم، لەبەرئەوە لە خۆم ئەترسام کە هەمو دەقیقەیەک کەشف ببم ئەو کاتە بە دڵنیایەوە لەلایەن پارتی و مەلا مستەفاوە دەکوژرام.

هەروەها بۆمان دەرکەوت، مەلا مستەفا دەستی کردۆتەوە بەگرێدانەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئێران و ئیسرائیل و ئەمەریکا، ئەو سەفەرەی دکتۆر مەحمود و ئیدریسیش لە حوزەیرانی ١٩٧٢ دا بۆ ئەمەریکا و بینینی ریشارد هێلمسیان سەرۆکی سیا (CIA)، هۆی ساردبونەوەی پەیوەندی ئێمە بو لەگەڵ مەلا مستەفا، چونکە ئەوکاتە ئەو پەیوەندیانە، بە تایبەتی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا و شا بەو جۆرە، هەرکەس بیکردایە بە کفر دائەنرا[٢].

*** کە ئێوە ئەو سیاسەتەتان بە دڵ نەبو، بۆچی لەناو پارتی و لای بارزانی مانەوە و دەرنەچون، لایەنی کەم حیزبێکی ترتان دروست بکردایە لە دەرەوەی پارتی؟**

- ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەبو، من بیرم لەوە ئەکردەوە لەوێ نەمێنم، ئەوەبو پاش نزیکی دو ساڵ ئیجازەم لە مەلا مستەفا وەرگرت کە سەفەرێکی دەرەوە بکەم بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی هێرۆ، لەو سەفەرەی دەرەوەدا من

نەگەڕامەوە و نامەیەکم بۆ مەلا مستەفا نوسی گوتم: "لە دەرەوە ئەژیم و دژایەتی ئێوە ناکەم، خەریکی خوێندن و ژیانی خۆم ئەبم، تکاشم وایە، بە هەمو قسەیەک دەربارەی من باوەڕنەکەیت، (اذا جاءکم فاسق بنبا فتبینوا ان تسیبوا قوما بجهالة) فتسبحوا علی ما فعلتم نادمین)

حەز ئەکەم بزانی من وەختی خۆشی، پێم خۆش نەبوە لەگەڵ تۆ تێکبچین و شەڕی تۆ بکەین، بەڵکو ناچارکراین، ئێستاش پێم خۆش نیە لەگەڵ تۆ تێکبچم، بەڵام قەولبو لە ماوەی شەش مانگ تا ساڵێک هەندێ چاکسازی بکرێت، ئەوە دوساڵە هیچت نەکرد، لەبەرئەوە من لە دەرەوە ئەبم، هەر ئیشێکی جەنابت یا شۆڕش لەسەر من بوەستێت من ناهێڵم پەکی بکەوێت و بەئەنجامی ئەگەیەنم".

ئیدریس و مەسعود کاغەزیان بۆ نوسیم کە مەلا مستەفا مانەوەی منی لە دەرەوە پێ خۆشنیە، منیش وەڵامم دانەوە و گوتم کە هەر کارێکی ئەوان هەبێت لە دەرەوە، ئەوا بۆیان ئەکەم.

من لە دەرەوە مامەوە، برادەران لای مەلا مستەفا مانەوە، کاک نەوشیروانیش پێشتر دەربازبو، چوبو بۆ نەمسا. عومەر دەبابە و مامۆستا ئیبراهیم و عەلی عەسکەری لەوێ مانەوە. منیش لە بەیروتەوە چومە فەرەنسا و دوایی میسر و سوریا، دوایی لە فرسەتێکی تردا بۆت باس ئەکەم.

## ئاوڕێک لە شەڕی ناوخۆ و هاوکاری لەگەڵ حکومەتدا

*** ئێوە هەڵوێستی خۆتان لە ١٩٦٦-١٩٧٠ چۆن هەڵدەسەنگێنیت کە هاوکاریتان لە حکومەت وەردەگرت بۆ شەڕی بارزانی؟**

- نا ئەو هەڵوێستە بە باش نازانم، ئەوە شتێک بو بە ناچاریی کردمان، بۆ نمونە، ئێمە ساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ حکومەتی عێراق گفتوگۆمان کرد، خۆ ئەوە داخوازی ئێمە نەبو، بەڵکو شەقی زەمانە سەپاندی، ئەگەر بهاتایە و ئێمە بمانتوانیایە حکومەت بڕوخێنین، ئەوا بێگومان بە خێرایی ئەمانکرد، بەڵام کە نەمانتوانی، بارودۆخێکی وا هاتە پێشەوە، کە تێیدا کەوتینە دانوستاندن.

شەڕی ساڵانی ١٩٦٦ تا ساڵی ١٩٦٩ مەلا مستەفا سەپاندی و ئەبوایە بکرایە، ئێمە دو ڕێگامان لەبەردەمابو، یان تەسلیم بین، یان بەرگری بکەین، لەبەرئەوە هیچ چارەیەک نەمابویەوە، ئایا ئەوکارە چاکترە کە رویدا، نەخێر، ئەوە کارە باشەکە نەبو، نەخێر باشتر ئەوەبو، لە سەرەتاوە شەڕ نەبێ، راستتر وابو ئێمە و مەلا مستەفا هەرکەسە چالاکی سیاسی خۆی و حیزبی خۆی هەبێت و بیروباوەڕی خۆی هەبێ، بەڵام کە مەرجت بەسەردا سەپێندرا و یەکێک هات پەلاماری دای، دو حاڵەت دێتە پیشەوە، یائەبێت بچیت لەگەڵ ئێران هاوکاری بکەیت، نەخێر باشترە کە ئێمە بەتەنیابین و پشت بە خۆمان ببەستین، ئێمە شەڕەکەمان بەسەردا سەپێنرا، ئەو شەڕەی کە بە ویژدانەوە وەک خۆی باسم کرد، سەپێندرا بەسەر ئێمەدا، ئێمە بەرگریمان لە خۆمان و لە حیزبەکەمان کرد.

هیچ کاتێک ئێمە شەڕ هەڵگیرسێنەر نەبوین، لە ساڵی ١٩٦٧دا مەلا مستەفا شەڕی هەڵگیرساند و پەلاماری داین، لە ساڵی ١٩٦٩ دا تەرازوی هێزەکان گۆڕرا، لە هەندێ جێگە کە ئەوان پەلاماریان داین ئێمەش پەلامارمان داونەتەوە.

وەکو شەڕی ئێران و عێراق وابو، یەکەمجار عێراق چوە ناو ئێرانەوە، دوایی ئێران چوە ناو عێراق و بەو شێوەیە، ئێمە هیچ کاتێ شەڕمان نەویستوە، هەمو جارێ هەواڵمان ئەنارد بۆ مەلا مستەفا، کە وەکو بۆم گێڕایەتەوە، ساڵی ١٩٦٩ سەرەڕای ئەوەی باری عەسکەریمان باشبو، ئامادەیی گفتوگۆمان نیشاندا، واتا ئێمە ئەو شەڕەمان پێباش نەبو، بەڵام ناچاربوین بیکەین، بە رای من ئەو رۆژە ئەبوایە ئەو شەڕە بکرایە، رێگای تر نەبوە!.

*** ئەو سەردەمە ئەو نازناوە هەبو کە ئێوە جاشی ١٩٦٦ان، ئەو ناوە چەند لە شوێنی خۆیابو؟**

- ئێمە بەوانمان ئەگوت جاشی سەنتۆ، خەڵکی عام لەگەڵ ئێمەبون، زوربەی شار و لادێ لەگەڵ ئێمەبون، بچوینایە هەرجێیەکیش، رزگارمان ئەکرد، بەبێ موبالەغە تا بەیانی ئازار بەشی زۆری خەڵک لەگەڵ ئێمەدابون، ئێمە دەچوینە هەر جێگایەک هەزاران کەس چەکی هەڵئەگرت و لەگەڵ ئێمە بەرگری ئەکرد.

مەلا مستەفا، زوربەی زۆری خەڵکی لەگەڵ نەبو، هەتا ئازار، ئێمە هەڵمەتێکی گەورەمان لەسەربو، ئێران، حیزبی شیوعی، سۆڤیەت، ئیسرائیل و کۆنەپەرستی کورد هەمو دژمان بون، بەڵام لەناو جەماوەردا پشتگیریمان زۆربو.

*** باشە مام جەلال، ئەگەر سبەینێ هەمان بارودۆخی ١٩٦٦ دوبارە بێتەوە، ئایا تۆ هەمان هەڵوێست وەردەگریتەوە وەکو ئەو کاتە؟**

- ئەگەر بێنە سەرم و بمکوژن، بێگومان، ئەی چی ئەکەم؟ باشە چی بکەین، من ئەو پرسیارە لەتۆ ئەکەم؟ هەڵبێین؟ باشە بۆ کوێ هەڵبێین.

*** من نە مام جەلالم و نەئەو کاتە لێپرسراو بوم؟ کەواتە تۆ ئێستا بە چاوێکی رەخنەگرانەوە سەیری ئەو وەختە ناکەیت؟**

- من هیچ رەخنەیەکی جدی تێدا نابینم، جگە لەوەی کە ئێمە ناچاربوین شتێکمان بەسەرا سەپێندرابو، ئەبوایە یا بیکەین یا نەیکەین، من رەخنەم لە پێش ١٩٦٨ هەیە، نەک دوای ئەو مێژوە.

*** باشە نەئەکرا بۆنمونە واز لە هێزی چەکدار بهێنن؟ تەنیا کاری سیاسی لەشارەکاندا بکەن و شاخەکان بۆ بارزانی بەجێ بهێڵن بۆئەوەی خۆتان لەشەڕی ناوخۆ بپارێزن؟**

- نەتدەتوانی لە شار بمێنیتەوە، چونکە بەشەو ئەهات و ئەیکوشتی و ئەیرفاندی، لە کوردستان بەبێ خەباتی چەکدار خەباتی سیاسی نەدەکرا، ئیمکان نەبو خەباتی سیاسی روت لە شارەکاندا بکرێت. ئێمە ئەو پێشنیازەمان بۆ مەلا مستەفا کرد و گوتمان، ئێمە ئامادەین، کە هەمو هێزی پێشمەرگە بدەین بە تۆ و ئێمە تەنها کاری حیزبی بکەین، ئەو لەسەر ئەوە رازی نەبو.

*** نەدەکرا حیزب هەڵبوەشێنرێتەوە بۆ ئەوەی کورد توشی ئەو شەرە نەبێت؟**

- من ئامادە نەبوم حیزب حەل بکەم، رەنگە تۆ بتتوانیایە ئەوە بکەیت، من ئێستاش جارێکی تر ساڵی ١٩٦٨ بگەڕێتەوە، لە خەتە ئەساسیەکان هەمان هەڵوێست وەردەگرمەوە، پێش ساڵی ١٩٦٨ من رەخنەم هەبو، کە بۆم باسکردی، ئێستاش جارێکی تر لای هەرکەسێک بم، ئێستا لای تۆم هاورێمانی، بزانم تۆ ئەمکوژی سبەینێ یان هەڵدیم لەدەستت یان ئەتکوژم، ئەگەر بزانم ئێستا سلاحەدین تۆ بەتەمای لێرە من بکوژی، ئەگەر پێمکرا لەپێشەوە ئەتکوژم، ئەگەر پێمنەکرا هەڵدێم، دانانیشم لێرە سەلاحەدین، بەسەلامەتی بمکوژێ!، لەوێ لەکن مەلا مستەفا دانانیشم بمکوژێت و خۆشم بە موستەحەقی کوشتن نازانم، لەبەرئەوە هەڵدیم لەدەستی، خۆ ئەگەر بێتەسەرم و پێمبکرێت بەرگری ئەکەم. بەڵام ئایا ئەگەر پرسیارێکی تر بکەین و بڵێین ئایا ئەوە باشترین چارەسەر بو؟

من ئەڵێم نەخێر ئەوە باشترین چارەسەر نەبو، چارەسەری باش ئەوەبو، مەلا مستەفا نەیەتە سەرمان و ئێمەش هێزی چەکدار دروست نەکەین، بۆ ئەوەی شەڕی براکوژیی روونەدات.

شەڕی براکوژی باشترین رێگە نەبو، بەڵام زۆرجار بزوتنەوەی نیشتمانی توشی هەندێ گیروگرفت دێت کە ناچاری ئەکات هەڵوێستێک وەربگرێت کە بە دڵی خۆی نەبێت، ئەو هەڵوێستە هەمیشە ئەوە نییە کە پلانی بۆ دانراوە، یاخود ویستراوە، بەڵکو زیاتر هەڵوێستێکە، شەقی زەمانە ئەیسەپێنێ، من خۆم بە مێژوی ئەو سەردەمە ناڵێم باشە و بە باش تۆماری ناکەم لە مێژوی کوردا.

# بارزانی دوای ئازار

*** رێکەوتنی بارزانی لەگەڵ ئێوە لە دوای ئازارەوە، جگە لە هەڵوێستی نیشتمانپەروەریی هیچ ئامانجێکی تری هەبو؟**

- بەرەئی خۆم مەلا مستەفا باش لە هەڵوێستی بەعس گەیشتبو کە بەعس بەراستی لەگەڵیدا نییە و ئەیزانی تێکئەچێتەوە، پێی وابو کە فرسەتە لەگەڵ ئێمە پێکبێتەوە، چاکترین وەزعە بۆ پێکهاتنەوە بەحساب، ئەو سەرکەوتوە و لە مەوقفی هێزەوەیە و ئێمە سیاسییەن شکاوین، لەبەرئەوە ئەتوانێ بە مەرجەکانی خۆی لە گەڵماندا پێکبێتەوە.

پێموایە جگە لە بۆچونی راست بۆ ئەو وەزعە و جگە لە هەستکردن بە نیشتمانپەروەریی هیچ شتێکی تری تێدانەبو. دیارە من ئەمەوێ شتێکی ترت پێ بڵێم: هەرچی مەلا مستەفای خۆش ئەویست لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا، ئامۆژگاریی ئەکرد کە لەگەڵ ئێمە پێکبێت، چونکە من لە بیرمە، سۆڤیەتیەکان ئامۆژگاریان کرد، هەر لەو بارەیەوە بۆت بگێرمەوە، کابرایەکی سۆڤیەتیم لە ماڵی نوری عەبدولرەزاق بینی ناوی ئازارۆف بو، بەتایبەتی دوای ئازاربو هاتبو من ببینێ و لێی پرسیم: هەڵوێستت چییە لە بەیانی ئازار؟ منیش گوتم ئەو بەیانە شتێکی باشە، هەرچەندە ئێمە وەکو حیزب زەرەرمان کردوە. ئەو هەڵوێستەی ئێمەی

زۆر پێباشبو، گوتی: "ئێمە پێمان خۆشە ئێوە لەگەڵ مەلا مستەفا پێکبێینەوە"، منیش گوتم ئێمەش ئەوەمان پێ خۆشە، گوتی: پێتان باشە ئێمە هەوڵ بدەین؟ گوتم بەڵێ، زۆرمان پێباشە.

من پێموایە هەوڵ و ئامۆژگاری سۆفیەتیش دەوری هەبو، لە پاشاندا مەلا مستەفا ئەیویست هەمو دەرگایەک لەسەر مونافیسەکانی دابخات، ئەوکاتە هیچ هێزێک نەبو لە کوردستان بەربەرەکانیی بکات. مەلا مستەفا پێی وابو، رەنگە ئێران یاخود لایەکی تر هەوڵ بدات لەگەڵ ئێمە پێکبێت، بۆچی خۆی ئەو کارە نەکات و لەگەڵماندا پێکنەیەت؟ مەلا مستەفا ئەیویست هەمو کورد لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، ئەیزانی کە ئێمە هێزمان هەیە و ئەتوانین خەڵک کۆبکەینەوە، بۆیە ئەیویست بەلای خۆیماندا رابکێشێت، من جگە لەوانە هیچ شتێکی تری تێدا نابینم.

*** ئایا بەهێزبونی کورد، لە ئیستراتیجی بەعسدا هەبو؟!**

- بەعس، دو بەعسە، من بەعس بە یەک حیزبی موتەجانس نازانم، بزانە تا سەدام هاتە سەر حوکم ئەوان یەک حیزب نەبون، بەڵکو چەندین باڵ بون، واتا تا ١٩٨٠ چەند باڵێک لەناو بەعسدا هەبون، هەندێک ئەیگوت با لەگەڵ کورد پێکبێین و مافی خۆیان بدەینێ، ئەو کۆمەڵەی کە ئەو بۆچونەیان هەبو سەدام ئیعدامی کردن، بۆ مەعلوماتت ئێمە بەهۆی جەماعەتی بەعسی چەپەوە ئاگامان لەو جەماعەتە هەبو، حازم جەواد هات بۆلای من لە تاران و گوتی: "بەپەلە جەلال تۆ بگەڕێرەوە بۆ کوردستان، لەم رۆژانەدا هەواڵێک دێت و منیش دێم بۆلاتان"، من لەرێگا بوم ئەوانە ئیعدام کران.

ستراتیژیەتی تەیاری سەدام و میشێل عەفلەق، لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردبوە، لە رێگای بەکارهێنانی هێزەوە، ئەو سەردەمە دو تەیار هەبون: تەیاری عەبدولخالق سامرائی و عەبدوڵڵا سەلوم سامەرائی، ئەمانە لەگەڵ ئێمە بون و پێیان خۆشبو لەگەڵ کورد پێکبێن و مافی کورد بدەن، تەیاری سەدام، هەوڵی لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردیان ئەدا، ئەو ئەیگوت، ئەمانە حیزبن لە سەرەتادا پێویستە ئەمانە لەناوبەرین، دوایش مەلا مستەفا تاکە کەسە ئەتوانین بیکوژین، ئەوەبو هەوڵی کوشتنیدا و خوا نەیکوشت.

*** باشە ئەگەر حکومەت بەیانی ١١ی ئازاری لەگەڵ ئێوەدا مۆر بکردایە، هەڵوێستی ئێوە چی ئەبو بەرامبەر بە بارزانی؟**

- ئەگەر حکومەت بەیانی ١١ی ئازاری لەگەڵ ئێمەدا مۆر بکردایە، بەدڵنیایەوە ئەڵێم کە ئەو سەیتەرەیەی بارزانی کردی، ئەوا ئێمە ئەمانکرد و بە شێوەیەکی رێکوپێکتریش، ئێمە هەمیشە ڕامان وابو، ئەگەر مەلا مستەفا لە بێ هێزترین کاتدا بێت، ئەوا گرنگە کە لەگەڵیدا پێکبێینەوە.

رەئی زۆر لە برادەران وابو، نە مەلا مستەفا ئێمەی پێ لەناوئەچێت و نە ئێمە ئەومان پێ لەناوئەچێت، ئێمە پێویستین بۆ کورد وەکو حیزب، مەلا مستەفاش پێویستە، لەبەرئەوە گرنگە کە بگەینە شێوەیەک لە پێکهاتن.

من دڵنیام ئەگەر حکومەت بەیانی ئازاری لەگەڵ ئێمەدا مۆر بکردایە، ئەوا من یەکێکم ئەنارد بۆلای مەلا مستەفا، یا خۆم ئەچوم بۆلای، بە مەرجێ بمزانیبایە نام کوژێت، بۆئەوەی لەگەڵی پێکبێینەوە، چونکە شەڕی ناوخۆ نەدەبڕایەوە.

*** واتا بۆچونی ئاشتبونەوە لەگەڵ بارزانیدا، پێش ١١ی ئازار لەناو ئێوەدا هەبو؟**

- سەلاحەدین، بۆ مێژو هەمیشە ئەو بۆچونە لەناو ئێمەدا هەبو کە ئێمە شەڕ نەکەین، باشترە بتوانین گیروگرفتەکانمان بە ئاشتی و بە رێگای سیاسی چارەسەر بکەین، ئێمە وابیرمان ئەکردەوە کە کەشی ئاشتی لە خزمەتی ئێمەدایە، ئاڵۆزی و شەڕ کردن لە سودی مەلا مستەفایە.

ئێمە پێمان وابو، ئەگەر ناکۆکیەکان بە سیاسی و بە ئاشتی و بە خەباتی جەماوەری چارەسەر بکرێت، ئەوا ئێمە دەیبەینەوە، ئەگەر بە شەڕ و تەق و تۆق بکرێت، ئەوا ئەو دەیباتەوە، لەبەرئەوە هەمیشە ئێمە خەباتی سیاسیمان هەڵدەبژارد، مەلا مستەفاش هەمیشە خەباتی سیاسی و رێگای ئاشتی بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان رەت ئەکردەوە و چارەسەری چەکداری ئەگرتەبەر.

ئەو لە جیاتی ناکۆکی سیاسی، ناکۆکی چەکدارانەی ئەسپاند، چونکە ئەیزانی، ئێمە لە مەیدانی رێکخستن و فکری و جەماوەریدا ئەیبەینەوە، خۆ ئەگەر نەشمان بردایەوە، ئەوا هێزێکی زۆر گەورە ئەبوین، بەڵام ناکۆکییەکانی خۆی بە شەق و بە گولە و بەتۆپ و بەچەک چارەئەکرد.

ئێمە زۆر خەڵکمان کرد بە ناوبژیکەر، هەر لە ئێرانەوە کە دۆستی بو، هەتا شێخ و مەلا و چەندین کەسایەتی جیاوازمان نارد بۆلای مەلا مستەفا، بەڵام بێ ئەنجامبو.

*** سەرەڕی هەمو ئەو کێشانە کە ڕویاندا، ئەتوانرا شەری ناوخۆ نەکرێت؟**

بەرای من ئەگەر ١٩٦٤ مەکتەبی سیاسی، سیاسەتێکی حەکیمانەی بگرتایەبەر و نەرمی بنواناندایە و نوری شاوەیس و عەلی عەبدوڵڵا و هەندێ لەو برادەرانە وا بەتوندرەوی نەچونایە پێشەوە و بە هەڵە مامۆستا ئیبراهیمیان تێنەگەیاندایە، ئەگەر ئەویش کەمێک دوربین تر و ئارامتر و هەمەلایەنە تر سەیری کێشەکانی بکردایە، ئەو شەڕەی ناوخۆ روی نەئەدا، هەرچەندە مەلا مستەفا ئەیەویست، بەڵام ئەمانتوانی بەری بگرین، وەکو بۆم باسکردیت، ئەتوانرا کۆنفراس، یان کۆنگرەیەکی هاوبەش ببەسترایە.

## پەراوێزەکان:

١- دەربارەی پرۆسەی خۆحەلکردنی باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان، د.موحەمەد سابیر و مامۆستا جەمال عەبدول کادیرانی دیاری ئەو کاتەی پارتی و کەمال موحێدین، ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەمان پارتی، دەڵێن: پارتی باڵی مەکتەبی سیاسی بڕیاری دا کە کۆنگرەیەک بۆ مەبەستی تێکەڵبونەوە لەگەڵ بارزانی بگرێت. کۆنگرەیەک لە ١٩٧٠/١١/٢٧ لە بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لە شەقامی فەلەستین لە بەغدا بە ئامادەبونی ١٠٥ ئەندام، کە نوێنەرایەتی هەمو رێکخستنەکانی پارتیان لە کوردستان و عێراق و دەرەوەی وڵات دەکرد گیرا.

دو بۆچون لە کۆنگرەکەدا هاتە کایەوە، یەکێکیان ئەوە بو، لەگەڵ بارزانی تێکەڵ بن، بۆچونی دوهەم ئەوە بو، حیزبێکی نوێ دروست بکرێت، سەرکردە کۆنەکانی تێدا نەبێت و هێزی چەکداریشی نەبێت.

لە رۆژی چوارهەمی کۆنگرەکەدا، بە دەنگی زۆربە ئامادەبوان، بڕیاری تێکەڵاوبون درا لەگەڵ پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی، هەرلەوێ لیژنەیەک پێک هات کە بۆ میکانیزمی تێکەڵبونەکە بچن بۆ لای بارزانی و کە گەڕانەوە، کۆنگرەکە بەشی دوهەمی ببەستێ و بڕیاری کۆتایی بدرێت.

دوای گەڕانەوەی وەفدەکە، بەشی دوهەمی کۆنگرەکە لە ١٩٧١/٢/١٠ لە ماڵی مامۆستا برایم لە بەغدا گیرا و بڕیاری کۆتایی درا بە چونەناو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بە سەرۆکایەتی بارزانی.

زۆربەی ئامادەبوان ٩٣ ئەندام بڕیاری تێکەڵبونیان دا لەگەڵ پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی و تەنها ١٢ ئەندام لەوانە مام جەلال دەنگیان بۆ بڕیارەکە نەدا.

لە کۆتایی کۆنگرەکەدا کە بە کۆنگرەی حەوتەم ناوبرا، بەیانێکی کۆتایی بێ مێژو دەرچو لەژێر ناوی (بەیاننامەی هەڵوەشاندنەوەی حیزبی شۆڕشگێری کوردستان، تێدا هاتبو "کۆنگرە پرنسیپی چوونە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی قبوڵ کرد وەک رێگەیەک بۆ زاڵ بوون بەسەر گیانی جیاخوازی و گرتنی هەموو کون و کەلەبەرێکی رێزەکانی گەلی کوردمان و پتەوکردنی یەکێتی بزوتنەوەی نیشتیمانی رزگاریخوازی کورد...کۆنگرە بڕیاری دا شاندێک رەوانەی بارەگای بەڕێز بارزانی بکات، تا بڕیارەکانی کۆنگرەی پێ رابگەیەنێ، شاندەکە لەگەڵ سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و لە سەروشیانەوە بارزانی کۆبۆوە، کە بە بڕیارەکانی حیزبمان خۆشحاڵ بوون و لەگەڵ ئەندامانی شاندەکەدا ئاوتوێی تۆژینەوەی ئەو هەنگاوانەیان کردکە پێویستە بگیرێتە بەر بۆ پێکهێنانی یەکێتیەکی پتەوی حیزبی و لیژنەیەکی باڵا لە نوێنەرانی هەردوو حیزب بەسەرپەرشتی بارزانی پێک هات)

(مەسعود بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد بەرگی سێیەم، بەشی دووەم.ل. ٢٧٩).

مەکتەبی سیاسی پارتی بەسەرۆکایەتی بارزانی لە ١٩٧٠/١٠/١ دا، بڕیاریان دا کە باڵی مەکتەبی سیاسی تێکەڵیان بێت. (هەمان سەرچاوە.ل. ٥٩).

٢- (د.مەحمود و ئیدریس بارزانی لە ١٩٧٢/٦/٣٠ چاویان بە هەریەك لە ریچارد هێڵمز- بەڕێوەبەری C.I.A- و ڕیچارد کەنەدی یاریدەدەری هنری کسینجەر لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی کەوت، ئەمریکا بڕیاریدا کە هاوکاری کورد بکات بەنهێنی) (دۆزی کورد لە بازنەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا و عێراقدا -گۆران ئیبراهیم سالح -ل. ٩٤).

# کوردی عێراق و ئێران و
# پەیوەندییان لەگەڵ چەپەکانی ئێران

*** پەیوەندی پارتی لەگەڵ گروپە ئێرانییە چەپەکان، بەتایبەتی لەگەڵ گروپی سازمانی ئینقیلابی و جەماعەتی مەلا ئاوارە چۆن دەستی پێکرد؟**

– کاکە، ئەوە دو مەسەلەی لەیەک جیاوازن، مەلا ئاوارە لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ قادر شەریف (هاشمی حەق تەلەب)، سەعید کوێستانی و حسێنی مەدەنی جیابونەوە. ئەوکاتە ئەحمەد تۆفیق کە ناوی (عەبدوڵڵا ئیسحاقی) بو، سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بو. ئەمانە کۆمیتەیەکیان دروست کردبو بەناوی (کۆمیتەی ساخکەرەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران) کە لە ١٩٦٤ دا دروست بو و تەنها یەک ساڵی خایاند[1].

لە ساڵی ١٩٦٧ بە هاوکاری سلێمانی موعینی، سمایلی شەریف زادە، مەلا ئاوارە، سەعید کوێستانی، سەنناری مامەدی و سالاری حیدەری، کۆمیتەیەکیان پێکهێنا بە ناوی (کۆمیتەی ئینقیلابی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)[2].

ئەو کۆمەڵەیە باوەڕیان بەوەهەبو کە ئەبێ لە بن دەستی ماڵی مەلا مستەفا دەرچن و بچنەوە کوردستانی ئێران و شۆڕش و خەباتی خۆیان لەوێ بکەن.

لەپێش ئەوەی شۆڕش بکەن، گروپی چەکداری بچوک دروست بکەن و بگەڕێن بە ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا و خەڵک هۆشیار بکەنەوە.

ئەو کەسانەی بەچالاکی ئیشیان ئەکرد بریتی بون لە مەلا ئاوارە و ئیسماعیلی شەریف زادە و سلێمانی موعینی، هەریەکەیان بۆ ناوچەیەک دانرابون، سلێمانی موعینی، بۆ مهاباد، مەلا ئاوارە بۆ سەردەشت و ئیسماعیلی شەریف زادە بۆ بانە، ئەوان دەمێک بو پەیوەندییان لەگەڵ ئێمەدا هەبو.

مەلا ئاوارە و قادر شەریف لەکۆنەوە پەیوەندییان لەگەڵ ئێمەدا هەبو، لە کاتی ناکۆکی نێوان مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفادا، ئەوان لایەنی مەکتەبی

سیاسیان گرت و لەگەڵ مەلا مستەفا نەبون، بەتایبەتی دوای ئەوەی، مەلا مستەفا پەیوەندی لەگەڵ ئێران بەهێزکرد و ئێمە دور کەوتینەوە لە ئێران و پەیوەندیمان لەگەڵ بەغدا و قاهیرە دامەزراند و بەهێزکرد.

ئەوان زۆرتر بەلای ئێمەدا دایانشکاند، ئەوکاتە ئەوانە دەستیان کردبو بەخەباتی چەکدار و پێویستیان بە هاوکاری هەبو، مەلا ئاوارە، سلێمانی موعینی نارد، بێتە شاری سلێمانی و ئێمە ببینێت و داوای یارمەتیمان لێبکات. کاتێک سلێمانی موعینی دەگاتە سلێمانی ئەکەوێتە دەست شیوعییەکان، ئەوان پێیان ئەڵێن کە نەیەن بۆلای ئێمە و خۆتان توشی ئەوان مەکەن، ئەوان یارمەتیتان نادەن، وەرن ئێمە ئەتانبەین بۆ بەغدا، بۆ سەفارەتی میسری.

ئەوانیش بە قسەیان کردبون و چوبون بۆ بەغدا بۆ سەفارەتی میسری، سەفارەتی میسریش لە ئێمەیان پرسی و گوتیان جەماعەتێک هاتون سەردانی ئێمەیان کردوە و ئێوە ئەڵێن چی؟ گوتمان ئێمە رەئیمان لەسەر سلێمانی موعینی باش نیە، بەڵام گوتمان مەلا ئاوارە و ئیسماعیلی شەریف زادە، پیاوی زۆرچاکن و ئێمە پشتیوانیان لێدەکەین.

دوایی کە زانیمان سلێمانی موعینیش لە جەماعەتی ئەوانە، بۆچونیشمان لەسەر ئەو گۆڕا، چونکە گلەییەکەمان لە سلێمانی موعینی ئەوەبو، زۆر لەگەڵ ئەحمەد توفیق بو. کە زانیمان ئەو لەو جیابۆتەوە و هاتۆتە لای کۆمیتەی ئینقیلابی، رامان لەسەری گۆڕی و گوتمان زۆرمان پێ باشە ئەگەر هاوکاریان بکەن، بەڵام میسریەکان گوتبویان ئێمە دەرسی داخوازیەکانیان ئەکەین.

سولێمانی موعینی، هاتبوە سلێمانی و پەیوەندی لەگەڵ قالە تەگەرانی دروستکردبو، ئەویش لەگەڵ خۆی هانیبویە دەرەوەی شار و لەسەری شاخی ئەزمر، سەدیق ئەفەندی، کە فەرماندەی هێزێکی مەلا مستەفا بو، پێشی پێگرتبو، سولێمانی موعینی لە جێبەکە هێنابوە دەرێ.

بێگومان خەبەردرابو بە سەدیق ئەفەندی کە سولێمانی لە جێبەکەدایە، زۆر رون نییە کێ هەواڵەکەی گەیاندوە، دەوری حیزبی شیوعی چی بوە؟ نادیارە، بەڵام دەوری قالە تەگەرانی دیاربو، سدیقە ئەفەندی چو سولێمانی موعینی تەسلیمی مەلا مستەفا کرد و مەلا مستەفا کوشتی و تەرمەکەی ناردەوە بۆ ئێران و ئەوانیش تەرمەکەیان لە بەر مەرکەزی پۆلیسی مەهاباد هەڵواسی و گوتیان ئەوە فڵانە کوڕی فڵانە کە مەلا مستەفا لەسەر داخوازی ئێمە تەرمەکەی تەسلیم کردوینەتەوە.

تەسلیمکردنەوەی سولێمانی موعینی بە ئێران، دەنگێکی هێجگار خراپی نایەوە بۆ مەلا مستەفا، ئێمەش ئەوەمان کرد بەهەڵا کە حیزبی شیوعی لەسەری نوسی، بەڵام نەینوسی، مەلا مستەفا بەرپرسە، بەڵکو وتارەکەیان لەژێرناوی (لمصلحة من محاربة آحرار کردستان ایران؟) نوسیبو کە ئەوە کارێکی خراپە، بەڵام ناڵێن کێ کردویەتی و کێ بەرپرسە.

*** ڕۆڵی ئەحمەد تۆفیق چی بو لەناو پارتیدا، پەیوەندی و نزیکایەتی لە بارزانییەوە لە چیەوە سەرچاوەی گرتبو؟**

- ئەحمەد توفیق لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا، دو، سێ دەوری زۆر خراپی بینیبو.

یەکەم: هەتا بڵێی راسترەوبو، هەتا بڵێی لایەنگریی ئەوەبو، لە کوردستاندا کورد ببەسترێتەوە بە ئەمەریکا و وڵاتانی ئەوروپا و ڕۆژئاواوە، هەتا ئەوەبو بەناوی مەلا مستەفاوە هات بۆ بەیروت، بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمەریکادا.

دانا ئادەم شمیدت لەکتێبەکەیدا سوپاسی ئەحمەد تۆفیق ئەکا کە چۆن دەلیلی بوە و هێناویەتی بۆلای مەلا مستەفا.

دووەم: ئەحمەد توفیق کابرایەک بو، زۆر تموحاتی هەبو، هەتا بەتەمای ئەوەبو کە کچێکی مەلا مستەفا بهێنێت و ببێتە کوێخای کوردستانی ئێران.

سێیەم: ئەو زۆر دژی پارتی بو لە عێراق و دەورێکی زۆر خراپی بینی لەنێوان مەلا مستەفا و پارتیدا. لە هاندانی مەلا مستەفادا، ئەوەندە خراپ بو کە عەلی عەبدوڵڵا و برادەرانی تر لە سەنگەسەر گیران، ئەویان دانابو بە پاسەوانی زیندانەکە، ئەو لێپرسراوی بەندیخانەکەبو.

*** ئەی باشە پەیوەندی ئێوە لەگەڵ چەپەکانی ئێراندا چۆن دروست بو؟**

- بەهەمان رێگا، ئەو گروپە ئەوجارە بەرێیەکی ترەوە پەیوەندیان بەئێمەوە کرد، هەروەها ئەوان دەنگیان گەیاندبوە ئەوروپا، جەماعەتێک لە ئەوڕپا پەیدابون بەناوی (سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەی ئیران)، بڕیاریاندابو کە نوێنەرێک بنێرن بۆ لای ئەوان لە کوردستان، ئەو نوێنەری دکتۆر (کورشی لاشایی) بو، دوایی لای ئێمە ناوی لەخۆی نابو (دکتۆر جەلال).

کە دکتۆر جەلال هات، من لەبەغدا بوم و لەوێ یەکتریمان بینی زو تێگەیشتم کە کەمال فواد راستی کردبو، بۆچونمان لەیەک نزیک بو، گوتی: "وەڵڵا من هاتوم

لەرێی ئێوەوە بچمەوە بۆلای مەلا ئاوارە و برادەرانی تر لە کوردستانی ئێران"، منیش گوتم: "زۆر زۆر باشە، برۆ قسەیان لەگەڵدابکە و رێکبکەون".

ئینجا چو بۆلای مەلا ئاوارە و برادەرەکانیان، لەوکاتەدا مەلا ئاوارە یەکێکی ناردبو بۆلای ئێمە بۆ مەسەلەی هاوکاریکردنیان، ئێمەش چەک و پارە و فیشەکی زۆرمان بۆناردن و پێشمانگوتن هەرچیتان دەوێ ئێمە ئامادەین هاوکاریتان بکەین.

لەو کاتانەدا کۆمەڵێک لە گەنجەکانی ئێمە بە سەرۆکایەتی نەوشیروان مستەفا و شازاد سائیب، حەماس گرتبونی و ئامادەبون کە ئیلتحاقیان پێوەبکەن و لەگەڵیان ئیش بکەن. راستیەکەی ئێمەش پێمان خراپ نەبو، بەڵام لەوکاتەدا کە دکتۆر جەلال چوە لایان، هەم ئیسماعیلی شەریف زادە و هەم مەلا ئاوارەی بینیبو. کە گەڕایەوە رەئێکی زۆر باشی لەسەریان لەلا دروست بوبو، بۆچونیان وابو کە ئەوانە کۆمەڵێک گەنجی زۆر باشن، هەتا کاغەزێکی ئیسماعیلی شەریف زادەی بۆمن هێنابو، وا بزانم ئەو نامەیەم هەرماوە.

ئیسماعیلی شەریف زادە، زۆر بە دۆستانەوە لە نامەکەیدا باس ئەکات و ئەڵێ: "پێویستمان بە ئامۆژگاریی سیاسی و هاوکاری ئێوە هەیە"، چەند پرسیارێکی لێکردبوم دەربارەی باری سیاسی دنیا و ناوخۆ و شەڕی پێشمەرگانە، ئەو پرسیارانەی کە ئەو رۆژە گرنگبون، منیش ۳۰ لاپەرەم بۆ نوسی، بەڵام بەداخەوە ئەو نامەیە دوای شەهید کردنی ئیسماعیلی شەریف زادە لە تەرمەکەیدا گیرا و ئێران کردی بە بەڵگەیەک دژ بە من.

هێشتا ئێمە پەیوەندیمان بە تەواویی لەگەڵ ئێران نەپچرابو، مامۆستا ئیبراهیم لە تارانەوە هاتبوەوە بەغدا، عومەر دەبابەیان دیبو، هەرەشەیان لێکردبو و گوتبویان: "نامەی جەلال تاڵەبانی گیراوە، ئەو دەست لە کاروباریی ناوخۆی ئێرانەوە ئەدات، ئێمە راناوەستین و پێتان ئەڵێین: وەڵڵاهی بچێتە باوەشی عەبدولناسریش ئەیکوژین".

کاک عومەریش، خۆی ئاسایی گوتبوی: "ئێمەش ئەگەر شا بچێتەوە ناو سکی دایکیشی ئەیکوژین"، عومەر دەبابەش هەڕەشەکەی ئاوها گەورە کردبوەوە و بوە قڕە لە نێوانیاندا.

# پەیوەندی لەگەڵ کوردستانی ئێران

*** ئەو هاوکاریە سیاسی و پێشمەرگانەی ئێوە لەگەڵ ئەو گروپە چەپانەی کوردستانی ئێراندا، چەندی خایاند و لە چ ئاستێکدا بو؟**

- ئێمە پەیوەندی سیاسیمان هەبو، بەڵام پێشمەرگانە کەمتربو، ئەوەبو کە ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵدا کردن و یارمەتیماندان، نەختێ بوژانەوە، بەڵام بەداخەوە دو شتی خراپ رویدا، شەهیدبونی ئیسماعیلی شەریف زادە و مەلا ئاوارە و تەسلیمکردنەوەی سلێمانی موعینی بوەهۆی دامرکاندنەوەی بزوتنەوەکەیان، بە شەهیدبونی ئەوان، بزوتنەوەکە کۆتاییهات و پەیوەندی ئێمەش لەگەڵیاندا تەواوبو.

مەلا مستەفا، سولێمانی موعینی کوشت و حکومەتی ئێرانیش مەلا ئاوارە و سمایلی شەریف زادەیان کوشت، ئەوانەی کە لەگەڵ ئەوان بون و مابونەوە هەڵهاتن و هەندێکیان هاتنە لای ئێمە و بون بە پێشمەرگە لە بەکرەجۆ، نزیکەی ١٠٠ کەسێک ئەبون، دوایی زیادیانکرد، ئێمە بە تەمابوین بیاننێرینەوە بۆ کوردستانی ئێران، چونکە ژمارەشیان زیادیکرد.

هاتنی دکتۆر جەلال، هۆیەک بو بۆ دروستکردنی پەیوەندی چەپی ئێرانی لەگەڵ ئێمە، ئەوان وەک سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودە، رۆژنامەیەکیان دەرئەکرد بە ناو(تودە) و لەگەڵ خۆی چەند دانەیەکی هێنابو، ئیتر لەوکاتەوە سەرەتای دۆستایەتی نێوانمان دەستی پێکرد.

دکتۆر جەلال گێرایەوە، گوتی: "جەماعەتێک لە ئێمە چونەتە کوبا و تەدریبیان کردوە، حەزئەکەین ئەوان بگەرێنەوە و ئیلتیحاق بکەن بە بزوتنەوەکەی ئێرانەوە"، ئێمەش گوتمان: "بەخێربێن بەسەرچاوان".

کاتێ ئەوان گەیشتن، ئیسماعیلی شەریف زادە و مەلا ئاوارە هەردوکیان شەهید بوبون، بۆیە ئەوان نەیانتوانی وەک پێویست ئیلتحاق بە بزوتنەوەکەوە بکەن، بۆیە ناچاربون لای ئێمە بمێننەوە و ژمارەیان زیاتر لە ٣٠ کەس ئەبو.

بە مانەوەی ئەوان پەیوەندی نێوانمان زیاتر بەرەو پیشەوە رۆیشت، یەکەمجار

گوتیان، پێمان باشە کە تەدریبمان پێبکەن، منیش چاکترین مامۆستای خۆمان (عەریف حەمید) کە بە حەمید رەشاش ناسراوبو، رامسپارد چۆن تەدریبیان پێبکات.

ئێوارە هاتەوە لام بەتەنیا و گوتی: "مامە ئەوانە هەمو شتێک ئەزانن بۆخۆیان تەدریبیانکردوە، ئەوە بۆ خۆشاردنەوەیە"، وەڵا منیش پێمگوتن، "ئەوان هەمو تەدریبەکان ئەزانن"؟ بەپێکەنینەوە گوتیان: "بەڵی ئێمە لە کوبا تدریبمانکردوە".

بەوشێوەیە لای ئێمە مانەوە و بارەگامان لە بەکرەجۆ بۆ دانان و چاپخانەیەکمان دانێ و دەستیانکرد بە چالاکی و پەیوەندی لەگەڵ ئێران، هەرچەندە خەڵکیان لێگیرا و ئیعدامکرا، بێگومان مانەوەیان لەلای ئێمە تەئسیری فیکری هەبو، چونکە ئینسانی زۆر چاکبون، پیاوی روناکبیربون، زۆریان خوێندنی باڵای زانکۆیان تەواوکردبو، زۆر خاکی و میللی بون.

لەگەڵ کۆمەڵێک رۆشنبیری سلێمانی، دۆستایەتیان پەیداکرد، وەک نەوشیروان مستەفا، شازاد سائیب، بەکر حسێن و مەحمودی مەلا عیززەت و هەندێ برادەری تر.

بەوهۆیەوە دۆستایەتی و پەیوەندی لەگەڵ دیوی ئێران گەشەیکرد، هەتا جارێکیان لەبیرمە کە چریک (جاشی شا) لەگەڵ جەماعەتی بارزانی هاتنە سەرمان، لە هەڵەبجە هەندێک لە چریکەکانمان ئەسیرکردن و هێنامانەوە، ئەوان چون بینیانن، ئەوەبو هەندێکیانیان ناسینەوە، خەڵکی کام جێگان لە ئێران؟ دوایی رەسمیان گرتن و بڵاویانکردەوە.

*** بۆچی پەیوەندیتان لەگەڵ گروپە ئۆپۆزیسیۆنەکانی تری ئێرانی پەیدا نەکرد؟**

-بەهۆی ئەوانەوە پەیوەندیمان لەگەڵ (فدراسیونی دانشجویان ایران در خارج کشور)[٣] پەیداکرد، ئەوکاتە فیدراسیون بەشی زۆری سازمانی ئینقیلابی بون، بەڵام جگە لەوان خەڵکی تریشی تێدابو، وەک جەماعەتی بەرەی میللی و هەندێ کەسی ناسراوی تر، یەکێکیان پێناساندین بەناوی (حەسەنی ماسالی) ئیستاش دۆستمانە و کابرایەکە لە ئەڵمانیا ئەژی، وابزانم دوایی گروپێکی لەئێران دروستکرد و بۆ پەرلەمان خۆی هەڵبژارد، دەرچو، بەڵام قبوڵیان نەکرد.

ئەووەختە ئەو لێپرسراوی بەرەی میللی بو لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەهۆی یارمەتی ئێمەوە هاتە عێراق و دوایی چو بۆ لوبنان و ئینجا بۆلای فەلەستینیەکان.

لە پاشاندا کۆمەڵێک هاتن پێیان ئەگوتن (گروپی فەلەستین) گروپی فەلەستین ئەوانەبون، ئەیانویست بچن بۆ فەلەستین، لە ئێرانەوە هاتبون کە بێن بۆلای ئێمە

و لەلای ئێمەوە بیانئێرین بۆ قەڵەستین، ئەوەبو لە ڕێگا گیران و هەندێکیمان ڕزگارکردن و هەندێکیان بێ سەروشوێن بون.

ئەوەی ڕاستی بێت، ئەوکاتە ئێمە وامان ناو دەرکردبو کە هێزێکی چەپرەوی دژی شاین لەبەرئەوە زوربەی هێزی دژ بە شا ڕوی ئەکردە ئێمە.

*** ئەو کاتە شا ئیمام خومەینی دەرکردبو، ئەویش لە نەجەف نیشتەجێ بو، ئایا پەیوەندیتان لەگەڵیدا هەبو؟**

- ئەوکاتە پەیوەندیمان نەبو، ئێرانیەکان هاتن و باسی ئایەتوڵڵا خومەینیان بۆ ئەکردین، ئەوکاتە ئایاتوڵڵا خومەینی لە نەجەف بو، ئێمە شتێکی ئەوتۆمان لەسەر نەدەزانی، تا سازمانی ئینقیلابی و حەسەنی ماسالی هاتن و پێیان ڕاگەیاندین کە خومەینی ڕۆحانییەکی وا گەورە و بەرێز و ئینقیلابیە و زۆریان مەدحکرد.

ئەوان هەواڵی ئەوانیان لە ڕۆژنامەی خۆیاندا بڵاوئەکردەوە، من زۆر چاکم لەبیرە بەهۆی حەسەنی ماسالییەوە، پەیوەندیمانکرد بە سەید مستەفای کوری خومەینیەوە کە لەوێ شەهیدکرا،[٤] جارێکیش سەید مستەفا هات بۆ بەغدا و لەوێ بینیم و قسەمانکرد و وەعدم پێدا کە ئێمە ئامادەین بۆ هاوکاریکردنیان، ئەگەر خەڵکیان دەوێ تەدریبیان پێ دەکەین، یان بۆیان بنێرینەوە بۆ دیوی ئێران، ئەوە سەرەتابو بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئیمام خومەینیدا.

ئەوکاتە لەعومانیش بزوتنەوەیەک هەبو، لەگەڵ ئەوانیش پەیوەندیمان پەیداکرد، لە عومان حیزبێک پەیدابو بەناوی (حزب العمال اليمني) ئەوانیش ٢٠ -٣٠ کەسیان هاتن بۆلامان و تەدریبمان پێکردن و چەکمان دانێ کە بڕۆنەوە لە جەبەل ئەخزەر شۆڕش هەڵگیرسێنن و هاوکاری جەماعەتی زەفاریکەن.

دوایی دکتۆر کورشی لاشایی چوە لای ئەوان، وەک کرێکارێکی ئێرانی کاری ئەکرد، چونکە ئەوان عادەتێکیان هەبو ئەچون خۆیان ئەکرد بە کرێکار و کاریان ئەکرد، ئەوە بو دوایی لاشائی گیرا و لە زیندان ڕوخاو و خیانەتی کرد، چوەسەر تەلەفزیۆنی ئێرانی. ئەم گروپە کاریگەری فیکری زۆریان لەسەر ئێمە هەبو، دەربارەی بڵاوکردنەوەی بیروباوەری ماوتسیتۆنگ، چەند وتارێکیان لە گۆڤاری ڕزگاریدا بڵاوکردەوە، زوربەی وتارەکان دکتۆر ئیبراهیم ئەینوسی، ناوە ڕاستیەکەی (دکتۆر عەلی سادقی) یە، بنەماڵەکەی بە ڕەگەز کوردی خۆراسانن، ئەوانە کۆمەڵێک برای تێگەیشتوبون، وەختی خۆی هەمویان لە دەرەوە خوێندبویان و

برایەکی دکتۆرێکی ناوداری دڵە و خۆشی دکتۆری فیزیکی ئەتۆمی بو.
دکتۆر ئیبراهیم وتارەکانی بە فارسی ئەنوسی و نەوشیروان مستەفا تەرجەمەی ئەکرد بۆ کوردی و لە گۆڤاری رزگاری بڵاودەبۆوە، چەند وتارێکی تێدانوسی، واتا گۆڤاری رزگاری ئەو سەردەمە، تاکە گۆڤار بو لە عێراقدا، بە ئاشکرا بۆچونی چەپی تێدا بڵاوئەکرایەوە.
وەختی خۆی من و نەوشیروان پێکەوە چوین بۆ لای عەبدوڵلا سەلوم ئەلسامرائی، بۆئەوەی رێگامان بدات، گۆڤارێک دەربکەین، بەڵام رەقابە هەبو، نەوشیروانیش گوتی: "وەڵڵا رەقابەی لەسەربێ من نایکەم"! عەبدوڵلا سەلومیش گوتی: "برۆ قەیناکە خۆت وەکیل بە، رەقابەمان ناوێت"، شازاد سائیبیش بو بە سەرنوسەری گۆڤارەکە کە بە (رزگاری) ناوی دەرکرد.(٥)
ئەو گروپە دەوریان هەبو لە دروستکردنی پەیوەندی ئێمە و چین و هەوڵیاندا کە ئەو پەیوەندییە قوڵ و توندبێت. پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئەوان ئەوەندە باشبو، زۆرجار ئازاد هەورامی تەعیلقێکی هەبو ئەیگوت: "من گەیشتومەتە ئەو قەناعەتەی کە مام جەلال بچێتە قوتبی شیمالیش، برادەرانی سازمانی ئینقیلابی، ئەچن و دو چادری بەرامبەر هەڵ ئەدەن و لەگەڵیدا ئەمێننەوە".
دوای شۆڕشی ئێرانیش، بەینمان زۆرباشبو، لە ساڵەکانی حەفتادا، من لە بیروت بوم زۆر هەوڵم بۆدان و بە فەلەستینییەکانم ناساندن، لەلای دکتۆر جۆرج حەبەش و نایف حەواتمە و هەمو هێزەکانی لوبنان و لە پاشاندا بە لیبیەکانیشم ناساندن.
من زوربەی هێزی بەربەرەکانی ئێرانیم بە لیبیەکان ناساند، هەتا حەسەنی ماسالی کە بەناوی بەرەی میللییەوە کاری ئەکرد، من بردم بۆ لیبیا.
هەروەها موجاهدینی خەلقیشم بە لیبیەکان ناساند، بەڵام ئەوەبو موجاهدین بون بە دوبەشەوە، بەشە مارکسیەکە گروپی (پەیکار)یان دروستکرد، هەروەها من زاواکەی ئیمام خومەینی (ئایاتوڵا ئیشراقی)یشم بە لیبیەکان ناساند.
هەتا جارێکیش لە لیبیا دایەنەوە بەچاوی محەمەدی مونتەزریدا، گوتیان ئێوە جەماعەتێکی بێوەفان لەگەڵ یەکێتی نیشتمانیدا، هەمو ئەو یارمەتیانەی کە لە ئێمەتان وەرگرتوە، هەموی بەهۆی ئەم زاتەوەبوە، دەستیان بۆ من ڕاکێشا کە لەوێ دانیشتبوم، گوتیان: "ئەو مام جەلالە هاتە لای ئێمە و باسی ئێوەیکرد و گوتی ئایاتوڵای خومەینی زاتێکی گەورەیە و ئێوەی بە ئێمە ناساند، کەچی ئێوەش ئێستا وا مامەڵەی لەگەڵدا ئەکەن".

هێزی ئۆپۆزسیونی ئێرانی بەو شێوەیە پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە باش بو، تا شۆڕشی ئێران رویدا، کە شۆڕشی ئێران هەڵگیرسا، جەماعەتی سازمانی ئینقیلابی بون بە حیزبی رەنجبەران و نێوانمان هەر باشمابۆوە، هەروەها لەگەڵ (چریکهای فیدائیی خەلق) کە (ئەشرەفی دیهقانی) لێپرسراویان بو، پەیوەندیمان باشبو تا جیابونەوەیان.

حمادی شیبانی، نوێنەری چریکەکان بو لە دەرەوە، ئەو لە ماڵی ئێمە وەکو کوری ماڵیی لێهاتبو، دوایش یەکێک بو لە تێکۆشەرەکان، تا پێش چەند ساڵێک لەگەڵ جەماعەتی فیدایی ئەقەلییەت مابۆوە، تاکو ئێستاش هەر دۆستمانە و پەیوەندیمان بەردەوامە، تا پێش راپەرینیش، کە لە یاخسەمەر مابوینەوە ئەوانیشمان لەگەڵدابون.

* ئەی پەیوەندیتان لەگەڵ موجاهیدینی خەڵق چۆن بو؟

– مجاهیدین کە بون بە دو بەشەوە، راستیەکەی ئێمە پشتیوانی لایەنە مارکسیەکەمان کرد، راستیەکت پێ بڵیم، ئەویش لایەنە مارکسیەکەی، بون بە (پەیکار) بەینمان لەگەڵیاندا زۆرباشبو، هەتا کە لێدران و تەفروتونا بون. ئەوان دوای چریکی فیدائی و موجاهیدین بە هێزترین گروپ بون، بۆ نمونە یەک کرێکاریی نەناسراویی سەر بەوان لە تاران خۆی هەڵبژارد، ئەو کابرا نەناسراوە توانی ٨٨ هەزار دەنگ بهێنێت، دیارە جگە لە خۆیان کەس دەنگی بۆ نەدا، ئەوە نیشانەی هێزی ئەوان بو، بەڵام دوایی تێکشکان، هەندێکیان گیران و هەندێ ئیعترافیان کرد و هەندێکیشیان کوژران.

ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ لایەنەکەی تردا نەبو، چونکە ئێمە پشتیوانی ئەوانمان کردبو لایەکەی تر ساردبون لەگەڵماندا، دوای ئینقیلابی ئێرانیش، ئێمە لەگەڵ موجاهدین پەیوەندیمان کزبوبو.

## پەراوێزەکان:

١- ئەحمەد تۆفیق، کە ناوە راستیەکەی سەید عەبدوڵلای ئیسحاقی، کوڕی سەید حەمە ئەمینی قەسابە، لە مهاباد لە ١٩٣١ دایکبوە، خانەوادەیەکی ناسراوی تێکۆشەر بون، لە سەرەتای لاوێتیەوە، چۆتە ناو کاری سیاسیەوە و بوە بە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، لە ١٩٥٩ دا پەنای هێناوە بۆ کوردستانی عێراق. لە حیزبی دیموکراتدا، دو باڵ هەبون، ئەم سەکردایەتی باڵی راستیکردوە و پەرەی سەندوە. بارزانی و کۆمەڵێك سەرۆك خێڵ پاڵپشتی ئەحمەد تۆفیقیان کرد و وەك سکرتێری حیزب ناوی دەرکرد و قاسملۆش کێشەی لەگەڵ بەغدا هەبو، ناچار عێراقی بەجێهێشت و بەرەو چیکۆسلۆڤاکیا رۆیشت. دوای ماوەیەك روداوەکان هەڵگەرانەوە و ئەحمەد تۆفیق، کوردستانی بەجێهێشت و چوە بەغدا و قاسملۆ هاتەوە کوردستان و بوە سەرکردەی ناسراوی حیزبی دیموکرات، رژێمی بەعس ئەحمەد تۆفیقیان زیندانی کرد، بە تۆمەتی پەیوەندی لەگەڵ ئێران و دوای ئەشکەنجەی زۆر لە زیندانی ئەبو غرێب بێ سەروشوێن کرا.

٢- سلێمانی موعینی لە ١٩٣٥ لە مەهاباد لە دایکبوە و باوکی وەزیری ناوخۆی کۆماری مهاباد بوە، لە ١٩٥٢ دا چوەتە تاران بۆ خوێندن و خەباتی خوێندکارانەی کردوە، و دوای ٣ ساڵ بەندکراوە و لە ١٩٥٩ دا هاتۆتە کوردستانی عێراق و پاش ماوەیەك گەراوەتەوە زێدی خۆی. لە هاتنێکیدا بۆ کوردستانی عێراق، لە ١٩٦٨ دا لەلایەن قالە تەگەرانیەوە دەگیرێت و ڕادەستی پارتی دیموکراتی کوردستان دەکرێت و ئەوانیش بە کوژراوی تەسلیمی ئێرانی دەکەن و ئێرانیش تەرمەکەی بە شارەکانی کوردستاندا بۆ چاوترسی دەگێرێت.

- سلێمانی شەریف زادە، لە ١٩٤٢ دا لە خێزانێکی بازرگان لە دایکبوە، خوێندنی لە مەهاباد و تاران تەواوکردوە، هەر لەوکاتەوە دەستیکردوە بەکاری سیاسی لە نێوان خوێندکارە چەپەکاندا. لە ١٩٦٤ لەگەڵ چەند هاورێیەکی، دێنە کوردستانی عێراق و دوای ٣ ساڵ دەگەرێنەوە بۆ خەباتی سیاسی بۆ کوردستانی ئێران و تا لە ١٢ مانگی بانەمەری (مایسی) ١٩٦٨. کابرایەکی جاش خەبەری لێدەدا و شوێنەکەی ئەدۆزنەوە و خۆی و چوار هەڤاڵی دەکەونە شەرەوە بەرامبەر بە هێزێکی زیاتر لە ٥٠٠ ژەندرمە، لە کۆتاییدا هەر هەمویان شەهید دەکرێن.

- مەلا ئاوارە، ناوی مەلا ئەحمەدی شەڵماشی بو، کوڕی مەلا ئەحمەدەمینی هەمەوەند و لە گوندی شەلماشی ناوچەی سەردەشت لە ١٩٣٤ لە دایکبوە، لە مزگەوتەکانی کوردستان گەڕاوە و خوێندویەتی، هەر لە گوندەکان هەوڵی داوە خەڵك وریا بکاتەوە و هانیانبدات بۆ مەیدانی خەبات و تێکۆشان. لە ١٩٦٦دا

لەگەڵ هاورێکانی تری حیزبی دیموکرات گەڕاوەتەوە بۆ کوردستانی ئێران و دەستی کردوە بە خەبات تا بە فێڵ لە گوندی دیوالاند دەستگیر دەکرێت و لە ١٩٦٨/٥/١٠ لەگەڵ دوو هاورێی تری لە شاری سەردەشت ئیعدام دەکرێن. (کاروانێك لە شەهیدانی کوردستانی ئێران، کەریم حیسامی ١٩٧١)، بنکەی پێشەوا.

٣- چەتری رێکخراوە چەپ و دیموکراتەکانی خوێندکارانی ئێرانی دژی شا بون لە دەرەوە.

٤- مستەفای خومەینی لە شاری قوم لە ئێران لە ١٩٣٠ دا لە دایك بو، ساواك لە نەجەف، لە ١٩٧٧/١٠/٢٣ دەرمان خواردی کرد.

٥- گۆڤاری رزگاری، یەکەم ژمارەی لە٢٠/١٩٦٩/٤ دەرکرا، ١٥ ژمارەی لێدەرچو، ئاخر ژمارەی لە ١٩٧٠/٣/٢٧ بو.

# ژیانی ناو فەلەستینیەکان

*** لە هاوینی ١٩٧٢ چویتە دەرەوە و پاشان لە لوبنان و سوریا و لەناو جەوی عەرەبی و فەلەستینیدا ژیایت، لەگەڵ فەلەستینیەکان بەگشتی و بەرەی میللی فەلەستینی بە تایبەتی کارت ئەکرد، تا هەڵگیرسانی شۆڕش، چیتکرد و چی فێربویت لەو ماوەیەدا؟**

- بەڵێ، ئەوەی راستی بێ، تۆ هەندێ مەسەلەت تێکەڵ و پێکەڵکرد لە پرسیارەکەتدا، جارێ پەیوەندی من لەگەڵ (جەبهەی شەعبی) ئەگەڕێتەوە بۆ سالانی دامەزراندنیان، واتا بۆ ساڵی ١٩٦٧، ئەوکاتە جەبهەی شەعبی دابەش نەبوبو بە جبهەی شەعبی، جەبهەی دیموکراتی و بە جەبهەی شەعبی قیادەی عامە، ئەحمد جبریلیلیشیان لەگەڵدابو. من پەیوەندیم لەگەڵ هەمویان باشبو کە دابەشیش بون، پەیوەندیم لەگەڵ هەرسێکیان بە باشی مایەوە، هەم لەگەڵ دوکتۆر جۆرج، هەم لەگەڵ نایف حەواتمە و هەم لەگەڵ ئەحمەد جبریل.

من زنجیرەیەک وتارم لە گۆڤاری (الهدف)ی جەبهەی شەعبی بڵاوکردەوە، ئەوە پێش ئەوەی بچمە لوبنان، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەی، ئێمە لە حەفتاکاندا دەورەیەکمان بۆ کادیرەکانی خۆمان لە بەغدا کردوە، کۆمەڵێک برادەر لەو دەورەیەدا بەشداربون، لەوانە فەرەیدون عەبدولقادر، فازیلی مەلا مەحمود، شەهابی شێخ نوری و جەعفەر عەبدولواحید و کۆمەڵێکی تریش، نزیکی سی، چل کەسێ ئەبون. ئەو زنجیرە موحازەرەیەی کە لەوێ دابوم، لە دواییدا کۆمکردەوە و بەناوی (بەرەی نیشتمانی) لەسەر (قۆناغی خەباتی رزگاریخوازی نیشتمانی) بو، دەربارەی ئەوەی کە ئەو قۆناغە چیە و پیویستییەکانی ئەو قۆناغە و دەوری چینەکانی کۆمەڵ لەو قۆناغەدا چین؟

ئەو وتارانە، لە نامەیلکەیەکدا کۆکرایەوە و چاپمانکرد و جەبهەی شەعبی بە چوارده وتار لە گۆڤاری هەدەفدا بڵاویکردەوە، ئەوکاتە غەسان کەنەفانی سەرنوسەر بو، ئەو وتارانەی زۆر بەدڵ بو.

ئەو دەورەیە بەهاوکاری سەفارەتی چین کرایەوە، ئەوان دەعوەتێکیان بۆ

کردین بۆ ئەو دەورەیە لە بەغدا، سەفیری چین خۆی قسەی کرد و خۆشحاڵی نیشاندا کە ئەو دەورەیە کراوەتەوە، باسی دەورەکەی کرد و نیشانەی بە من و دۆستایەتی من لەگەڵ چیندا و ئەو وەختە نێوانمان خۆشبو.

دوای ئەوە لە مایسی ١٩٧٢ دا هاتمە بەغدا و ئیجازەم لە بارزانی وەرگرت و لەگەڵ هێرۆ هاتمە دەرەوە، کە هاتمە دەرەوە راستییەکەی بڕیارم دابو نەگەڕێمەوە، چونکە دو ساڵ بەسەر ڕێککەوتنی ئێمە و مەلا مستەفادا تێپەڕیبو، ئێمە لای ئەو بوین، بەڵام هیچ کارێکی نەداینێ. هەروەها من نەترسام، چونکە کۆمەڵە بوم، نەوەک یەکێ ئیعترافم لەسەربکات و ئەوان ملمان بپەڕێنن.

لە لایەکی تریشەوە، هیچ سودێکم لە مانەوەی خۆم لەوێ نەدەبینی، لەبەرئەوە من هاتمە فەرەنسا و لە شاری لیۆن چومە قوتابخانەی زمانی فەرەنسی و دو مانگم تەواو نەکردبو، ئەو برادەرانەی سازمانی ئینقیلابی نامەیەکیان بۆ نوسیم و گوتیان: "کۆرشی لاشائی گیراوە لە تاران ئەترسێین ئیعدام بکرێت، لەبەرئەوە تکایە بگەڕێرەوە رۆژهەڵاتی ناوەراست، بەڵکو حەملەیەکی چالاکی دژی گرتنی دەست پێبکەین".

من پێشتر حەملەیەکم کردبو بۆ رزگاری زیندانی سیاسی لە ئێران و کۆمەڵێک کەسایەتی وەک کەمال جونبوڵاتم بۆ ئەو حەملەیە راکێشابو.

منیش لەسەر قسەی ئەوان هەستام خوێندنی زمانی فەرەنسیم بەجێهێشت و چومە شام، ئەو کاتە کۆتایی ساڵی ١٩٧٢ بو، من لە شام لە ساواکی ئێرانی و موخابەراتی عێراقی سڵم ئەکردەوە.

بەهۆی دۆستایەتیی کۆنمانەوە پەیوەندیم توندترکرد لەگەڵ جەبهەی شەعبی فەلەستینی، ئەو سەردەمە فەلەستینییەکان مافی چەک هەڵگرتنیان لە دەرەوەی موخەیەمات نەبو، تەنها هەندێک لە ئەفسەر و لێپرسراوەکانیان نەبێت، بۆیە منیش کرام بەیەکێک لەو ئەفسەرانەی جەبهەی شەعبی، بۆ ئەوەی مافی ئەوەم هەبێت، بتوانم بە رەسمی دەمانچە و کلاشنکۆفیش لەناو ئوتۆمۆبێلدا هەڵگرم.

ئەوماوەیە لەگەڵ جەبهەی شەعبی بوم و لە دوسێ بەشدا کارم ئەکرد، هەم دکتۆر (ودیع حداد) هاورێی نزیکم بو، هەم (هانی هندی) کە پیاوێکی زۆر چاک و نەبیلە و ئێستاش هەر دۆستمە و پێکەوە هەم لە بەشی عەسکەری و لە پاشاندا لە رۆژنامەدا کارمان ئەکرد.

دو روداوی سەرنج راکێش دەربارەی گۆڤاری هەدەف هەیە، بۆت ئەگێرمەوە، یەکێکیان شایەتم زۆرە و یەکێکیان شایەتم کەمە، یەکێکیان زۆر کەس ئەیزانن

لەوانە دوکتۆر جۆرج حەبەشە کە من بە غەسان کەنەفانیم گوت: "تۆ ئەکوژرێیت، ئێوە هێشتا فێری خەباتی نهێنی و خەباتی چەکدار و خەباتی دژی ئیسرائیل نەبون"، بۆ نمونە لەو مەسەلانەی، رەخنەم لێگرتبون، کردنەوەی ئەو نامانەبو کە بۆیان ئەهات، ئاخر چۆن ئەبێ ئێوە خۆتان کاغەز بکەنەوە!.

جەبهەی شەعبی باڵەخانەیەکی هەبو، پێشنیازمکرد، لە خوارێ با برادەرێک جهازێک دانێت بۆ پشکنینی نامە، دوای پشکنین، با ئەو برادەرە بیکاتەوە و بیهێنێت بۆتان. چونکە کە دوژمن زانی پشکنینی نامە هەیە، ئەوکاتە هەوڵی تەقینەوە نادات، بەڵام کەزانی غەسان کەنەفانی، یا بەسام ئەبو شەریف کە جێگری بو، ئەوان خۆیان نامە ئەکەنەوە، ئەوا بێگومان هەوڵی کوشتنتان ئەدەن. لە پاشان گوتم: "غەسان، تۆ جێگای ماڵەکەت خراپە، خۆشت ئوتومبیل لێدەخوڕیت، ئەوەش خراپە، بە تەحدید گوتم ئوتۆمبیلەکەت بۆ تەلغیم ئەکەن، تۆ ئەبێ بزانیت ئیسرائیل لە لوبنان ئەتوانێت زۆرکار بکات".

گوتم: "پێشنیاز ئەکەم، سایەقێکت بۆ بگرن، با ئوتومبێلەکە لای تۆ نەبێ، ماڵی تۆ لە باڵەخانەدایە، شەوێک دێن و ئوتومبیلەکەت لەناو خانوەکە بۆ تەلغیم ئەکەن"، گەڕەکەکەشیان، شوێنێکی شەعبی بو، گوتم: "با یەکێک لە سایەقەکانی جەبهەی شەعبی ئوتومبیلەکەت لێ بخورێت و بەیانیان بیهێنێتەوە بۆت و تا ئێوارە کە ئەگەرێتەوە ماڵەوە لەگەڵتابێت".

هەندێک لەوانە پێیان وابو ئەم کارانە سیمای بورجوازیە، تا غەسان کەنەفانی شەهید بو جارێکی تر لە کۆبونەوەدا باسمکردەوە، بەسام ئەبوشەریف دوایی ئیعترافی ئەکرد کە من ئاگادارم کردونەتەوە، بەو مناسەبەتەوە ئەوەت بۆ باسبکەم کە لەسەرچیبو، بە بەسام ئەبوشەریفم گوت، ئەوە غەسان رۆیی و نۆرەی تۆیە، لەبەرئەوە تکایە نامە مەکەرەوە، گوتی باشە، بەڵام بە قسەی نەکردم هەتا پێیدا تەقییەوە. دوایە کە چاک بوەوە بە جۆرج حەبەشی گوتبو، ئەگەر بە قسەی فلانم بکردایە، وام لێنەدەهات!

# کاری زۆر مەترسیدار

*** ئایا هیچ هاوکارییەکی فەلەستینیەکانت کردوە کە ژیانتی خستبێتە مەترسییەوە؟**

- من دو سێ کارم بۆ ئەکردن، یەکێکیان پڕکردنەوەی ئەو پاسپۆرتە ئێرانیانەی کە هەیان بو، لەبەر ئەوەی ئەوان فارسیان نەئەزانی، هەروەها لە چالاکییەکانی دەرەوەیاندا یەک دو جار بەشداریم کرد، جا ئێستاش بۆت ئەگێرمەوە.

من لە ماڵەکەی (ودیع حداد) بوم لە شاری ئامردار، سەفەرێکی ڤییەنام کرد، کاتێ ویستم بگەرێمەوە، دوکتۆر وریا رەواندزی هات بۆ لام و گوتی: "من تۆم دەعوەت کردوە تۆ هەمو جارێ دێیت وخێرا ئەڕۆیت و هیچ کاتت نیە، بۆیە ئەمجارە نابێت بڕۆیت"، نەوشیروان مستەفاش لەوێ بو، ئەویش گوتی وەڵلا مەڕۆرەوە، بەو جۆرە دو سێ رۆژ دوایان خستم.

ئەو شەوەی کە دامنابو بگەڕێمەوە ئەو شەوە بو کە ئیسرائیلیەکان پەلاماری ماڵەکەی ودیعیاندا و بارەگاکەی ئێمە و ئەو جێیەی کە من لێی ئەنوستم، گرتیان و هەرچیم هەبو، دەمانچە، پارە و کەلوپەلی تایبەتی خۆم، ئیسرائیلیەکان هەمویان تاڵان کرد و بردیان، بە دڵنیاییەوە ئەگەر لەوێ بومایە ئەکوژرام، چونکە هەرچی لەوێ بو کوژرا، واتا سوربونی دکتۆر وریا و نەوشیروان هۆ بون بۆ سەفەر نەکردنم، یاخود بۆ رزگار کردنم.

*** بۆچی لەناو فەلەستینیەکاندا، بە تایبەت لەگەڵ جبهەی شەعبی کارت ئەکرد، ئایا پەیوەندیت لەگەڵ لایەن و حیزبەکانی تردا هەبو؟**

- کارکردنم لەگەڵ جەبهەی شەعبی هۆی ئەوەبو، کە ئەوان زیاتر بەفیکریش لە من نزیکتربون لەوانی تر و شۆڕشگێرتربون، جگە لەوەش ئەوان پەیوەندیان لەگەڵ هێزەکانی شۆڕشگێری رۆژهەڵاتیش زۆرباشبو.

کارە گرنگەکانی کە بەرەو روی من کرابونەوە دوجۆربون، یەکێکیان ئەوەبو کە (باسیل کوبەیسی) تێدا کوژرا، مەسەلەی تێرۆرکردنی باسیل کوبەیسی، ئەوەبو

کە فەلەستینییەکان هاتبون بۆ فراندنی فرۆکەیەکی ئیسرائیلی لە فرۆکەخانەی رۆما.

بۆئەوەی ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنرێ، چوار کەس لە جنیفەوە ئامادەکرابون، من هاوکاریم کردن بۆ مەسەلەی سەفەریان بۆ ئیسپانیا و لە ئیسپانیاوە بۆ لیسابۆن و لەوێشەوە بە شەمەندەفەر بۆ ئیتالیا، ئەوانە پاسپۆرتی ئێرانی تەزویریان پێبو. لە رۆما پەیوەندیان بە برادەرێکمەوە کرد، ناوی (آبو فیدا)، ئەو لەوێ لێپرسراوی عەمەلیەتەکەبو.

وا بریاربو، من هاوکاریان بکەم لە بردنە ناوەوەی چەکەکان بۆ فرۆکەخانە، ئەوەش بەهۆی تەها محیدین معروفەوە، ئەو کاتە سەفیری عێراق بو لە رۆما و حسانەی دبلۆماسی هەبو.

وا بریاردرابو، من بێمەوە پاریس و باسیل کوبەیسی ببینم، ئەو پاسپۆرتەی کە پێم بو بیدرێنم و بچم بۆلای پۆلیس و بڵێم کە من پاسپۆرتم ونکردوە، چۆن پیلانمان دانابو ئاوامکرد. گەیشتمە فەرەنسا پاسپۆرتەکەی خۆمم دڕاند و لەگەڵ ناسیاوێک بە ناوی دکتۆر یوسف سنجاری، چوم بۆلای پۆلیس و گوتم: من پاسپۆرتەکەم ونکردوە، دوایی چومە سەفارەتی عێراقی، بەسودفە سەفیر دۆستێکی کۆنی خۆم بو، ناوی (نعمت نعمة)، سەفیر گوتی: یاخوا بەخێربێیت و داینام و پاسپۆرتێکی نوێیان بۆ دەرهێنام و منیش خستمە گیرفانمەوە.

سەفیر سوربو لەسەرئەوەی، بەیەکەوە نان بخۆین، گوتی وەفدێکی پارێزەرانی عێراقیش هاتون ئەبێت بێیت. ئەوکاتە نوسین لە نێوان رۆژنامەی سەورە و تەئاخی دەستی پێکردبو، ویستیان رەئیم لێوەربگرن، گوتم: وەڵڵاهی هەردوکیان قسەی راستیان تێدایە.

دوای ئەوە، باسیلم لە پاریس دۆزیەوە.

*** باسیل کوبەیسی کێ بو؟**

- دکتۆر باسیل کوبەیسی، یەکێک بو لەسەرکردە کۆنەکانی (حرکة القومیین العرب)، عێراقییە، لە بنەماڵەی کۆبەیسیە، کاتی خۆی لە سەرکردایەتی حەرەکەی قەومی بو، دوایئەوە لەناو ریزەکانی جەبهە شەعبی کاری ئەکرد، دکتۆراکەشی لەسەر (الحرکة القومیین العرب)، لە ئەمەریکا وەرگرتبو.

ئەو لێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوەی جەبهەی شەعبی بو، لە پاریس پێکەوەبوین، یەکەم شەو بەیەکەوە لە یەک ئوتێل بوین، بریار وابو هەر شەوە لە

ئوتێلێک بین و شوێنەکانمان بگۆڕین بۆئەوەی ئەگەر وەسف کراین نەدۆزرێینەوە، شەوی دوەم جێگامان گۆڕی، ئەو چوە ئوتێلێک لەنزیک ئۆپێرا، من چومە ئوتێلێک لەوبەر ئۆپیرا.

رۆژی سێشەممە بەیەکەوەبوین و بریارماندا بۆ سبەینێ کە چوارشەممەبو، هەردوکمان سەفەر بکەین، من برۆم بۆ ڤییەنا و ئەویش بچێ بۆ مەغریب. زاوایەکی هەبو لە مەغریب بەناوی (عەبدول غەنی دەلی) کە سەردەمێک وەزیری کشتوکاڵ بو لە عێراق.

بەیانییەکەی خواحافیزیمان لەیەککرد، من پێمگوت تۆ بە دڵنیاییەوە ئەمرۆ ئەرۆیت؟ گوتی: "بەڵێ بە ئەکیدی ئیمرۆ ئەرۆم و فرۆکەم حیجزکردوە"، گوتم: "باشە ئەگەر نەرۆیشتی"؟ گوتی: "ئەگەری تێدانییە، هەر ئەرۆم"، گوتم: "ئەگەر نەرۆیشتی ئوتێلەکەت بگوازەرەوە وەکو لەسەری رێککەوتوین"، بۆیە چەند جارێک ئاگادارم کردەوە، گوتی: "نا نا بەتەئکید ئەرۆم، تۆ پێش نیوەڕۆ ئەڕۆی و منیش پاش نیوەرۆ سەفەرئەکەم".

من پێش ئەو هاتم بۆ فرۆکەخانە و سەفەری ڤییەنامکرد، رۆژی هەینی بو، لە ماڵی دکتۆر وریا رەواندزی دانیشتبوین، گوێمان لە رادیۆ دەگرت، هەواڵێک لە رادیوی ئێرانەوە خوێنرایەوە، بە ناونیشانی (تیرۆری دکتۆرێکی عێراقی لە پاریس) گوتم: "بەشەرەف ئەوە باسیلە"، گوتیان: "باسیل کێیە"؟ گوتم: "توخوا راوەستن، با گوێ لە هەواڵەکان بگرین"، درێژەی هەواڵەکە باسیکرد، ئەوەبو کە باسیل بو، تومەز چوارشەممە سەفەری نەکردوە و شەوی پێنجشەممە لەسەر هەینی لە هەمان ئوتێل ماوەتەوە و جێگاکەی نەگۆڕیوە. تاکو ئێستا رون نەبۆوە کە بۆچی باسیل سەفەری نەکرد و دواکەوت، دو بۆچون هەبو، یەکێکیان باس لە کابرایەکی عێراقی ئەکرا کە پەیوەندی لەگەڵ سەفارەتی عێراقیدا هەبو، گوایە بەعسی عێراق پەیوەندی پێوەکردوە و ئەو لەدوای ئەوکارەوە بو. یەکێکی تریان، باس لە کچێکی مەغریبی ئەکرا، لەگەڵیا ئیشی ئەکرد، گوایە ئەو کچە جاسوسی ئیسرائیل بێ، ئەو سەفەرەکەی دواخستبێت.

(ناوی یەکێکی دیکە هەبو هێشتا وەختی نەهاتوە ئاشکرای بکەین).

*** لە ئەنجامدا دەرنەکەوت کە کێ کوشتویەتی؟**

- ئیسرائیلیەکان کوشتیان، زانیان کە پیلانی هەیە لە دژی ئەوان، نەیانهێشت کە پیلانەکەی سەربگرێ.

*** واتا ئیسرائیلییەکان ئـاگاداری پیلانەکـەی ڕۆما بون؟ ئایا هیچ هەوڵێک درا بۆ تیرۆرکردنی تۆ؟**

- پیلانەکەی ڕۆمایان زانی، مەزەندە دەکرێت، کچە مەغریبییەکە ئاگاداری کردبن، من لەو پیلانەدا ناوم هاتبو، بۆیە ئیسرائیلییەکان ئەیانویست بمخەنە ژێر چاودێرییەوە و لەگەڵ دەزگای پاراستنی پارتی قسەیان کردبو، یەکێکم بۆ بنێرن، فەقەت دەوری ئەوەبێت بزانێت هاتوچۆی من چۆنە و پاراستن هەوڵ بدات ئوتومبیلێکم بۆ بکرێت.

کوڕێک هەبو ناوی محێدین بو، کاتی خۆی لای خۆم سایەق بو، پاراستن ئەوی بانگکردبو، یەکەمجار کردبویان بە پاراستن و دوایی گوتبویان ئەتنێرین برۆ بۆلای مام جەلال، ببە بە سایەقی ئەو. کە زانیبوی مەسەلەیەک هەیە لە پشت ئەم کارەوە، ئەویش کارەکەی ڕەتکردبۆوە و گوتبوی بەخوا من ناچم.

ئیتر من لە لوبنان کەوتمە ئەوەی کە لەجاران زیاتر ئاگام لەخۆم بێت، حکایەتێکت بۆ بکەم: شەوێک لەگەڵ دکتۆر وەدیع حەداد چوبوینە دەرێ بۆ ناوچەی مەسیحیەکان لەسەر شاخ بۆ ماڵی (جۆرج سالح) لە بەیروتی شەرقی و شەو لەوێ مامەوە.

من شوقەیەکیان لە شارع سەعداد دابومێ، بەیانی زو سایەقەکەی وەدیع حەداد منی گەیاندە ماڵی ئەوان، کە گەیشتمە ئەوێ سەعات نۆ بو، هەرئەوەنەم زانی دەرگا لێیدا کە کردمەوە هانی هندی بو، گوتی: "هاى انت موجود"؟ گوتم ئەوەتام ئەوەنییە (ماصار لك شي)؟ گوتم دەدانیشە ئەوە چ قەماوە؟ دانیشە.

زۆر بە پەرۆشەوە هاتبو، گوتی: ئەمشەو ئەبوایە بکوژرایتایە، گوتم بۆ؟ گوتی: "عێراقییەکان کەمینێکیان بۆ دانابوی لەبەردەمی ماڵەکەتا، ئەگەر شەو بێیتەوە درەنگ بتکوژن، من دوێنی ئێوارە هەتا درەنگ لێت گەڕاوم"، گوتم چۆنت زانی؟ گوتی وەڵلا حاڵ و مەسەلە ئەوەیە، معاونی مولحەقی عەسکەری زابتێکە، بە فیکر و نیتیما لەگەڵ حەرەکەی قەومی عەرەبیی بو، ئاگای لەمەسەلەکە هەبوە، ئەو هاتبو لە مەسەلەکە ئاگادارمان بکاتەوە، بەڵام منی نەبینیبو، بۆیە مەسەلەکەی بە کابرایەکی تر گوتبو، ئێستا ناوەکەیم دێتەوەیاد، یەکێ بو لەوەزیرەکانی (حركه القوميين العرب) لە ئینقیلابی ١٩٦٣دا بەشداربو، پیاوێکی زۆر چاکبو، مەسیحییە و بەوی گوتبو، ئەویش هات بەمنی گوت و منیش لێت گەڕابوم، چەندجار هاتم بۆ ئێرە و تۆم نەبینی،: "وەڵا وامزانی کە کوژراوی، سبەێنێش زو هاتوم لەدەرگای

ماڵی تۆم داوە نەتکردەوە".

گوتی: "بریار بو سەعات تۆ خەبەری پۆلیس بدەم، ئایا لە ژورەوە کوژراوی یان شتێکت لێهاتوە"؟ گوتم: "نەوەڵا ئەمشەو لەگەڵ وەدیع بوم لەماڵەکەی خۆم نەبوم".

کە دانیشتین و باسی وەزعەکەمان لەگەڵ دکتۆر جۆرج و وەدیع و ئەوانکرد، گوتیان: "بە حەقیقەت تۆ ئیستا کەوتویتەتە مەترسیەوە، لەسەرێکەوە ئیسرائیلیەکان و لەسەرێکەوە عێراقییەکان بەدواتەوەن، ئەوە حەتمەن ئەتکوژن، لەبەرئەوە برۆ ئێرە بەجێ بهێڵە"، منیش گوتم: "باشە، بەڵام بۆ کوێ بچم"؟.

لەبەینی ئەوەی بچم بۆ سوریا یان بۆ میسر؟ چوم بۆ میسر، لەبەرئەوەی میسر شوێنێکی ئەمین بو، عێراقییەکان موئامەرەیەکیان کردبو، ئاشکرا بوبون و گیرابون، دوای ئەوە وەعدی تەواویان دابو بە سادات، جارێکی تر لە میسر شتی وا ناکەن.

ئەوە بەهاری ۱۹۷۳ بو، من پێشتر لە شوباتدا لە بەیروت بوم، شەهابی شێخ نوریش هاتبو، دومانگێک پێکەوەبوین، دوایی شەهابمان لە رێگەی سوریاوە بە پاسپۆرتی ساختەوە ناردەوە بۆ کوردستان، بۆئەوەی بگەڕێتەوە و خۆی ئاشکرا نەکات و بە نهێنی کاربکات.

من شەهابم بردە شام و ئیشەکانیم بۆ جێبەجێکرد و خۆم چومە قاهیرە، من لە بەیروت بوم کە باڤڵی کوڕم لەدایکبو، کە چومە قاهیرە، هەندێ دۆستی جەماعەتی عەبدولناسر مابون لە وەزارەتی کاروباریی عەرەبی کاریان ئەکرد. لە مەکتەبی سەرۆک کۆمار گەنجێکی لێبو بەناوی (عبدالحمید المازني) کوڕی عەبدولقادر مازنی نوسەری مەشهوربو، یەکێکی دیکەشی لێبو بەناوی (حەسەن رەفعەت)، کە ئەویش کاتی خۆی وەزیربو، ئەوانم دیت و بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم و گوتیان: "ئەبێت ئێمە ئاگاداری سەرۆک سادات بکەینەوە، کە تۆ هاتویت بۆ ئێرە". دوایی ساداتیان ئاگادارکردەوە و گوتبوی بەسەرچاوان هاتوە، ئێرە ماڵی خۆیەتی و چی ئەوێت بۆی بکەن؟.

شتیکی تریشت پێ بڵێم، دەربارەی هەڵوێستی سادات، دوای روخاندانی شۆرشی کورد لە ئازاری ۱۹۷۵دا، سادات بە دامودەزگاکەی خۆی گوتبو، کە من لە میسر بەخۆشییەوە ئەتوانم بمێنمەوە و هەمو کەسێکیش کە من دەستنیشانی بکەم ئەتوانن وەک پەنابەر وەریبگرن.

کاتێ حەبیب کەریم چو بۆ قاهیرە، وایان پێ گوتبو، ئەویش لای ستەم بو، بەهۆی منەوە وەک پەنابەر وەربگیرێت، ئەوەبو گەڕایەوە بۆ عێراق و تەسلیم بۆوە.

کەچومە قاهیرە، ئاگادارم کردن، من نامەوێت ببم بە پەنابەری سیاسی، چونکە یارمەتیم ناوێت و لە شۆڕشی کوردەوە یارمەتیم هەیە، تەنها ئەوەیە، من حەزم لێیە مافی پەنابەری سیاسیم هەبێت، گوتیان زۆرباشە هەندێ هاوکاریانکردم، بۆ نمونە، ئەگەر ئۆتۆمبێل و شتومەک لە دەرەوە بهێنم، گومرگ نەدەم، خوشک و پورزاکانی هێرۆشم لەگەڵدابون بۆئەوەی بتوانن بچنە قوتابخانە و بە فەرمانی تایبەتی لە سەرۆکایەتی کۆمارییەوە داخلی جامیعە بکرێن، ئەو کارئاسانیانەیان بۆکردین و توانیمان بێ گیروگرفت لەوێ بمێنینەوە.

*** تاکەی لە قاهیرە مایتەوە، ئایا لەو کاتانەدا هیچ پەیوەندیەکت لەگەڵ شۆڕش هەبو؟**

- تا هاوینی ١٩٧٤ لە قاهیرە مامەوە، بەڵام ناویەناو ئەهاتم بۆ بەیروت و شام، لە شام عەبدوئیلا نەسراوی، ئەبو شەوقی و ئەبو عومەری لێبون لە موعارەزەی عێراقی و ئەمبینین، ئەوان لەوێ (تەجەموعی وەتەنی عێراقی) یان دروستکردبو.

لە میسر مامەوە، هەتا رۆژێک کاک عەزیزی شێخ رەزا هات و نامەیەکی مەسعود و ئیدریس بارزانی هێنابو، داوای کارکردنیان لە من ئەکرد، منیش گوتم: بەسەرچاو چی بکەم؟ گوتیان مەکتەبێکمان داناوە بۆ کاروباری عەرەبی لەدەرەوە، لە من و لە دکتۆر فواد، لێپرسراوەکەمان عەزیزی شێخ رەزایە، گوتم: بەسەرچاو و دەستمان بەکارکرد.

دوایی دکتۆر فواد بۆی گێرامەوە کە من لەژێر چاودێرییدا بوم، بەڵام هەر دایاننابوم بۆ ئەوەی، چاودێری بکرێم، لەو ماوەیەدا کاری باشمانکرد، لەوانە بەناوی شۆڕشی کوردەوە پەیوەندیمان لەگەڵ میسرییەکان پەیداکرد.

تا هەرەسهێنانی شۆڕش لە ١٩٧٥دا، من لە مەکتەبی کاروباری عەرەبی لە لوبنان مامەوە و لەوێ گۆڤارێکمان دەرئەکرد، زیاتر من تێدا ئەمنوسی، تەرخانکرابو بۆ هەواڵی شۆڕش، عەزیزی شێخ رەزا هاوکاری چاپی ئەکرد و برادەرانی پارتی زۆر گرنگیان پێنەدا.

*** لەو ماوەیەی کە لە بیروت بون، توانیتان هیچ کارێکی گرنگ ئەنجام بدەن، چ لە روی سیاسیەوە، چ لە روی دیبلۆماسییەوە؟**

- لەو ماوەیەدا، دو کاری گرنگم بە ئەنجامگەیاند کە بەداخەوە برادەرانی پارتی گوێیان نەدایە، یەکێکیان ئەوەبو، کۆنگرەی سەرانی عەرەب بەسترا و سەدام

بەشداری تێداکرد و ئاشتبونەوەیەکی لەگەڵ سادات و مەلیک فەیسەڵ کرد و داوای لە کۆنگرەکەکرد، پشتگیریی بکەن.

پێش ئەو کۆنگرەیە بە ماوەیەک، عەزیزی شێخ رەزا هاتەلام لە قاهیرە و گوتی: بەشکو هەوڵێک بدەی بۆ پەیوەندیکردن، چونکە وەفدێک دێت بۆ قاهیرە، گوتم: بەسەرچاو هەر لە ئوتێلی شیبردەوە تەلەفۆنم کرد بۆ محەمەد حەسەنین هەیکەل، بەڵام دەستم نەکەوت و لەوکاتەدابو، تازە لە ئەهرام لابرابو، چونکە هەیکەل پەیوەندی نێوان من و ساداتی دروستکرد، بەراستی ئەچومە لای هەیکەل و ئەگەر شتێکم هەبوایە بۆ سادات بەوم ئەگوت و ئەویش ئەیگەیاند.

ئەحمەد بەهائەدین (نوسەرێکی میسریە و دۆستی ئەنوەر سادات بو) لە جێگای ئەو دانرابو، ئەحمەد بەهائەدینیشم ئەناسی و دۆستایەتی کۆنمان هەبو و پیاوێکی خۆشیشە. من تەلەفۆنی سکرتیرەکەی هەیکەلم لابو، تومەز هەیکەل سکرتێر و هەمو شتی لەگەڵ خۆی بردوە، منیش تەلەفۆنم کرد و پیاوێک هەڵیگرت، دکتۆر فواد و عەزیزی شیخ رەزاش دانیشتبون، گوتم: من ئەمەوێت لەگەڵ سکرتیرەی مامۆستا بەهائەدین قسەبکەم، گوتی: تۆ کێیت؟ گوتم: جەلال تاڵەبانی، گوتی: "باشە تۆ ئیشت بە سکرتیرەکەیەتی، یان بەخۆیەتی"؟ گوتم: نەوەڵڵا ئیشم بەخۆیەتی، لەوکاتەدا زانیم، کە ئەوە خۆیەتی و بە پێکەنینەوە گوتی: "کابرا من چاوڕێتم و بەشوێنتا دەگەڕێم، وەرە بۆلام ئیشم پێتە"، گوتم: باشە و منیش راستەوخۆ چوم.

کە چوم بۆلای، گوتی: "من ئەمرۆ لەگەڵ سەرۆک بوم، سەرۆک لێی پرسیم ئایا جەلال لێرەماوە"؟ گوتم: بەڵێ لێرەیە، گوتی: نەتدیوە؟ گوتم: نەخێر، گوتی: "باشە بچۆ بۆ لای و پێی بڵێ وەکو جاران چۆن هەیکەل هۆی پەیوەندی بوە، ئێستا تۆ ئەو کارە ئەکەیت، پێی بڵێ عێراق شتێکی وای بەدەستەوەیە، لە کۆنگرەی قیمەی عەرەبی مەسەلەی ئاشتبونەوە لەگەڵ ئێران تەرح بکات، من پێشنیازم ئەوەیە، کەوا وەفدێکی کوردی بێت (احد ابناء البارزانی)ی لە وەفدەکەدابێت"، ئەو وەختە ساڵح یوسفی و محەمەد مەحمود عەبدولرەحمان لای ئەوان سومعەیان باشنەبو، گوتبوی: "با کوڕەکانی و جەلال بێن، من ئەم سێ کەسە لەگەڵ خۆمدا ئەبەمە کۆنگرە، هەرکاتێ، عێراق مەسەلەی ئاشتبونەوەی لەگەڵ شا باسکرد، من وەڵامەکەی وائەدەمەوە و ئەڵێم لەجیاتی ئەوەی ئێمەی عەرەب لەگەڵ شا پێکبێین، بۆچی لەگەڵ برا کوردەکان پێک نایەین، ئەوا برا کوردەکانمان لێرەن و با لەگەل ئەوان پێکبێین"، منیش گوتم: وەڵڵاهی زۆر باشەو زۆر کەیفم هات،

هەروەها گوتی: "پرسیارێکم هەیە، ئایا ئێوە سورن لەسەر مەسەلەی کەرکوک".
گوتم: "ئەتوانین چارەسەرێک بۆ کەرکوک بدۆزینەوە".
هەر لەبەرچاوی خۆم تەلەفۆنی بۆ سادات کرد گوتی: (جلال موجود) حاڵ و مەسەلەکە ئەوەیە، گوتی: "زۆرباشە و لێی دوپات بکەرەوە بۆ مەسەلەی کەرکوک، ئایا ئەوان ئیلحاح ناکەن". گوتم: نا، گوتی: دەپێی بڵێ (انا اضمن لهم) مەبەستی پێکهاتن بۆ لەگەڵ سەدامدا.
گەڕامەوە شوێنی خۆمان و بە عەزیز شێخ ڕەزا و دکتۆر فوادم گوت و ئەوانیش زۆر کەیفیان هات و نامەیەکم بۆ ئیدریس و مەسعود نوسی کە بەشکو حەبیب محەمەد کەریم نەنێرن بۆ قاهیرە، چونکە حەبیب لە ڕێگای ئێرانەوە دێت، ئەوکاتە ئێران و میسر نێوانیان باشنەبو.
کە لە کوردستان نامەکەی منیان خوێندبۆوە، گاڵتەیان پێی هاتبو، عەزیزی شێخ ڕەزا دوای ئاشبەتاڵ بۆی گێرامەوە و گوتی: "پێکهاتنی چی! عەرەبی چی؟ چۆن لەگەڵ عێراق پێکدێین"!.
لەجیاتی نوێنەر بنێرن، کۆمەڵێک نامەیان نوسی، مەلا مستەفا گوتبوی: "ئەو نامانە مەدە بە جەلال، با ئاگاشی لێ نەبێت و نەزانێت، خۆت برۆ لە مەغریب بڵاوییکەرەوە".
نامەکانی مەلا مستەفا ئەنجامی نەبو، کە چوبو بۆ مەغرب لە فرۆکەخانە نەیانهێشتبو داخڵ بێت، بۆیە نامەکان نەگەیشتنە کۆنگرەکە، ئەوەبو کە ئەو فرسەتە گرنگەمان لە کیس چو.
سەرۆکی گەورەترین دەوڵەتی عەرەبی، ئەیویست وەفدی کوردی لەگەڵ خۆی ببات بۆ کۆنگرە، بۆئەوەی چارەسەری کێشەکەی کوردی و عێراقی بکات.

*** ئایا سەرکردایەتی شۆرش، هەوڵی نەدا نوێنەر بنێرێتە لای وڵاتانی عەرەبی بە گشتی و میسر بە تایبەتی، یان بۆلای وڵاتانی تر؟**

- بەڵێ هەوڵیدا، ئەوەبو مەلا مستەفا، حەبیب محەمەد کەریمی نارد بۆلای ئێمە بۆ میسر، میسرییەکان زۆر شادنەبون بە هاتنی حەبیب، منیش پێمگوتن، خۆتان ئەزانن من ئەوەندە قسەم ناروات لای مەلا مستەفا، بەڵام شۆڕش ئەوی ناردوە، گوتیان چی بکەین؟ گوتم: پێم باشە ببینن، وەڵامیان لێگێراینەوە و گوتیان: سەرۆک سادات نایبینێ یەکێکیان دانا لە (ئیتحادی ئیشتراکی)، هەر ئەو عەبدولحەمید مازنییە کە باسم کرد، ئەویش هات لە ماڵی ئێمە بینی، ئینجا ئەوە

حکایەتی (مستر قۆندەرە) لەوێ رویدا، دوایی بۆت ئەگێرمەوە.

حەبیب ئەمری پێکرابو کە چینیەکانیش ببینێ لە داخی سوڤیەتییەکان، چونکە سوڤیەتییەکان هاوکاریان نەئەکرد، منیش لەگەڵ سەفارەتی چین بەینم هەبو لەوێ ناوبەناو دەعوەت ئەکرام. لەوێ کورێکی زۆر بە ئەدەبم ئەناسی ناوی میستەر شو بو، جا چینی زۆر بەئەدەبن، رۆژێک تەلەفونم بۆکرد و گوتم مستر شو ئیشت هەیە؟ گوتی: نا گوتم: دێین بۆ لات، گوتی: فەرمون، منیش چوم بۆلای زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و گوتم: "ئەوە حەبیب محەمەد کەریم لێرەیە، کە سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانە و مەلا مستەفا ناردویەتی ئەیەوێت بتانبینێت".

گوتی: "ئێمە ئەوانە نابینین! ئەوانە نۆکەری ئیستعمارن، رۆژێک لەگەڵ سۆسیال ئیمپریالیزمن و رۆژێک لەگەڵ ئەمەریکای ئیمپریالیزمن، هێزی سیاسی چۆن وائەبێت"؟

گوتم: "لەسەرخۆ لەسەرخۆ"! بەراستی تورە بوم، گوتم: "بی کوایت پلیس، ئەم قرە قرەی بۆ چییە! بلّی نایبینم"، گوتی: "نا خۆتۆ ئەزانی من لەگەڵ تۆ چۆنم"، گوتم: "نا، هیچی پێناوێت" چاکەشم نەخوارد و هەستام و رۆشتم، گوتم: باشە مەیبینە، بەڵام بۆ وابەتورەییەوە!.

ئێمە بەهۆی سەفیری ئەلبانیاوە لە قاهیرە میستەر شوزمان ناسی، ئەو پێی گوتم: ناوەکەم لە بیرتان ناچێتەوە، چونکە ناوەکەم (شوز)، واتا قۆنەرەیە بە ئینگلیزی، بۆیە لای ئێمە بە (میستەر قۆنەرە) ناوی دەرکرد کە هاتمە دەرێ زۆر عاجز بوم، بە حەبیبم گوت، ئامادەنییە تۆ ببینێ، گوتی های زەمانە ! هەتا (مستەر قۆندەرە)ش نایەوێت بمانبینێ!!

*** باشە، بەدەر لەم هەوڵانە، هەوڵی تری عەرەبی، یان نێودەوڵەتی هەبو بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد؟**

- جاریکی تریش فرسەتێکی مێژویی هاتەپێشەوە، ئەویشمان لە دەستچو، ئەوەش ئەوەبو، من لە لیبیا بوم، لە کانونی دووەمی ١٩٧٥دا لەوێ کۆنگرەی لاوانی ناسری هەبو، منیش دەعوەت کرابوم و دوکەسیشم لە ئێرانییەکان، حەسەنی ماسالی و حیکمەت پورکی، کە کورێکی باشبو، دوایی شەهیدکرا، لەگەڵ خۆم بردن بۆئەوێ.

لە کۆنگرەکە، قەزافیم بینی، زۆر پیاوێکی سادەبو، بۆخۆی بەسەر وەفدەکاندا

ئەگەرا، من راوەستابوم، هات بۆلام و سڵاوی لێکردین و گوتی: ئەوە لێرەیت؟ گوتم بەڵێ، گوتی دیارنیت، منیش گوتم ئێوە مەشغوڵی کۆنگرەن، بەتەمام دوایی بتانبینم، پرسی چی هەیە و چی نیە و گوتم: دو گەنجی ئێرانی رێکوپێکهاتون، گوتی دەبا بیانبینم، منیش ئەوانم برد بۆلای و بوم بە موتەرجمیان و دەستیانکرد بە قسە و داخوازیان پێشکەشکرد، قەزافیش وەرەقەیەکی ئیمزاکرد و گوتی: "داخوازیەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن".

قەزافی بانگی کردم و گوتی: "جەلال هەواڵێکی خراپم پێیە بۆ تۆ، وەزیری دەرەوەی عێراق سەعدون حەمادی و وەزیری دەرەوی ئێرانی خەلعەت بەری لە ئەستەنبوڵ یەکتر ئەبینن، پێکهاتنیان زۆر نزیکە".

قەزافی زۆر رەئی باشنەبو لەسەر مەلا مستەفا، ئەیگوت: "من عەقڵم نایبڕێ کە وێنەکەی بە خەنجەرێکەوە ئەبینم لە پیاوی ئەم عەسرە ناچێ، ئەو ئەگەر لە چەرخی نۆزدەمدا بهاتایە دنیاوە، ئەوا زۆر باشبو".

# ڕێککەوتننامەی جەزایری ١٩٧٥

# ڕێککەوتنامەی ١٩٧٥ لە جەزایر

*** واتا ئێوە ئاگاداری کەینوبەینی ڕێککەوتنامەی جەزایر بون، باشە هۆی چی بو کە بارزانی پێش هەرەس، داوای هاوکاری تری لە دەرەوە نەکرد لە جیاتی هاوکاری ئێران و ئەمەریکا؟**

– بەڵێ، وەک باسمکرد ئاگاداربوین، قەزافی خۆی پرسیاریکرد و گوتی: "چیتان بەسەردێت ئەگەر عێراق و ئێران ڕێکبکەون"؟ منیش گوتم: "شەڕ ئەکەین و بەرگریی ئەکەین"، گوتی: "تۆ دڵنیایت"؟ گوتم: "زۆر دڵنیام، بەڵام ڕەنگە ئەوکاتە زۆر پیوێستیمان بە هاوکاری جەنابتان هەبێت، ئەوکاتەش ئەتوانین ڕێبازی بزوتنەوەکە بگۆڕین، لە جیاتی هاوکاری لەگەڵ ئێران بکەین، ئەتوانین هاوکاری لەگەڵ دۆستانماندا لە لیبیا و سوریا بکەین".

قەزافی گوتی: "ئەگەر بزوتنەوەکە بەوشێوەیەبێت، ئەوە من ئامادەی هەمو جۆرە یارمەتییەکم"، منیش گوتم: باشە هەمو جۆرە یارمەتیەک، گوتی: "جەلال بەڵێ هەمو جۆرە یارمەتیەک" منیش گوتم: "ئاخر مەلا مستەفا من نیە بە ٢٠ هەزار دینار مانگانە ڕازی بێت، ئەو چەند ملیونێکی ئەوێت"! قەزافیش گوتی: "بەڵێ من ئامادەم"!.

کە گەڕامەوە، نامەیەکم بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی نوسی و بە عەزیزی شێخ ڕەزادا ناردم، ئەوان هەمدیسان گاڵتەیان پیکردبو، گوتبویان ئەوە تەنها پروپاگندەیە!.

ئینجا خۆشتر لەو حادیسانە ئەوە بو، کە ڕێککەوتنامەی ٦ی مارت لە جەزایر ڕویدا، قەزافی بەپەلە منی ناردەوە و گوتی: "برۆ بە مەلا مستەفا بڵێ من لەسەر وەعدی خۆم بەردەوامم، ئەگەر مەلا مستەفا بەرگری بکات و تەجەموعی وەتەنی عێراقی پشتگیری بکات، ئەوا من ئامادەم هەمو هاوکارییەکی بکەم".

گوتم: وەڵڵا زۆر چاکە و باشە کە من گەیشتمە فرۆکەخانەی دیمەشق هەمو چاوەڕێی منیان ئەکرد، لەوانە عومەر دبابە و ئەحمەد عەزاویی و کۆمەڵێک کەسایەتی

تری لە گروپە جیاوازەکانی هێزەکانی بەربەرەکانی عێراقی بەپیرمەوە هاتبون.

*** لەوکاتەدا چۆن پەیوەندیتان بە بارزانییەوەکرد و پێشنیازی چیتان بۆکرد؟**

- هەمو لە سوریا مشەوەش بوبوین کە پێویستە شتێ بکرێت، لە ئەنجامی ئەو رێککەوتنامەیە! من رەئیم وابو کە مەلا مستەفا بەرگریی ئەکات، عومەر دەبابە گوتی: "وەڵڵاهی مەلا مستەفا هێزی تێیدا نەماوە، بە بڕوای من تەقە لە تفەنگیەوە نایەت و ڕادەکات".

لەلای عەلی سنجاری و ئەسعەد خۆشەوییەوە هەواڵهات کەوا تەجەموعی عێراقی ئامادەیە هەمو هاوکاریەک بکات، منیش بەپەلە عومەر دەبابەم ناردەوە بۆ کوردستان و نامەیەکم بۆ مەلا مستەفا نوسی تێداهاتبو: "ئەوە لیبیا ئامادەیە، سەرۆک حافز ئەسەدیشم بینیوە، ئەویش ئامادەیە بۆ هاوکاری و گوتی چەک و تەقەمەنی لەسەر من، بەڵام، من پارەم نییە، بەڵام وا لیبیا پارەئەدات، واتا چەک و پارە و تەقەمەنی تەئمینە، لەبەرئەوە گرنگە کە دریژە بە خەباتبدەن".

کاک عومەر گەڕایەوە، بەڵام وەڵام نەبو، بۆیە ناچاربوم کە نامەیەکی ترم بە هێرۆدا نارد، بەڵام تاوەکو ئەو گەیشتە کوردستان، ئاشبەتاڵ ڕویدابو، مەلا مستەفا بڕیارێکی دابو کە نامە و ڕاسپاردە سودی نەمابو، بەڵام سوپاسی ناردنی نامەکانی کردبو.

ماڵی مەلا مستەفا لە هەڵوێستی من مەمنون بون، چونکە ئەیانزانی من چی ئەکەم، پێشئەوەی لە ١٩٧٤دا شەڕ هەڵگیرسێتەوە من لە ڕۆژنامەی سەفیری لوبنانی وتارێکم نوسی و داوام لە حکومەتی عێراق کرد، شەڕی مەلا مستەفا نەکات و واقعی بێت، مەلا مستەفا ئەمرۆ سەرۆکی بزوتنەوەی کوردایەتییە و ئەو بزوتنەوەیە واقعیە و ناتوانرێت حەزف بکرێت، یاخود هەوڵی لەناوبردنی بدرێت. ئەو وتارە زۆر دەنگیدایەوە و حکومەتی عێراق زۆری پێ ناخۆشبو، پیاوانی حکومەت، وەک خورشید ڕەواندزی، وەڵامی دامەوە و هەزار قسەی پێ گوتبوم.

هەروەها، من کارێکی ترمکرد، ئەویش هانی کۆمەڵێک کەسایەتی عەرەبیمدا و بروسکەیان بۆ سەدام حسێن نارد کە پێویستە لەگەڵ کورد پێکبێت و رێگای شەڕ نەگرێتەبەر، بەڵکو پێویستە چارەسەری ئاشتیانە بدۆزێتەوە.

مەلا مستەفا، پێش شەڕ هەڵگیرسانەوە، سی هەزار دیناری دابو بە عەزیزی

شێخ رەزا و گوتبوی ئەوە بۆ جەلالە و با پێی بێ، بچێ جەولە بکات، (دە) نامەشی بە سپی بۆ ئیمزا کردبوم و بۆی ناردبوم، گوتبوی با خۆی پڕی بکاتەوە، بۆ هەرکەسێک ئەیەوێت.

برایەتی وا کەوتبوە نێوانمانەوە، وای لێهاتبو، نامەی بەسپی بۆ ئیمزا ئەکردم، منیش دەستم کرد بە کارکردن، بەڵام زۆریپێ نەچو کە ئاشبەتاڵەکەی بەسەرداهات ئەو فرسەتەش لەدەستچو.

# ڕۆڵی تازەی سۆڤێت

*** رۆڵی یەکێتی سۆڤێت چی بو لەم روداوانەدا؟**

– لە ۱۹۷٤ دا لە قاهیرەبوم، رۆژێکیان مستەفا جاف تەلەفۆنی بۆکردم، گوتی: "تکایە سبەینێ بگەرە بیروت، ئیشیکی گرنگم پێتە و دۆستیکی کۆنی خۆت هاتوە و ئەیەوێت بتبینێ، ئەبێ سبەینێ لێرەبیت". منیش چوم بلیت ببرم، بەڵام بە فرۆکە هیچ جێگا نەمابو، ناچاربوم پەیوەندیم بە سەرۆکایەتی کۆمارەوەکرد، چونکە ئەوان هەمیشە دو کورسیان بۆئەگیرا کە مەسەلەکەم بۆ رونکردنەوە، ئەوان رازیبون، جێگایەکی خۆیانم بدەنێ.

لە بێروت چومە ماڵی مستەفا جاف، گوتی: برادەرەکەت ئێستا دێت، نزیکی نیو سەعاتی پێچو، زەنگی لێدا و (بریماکۆف) هاتە ژورەوە، بریماکۆف، سەردەمێک وەزیری دەرەوە و سەرۆک وەزیرانی روسیا بو[1].

*** بریماکۆف بە چ سیفەتێک هاتبو بۆلای تۆ و باسی چیتانکرد؟**

– ئەوکاتە، نوێنەری رۆژنامەی پراڤدای ڕوسی بو لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، شارەزای مەسەلەی کوردبو، ئەملاوئەولای ماچ کردم و دانیشتو گوتی: "ئیشم پێتە و ئیشەکەمان بە تەنیایە، برۆ با برۆین بۆ خۆمان پیاسەیەک بکەین"، کە چوینە دەرێ پێی گوتم: "من حەز ئەکەم پێت بڵێم کەوا ئێمە تۆ بە پیاوێکی پێشکەوتوخواز و شۆڕشگێر ئەناسین و مەلا مستەفا هەڵەی کردوە"، زۆری لەسەر

ڕۆیشت، منیش گوتم: "تۆ ئەتەوێت رامکێشی بەلای حیزبی شیوعیدا، گوێت لێبێت، رەفیق بریماکۆف، من تاقیکردنەوەی خۆمم هەیە لەگەڵ ئەو بەعسییانە و باشیان ئەناسم، ئەوانە مافی کورد نادەن، شتێکی وا نادەن، لە ڕوت بێت باسی بکەیت، ئێستا هەمو خەڵکی کورد لە دەوری مەلا مستەفا کۆبۆتەوە، بە گژاچونی کارێکی خراپە"، گوتم: "(تەبارش) واتا (هاوڕێ) بریماکۆف، وەرن با ئێمە پەیوەندی نێوان ئێوە و حەرەکەی کوردی دروست بکەین"، گوتی: "باشە خۆ ئێمەش ئەوەمان پێخۆشە، ئێمە لاریمان نییە و نامانەوێ عێراق تێکبدەین، بە هیوام لە ڕێگای تۆوە پەیوەندیمان تازە بێتەوە، بەشکو تۆ هەوڵ بدەی ئەو پەیوەندییە زیندوبکەیتەوە".

ئەویش یەکێکی لە سەفارەتی سۆڤێتی پێ ناساندنم و گوتی: هاورێیەکی کۆنت هەیە، کە چوم لەوێ ناسیمەوە (زاید سیف) بو، کاتی خۆی لە بەغدا ئەمناسی و گفتوگۆمان لەگەڵ ئەکرد، ئەو هات بۆ ئوتێلەکەی کە ئێمەی لێبوین، بو بە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان من و سۆڤیەتییەکان.

ئەوکاتە ئەو لە لوبنان سکرتێری یەکەم بو، ناسیمەوە و دانیشتین و پەیوەندیەکە تازەبۆوە و چەند جارێکی تریش بینیمەوە، بۆ حەقیقەتیش جارێک کۆمەڵێک لیرەی لوبنانی دەرهێنا و گوتی: "چەندت دەوێ بتدەمێ، ئێستا تۆ لە دەرەویت و پارەشت پێویستە"، گوتم: "زۆر سوپاست ئەکەم و وەزعم باشە و پارەم هەیە، بافێری پارەوەرگرتن لە سۆڤیەت نەبین"، هیچم لێوەرنەگرت و زۆر سوپاسمکرد.

*** هەڵوێستی بارزانی چی بو بۆ ئەو پەیوەندییە لەگەڵ سۆڤێت، ئایا ئەو ئاگاداری ئەو پەیوەندیە هەبو؟**

– لەو بارەیەوە نامەم بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی نوسی و ئەوانیش وەڵامیان دامەوە و گوتیان: "بریماکۆف جاسوسە، سۆڤیەت هیچی پێنیە بۆ ئێمە، حسابیان بۆ مەکە، ئەوانە تەنها مەبەستیان ئەوەیە هەواڵمان لێوەربگرن، ئەوانە ناحەزی ئێمەن".

من بەقسەیانم نەکرد و پەیوەندییەکەم نەپساند، هەتا دوای روخاندنی شۆڕشی کورد.

کە شۆڕشی کورد روخا، سۆڤێتییەکان زۆر تەنگاوبون، پێش هەرەس، هاتنە لام و گوتیان با بارزانی بەرگری بکات، ئێمە ئامادەین پشتیوانی لێبکەین، بەڵام ئەوەبو هەمو ئەو داخوازیانە سودی نەبو.

## پەراوێزەکان:

١- بریماکۆف لە ١٩٢٩/١٠/٢٠ لە شاری کیفی ئۆکرانیا لە دایکبوە و لە ٢٠١٥/٦/٢٦ لە مۆسکۆ کۆچی دواییکرد و ئەو لە رۆژنامە نوسیەوە دەستی کردوە بە کار و بوە بە سیاسیەکی چالاك و چەند پۆستێکی لە حکومەتە جیاوازەکانی روسیا وەرگرتوە، لەوانە لێپرسراوی هەواڵگری دەرەوە و وەزیری دەرەوە و ماوەیەکیش سەرۆك وەزیران بو.

# بناغە بۆ خەباتێکی نوێ
# (ئەڵقە رۆشنبیریەکانی کۆمەڵە و دامەزراندنی)

# کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان (کۆمەڵە)

*** پێش بیرکردنەوە لە دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان هەبو، ڕۆڵی ئێوە چی بو تێیدا و ڕۆڵی کۆمەڵە چی بو لە دروستکردنی یەکێتیدا؟**

- دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان، کە پاشان بوبە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، لەوتەکانی پێشومدا باسی ئەوەمکرد، کە لە دێرین زەمانەوە، لە سەرەتاوە لەناو پارتی دیموکراتی کودستانی عێراقدا، تەیارێکی مارکسی لینینی هەرهەبوە، ئەو تەیارە مارکسیە لینینیە ناوبەناو باڵا دەستبوە و ناوبەناو کزبوە و ناوبەناو دەنگێکی دلێر و زوڵاڵی هەبوە و ناوبەناویش لەناو جەماوەری زۆر و زەبەندی حیزبەکەدا گونجاوە. لەساڵی ١٩٥٣ پارتی خۆی بەرەسمی مەسەلەی مارکسی لینینی هێنایە کایەوە. لە ساڵی ١٩٥٩دا، کە لە بەغدا بوین و بەئاشکرا کارمان ئەکرد و لە ١٩٦٠/١/٦ دا ئیجازەی کارمان وەرگرتبو، لە پەیرەوپرۆگرامدا باس لە سود وەرگرتن لە تیۆری مارکسی لینینی ئەکرا، بەڵام ئەوە زۆری نەخایاند، تیۆری مارکسی لینینی گۆرا بۆ تیوری عیلمی.

لەساڵەکانی ١٩٥٨ و ١٩٥٩ دا ئەو کەسانەی خۆیان بە مارکسی لینینی ئەزانی و لەناوپارتیدا بون، سوربون لەسەرئەوەی کە تیۆری مارکسی، پێویستە بە شێوەیەک لە شێوەکان خۆی بنوێنی لە بەرنامەکانی پارتیدا، تەنانەت لەو ناکۆکیە زۆر و زەبەندەی نێوان پارتی و شیوعی یاخود لە نێوان باڵەکانی پارتیدا هەبو، وەک باڵی هەمزە عەبدوڵڵا، نەژاد، خەسرەو، حەمید عوسمان و ساڵح حەیدەریی، ململانێیەکی زۆر لەسەرئەوە هەبو، ئایا پارتی وەک ئەوان باسیان ئەکرد، موڵکدار و بازرگان و بورجوازیەتی کوردە، یان پارتی ڕەنجدەرانی کرێکاران و جوتیاران و خوێندەواران و ڕۆشنبیران و کاسبکاران و جەماوەری کوردستانە؟ ئەم تەیارە لەدوای جیابونەوەی ١٩٦٤ لەگەڵ مەلا مستەفا زیاتر سەری هەڵدایەوە.

لە سەرەتادا، ناکۆکی لەنێوان هەمو ئەو ئەندامانەی پارتیدا پەیدا بوبو کە

بۆچونی سیاسی و بیرکردنەوەی ئایدیۆلۆجیان هەبو، بە تایبەتی لەسەر مەسەلەی مارکسیزم - لینینیزم، چونکە ئەوکاتە مارکسییەت دو شێوەی بیرکردنەوەی بەخۆوە گرتبو، شێوەی سۆڤیەتی و شێوەی چینی، من خۆم لەو کەسانە بوم، بۆچونی چینییەکانم پێ باش بو. لە ساڵی ١٩٦١وە گوێم لە رادیوکانی مۆسکۆ و پەکین ئەگرت و ئاگاداری ناکۆکیەکانیان بوم، بە تایبەتیش بەهۆی ئەحمەد عەبدوڵڵاوە بڵاوکراوەی چینیەکانم پێدەگەیشت، ئەو لەو رەئیەدابو، بۆچونی چینیەکان راستترن لە هی سۆڤێتیەکان.

*** هۆی چی بو، ئێوە زیاتر بەلای چینیەکاندا داتانشکاند؟**

- ئەوەی کە سەرنجی ئێمەی زۆر راکێشا لە ناکۆکی نێوان چینی و سۆڤێتیەکان، مەسەلەی خەباتی شۆڕشگێرانەی شۆڕش بو دژ بە ئیمپریالیزم و پشت ئەستور بە جوڵانەوەی جەماوەر، هەروەها مەسەلەی گرنگیدان بە جوڵانەوەی رزگاریخوازی گەلان.

ئەوکاتە خرۆشۆفیزم، ئەوانەی هەمو بەلاوە ئەنا، یان ئەیخستە ژێر لێوەوە، لەبەرئەوەی لەناو پارتیدا ئەو زەمینەی تەییارە مارکسیە لینینیە شۆڕشگێرە لەباربو و باسی لێوە ئەکرا، بۆیە زوربەمان کەوتینە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕەکانی چین بە گشتی و بیروباوەڕەکانی ماوتسی تۆنگەوە بەتایبەتی.

لەسەرەتادا بیروباوەڕەکانی ماوتسی تۆنگ و جێبەجێکردنی مارکسیزم لینینزم لە وڵاتێکی نیمچە دەرەبەگی نیمچە موستەعمەرەی دواکەوتودا، لە وڵاتێکی دنیای سێ کە زۆرتر لە بارودۆخی کوردستانەوە نزیکبو، هەروەها خەباتی چینیەکانیش، گوێزانەوەی خەباتی چەکدارانە لە لادێوە دەستی پێکردبو بۆ شاخ و دۆڵەکان و دوایی شارەکانی رزگارکردبو، ئەمەش زیاتر لەگەڵ خەباتی کوردستاندا ئەگونجا.

جگە لەو سەرکەوتنانەی کە چین بەدەستی هێنابو، جگە لەو باس و نوسینانەی کە لە کۆنەوە لەسەر چین، چ لە رۆژنامە و گۆڤاری گەلاوێژ و هەندێ کتێب، بەعەرەبی تەرجومەکرابون. ئەوانە هەمو کاری خۆیان کردبوە سەر ئەو کەسانەی لەناو جوڵانەوەی کوردایەتیدا خۆیان بە مارکسی لینینی ئەزانی، بەتایبەتیش کە خورۆشۆفیزم ئەو سەردەمە، پشتیوانی لەو تیۆرییە ئەکرد کە تاقە رێکخستنێک لە وڵاتانی عەرەب وەک میسر و سوریا و عێراق بەناوی (ئیتحادی ئیشتراکی) دروستبکرێت و هەمو شۆڕشگێرەکان بچنە ناو ئەو یەکێتیەوە، لەو روانگەیەوە، پێویست بو مارکسی لینینیەکانی ئەو وڵاتانە حیزبەکانیان حەلبکەن.

سۆڤیەتەکان لەروی تیۆریی و بەکردەوەش پشتیوانیان لە سەرکردایەتی مەلا مستەفا ئەکرد لە دژی سەرکردایەتی مەکتەبی سیاسی، تەنانەت رۆژنامەی پراڤدا، کاتی خۆی وتارێکی لەسەر ئەو ناکۆکیەی نێوان مەکتەبی سیاسی و پارتی نوسیبو کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی و لایەنگرەکانیانی بە (چەپڕەوی موتەتەڕیف) نیشاندابو، "تەنها باوەڕیان بە خەباتی چەکدار و خەباتی شۆڕشگێرانە هەیە و لەو راستییە ناگەن کە ئەمڕۆ گەشەکردن، مانای خەباتە بە شێوەی ئاشتی و ئاشتی خوازانە. کۆمەڵێکی توندوتیژ و توندرەی بەم شێوەیە، ئەبینین کە هەم لەروی بیروباوەڕ و هەم لە روی کردەوەوە نا دروستن و باڵێکیان لەناو پارتیدا دروستکردوە کە ئەو بیروباوەڕەیان لاپەسەندبو".

## بیری ماویزم لەناو بزوتنەوەی چەپی کوردیدا

*** جگە لەو هۆیانەی کە باستانکردن، هۆی تر هەبو کە فکری (ماویزم) لەناو چەپی کوردیدا بڵاوبێتەوە؟**

- بەڵێ، پاش هاتنی برادەرانی سازمانی ئینقیلابی حیزبی تودەی ئێران بۆلای ئێمە لە بەکرەجۆ، بۆچونی ئێمە زیاتر گەشەیکرد، دەربارەی مارکسیزم و تیۆری ماوتسی تۆنگ، من لەگەڵ ئەو دەستە گەنجانەدا بوم کە ئەوسەردەمە لەمنەوە نزیک بون. لەناو پارتیدا ئەو بیروباوەرە وردە وردە لە سەرەتادا لە سلێمانیەوە بڵاوبۆوە، چونکە خۆم لەوێ بوم و ئەو برادەرانەی سازمانی ئینقیلابیش لەوێ بون. کۆمەڵێک گەنجی هۆشیاریی چەپی تازە پێگەیشتوی، وەک نەوشیروان مستەفا و بەکر حوسێن و فوئادی مەلا مەحمود و شازاد سائیب و فەرەیدون عەبدولقادر و ئەحمەد عەبدوڵلا و جەلالی کەرکوکی ئەوانە کۆبوبونەوە و وردەوردە ئەو بیروباوەرە پەرەی ئەسەند.

بەشەکەی تری ناو سەرکردایەتی پارتی، مارکسیزم - لینینیزمیان پێباشبو، بەڵام سەدی سەد بۆچونی چینیان پێقبولنەبو، بەڵکو هەندێک عمومیاتی کلاسیکیی مارکسیزمیان پێباش بو. ئەتوانین بڵێین "ئێمە لە واقیعدا، لە ساڵی

١٩٦٨وە تەيارێكی دياروئاشكرا كە كتێبی چينی و بير و باوەڕی ماوتسی تۆنگمان بڵاودەكردەوە لەناو خەڵكدا، سەرمان هەڵدابو و وردە وردە گەشەمان ئەكرد".

هەروەها ئيجازە وەرگرتنی گۆڤاری رزگاری و هاتنی برادەرانی سازمان ئينقيلابی، هۆبون كە بۆچونەكانمان شێوەی تەيارێكی فكری بەخۆوە بگرێت، جگە لەوە هەندێك هەڤاڵی تریش كاريگەرييان تێكرابو لە زانكۆی بەغدا ياخود خۆيان بيروباوەرەكەيان قبوڵبو، وەكو دارۆی شێخ نوری، فازيلی مەلا مەحمود، شەهابی شێخ نوری كە ئەو كاتە لەبەسرەبو، بەڵام دوايی گەڕابۆوە بۆ بەغدا.

چەندين كەسی ديكەش هەبو لە شاری سلێمانی، لە ليژنەی ناوچەی پارتيدا كاريان ئەكرد، وەك جەمال تايەر، محەمەد سابير، رەفعەتی مەلا و فواد قەرەداغی، ئەوانيش لە هەمان بيروباوەڕەوە نزيكبون، ئەوانە هەمويان لە دەوری گۆڤاری رزگاری كۆبوبونەوە. جگەلەوە چەند برادەرێكی ديكەی وەك مەحمود ئەفەندی (مەحمودی مەلا عيززەت) و حەمە چاوشين و چەندين لاوی تريش، رەنگە ناوی هەمويانم لەبير نەبێت، ئەوانەش هەمان بۆچونی چەپانەيان هەبو.

بەم شێوەيە ئەتوانين بڵێين كە تەياری چەپی مونەزەم وەك تەيارێكی ديار و خەملێو لەناو پارتی وردەوردە خۆی ئەنواند[1].

*** دوای حەل كردنی پارتی شۆرشگێر، ئەو برادەرانەی كە باسكردن چيان بەسەرهات؟ ئايا رێكخستنی تايبەتی خۆيان دروستكرد؟**

- پاش رێككەوتننامەی ١١ی ئازار و حەلكردنی پارتی شۆرشگێر، ئەوانەی كە خۆيان بە ماركسی و لينينی ئەزانی، كەوتنە خۆيان و هەوڵيان بۆ دامەزراندنی رێكخراوێكی تازەی سەردەمدا.

ئێمە كتێبخانەی بيری نوێمان لە بەغدا دانابو، وەك وەكيلی كتێبی چينی وابو، هەرچی كتێبی چينی ئەهات، ئەيفرۆشت و بڵاويئەكردەوە، من چارەسەری كێشە داراييەكەم ئەكرد، ئيجازەكەی بەناوی دارۆی شێخ نورييەوەبو، شەهابی براشی سەرپەرشتياری ئەكرد.

ئەو مەكتەبەيە، مەركەزێكی فكری بو، بۆ بڵاوكردنەوەی كتێب و نوسراو و بير و باوەڕی چەپڕەو، ئەوەی شايەنی باسە، ئێمە لەگەڵ سەفارەتی چيندا پەيوەنديمان زۆر بەهێزبو، پەيوەنديمان لەگەڵ كارمەندێكی چينی هەبو لە سەفارەتەكەيان لە بەغدا، ئەوان پشتيوانييان لێدەكردين و ناراستەوخۆ تەشويقيان ئەكردين بۆ كارەكانمان.

بەو شێوەیە تەماشا ئەکەین لە دوای ١٩٧٠ەوە بیروڕای کۆمەڵە هاتەکایەوە، بەڵام چەند بۆچونێک هەبو کە کۆمەڵە چۆن بێت و چۆن نەبێت و هەڵگری کام بیروباوەر بێت.

لەو بارەیەوە دوسێ بۆچون هەبون، شەهابی شێخ نوری و فەرەیدون عەبدولقادر، فازیلی مەلا مەحمود، دلێر سدیق و فواد قەرەداغی، ئەوانە کەوتبونە خۆیان، کە ڕێکخراوێک دروستبکەن و هاتن بۆلای من، من فیکرەکەم پێباش بو، بەڵام پێمگوتن ئەوەی ئەوان ئەیانەوێت زۆر سنورداربێت، چونکە تاقمی تریش هەن بە تایبەتی ئەو برادەرانەی کە لە گۆڤاری ڕزگاری کاریان ئەکرد، ناکرێ ئەوان بەلاوەبنرێن و نەهێنرێنە ئەو ئیشەوە.

هەروەها پێمگوتن: هەندێ برادەری تر هەن کە بیروباوەڕیانم پێ باشە، پێویستە ئەوانیش وەربگیرێن، دوایی ئەوان باوەریان بەوەهێنا، پێویستە خەڵکانی تریش وەربگرن، بۆیە بڕیاریاندا کە دەسەڵات بدەن بە من، ئەو برادەرانە کۆبکەمەوە، چونکە ئەوان باوەریان بەمن هەبو و پەیوەندیان لەگەڵمدا باشبو، ئەمتوانی کۆیانبکەمەوە.

ئێمە لەو سەردەمەدا، دەورەیەکی فیکریمان کردبۆوە بۆ پەروەردەکردنی کادێر، هەروەها شتێک هەیە پێویستە بیڵێین: ئەوکاتە شەهابی شێخ نوری، وەک ڕیش سپی ئەم تاقمە وابو، نەوشیروان مستەفاش وەک ڕیش سپی ئەو جەماعەتەی کە ڕزگاریان دەرئەکرد، نێوانیان ساردییەک و بێ متمانەییەکی تێدابو[٢]. من کەوتمە بەینەوە و لەئەنجامدا هەمو ڕازی بون، ڕێکخراوێک دروست بکرێ بەناوی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان) کە بیروڕای مارکسی لینینی و بیروباوەری ماوتیستۆنگ تەبەنی بکات و هەوڵ بدات پارتێکی پێشرەوی کوردستانی دروستبکات و دژایەتی ئیمپریالیزم و هەمو ئەولادانانەی بکات کە هەیە لە ڕێبازی خەباتدا[٣].

*** کەواتە تۆ بە داینەمۆی دامەزرێنەری کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان دائەنرێیت؟**

- لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەدا، کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی پان و بەرینمان دروستکرد، لە پاشاندا هەندێ لەو برادەرانە لێی کشانەوە، وەک ڕەفعەتی مەلا، مەحمودی مەلا عیززەت، بەکر حسێن. ئەوەی لە سەرکردایەتی مایەوە، من، شەهاب، فازیلی مەلا مەحمود، فواد قەرەداغی، فەرەیدون عەبدولقادر، دلێر سدیق بوین.

ماوەیەکی پێچو هەستمکرد، کە فازیلی مەلا مەحمود ئەیەوێ کۆمەڵە بەلایەکی

ترا بەرێت. ئێمە پرۆگرامێکمان دانابو، پرۆگرامەکەمان زۆر بەدزی و بە تەسکی بڵاوئەکردەوە، بریارماندا کە کۆمەڵە زۆر نهێنی بێت و کەس نەیزانێ، تا گەشە ئەکات و لەسەر قاچی خۆی ئەوەستێت، نەوەکا توشی زەربەی حکومەت و زەربەی مەلا مستەفا بێت، لەبەرئەوە پێویستە کارەکانمان زۆر بە نهێنی بکەین و بە هیچ شێوەیەک باسی نەکەین.

*** شێوەی کارکردنی رێکخراوەیی لەناو ئەو رێکخستنە تازەیەدا چۆن بو؟**

- بریارماندابو کە کۆمەڵە شێوەی شانەی هوشیارکردنەوە بەخۆیەوە بگرێت و لە هەمو شوێنێک شانەی هوشیارکردنەوە دروستبکات، ئەوە پێویست بو، لە پاشاندا لەناو ئەو خەڵکانەی لە شانەی هوشیاریدان، بگەرێین بۆ ئەو کەسانەی کە ئامادەییان تێدایە بۆ کاری رێکخستن و وردە وردە بیانکەین بە پاڵێورا و پاشان بیان کەین بە ئەندام.

لەسەرەتادا بوین، فازیلی مەلا مەحمود کەوتە پیلانگێران، فازیلی مەلا مەحمود زۆر زیرەک و زۆر توانای خۆگونجاندن و خۆ رەخساندنی هەبو، بیروروباوەری عێراقچێتی بڵاوئەکردەوە و ئەیوست ئەو بیروباوەرە عێراقچێتییەی کە خۆی هەیەتی و ئێمەش کوردستانی بمێنینەوە[٤]. من لەگەڵ شەهاب و فەرەیدون و دلێر و برادەرانی تر قسەمکرد و گوتم: پێویستە ئێمە چارەسەری بکەین، ئەوەبو لە کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی کۆمەڵەدا، بریارماندا کە فازیل و فواد قەرەداغی لە نێوانماندا دوربخەینەوە لەبەرئەوەی ئەوان بیروباوەری عیراقچێتیان هەبو[٥].

فازیلی مەلا مەحمود لە بنەوە بەهۆی فاروقی مەلا مستەفای ئامۆزایەوە، پەیوەندی لەگەڵ قیادەی مەرکەزی پەیداکردبو، ئەیانویست بیکەن بە ئەندامی خۆیان. کە فازیل و فواد رۆیشتن، بە دوژمنایەتی نەرۆیشتن و پەیوەندیمان وەک دۆست مایەوە، بەڵام چەند کەسێکیان لەگەڵ خۆیان برد لە کۆمەڵە، ژمارەیەکی کەمبو، بەڵام ئەساسیەکە لەگەڵ خۆمان مانەوە[٦].

لەوسەردەمەدا نەوشیروان و مەحمودە فەندی و شازاد و ئەو برادەرانە مەسئولیەتیان وەرنەدەگرت، بەتایبەتی نەوشیروان مستەفا حوکم درابو بە چەند سالێک، ئێمە رەئمان وابو کە بینێرینە دەرەوەی وڵات. ئەوەبو دوای ئەوەی، کە لەگەڵ مەلا مستەفا پێکهاتین رێگامان بۆ رەخساند و سەفەریکرد، کە لەدەروەشبو، هەر ئەندامبو، بەڵام ئەندامێکی چالاک نەبو.

ئەو سەردەمە شەهاب و فەرەیدون چالاکبون، دلێر سدیق ئەندامێکی چالاک

نەبو، پاش ماوەیەکی تر ئەویش خۆی دور خستەوە، هەروەها بەکر حوسێن و برادەرانی تریش کوڕی چاک و هوشیاربون، بەڵام چالاکی زۆریان نەبو. دو، سێ گەنجی تر، لە بەغدا دائەنیشتن هاتنە پێشەوە یەکێک لەوانە جەعفەر عەبدول واحید بو، ئەوکاتە، هەرکەسێ تا دەورەی کادیری لەبەغدا تەواونەکردبایەوە و بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگی قبوڵ نەبوایە، رامان نەئەکێشا بۆ ناو ریزەکانی رێکخستنی کۆمەڵە.

دوای ئەوەش کرێکارێک پەیدابو بەناوی ئەنوەر زۆرابەوە، کوڕێکی چاک و هوشیار بو، ئەویش هاتە ریزی کۆمەڵەوە، ئەوەبو دوایی لەگەڵ شەهابی شێخ نوری ئیعدام کران، بەڵام پێش ئعدامکردنی، وەک پێویست بەرگری نەکرد، بەڵام ئیعدامکرا و بەخوێنی پاکی خۆی ئەوەی سڕییەوە.

پاش ماوەیەک، کۆمەڵە وردە وردە گەشەی کرد، خەڵکانی هوشیاری لێ کۆبونەوە و ئەوانەی لەو سەردەمەدا هاتنە ناوەوە، بریتی بون لە: ئەبو شهاب لە کەرکوک و شاسوار جەلال لە سلێمانی و کۆمەڵێک برادەری تر، لە شوێنەکانی تر.

لەو کاتانەدا، گومانمان لە دو ئەندام هەبو کە خەبەری پارتیان دابێ، یاخود خۆیان زۆر لە پارتیەوە نزیک کردبۆوە، یەکێکیان (م.م) بو، بەراستی دەورێکی باشی نەبو، زۆر خۆی ئەپاراست، دوەمیشیان، (س.ب) بو کە ئەویش نوسخەیەک لە بەرنامەکەی کۆمەڵەی گەیاندبوە سەرکردایەتی بارزانی.

پارتی و خەڵکی، هەستیان بە بونی کۆمەڵە ئەکرد، بەبێ ئەوەی کەس بزانێ ناوی ئەم رێکخستنە نوێیە چیە؟ و رەمزی چیە! دوای ئەوە من لە هاوینی ١٩٧٢دا چومە دەرەوە و برادەران لە ناوەوە مانەوە وەک شەهابی شێخ نوری و فەرەیدون عەبدولقادر و جەعفەر عەبدولواحید، کە چاکترین و شارەزاترین ئەندامەکانی کۆمەڵەبون.

*** کەتۆ لە دەرەوە بویت چۆن سەیری کارەکانی کۆمەڵەت ئەکرد، خاڵی بەهێز و بێ هێزییان چی بو؟ کێ دەوری سەرەکی ئەبینی، دەوری تۆ چی بو لە ئامۆژگاری و هاوکاری کردنیاندا؟**

– من لە دەرەوەی وڵات کە سەیری کۆمەڵەم ئەکرد، هەستم بە دو، سێ شت ئەکرد کە بە سود بۆ کۆمەڵە نە ئەگەڕایەوە، یەکەم: ئسلوبی شەهابی شێخ نوری بو کە زۆر نەرم و گونجاو نەبو بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان، ئەو گیروگرفتێکی لەگەڵ ئاوات عەبدولغەفور و چەند برادەرێکی تر دروستکردبو،

دوایی بوە هۆی ئەوەی هەندێکیان چون کۆمەڵەی رەنجدەرانیان دروستکرد.

هەروەها ئسلوبی فەرەیدون عەبدولقادریش لەو سەردەمەدا هەڵپە هەڵپی پێوە دیاربو، حەزی لە خۆنیشاندان و لە شکڵیەت ئەکرد، بۆ نمونە ئەگەر بە قسەی فەرەیدونمان بکردایە، گۆڤارێکمان بڵاوئەکردەوە چەکوش و داسێکی لە سەرەوە و لەولاشەوە ئەستێرەیەکی سوری پێوەبێت، ئەوە دروشمی دیار و ئاشکرای حیزبی مارکسی بو، فەریدون عەبدولقادر زۆر گرنگی بە مەزهەر ئەدا، ئێمە ئەوکاتە زیاتر پێویستمان بەوەبو گرنگی بدەین بە ناوەرۆک، بۆئەوەی خۆمان بشارینەوە، ئەگەر رێگا بەو هەڵپە هەڵپە و پەلە پەلە بدرایە، ئەبوەهۆی ئاشکراکردنی کۆمەڵە.

ئەگەر کۆمەڵە ئاشکرا ببوایە، بێگومان هەم لەلایەن حکومەت و حیزبی شیوعییەوە دژایەتی ئەکرا و هەم لەلایەن پارتیشەوە بەتوندی لێی ئەدرا و زو دائەمرکایەوە و لەناوئەچو. من رەئیم وابو کە پێویستە زۆر بە نەهێنی کاربکەین و لە وەرگرتنی ئەندامدا زۆر ورد بین، من رەئم وانەبو، کە پەلە بکرێت، من رەئیم وابو شانەی هوشیاری لە هەمو شوێنێکدا پەرەی پێبدرێت و گەشەی پێبدرێت. لەو شانانەوە خەڵکی باش و هوشیار هەڵببژێرێت بۆ ریزی رێکخستن، ئەویش کاتێک کە خۆی هاتە سەر ئەو قەناعەتە و خۆی داوای ئەوەی کرد کە بێتە ریزی رێکخستنەوە. کە رێکخرا، ئەوکاتە پێی بگوترێ، کە رێکخستنێک هەیە و وردە وردە رابکێشرێت بۆناو کۆمەڵە ئاگاداری مەسەلەکان بێت، بەداخەوە لە وەرگرتنی ئەندام و لایەنگیر پەلەپەلییەک هەبو، من ئەو پەلەیەم پێ خراپ بو.

*** ئەوکاتە باس لە هەندێ گیروگرفتی ناو ریزەکانی کۆمەڵە ئەکرا، رای تۆ چی بو بۆ چارەسەرکرنیان؟**

- ئەوکاتە باسی ئەوەئەکرا کە ناکۆکی لەناو برادەرانی خۆماندا لە وڵات هەیە و چۆن ئەتوانین ئەو ناکۆکیانە چارەسەر بکەین، من رەئیم وابو ئەو برادەرانەی کە ناگونجێن لەگەڵیاندا بیان نێرن بۆ دەرەوەی وڵات بۆلای من، ئەو کاتە ئەمتوانی بیان نێرم بۆ چین یان بۆ هەندێ وڵاتی تر، بۆئەوەی بخوێنن و رۆشنبیریی و زانیاریان زیاد ببێت و تێگەیشتن و هوشیاریان گەشەبکات، ئەوکاتە هەم ئەبنە هاورێی باش بۆ دوارۆژ و برادەرانی ناوەوەش لەو سەریەشەیە رزگاریان ئەبێت.

خالێکی تر کە بەلامەوە خراپبو، ئەوەبو لەناو کۆمەڵەدا بەتایبەتی شەهابی شێخ نوری و جەعفەر و فەرەیدون دوابەدوای ئەوانیش برادەرانی تریش زۆر بەبێ موجەب، موعجیب بون بە نوسینەکانی مونیر شەفیق، مونیر شەفیقیش

ئەوکاتە لاف و گەزافی مارکسیزم لینینزم و بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگی لێئەدا و کتێبی دەرئەکرد. هەر چەندە مونیر شەفیق پیاوێکی تێکۆشەر و بیرڕۆشنبو، زۆر نوسینی بڵاوکردبۆوە، بەڵام ئەو نوسینانە سەرچاوەنەبون، هێشتا کاڵوکرچ بون و هێشتا نەخەملێوراوبون، لەبەرئەوە نەئەکرا ببن بەسەرچاوە.

من پێموابو لە جیاتی ئەوە، برادەران خۆیان بەو کتیبانەوە مەشغوڵ بکەن و بیکەنە سەرچاوە، باشتروابو کە بیخوێننەوە و سودی لێوەرگرن، بەڵام بابچنەوە سەرچاوە سەرەکییەکانی مارکسیزم- لینیزم و کتێبەکانی ماوتسیتۆنگ بخوێننەوە، ئەوانە سەرچاوە سەرەکیەکانن.

لەو بوارەدا کتێبخانەی (بیری نوێ) دەورێکی گرنگی هەبو، بۆ بڵاوکردنەوەی بیری تازە، کتێبی دەربارەی جەنگی گەلی تەرجەمەکرد بۆ کوردی، دوای ئەوە کتێبی (بژی جەنگی گەل) نەوشیروان مستەفا تەرجەمەی کردبو، لەپاشان (چەپکێک لە وتەکانی سەرۆک ماوتسیتۆنگی) کە مامۆستا ئیبراهیم و نەوشیروان مستەفا تەرجومەیانکرد، واتا کۆمەڵێک سەرچاوەی مارکسی و بیری ماوتسی تۆنگ بە زمانی کوردی کەوتنە بازارەوە.

## پەراوێزەکان:

١- (لە کۆتایی حەفتاکاندا، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە خۆیان بە م.ل. ئەزانی و باوەڕیان بە بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ هەبو و لەناو پارتیدا بون "باڵی م.س". چەند گروپێکی بچوکیان دروست کردبو....کۆمەڵە ئەو کاتە دەرکەوت کە پارتی "باڵی م.س" بەرەو ئەوە دەچو هەڵبوشێتەوە. ئەو برادەرانە کەوتنە خۆیان کە ئیتر سەرکردایەتیەکی یەکگرتو بۆ خۆیان دروست بکەن و بەرنامەی کار بۆ خۆیان دارێژن. چاوپێکەوتن لەگەڵ نەوشیروان مستەفا لە بەرلین لە ١٩٩١/٨/٢٠).

٢- (ناوەرۆکی سەرەکی لە نێوان گروپەکانی کۆمەڵە، بریتی بو لە هەڵوێست وەرگرتن لە چین، کۆمەڵێك لەو برادەرانە پێیان وابو پێویستە ئێمە هەمو شتێکی چین وەربگرین وەك خۆی، نەك هی ماوتسی تونگیش، بە حسابی ئەوەی کە مەرکەزیەتی ئوممەمیەتی تازەی دنیا چینە و ئەبێ پەیرەوەی بکەین، لەو کاتانەشدا کۆمەڵێك سیاسەتی دەرەوەی چین کە ئێمە بە هەڵەمان دەزانی سەری هەڵدابو، لەوانە پشتگیریان لە حکومەتی کۆنەپەرستی پاکستان و پشتگیری نومەیریان دەکرد لە سودان کە کۆمۆنیستەکانی دەکوشت و پشتگیری سیاسەتی کۆنەپەرستی شیلی لە ئەمریکای لاتین، هەروەها دەربارەی رۆڵی سەرکردایەتی پارتی "باڵی م.س" لەم رێکخراوە نوێیەدا و ئایا ئەو رێکخراوە نوێیە ماوی سرف بێت یان مارکسی، هەروەها رێکخستنەکە فراوان بێت و خەڵك زۆر کۆبکاتەوە یان رێکخستنێکی نوخبەوی بێت). چاوپێکەوتن لەگەڵ نەوشیروان مستەفا لە بەرلین ١٩٩١/٨/٢٠.

٣- فواد قەرەداغی دەگێڕێتەوە: ( لە بنەڕەتدا دوو گروپ بوون، گروپی نەوشیروان مستەفا، کە پێکهاتبو لە: نەوشیروان مستەفا، مەحمودی مەلا عیززەت، حەمە چاوشین، شازاد سائیب، کە ئەوانە لە دەوری گۆڤاری ڕزگاری گردببونەوە، گروپی دووهەم پێکهاتبو، لە: شهابی شێخ نوری، فازیلی مەلا مەحمود، فەریدون عەبدولقادر، کە لەسەر ڕاسپاردەی ئەوان، من چوم قسەم لەگەڵ مام جەلال کرد.... ئەویش ڕازی بو وتی: با ئێمە گروپێك بین لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و هەوڵی رێکخستنی گروپەکان بدەین. ئەنجام کۆبونەوەیەکمان کرد لە ئوتێل ڕەشید لە بەغدا، بە ئامادەبونی ڕەفعەتی مەلا، بەکر حسێن و مام جەلال و من. بڕیاری ئەوەماندا پشتگیر لە بابەتەکە بکەین) ( ڕەوتی چەپ لە باشوری کوردستان- کۆمەڵە وەك نمونە (١٩٧٠-١٩٨٨) ئەحمەد حەمە ئەمین ئۆمەر- ماستەر نامە لە زانکۆی سەلاحەدین. ٢٠١٤- ل. ٣٦).

٤- ئەشرەف تاڵەبانی کە کادیرێکی دیاری ئەو گروپە بو کە بە "عێراقچی" ناسرا بو، بەم شێوەیە باس دەکات (ئێمە عێراقچی نەبوین، ئێمە مەبەستمان بو، حیزبێك لەسەر ئاستی عێراق دروست بکەین،

ئەوە فازیلی مەلا مەحمود و فواد قەرەداغی لە سەرکردایەتی و لە خوار ئەوانەی کە هەڵگری ئەو بیروباوەر بون، یەکەم کەس من و سلێمان عومەر و محەمەد وشیار بوو، کە ئێمە لە شانەی سەرەکی بوین، کادیرەکانی تریش بریتی بون لە: عەبدولڕەحمان قەرەداغی، سەرداری حەسەنە سوری سیوسێنان، حەسەنی حەمە خان کە خەڵکی کفری بو، هەروەها زاهیر باهیر کە لە شێخەکانی مەردۆخ بوو، ئەمیری عەلی ناجی کە لە بەغدا دادەنیشت، عەبدو موعتەسەم دەباغ، شێروان نوری مەردۆخی و لە کچەکانیش پرشنگ مەحمەند، ئێمە نزیکەی چواردە کەس بوین، کە ڕامان وابو ئێش بۆئەوە بکەین. ئەم ململانێیە تا نزیکەی ساڵێکی خایاند و لە دوای ساڵێك کۆمەڵە یەکلایەنە بڕیاری خۆی داو وتی: ئێمە ناوی خۆمان یەکلایی کردۆتەوە و بڕیاری یەکلاکەرەوەمان داوە و ئێمە کوردستانین. ئەوەی خۆی بە کوردستانی نەزانێت ئەتوانێت بمێنێتەوە و ئەوەشی ئەو بیروباوەڕەی قبوڵ نیە، ئەوا سەربەستە بۆ خۆی جیاببێتەوە و ئەو حیزبە دروست بکات کە خۆی دەیەوێت. هەر بۆیە ئێمە جیابوینەوە و کۆمەڵەیەکمان دروستکرد و ناومان نا" کۆمەڵەی مارکسی- لینینی حیزبی شیوعی کوردستانی عێراق") (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، ناوەندی مێژویی "ی.ن.ك." سلێمانی ٢٠١٢، ل.١٤٥).

٥- (سەرکردایەتی کۆمەڵە لەناو ڕێکخستنەکانیدا بابەتی (کوردستانی یان عێراقیی) کۆمەڵەیان خستۆتە ڕاپرسیەوە، ئەنجامی ڕاپرسیەکە بەوە کۆتایی هاتوە، کە زوربەی زۆری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، لەگەڵ ئەوەدابون، ڕێکخراوەکەیان ڕێکخراوێکی کوردستانی بێت و خەبات لەسەر ئاستی کوردستان بکات). (رەوتی چەپ لە باشووری کوردستان. ل. ٥٢).

٦- دەربارەی وازهێنانی "عێراقچیەکان" فواد قەرەداغی لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێت (لە تەموز یان ئابی ١٩٧١ دا بە شێوەیەکی هێمن و ئازادانە لەگەڵ هاورێیەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی و چەند هاورێیەکی دیکە لە سلێمانی و بەغدا دەستمان لە ڕێکخراوەکە "کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان - عێراق" کێشایەوە..... دوای کەمتر لە ساڵێك دانیشتن و ڕاگۆڕینەوە و خۆ ساخکردنەوە، ڕێکخراوێکمان دامەزراند بەناوی "ڕێکخراوی مارکسی لینینی شیوعیەکانی عێراق" کە تەنیا یەك هاورێمان لەم ڕێکخراوەدا کاری لەگەڵ نەکردین و چوە ریزەکانی حیزبی شیوعی عێراق - قیادەی مەرکەزییەوە، ئەویش فازیلی مەلا مەحمود بو). (ڕۆژنامەی هاوڵاتی ژمارە ٤١٢ی ٢٠٠٨/٤/٩).

هەروەها دەربارەی هەمان مەسەلە لە وتارێکدا دەنوسێت: (لە نێو ئێمەدا تەنها فازیل بە قیادەی مەرکەزی حزبی شیوعی عێراقەوە پەیوەست بوو، ئەوانەی دیکە دوای تێپەربونی نزیکەی نۆ مانگ بەسەر وازهێنانیاندا لە کۆمەڵە و خۆئامادەکردن بۆ کارێکی نوێ لە ڕۆژی یەك و دووی ئایاری ساڵی ١٩٧٢ دا کۆبونەوەیەکیان سازدا، کە ناوی "کۆنفرانس" یان لێناو تیادا ڕێکخراوێکی مارکسی لینینی ماویستیان پێکهێنا)- (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین، ناوەندی مێژویی "ی.ن.ك.") سلێمانی ٢٠١٢، ل. ٥٥٩).

ئەم دیدارە لە ماوەی ١٥ ساڵدا تۆمارکراوە و ئەنجامدراوە. لە ١٩٩٠ دەست پێ دەکات تا ٢٠٠٥.

ئەم دیدارە وەك تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی مام جەلال وایە و لەشێوەی پرسیار و وەڵام. هەر لەو روانگەیەشەوە، مام جەلال پێشتر لە چەند شوێنێك و لای چەند کەسێك باسی لەوە کردوە، کە بیرەوەریەکانی نوسیوەتەوە.

مێژوی هاوچەرخی کورد و نەوەی نوێ پێویستی بەم شایەتیەی و زانیاریانەی لای مام جەلال هەیە هەر لەبەر ئەوەش بڵاوکردنەوەیم بە گرنگ زانی.ئەم دیدارە وەك ئەمانەتێکی مێژویی و ئەخلاقی گرتۆتە ئەستۆ، هەروەها لەوەش زۆر دڵنیابوم کە روناکیەك دەخاتە سەر بەشێ لە مێژوی خەباتی گەلی کوردستان و دەبێتە گۆشەیەکی جیاواز بۆ بینینی رابردو، سەرئەنجام ئەم دیدارە نەبەمەبەستی دژایەتی لایەنێك یان کەسایەتیەك یان بە بەرژەوەندیان، ئەنجام نەدراوە، بەڵکو تەنها باسی دوێنێیە وەك ئەوەی مام جەلال بینیوێتی و تێدا ژیاوە.

سەلاح رەشید




Mam Jelal

successive interviews

from youth to the presidency